# تەفسیری ڕەوان

## (بۆتێگەیشتنی قورئان)

نوسینی:
مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەرگی (نۆیەم)

جزمی (٢٥، ٢٦، ٢٧)

# تەفسیری ڕەوان

( بۆ تێگەیشتنی قورئان )

نوسینی :

**مەلا مەحموودی گەلاڵەیی**

بەرگی ﴿نۆیەم﴾

جزمی ﴿٢٥، ٢٦، ٢٧﴾

بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان
- نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ( ٢١٤٠ )ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.
- چاپ و دیزاین: ( سامان محمد أمین ).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## زانیاری قیامەت تایبەتە بەخودا خۆیەوە

﴿ ۞ إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِۚ وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ أَيۡنَ شُرَكَآءِي قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ مِن قَبۡلُۖ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴿٤٨﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتی پێشوودا هەڕەشەی لەکافرەکان کرد بەوەی کە ڕۆژی قیامەت هەموو کەس پاداش و سزای کردەوەکانی خۆی دێتەوە ڕێی: ئامـاژە بەئایـەتی ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا﴾ ئـەمجار ئـەوە ڕادەگەیەنێ کەزانیاری دەربارەی ئەو ڕۆژەو کاتی هاتنی و چۆنیەتییەکەی تایبەتـە بەخودا خۆیەوەو کەسی تر نایزانێ.

ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە لەو ڕۆژەدا ئەفسانەی شیرك و بێدینی کۆتایی دێ و هەموو بۆیان ئاشکرا دەبێ و یەقینیان بۆ پەیدا دەبێ کە پـەروەردگار خودایـەکی تاك و تەنهاو بێ هاوەڵ و بێ نەفیرە. هەموو بتپەرست و بێدینـەکان لێیـان مـەعلووم دەبێ کە ئەو بت و صەنەم و خودا درۆزنانەی لەدونیادا هیوایـان پـێ بـوون هیـچیان لەدەست نایە.

دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾ زانیاری دەربارەی قیامەت‌و کاتی هاتنی هەر بۆ خودایە کەسی تر ئەو زانیارییەی نییە. ئەمە وەڵامی پرسیارە وەك بڵێی پرسیارکەرێك پرسیار بکاو بڵێ: ئەری ئەو ڕۆژە کەی دەبێ کەهەموو کەس کردەوەی خۆی دێتەوە ڕێ؟

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ – الأعراف/١٨٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ – لقمان/٣٤﴾ هەر بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێك حەزرەتی جوبرائیل پرسیاری لێ کردو دەربارەی قیامەت‌و کاتی ڕابوونی، فەرمووی (مالمسؤول عنها بأعلم من سائل) بوخاری‌و موسلیم ریوایەتیان کردووە.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە دووپات دەکاتەوە کەزانیاری دەربارەی داهاتوو بەشێکە لەغەیب‌و تایبەتە بەخۆیەوە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَاتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ﴾ پەروەردگار زانستی ڕەهای هەیە، هەر میوەو بەروبومێك لەتوێکڵ‌و غونچەو قروێلکی خۆی بێتەدەر خودا پێی ئاگادارەو دەزانێ کەی دێتەدەر، ئاگادارە بەوەی مێینە چی لەمنداڵدانی خۆیدا هەڵگرتووە چۆنی هەڵگرتووەو کەی دەیدەنێ ماوەی حەملی چەندەو چۆنە. زانیاری دەربارەی قیامەت عائید بەخودایە، هەروەکوو چۆن هەموو زانیارییەکی غەیب‌و پەنامەکی لەخەزێنەی زانستی خودایە...

نموونەی بەشێکی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا – الأنعام/٥٩﴾ نموونەی بەشی دووەمی ئایەتەکە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ، عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ – الرعد/٨ – ٩﴾ یان دەفەرموێ ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ – فاطر/١١﴾.

ئەمجار پەروەردگار بەکۆتا هاتنی ئەفسانەی شیرك‌و بێدینی رادەگەیەنێ‌و بۆ رەتدانەوەی هەڵوێستی ئەو موشریکانەی کە پێغەمبەری ئیسلام بانگەوازی کردن بۆ یەکتاپەرستی‌و دەستبەردار بوونی بتپەرستی، دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَائِي؟ قَالُوا: آذَنَّاكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ﴾ ئەی پێغەمبەر بیر لەو رۆژە بکەرەوە ئەو ساتە وەختە بێنەرە بەرچاو کە پەروەردگار بانگی موشریك‌و بتپەرستەکان دەکا لەرۆژی قیامەتدا، بەشێوازی گاڵتەو لاقرتێ‌و سەرزەنشت کردن پرسیاریان ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: کوان‌و لەکوێن ئەوانەی ئێوە پێتان وابوو هاوبەش‌و هاوشانی منن‌و عیبادەتتان بۆ دەکردن، دە بانگیان لێ بکەن با بێن شەفاعەتتان بۆ بکەن، با سزاو عەزابتان لێ دووربخەنەوە، هەموو موشریك‌و بتپەرستەکان وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: ئێمە پێمان راگەیاندوی‌و بەئاشکرا هاوار دەکەین کە ئەمرۆ هیچ کەس لەئێمە ئامادە نییە ئەوە بدرکێنێ‌و دان بەوەدا بنێ کەزاتی پاکت شەریکی هەبێ، کێ هەیە ئەمرۆ ئەو حەقیقەتە نەزانێ کە تۆ بێ شەریکی وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ – الأنعام/٢٣﴾.

﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَدْعُونَ مِن قَبْلُ وَظَنُّوا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ رۆژی قیامەت ئەو موشریك‌و بتپەرستانە خوداکانی خۆیان لێ گوم دەبن‌و ئەو بت‌و صەنەمانەی لەدونیادا پەرستشیان بۆ دەکردن نموویان نامێنێ‌و هیچیان بۆ ناکرێ‌و ناتوانن کەمترین سودیان پێ بگەیەنن، ئەوکاتە بەبڕینی خۆیان دەزانن. بۆیان مەعلووم دەبێ کەهیچ پەناگاو مەلجەئێك نییە پەنای بۆ بەرن لەعەزابی خودا بیان پارێزێ.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم ئایەتە دەکاو دەفەرموێ ﴿وَرَأَى الْمُجْرِمُونَ النَّارَ فَظَنُّوا أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَصْرِفًا – الكهف/٥٣﴾.

## گۆڕانی وەزعو حاڵی ئادەمیزاد

﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴿٥١﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا باسی گۆڕانی هەڵوێستی موشریکەکانی کردو ئەوەی ڕاگەیاند؛ کە ئەوان لەژیانی دونیایاندا سوورن لەسەر ئەوەی خودا هاوەڵی هەیە کەچی لەقیامەتدا دژی ئەم هەڵوێستو بیروباوەڕەی خۆیان دەوەستنو دان بەتاکو تەنهایی خودادا دەنێن. ئەمجار لەم ئایەتانەدا ئەوە رادەگەیەنێ: کەهەموو کاتێ وەزعو حاڵی ئادەمیزاد لەگۆڕاندایە دەمێ کەیفخۆشەو دەمێ حەزین، ئەمڕۆ گەنجەو سبەینێ پیرە، دوێنێ چوستو چالاکو ئەمڕۆ ورە ڕوخاوە. ئەمڕۆ لەش ساغە سبەینێ نەخۆشە، ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو لەخۆی بایی دەبێ ئەگەر بەلاو ناخۆشی یەخەیان گرت دەست دەکا بەهاوار هاوارو دادو فیغان. ئەمەش نیشانەی تەماعو نەزانیو لاوازی ئیمانو باوەڕیەتی.

دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْأَمُ الْإِنسَانُ مِن دُعَاء الْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ الشَّرُّ فَيَؤُوسٌ قَنُوطٌ﴾ ئادەمیزاد وەڕز نابێ لەوەی داوا دەکا لەخودا خێرو خێراتی بەسەردا بڕێژێ‌و ماڵ‌و سامانی زۆرتری بێ‌و تەندروست‌و دەسەڵاتی زۆری بدرێتێ، خۆ ئەگەر ئەو مرۆڤە شەڕو نەگبەتی توش هات هەژاری‌و نەخۆشی یەخەی گرت ئیتر دونیای لێ تەنگ‌و تاریك دەبێ‌و ناهومێدی لەڕەحمەتی خوداو ڕەشبینی لەژیاندا روی تێ دەکاو پێی وایە ئیتر ئەم بەڵاو ناخۆشییانە لەسەر لاناچن‌و جارێکی تر تووشی خێرو خۆشی نابێتەوە.

ئایەتەکە سورشتی ئادەمیزاد بەگشتی وێنا دەکا، هەرچەندە ئەو دیاردەیە بەزۆری لەسروشتی کافردا رەنگ دەداتەوە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ – یوسف/٨٧﴾.

بێگومان هەندی لەراڤەکەرانی قورئان ئایەتەکەیان تایبەت کردووە بە ئادەمیزای کافرەوەو وتویانە ئەمە رەوشتی کافرە، ئاماژە بەم ئایەتەی سورەتی یوسف کە دەفەرموێ ﴿إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ.......﴾.

بەڵام ظاهیر وایە مەبەست جینسی ئادەمیزادە چونکە زۆرێك لەموسوڵمانانیش ئەم گۆڕانکاری‌و حاڵ‌و وەزعەیان بەسەردا دێ. وەکوو لەوە پێش ئاماژەمان پێ کرد.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الإِنْسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ، وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاء بَعْدَ ضَرَّاء مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ، إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ – هود/٩ – ١١﴾.

ئەمجار پەروەردگار سێ خەصڵەت‌و رەوشتی ناشیرینتر لە رەوشتەکانی پێشوو باس دەکاو دەفەرموێ:

١- ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاء مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي﴾ واتە: ئەگەر ئێمە پاش ناخۆشیو بەلاو موصیبەت خێرێکی پێ ببەخشین؛ پاش نەخۆشی، تەندروستی پێ بدەینەوە، بەلاو کارەساتی لێ دوور بخەینەوە پاش هەژاریو دەوڵەمەندی بکەینەوە، دوای زەلیلیو ژێردەستەیی ئازادیو شکۆمەندی بۆ دەستەبەر بکەین لەجیاتی ئەوەی شوکرو سوپاسی خودا بکا، دەڵێ ئەمە مافی خۆمە بەسەر خوداوە، ئەمە ئاکامی تێکۆشانو لێهاتویی خۆمە، فەچلو ئیحسانی خودا لەبیر خۆی دەباتەوەو نازانێ خودا بەخێرو شەڕو خۆشیو ناخۆشی بەتاقی دەکاتەوە، بۆ ئەوە سوپاسگوزارو سپڵەو پێنەزان دەربکەون، بزاندرێ کێ لەکاتی بەلاو ناخۆشیدا خۆراگرەو کێ وانیە. ئەمانە ئاشکرا ببن بۆ ئادەمیزادەکان خۆیان، ئەگینا خودا پێویستی بەو تاقی کردنەوە نییەو بۆخۆی کونو نهێنی هەموو شتێك دەزانێ.

ئایەتەکە ئاماژە بە ئەوە دەکا کە ئادەمیزادی نناهومێد بوو لەڕەحمەتی خودا ئەگەر دوای ناخۆشیو بەلا نازو نیعمەتی بەسەردا بڕێژێتەوە، سەرلەنوێ دەست دەکاتەوە بە کوفرانی نیعمەتو سپڵەیی.

٢- ﴿وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً﴾ دەڵێ بڕوام وانیە قیامەت رابێ، ئەو پەیامو هەواڵانەی پێغەمبەران رایانگەیاندوە پوچو بێ بناغەن نەزیندوبوونەوە هەیەو نەحیسابو لێکۆڵینەوە لەسەر تاوان، هەر لەبەر ئەوەی نازو نیعمەتێکی پێدراوە کوفرانی نیعمەت دەکاو لەخۆی بایی دەبێو شانازی دەکا. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ ﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى – العلق/٦ – ٧﴾.

ئاشکراشە شكو گومان دەربارەی زیندوبوونەوە لە کەسانێك سەرهەڵدەدا کە کافرو بێدین بن یان دوڕووبن بەڕواڵەت موسوڵمانو بەدڵ کافرو بێ باوەڕ.

٣- ﴿وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَى رَبِّي إِنَّ لِي عِندَهُ لَلْحُسْنَى﴾ خۆ ئەگەر لەفەرزێکدا پێغەمبەران راست بکەنو زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش

هەبن ئەوە خودا چۆن لەژیانی دونیادا نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتوم لەو دونیاش باشترین شوێن و پلەوپایەو نازو نیعمەتی بۆ ئامادە کردوم واتە پێی وایە چونکە لەدونیادا خێرو فەڕی دراوەتێ لەقیامەتیش مافی خۆیەتی کە نازو نیعمەتی بدرێتێ.

هەرچەندە کردەوەکانی خراپ بن و بێ بڕوا بێ ئەمەش بەزۆری دیدو بۆچوونی کافرو بێدینەکانە. بۆیە پەروەردگار بەپێچەوانەی ئاواتەکانی وەڵامی ئەو جۆرە کەسانەی دایەوەو هەڕەشەی توندی ئاڕاستە کردن و فەرمووی: ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِمَا عَمِلُوا وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ بێگومان ئێمە ڕۆژی قیامەت هەواڵی ڕاست و دروستیان دەربارەی بیروباوەڕو کردەوەکانیان پێ ڕادەگەیەنین، بەعەزابی بەئێش و زۆر سزایان دەدەینەوەو بەهیچ جۆرێ ڕزگاریان لێ نابێ، ئەویش عەزابی دۆزەخە.

پاشان پەروەردگار جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئادەمیزاد چۆن ڕارایی لەکردەوەکانیدا هەیە ئاوایش ڕارایی لە وتەکانیدا هەیە.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَنْعَمْنَا عَلَى الْإِنسَانِ أَعْرَضَ وَنَأَى بِجَانِبِهِ وَإِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ فَذُو دُعَاءٍ عَرِيضٍ﴾ واتە: هەرکاتێك ڕزق و ڕۆژیماندا بەئادەمیزادو باری ژیانی خۆش بوو نازو نیعمەتی زۆرمان پێدا، تەندروستی و ماڵ و منداڵمان پێ بەخشی، ڕوو لەشووکرو فەرمانبەرداری وەردەگێڕێ و لوتبەرزی دەنوێنێ و سەرپێچی فەرمانی خودا دەکا، ئەمجار ئەگەر حاڵ و وەزعی گۆڕاو تووشی شەڕو نەگبەتی بوو، هەژاری و نەخۆشی و بەڵاو کارەسات یەخەیان دەست دەکا بەدۆعاو پاڕانەوەو نوزە درێژی و هاوارو فیغان بۆلای خودا کە ئەو ناخۆشیانەی لەسەر لابەرێ!

ئەمەش نیشانەی ئەوەیە ئەو بابەیە کەسێکی بەرژەوەند پەرست و مەصڵەحەتچییە، چونکە ئەو ئادەمیزادە لەکاتی تەنگانەو ناخۆشیدا خودا دەناسێ و لەکاتی فەرەحی و هەرزانی و لەش ساغیدا هاوار دەکاتە خوداو لەکاتی

نیعمەتدا واز لەپاڕانەوەو خوداناسی دێنێ ئەمەش دەق دەشوبهێتە حاڵو وەزعی موشریكو كافرەكان.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ الإِنسَانَ الضُّرُّ دَعَانَا لِجَنبِهِ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَا إِلَى ضُرٍّ مَّسَّهُ كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ – یونس/١٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَاهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ بَلْ هِيَ فِتْنَةٌ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ – الزمر/٤٩﴾.

## پێویستە لە ئایەتو نیشانەكانی هەبوونی خودا وردبینەوە

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾ ﴾

لەوەپێش هەڕەشەی لەموشریكەكان كرد لەسەر كوفرو بێدینی، ئەمجار باسی پاشگەزبوونەوەیان دەكا لەشیرك لەڕۆژی قیامەتدا، هەروا ئەوەشی ڕاگەیاند: كە ئەحواڵی ئادەمیزاد لەگۆڕانو بەرزیو نزمیدایە، لەكاتی لەش ساغیو بەهێزیو توانایی خۆی لێ بایی دەبێ، لەكاتی نەخۆشیو تەنگانەدا لاوازو زەبوون، ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە ئادەمیزاد دەكا: كە لەئایاتی خودا وردببنەوە لەبوونەوەرداو

لەخودی خۆشیاندا. بۆ ئەوەی دڵنیابن کە قورئان حەقەو لەخوداوە نازڵ بووەو قیامەتیش هەر رادەبیءو گومان لەهاتنیدا نییە.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾ ئەی پێغەمبەر بەو موشریکانە بڵێ: کە قورئان بەدرۆ دەخەنەوەو پەیامەکەت رەت دەکەنەوە پێیان بڵێ: ئەوە حاڵتان چۆن دەبێ چ هەڵوێستێك دەنوێننءو چی دەکەن ئەگەر لەواقیعدا قورئان لەخوداوە هاتبیءو هەقءو ڕاست بێ، پاشان رەتی بکەنەوەو بەدرۆی بخەنەوەو قبوڵی نەکەنءو کاری پێ نەکەن، ئایا کەواقیع ئەوە بێ ئێوە نابنە دوژمنی حەقءو صەواب؟!

بەڵکوو کەس لەئێوە گومڕاتر نییە چونکە ئەوەندە قوڵبوونەوە لەدوژمنایەتی کردنی پەیامی قوورئانءو رۆچوونتان لەکوفرو عەنادیدا، زێدەرەویتان لەحەق نەویستیءو دوورکەوتنەوە لێی.

ئەمجار پەروەردگار بانگی ئادەمیزادەکان دەکا بۆ وردبوونەوە لە ئایاتءو نیشانەکانی خودا بەبوونەوەرداو لەخودی خۆشیاندا فەرمووی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ لەوە بەولاوە بەڵگەکانی ڕاستی قورئانءو نیشانەکانی ئەوە کە لەخوداوە نازڵ بووە دەردەخەینءو ئاشکرایان دەکەین.

بەڵگەی جۆراو جۆر لە ئاسۆکانی ئاسمانەکانءو زەویدا نیشانی ئادەمیزادی دەدەین: کە بریتین لە مەخلووقاتی وەکوو خۆرو مانگءو ئەستێرەکان، هەروا بەشوێن یەکدیدا هاتنی شەوو ڕۆژو دووبارە بوونەوەیان بەهەمیشەییءو بە یاساو ڕێسایەکی تۆکمەو سەرسوڕهێنەر، هەروەها روداوە ترسناکە جۆراوجۆرەکانی تریشقەو زریانءو لافاو بومەلەرزە...

گەورەییءو سەرکەشی کێوەکانءو پانوپۆڕ ی دەریاو دەریالوشەکان، دیمەنی سەرەنج راکێشی روەكءو دارەستانەکانءو گوڵءو گوڵزاری جۆراوجۆریان! هەروەها ئەو

روداوانەی کە لەسەر زەوی روو دەدەن لەسەر دەستی جەنگاوەرانی سوپای ئیسلامو رزگـارکردنی زۆر وڵاتو روخانـدنی ئیمپراتۆریەتـە گـەورەکانی فـارسو رۆمو بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام تێیاندا......

هەروەها لەوە بەولاوە راستی پەیامی قورئانو راستی ئەوە کە لەخوداوە نازڵ بووە، لەخودی ئادەمیزادەکاندا دەردەکەوێ، بەڕاستی وردبوونـەوە لـەخودی ئادەمیزادو پێکهاتەی جەستەی نیشانەکانی هەبوونی خودایەکی زاناو داناو خاوەن دەسەڵاتو کار دروستە.

وەکوو لە ئایەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَفِـي أَنفُـسِكُمْ أَفَلَـا تُبْـصِرُونَ – الـذاريات/٢١﴾ هەروەها لەسەرەنجامی ئـادەمیزادو گۆڕانکـاری شـێوەو شـێوازیان لەماوەی تەمەنیاندا، هەروا گۆڕانی حاڵو وەزعـی دانیشتوانی مەککە لـەگومڕاییو سەرڕەقیو دکتاتۆرییەوە بۆ حاڵەتی زەلیلیو ملکەچی.

هەموو ئـەم روداو گۆڕانکارییانـە بـۆ ئەوەیـە ئـادەمیزاد بەگشتی بـزانن قورئـان حەقـەو ئـەو کەسـەی نـازڵی کـردووە خودایـەکی حەقـەو ئـەو کەسـەی بـۆ سەریشی نازڵ بووە پێغەمبەرو هیچ شكو گومانی تێدا نییە.

جا ئەگـەر ئەوانـە سـەیری ئـەو دیاردانـەی نـاو بوونـەوەریان نـەکردو لـە نەفسی خۆیـانو لـەو دیاردانـە وردنەبوونـەوەو نەیانکردنـە بەڵگـە لەسـەر ڕاستی پەیامی قورئان، ئەوە شایەتیدانی خودا خۆی لەسـەر ڕاستیو حـەقئامێزی قورئـان کیفایەتەو حەوێجە بەهیچی تر ناکا. وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَوَلَـمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾؟ کیفایەتە خودا بۆخۆی شایەتە لەسەر کردارو گوفتـاری ئـادەمیزاد هـەموویان بـەخاوەن بـاوەڕو بـێ باوەڕیانـەوە هـەروا کیفایەتـە خودا خۆی شایەتی دەدا لەسەر ئەوەی کە قورئان لە لایەن خۆیەوە نازڵ بووە.

ئـەمجار پـەروەردگار هۆکـاری سـەرڕەقیو عینـادی کافرەکـانی قـوڕەیشو سوربوونیان لەسەر کوفرو بێدینی روون دەکاتەوەو دەفـەرموێ: ﴿أَلَا إِنَّهُمْ فِـي مِرْيَـةٍ

مِّن لِّقَاء رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ﴾ ئاگاداربەو بزانە ئەی موخاطەب ئەو ملهوڕانەی قوڕەیش و هاو وێنەکانیان لەشك و گوماندان دەربارەی زیندوبوونەوە حیساب و لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش.

ئەی ئادەمیزاد ئاگاداربەو بزانە خودای گەورەو باڵادەست ئاگاداری هەموو شتێکەو هیچی لێ گوم نابێ و دەسەڵات و توانای بەسەر هەموو شتێکی مومکیندا هەیە، ئەو زاتە بەزانست و دەسەڵاتی رەهای خۆی هەموو شتێکی کۆنترۆڵ کردووە، مەخلووقات هەموویان لەژێر دەسەڵاتی بێ سنووری دان و کامێرای زانیاری زاتی پاکی هەموو شتێکی ئیحاطە داوە، بەگوێرەی عیلم و دەسەڵات و حیکمەتی خۆی ئەم بوونەوەرە هەڵدەسوڕێنێ و رۆژی قیامەتیش سزاو پاداشی هەموو کەس بەگوێرەی کردەوەکانیان دەداتەوە، چیە بۆ ئەوان کەوا کەوتوونە شك و گومانەوە دەربارەی رابوونی قیامەت و زیندوبوونەوەیان. لەکاتێکدا خۆیان دەزانن دان بەوەدا دەنێن کە یەکەمجار خودا دروستی کردوون؟!

بەکورتی هۆکاری کوفرو بتپەرستی و بێدینی ئەوان بڕوا نەبوونە بەرۆژی قیامەت تێنەفکرین و وردنەبوونەوەیانە لەنیشانەکانی کەون و خودی نەفسی خۆیان، وەلێ رۆژگار راستییەکان دەردەخاو کافرەکانیش هەڵەن و لەوە بەولاوە سەرەنجامی خۆیان دەبیننەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# سورەتی شورا

ئـەم سـورەتە پـیرۆزە نـاوی سـورەتی شـورایە چـونکە وەصـفی موسـوڵمانانی تێدایە بەوە کە کاروباریان بە ڕاوێژە، لەئایەتی ژمارە (٣٨)دا دەربارەی موسـوڵمانان دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾.

شوری واتە: ڕاوێژ کردن لە بـەڕێوەبردنی وڵاتـدا بنەمایـەکی سـەرەکی یاسـای ئیسلامە، قاعیدەیـەکی گرنگـە لـەبواری رامیـاری‌و کۆمەڵایـەتی ئاینیـەوە، ڕۆڵێکـی گرنگی هەیە بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵ‌و وڵات‌و ئاکامی سەرکەوتوانە بۆ ژیان.

**پەیوەندی نێوان سورەتی (شوری)و سورەتی پێشەوە لەچەند ڕوویەکەوە:**

١- لە هەردووکیانـدا وەصفی قورئان هەیەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتـەوە کـە قورئـان بـەنیگا بۆسـەر پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) نـازڵ بـووە، لەهـەر دووکیاندا ئەوە دەچەسپێنێ کە قیامەت ڕا دەبێ.

٢- لەهەردوو سورەتەکاندا موناقەشەی بیروباوەڕی کافرەکان دەکا، هەڕەشەیان ئاراسـتە دەکـا، هـەبوونی خـودا دەسـەلمێنێ‌و تـاک‌و تـەنهایی‌و بـەتوانایی‌و خـاوەن دەسەڵاتی بە بەڵگەی جۆراوجۆر دەچەسپێنێ.

٣- لە هەردوو سورەتەکاندا موسوڵمانان هەڵدەنێ بەوە کە بەردەوام بن لەسەر تاعەتکردن‌و گرتنەبەری ڕێبازی بەختەوەری‌و سەرفرازی.

٤- دڵدانـەوەی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) کـە بەهەڵوێـستی ناشیرینی قوڕەیشییەکان دڵتەنگ نەبێ.

سورەتەکە بەشێوەیەکی گشتی ئەو مەوضوعانەی لەخۆ گرتـووە کەبەڕواڵـەت سـورەتە مەککیـەکان لـەخۆیان گرتـووە، پـێ لەسـەر بنـەماکانی بیروبـاوەڕی ڕاسـت‌و حـەق دادەگـرێ، جـەخت لەسـەر تـاک‌و تـەنهایی خـوداو ڕاسـتی پێغەمبەرایـەتی

حەزرەتی موحەممەدو بەراست زانینی رابوونی قیامەت دەکاتەوە، جەمسەری سەرەکی سورەتەکە لەبارەی دیاردەی نیگاو سروشتەوەیە.

بۆیە سەرەتا باسی ئەو نیگاو سروشتە دەکا کە بۆ حەزرەتی موحەممەدو باقی پێغەمبەرانی پێشووی نێردراون.

ئەمجار باسی شکۆمەندی‌و هەیبەت‌و جەلالی خودا دەکا، ئەوە رادەگەیەنێ: کە نزیکە ئاسمانەکان شەق‌و شەقار ببن لەترسی جەلال‌و شکۆمەندی خودا، فریشتەکان هەمیشە سەرگەرمی تەسبیحات‌و تەقدیسن‌و خودا بۆخۆی چاودێرە بەسەر کردەوەی موشریکەکاندا، ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە، کە ئایینی خودا یەك ئایینەو هەموو ئایینەکان بنەماکانیان یەکەو بەگوێرەی رۆژگارو بارودۆخی ئادەمیزاد جوداوازی لە جوزئیاتدا دێتە کایەوە بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی ئادەمیزاد، هەرەشەی توندیش ئاراستەی ئەوانە دەکا کە گۆڕانکاری لە ئایینداد دەکەن، دووبەرەکی‌و دژایەتی لەئاییندا بەرپا دەکەن. هەموو پێغەمبەران بۆیەك ئایین بانگەوازییان کردووە، پەیامەکانیان پشتگیری یەکتریان کردووە.

لەبەشێکی تری سورەتەکەدا هەندێ ئایات‌و نیشانەی دەسەلات‌و توانایی خودا لەبەخشینی رزق‌و رۆژی‌و گرتنەوەی، لەبارانـدنی باران‌و بەدیهێنانی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیاندایە رادەنوێنێ، لەم بەلگەو نیشانانەوە رەوشتی موسوڵمانان دەخاتە ڕوو، لەکۆمەڵ‌و گرۆی تر جیایان دەکاتەوە، سەرەتای سورەتەکە بە باسی نیگاو سروش دەس پێ دەکا.

## نازڵ کردنی نیگا بۆ سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ شکۆمەندی پەروەردگارو ئاگاداری بەسەر کردەوەی کافرەکان

﴿حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴿٦﴾﴾

﴿حم، عسق﴾ لەوەپێش چەند جارێك ئاماژەمان بۆ ئەوە كرد كەمەبەست بەم پیتە پچڕپچڕانە ئەوەیە: كەسەر ئاسایی قورئان بچەسپێنێ، ئەوە دەدركێنێ كە قورئان لەم پیتانە پێكهاتووە ئیتر كێ ئازایەو لەخۆی ڕادەبینێ با لەو جۆرە پیتانە كەلامێكی وەكوو قورئان بخاتە ڕوو!

﴿كَذَلِكَ يُوحِي إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ وەكوو ئەو نیگاو سروشەی بۆتۆ نێردراوە ئەی محمد! نیگامان بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ كردووە، لەم سورەتەدا ئەی پێغەمبەر نیگامان بۆ كردووی، كە بانگەوازی ئادەمیزاد بكەی بۆ یەكتاپەرستیو ڕاستی پێغەمبەرایەتیو بڕواكردن بە زیندوبوونەوەو ڕابوونی

قیامەتو حەشرو حیسابو لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش بەگوێرەی کردەوە، هەروەها خۆ ئارایشدان بەرەو شتی بەرزو خۆپاراستن لە رەوشتی نزمو پەستو پەیڕەوکردنی رەوشتی جوانو بەرزو بەختەوەرکردنی کۆمەڵگاو خێزانو تاك، هەرچی لەنامە ئاسمانییەکاندا هاتووە بریتییە لەوە: کە پێویستە بڕوا بەتاكو تەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرایەتیو رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە هەبێ. ئەو کەسەی نیگات بۆ دەکا (الله)یەو باڵادەستە بەسەر بوونەوەردا، حەکیمو دانایە لە ئەنجامدانی کارەکانیدا، هەرچی دەیکا لەجێی خۆیدایەو شیاوو لەبارە.

﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ بۆ خودایە هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هەموو شتێك بەندەو مڵکی خودایە، ئەو خاوەنیانەو بەدیهێناون، بەڕێوەیان دەبا، بەویستی خۆی خەڵقیان دەکاو دەیانفەوتێنێ، خۆی باڵادەستو شکۆمەندە بەسەر بەدیهێنراوەکانیدا کیبریاو گەورەیی هەر لەخۆی دێ، لەکەس ناچێو کەس لەو ناچێ، لەهەموو کەس بێ ئاتاجەو هەموو کەس موحتاجی ئەوە.

﴿ تَكَـادُ الـسَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّـرْنَ مِـن فَـوْقِهِنَّ﴾ نزیکە ئاسمانەکان لە هەیبەتو شکۆمەندی خودا کە بەسەریان غاڵبو باڵادەستە شەقار شەقار ببن، یان نزیکە ئاسمانەکان شەق ببەن لەبەر ئەوەی ئەوەندە فریشتەیان لەسەرە، فەرموودەیەك هەیە ئەحمەدو تیرمیذی ریوایەتیان کردووە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «أَطَّتِ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ مَا فِيهَا مَوْضِعٍ إِلاَّ وفِيهِ مُلَكٌ راكِعٌ أو ساجِدٌ»

یان دەڵێن: مەبەست ئەوەیە: کە لەوانەیە لەداخی قسەی موشریکەکان شەق ببەن، کە دەڵێن: خودا منداڵی هەیە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا، لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا، تَكَـادُ الـسَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّـرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا، أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا﴾(مريم/٨٨-٩١).

بوونـەوەر هـەمووی سـەرگەرمی بەندایـەتی کردنـی خودایـە، ﴿وَالْمَلَائِكَـةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِـمْ﴾ فریـشتەکان بـەردەوامن لەسـەر تەسـبیحو تەقدیـسی خـودا، شوکرو سوپاس دەخەنە پاڵ تەنزیهو تەقدیس وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ – الأنبياء/٢٠﴾ وێـڕای تەسبیحاتو تەقدیس، ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي الْأَرْضِ أَلَا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ داوای لێخۆشبوون دەکەن لەخودا بۆ بەندە موسوڵمانانەکان، جا کە فریشتە دوعای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەن، بەمەرجی ئەوەیە خۆتان خاوەن باوەڕبنو بۆ خۆشتان تۆبە لە تاوان بکەنو ئیمان بهێنن، دڵنیابن خودا لێخۆشبوونی زۆرەو فرە بەڕەحمەو ڕەحمەتی بەشی هەموو شتێك دەکا. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ – غافر/٧﴾ ئەمجار هەڕەشە بەرامبەر بتپەرستەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء اللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ ئەوانەی بتپەرستنو چەند بتو صەنەمێکیان کردووە بەخوداو بەندایەتییان بۆ دەکەن، خودا ئاگادارو چاودێرە بەسەریانەوە. کارو کردەوەیان دەنووسێو سزاو پاداشتیان دەداتەوە، ئەی پێغەمبەر ئەتۆ بەرپرس نیت لە هێدایەتدانیان، تۆ ناتوانی بەزۆرە ملێو تۆپزی ئەوانە بخەیە سەر ئایین، تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرە، حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا سزاو پاداشتیان تایبەتە بە خوداوە.

## مەبەستەکانی نیگاو سروشتی پەروەردگار بۆ پێغەمبەر ﷺ

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی رونکردەوە، کە خودا رەقیبو چاودێرە بەسەر حاڵو وەزعی موشریکەکانو کردارو هەڵوێستیانداو سزایان لێ دەستێنێ، ئەمجار لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەر بەیانکردنی حەقیقەتی نیگاو هۆکاری ئەوە، کە بە زوبانی عەرەبی نێردراوە، ئەمجار ئادەمیزاد بەدوو تاقمو پێڕ پۆلین دەکاو بۆ هەر تاقمەیان شوێنی شیاو دیاری دەکا، ئەوە رون دەکاتەوە کە ئیمانهێنانیانو موسوڵمانانبون بە زۆرە ملێ نابێ، بەڵکوو دەبێ بە ویستو ئیختیار بێ، ئەمجار بەڵگە لەسەر دەسەڵاتو توانای خودا دەهێنێتەوە بە خەڵق کردنی ئاسمانەکانو زەویو بەڕێوەبردنیانو بەدیهێنانی نێرو مێ لە ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ هەر وەکوو چۆن لەوەپێش نیگامان بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ بە زمانی نەتەوەکانیان بۆ ناردوە، نیگامان بۆ تۆ بە زمانی عەرەبی ناردووە بۆ ئەوەی سەرەتا دانیشتوانی مەککەو دەوروبەریو ئەمجار هەموو ئادەمیزاد بە گشتی لە عەزابی خودا بترسێنێ، چونکە پەیامی تۆ گشتییەو بۆ هەموو گێتییە وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا – سبأ /٢٨﴾.

بۆیە بە تایبەتی ناوی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری هێنا چونکە سەرەتا نیگاو سروشی قورئان ئاڕاستەی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری کراوە بۆ ئەوەی ئیمانی پێ بهێنن‌و ببنە هەڵگری ئەو پەیامەو بەناو جیهاندا بڵاوی بکەنەوە.

بەڵگە لەسەر ئەوە کە پەیامی پێغەمبەرانی پێشوو بە زوبانی نەتەوەکانیان بووە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ – إبراهيم/٤﴾. ئێمە قورئانمان بە زوبانی عەرەبی بۆ ناردوی بۆ ئەوەی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری بترسێنی ﴿وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بترسێنی لە رۆژی قیامەتو روداوەکانی، ئەو رۆژەی گیانەکان لەگەڵ جەستەکان یەك دەگرنەوەو گومان لە رابوونی ئەو رۆژەدا

نیەو هەموو ئادەمیزاد لەسارای مەحشەردا کۆ دەکرێنەوەو حیساب و لێکۆلینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، دوای حیساب و لێکۆلینەوە دەکرێنە دوو بەش بەشێکیان بەهۆی ئیمان هێنانیان و کردەوەی چاکیان دەخرێنە ناو بەهەشتی رازاوەوە، بەشێکی تریان بەهۆی کوفرو خراپەکارییانەوە راپێچی ناو دۆزەخ دەکرێن.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ – التغابن/٩﴾.

لەو رۆژەدا ئادەمیزاد پەشیمانن، کافرەکان پەشیمانن چونکە ئیمانیان نەهێناوە، موسوڵمانان پەشیمانن چونکە کەمتەرخەمییان کردووە لە چاکەکاریدا.

ئەمجار پەروەردگار مەبدەئی ئازادی بیروباوەڕ رادەگەیەنێ و دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاء اللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن يُدْخِلُ مَن يَشَاء فِي رَحْمَتِهِ وَالظَّالِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە هەموو ئادەمیزادی دەکردنە یەک نەتەوەو پەیڕەوی ئایینێکیان دەکرد، ئایینی حەق یان ئایینی گومڕاو سەرلێ شێوان، وەلێ ویستی خودا لە بنەڕەتدا وابووە کە دابەش ببن بەسەر چەند ئایین و بیروباوەڕێکدا، خودا بۆخۆی بە ویستی ئەزەلی خۆی زانیویەتی ئادەمیزاد بە هەوەسی خۆیان ئیختیاری هیدایەت یا کوفر دەکەن، خودا بۆخۆی حەکیم و دانایە کردەوەکانی هەموو پڕ حیکمەتن، شتێك ناکا بێ حیکمەت بێ. کەسێك شیاوی هیدایەت بێ، خودا هیدایەتی دەدا بۆ رێبازی حەق و راست. لە ئاکامیشدا دەیانخاتە ناو بەهەشتی رازاوەوە. کەسێکیش بەویستی خۆی رێبازی گومڕایی هەڵبژێرێ شیاوی گومڕابوون بێ، خودا گومڕای دەکاو سەرەنجامیش دەیخاتە ناو دۆزەخەوە، ئەوانە کە رێبازی گومڕایی هەڵدەبژێرن ستەمکارو موشریکن رۆژی قیامەت شەفاعەتکاریان نیەو کەس ناتوانێ سزایان لێ دوور بخاتەوە.

ئایەتەکە تەئکیدو تەقریری ئایەتی پێشوو دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء اللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ – الشوری/٦﴾.

دڵدانـەوەو تەسـەللا هێنـانی پێغەمبـەرە (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) کـە بەهەڵوێـستی قورەیـشییەکان دڵتـەنگ نـەبێ، کورتـەی قسە ئەوەیـە بـە پێغەمبـەر دەفەرموێ: خەفەت بە هەڵوێستی ناڵەبارو ئیمان نەهێنانی قورەیـشییەکان مـەخۆ، هیدایەتو گومڕا کردن بەدەست خودایـەو بەویـستی ئـەو دێتەکایـەوە، کەسێك لـە زانیاری ئـەزەلی خودادا بەختـەوەر بـێ ئیمـان دەهێنـێ، کەسێکیش بەدبـەختی بـۆ نوسرابێ، پشت لە بانگەوازییەکەت هەڵدەکاو بە گومڕایی خۆی دەمێنێتەوە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَى آثَـارِهِمْ إِن لَّـمْ يُؤْمِنُـوا بِهَـذَا الْحَـدِيثِ أَسَـفًا – الكهـف/٦﴾. بۆیـە پـەروەردگار فـەرمان بـە پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەکا کە گرنگی نەدا بە هەڵوێـستو کردەوەیـان، دەفـەرموێ: ﴿أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء فَاللَّهُ هُوَ الْوَلِيُّ وَهُوَ يُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: بـەڵکوو ئـەو کـافر بێدینانـە چـەند خـودا درۆزنەیـەکیان بۆخۆیـان بڕیـار داوە لـە جیاتی خودای زاناو داناو بەدیهێنـەر دەیانپەرسـتن، پێیـان وایـە فریایـان دەکـەونو شەفاعەتیان بۆ دەکـەن، ئەوانـە بەهەڵـە چـوون، ئەگـەر خـودای حـەق دەپەرسـتنو دەیانەوێ بەندایـەتی بـۆ خـودای حـەق بکـەن ئـەوە (الله) وەلییـەو خـودای حـەقو فەردو صەمەدە، هەر ئەو شیاوی بەندایەتی بۆ کردنەو هەر ئەو فریای بەنـدەکانی دەکەوێ، هەر ئـەو بەدیهێنـەرو رزقو رۆژیـدەرە، هـەر ئـەو دەتوانـێ مـردو زینـدوو بکاتەوە، ئەو بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستو بـە دەسـەڵاتە. جگـە لـە خـودا هـیچ شتێکی تر، خۆرو مانگو ئەستێرە بێ، یان فریشتەو جندۆکەو شتی تر بـێ، خـودا نـینو بەکـەڵکی خودایـەتی نایـەن هـیچ دەسـەڵاتێکی حـەقیقییان نیـە، وەکـوو لـە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِـن دُونِ اللَّـهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ – الحج/٧٣﴾ ئایینی ئیسلام ئـاینێکی مامناوەنـدیو میانـەڕەوە، کێشەو موناعەزعە لەگەڵ کافرەکاندا مەکەن ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّـهِ﴾

لەهەر شتێکی ئایینی یان دونیاییدا کەوتنە کێشەوە، ئەوە بڕیارو سەرەنجامی لای خودایە، هەواڵی صەحیحو ڕاست لە قورئانو حەدیثی پێغەمبەردا هەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو دوو سەرچاوەدا بەراوردیان بکەنو بەو تەرازووە بیانکێشن، دەمە دەمێ لەگەڵ کافرو مولحیدەکان مەکەن، بە ئوسلوبی جوانو شیرینو لەسەرەخۆو بانگەوازییان بکەن بۆ ئیمان هێنانیان بە زۆرە ملێو تۆپزی ئایینیان بەسەردا مەسەپێنن. ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ ئەو خودایەی ئەم نیگاو سروشەی بۆ من ناردووەو ئەو فەرمانو حوکمو بڕیارەی پێ داوم (الله)یەو خودای منە لەهەموو ئیشێکمدا پشت بەو دەبەستمو هەموو کارێکم بەو دەسپێرم، تۆبەو گەڕانەوەم بۆلای ئەوەو هەر ئەو بەخودا دەزانم، چونکە خودای من تاکو تەنهاو بێ شەریکەو هەموو صیفاتێکی خودایەتی تێدایە.

١- ﴿فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، لە نەبوونەوە هێناویەتیە وجود.

٢- ﴿جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَمِنَ الْأَنْعَامِ أَزْوَاجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ﴾ بۆ ئێوەی دروست کردووە لە ڕەگەزی خۆتان ئافرەت بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە دڵ ئارام بن. نژادو ڕەچەڵەکتان درێژە بکێشێو دوابڕاو نەبن، چین لەدوای چین بێنە گۆڕەپانی ژیانەوە، هەروەها لە ئاژەڵو گیانلەبەرانی تریش نێرو مێی دروستکردووە ئێوەشو گیانلەبەرانی تریش بەهۆی زاوزێی نێوان نێرو مێینەتانەوە زۆرتان دەکاو بەناو زەویدا بڵاوتان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هەریەکەتان بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵسێو کاری خۆی ئەنجام بدا.

٣- ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ هیچ شتێ وەكوو خودا ناچێ‌و خودا لەهیچ شتێك ناكا، تاك‌و تەنهایە لەزات‌و لەصیفاتدا، دەسەڵات‌و حیكمەت‌و زانیاری لەهەموو بونەوەر جوداوازە، یەكێك لە نیشانەكانی دانایی خودا ئەوەیە، كە لە رێگەی پەیوەندی نێوان نێرو مێوە گیانلەبەران زیاد دەكاو ژیانیان بەردەوام دەكا.

٤- ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ هەموو شتێك دەبینێ، هەموو دەنگێك دەبیستێ، نهێنی‌و ئاشكرا، گەورەو بچوك‌و كەم زۆر لای ئەو چون یەكەو هیچ شتێك نیە لە ئەو نادیار بێ!

٥- ﴿لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء وَيَقْدِرُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ كلیلی گەنجینەی ئاسمانەكان‌و زەوی لای خۆیەتی، بەویستی خۆی رزق‌و رۆزی دەبەخشێ بۆ هەندێك زۆرو بۆ هەندێ كەم‌و بۆ هەندێ مامناوەندو بڕێ هەژار دەكاو بڕێ دەوڵەمەند دەكا. هەموو كارەكانی پڕ حیكمەت‌و لەجێی خۆیدان.

## بنەمای هەموو ئایینە ئاسمانیەكان یەك بنەمان

﴿۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِۚ ٱللَّهُ يَجْتَبِيٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيَۢا بَيْنَهُمْۚ

﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١٤﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند کە نیگاو سروش لەخوداوەیەو هەر ئەو خاوەنی نازو نیعمەتی جۆراو جۆرە بەسەر بەندەکانیدا، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ، کە یەکێك لە نیعمەتە گەورەکانی ناردنی پێغەمبەرانە بۆ سەر گەل‌و نەتەوەکان، نیگاو سروشی بۆ ناردوون، هەموو پێغەمبەران بانگەوازییان کردووە بۆ یەکتاپەرستی‌و بەندایەتی کردن بۆ خوداو ئیمان هێنانیان بۆ پێغەمبەران‌و بە نامە ئاسمانیەکان‌و بە هاتنی رۆژی قیامەت‌و حیساب‌و لێکۆلینەوەو سزاو پاداش بە گوێرەی کردەوە. ئەوە دوبارە دەکاتەوە، کە موشریکەکان بە بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی قەلس دەبن، ئەوان دوای راست کردنەوەی بەلگەو حوجەت لەسەریان، بەهۆی بوغرا بوون‌و سەر رەقییەوە پشتیان لە پەیامی حەق هەلکردووە. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە، کە خودا لە ئەزەلدا بریاری داوە ئەوان بە عەزابی کۆ کوژ لەناو نەبا، بەپەلە عەزابی بۆ دەناردن‌و ئاسەواری دەبرینەوە. دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ ئەی ئادەمیزادینە ئەی ئومەتی موحەممەد! ئاینێکمان بۆ ناردون هەلبژاردەو پەسەند، ئاینێکە لەوەپێش نووح‌و مووساو عیسا بانگەوازیان بۆ کردووە، هەموو پێغەمبەران ئەم رێبازەیان گرتۆتەبەرو جیهادیان بۆ کردووە، هەموو پێغەمبەرەکان بانگەوازییان بۆ یەکتاپەرستی‌و راستی پێغەمبەرایەتی‌و رابوونی قیامەت‌و زیندوبوونەوە کردووە، هەر لە حەزرەتی نووحەوە کە دوای ئادەم یەکەم پێغەمبەرە تا دەگاتە سەر

خەتمەی پێغەمبەران هەموویان لە بنەماکانی ئایینیدا یەك بوونو یەك پەیامیان بە نەتەوەکانیان راگەیاندووە، ئەوەی کە بۆ ئێوە نێردراوە ئەی ئوممەتی موحەممەد هەمان پەیامە، کە بۆ نووحو ئیبراهیمو مووساو عیسامان ناردووە، هەموویان بنەمای پەیامەکەی یەکتاپەرستیو ئیمان بە پێغەمبەرایەتیو ئیمان بە رابوونی قیامەت بووە، هیچیان جوداوازییان لەم پەیامانەدا نەبووە.

بەکورتی ئێمە لەم شەریعەتەی بۆمان ناردوون شتێکمان بۆ ناردون هەموو ئایینە ئاسمانییەکانی پێشوو تێیدا یەکانگیرن، هەموویان دەربارەی ئیمان بە خوداو پێغەمبەرانو بەهاتنی قیامەتو هەبوونی فریشتەو ئەنجامدانی ئەرکە سەرەکییە ئایینیەکانی وەکوو نوێژو رۆژو زەکاتو بەندایەتی کردن بۆ خودا یەکدی گیربوون، جوداوازیان تێدا نیە.

موجاهید دەڵێ: خودا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ نوێژکردنو زەکات دانی لەسەر فەرز کردووە، هەروەها هەموو ئایینە ئاسمانیەکان یەکدی گیربوون لەسەر بانگەوازی کردن بۆ پابەندبوون بە رەوشتی جوانی وەکوو راستگۆییو وەفاداریو پابەندبوون بەوادەو بەڵێنو پارێزگاری ئەمانەتو بەجێهێنانی صیلەی رەحم، خۆپاراستن لەتاوانی وەکوو زیناو دزیو دەستدرێژی کردن بۆ سەر ماڵو خوێنو ناموسی کەسانی دیکە. هەموو ئایینەکان بانگەوازییان کردووە بۆ یەکیەتیو تەباییو جڵەوگیری لێ کردوون لە دژایەتی کردنی یەکتریو تەفرەقەکاریو ئاژاوە نانەوە.

خاڵی سەرەکی بنەما ئایینیەکانی هەموو پێغەمبەرێك بریتی بووە لە خودا ناسینو یەکتاپەرستی، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ - الأنبياء/٢٥﴾ لە فەرموودەیەکی صەحیحو چەسپاودا کە ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو ئەبو داود لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لأَنْبِيَاءُ أَوْلاَدُ عَلاَّتٍ وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ». واتە: خاڵە

هاوبەشەکانی ئایینی هەموو پێغەمبەرەکان خودا ناسیو یەکتاپەرستی بووە، بڕوا بەنیگاو سروشو رابوونی قیامەت بووە.

جگە لەوە جوداوازی ئاینەکان لە فروعیاتداو ئەنجامدانی جۆری عیبادەتو چەندییەتو چۆنیەتی ئەنجامدانەکان شتێکی ئاساییەو بارودۆخو گۆڕانی رۆژگارو سەردەم داخوازی بوونو بۆ دەستەبەر بوونی بەرژەوەندیەکانی ئادەمیزاد، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا – المائدة/٤٨﴾ ئایەتەکە ناوی هەر پێنج پێغەمبەر ئولولعەزمەکانی لەخۆ گرتووە (نووحو ئیبراهیمو مووساو عیساو موحەممەد) بۆیەش ناوی ئەو پێنج ئەو پێغەمبەرەی بەتایبەتی هێناوە، چونکە رێزدارترین پێغەمبەرنو خاوەن شەریعەتو یاسان شوێنکەوتوانیان زۆرن ﴿كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ پەروەردگار بۆ هیدایەتو ئایینی خۆی کەسانێك هەڵدەبژێرێ کە بیەوێ بەختەوەریان بکا تەوفیقی هەندێ کەس دەدا بۆ ئایینو بەندایەتی کردن. کە بە ویستی خۆیان بۆلای خودا بگەرێنەوەو قبوڵی تاعەتکردنو خوداپەرستی بکەن، کەوابێ گەورەترین نیعمەتی خودا بەسەر موسوڵمانانەدا ئەوەیە: کە هیدایەتی داون بۆ ئایینێكو فەرمانی پێ کردوون بە پەیڕەوکردنی بەرنامەیەك هەموو پێغەمبەران بانگەوازییان بۆ کردووە!

هۆکاری تەفرەقەو بیروباوەڕی جوداوازیان لەبارەی ئایینەوە ئەوەیە: کە پەروەردگار لەم ئایەتەدا رونی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ﴾ جوداوازی لە بیروباوەڕدا نەکەوتە ناو شوێنکەوتوانی ئایینەکانەوە مەگەر دوای ئەوەی زانیاریان بۆ هاتو بەڵگەیان لەسەر راست کرایەوە زانیان کە پەرتەوازەیی گومراییەو بەدبەختی، ئەوەی هەڵینان بۆ گومراییو رەچاوکردنی کاری ناپەسەند سەر رەقیو لوتبەزیو بوغراییو بەرژەوەند پەرستیو پارێزگاری پلەو پایەی دونیاییە. دەترسن بە موسوڵمان بوونیان

دەسەڵاتە ڕەواڵەتیەکانیان لە کیس بچن. ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە کە خودا لەئەزەلدا بڕیاری داوە کە نەتەوەی پێغەمبەر بەعەزابی کۆ کوژ لەناو نەباو سزاو عەزابدانیان لێ هەڵگیراوە بۆ ڕۆژی قیامەت، ئەوە هەر زوو عەزابی سەختی بۆ دەناردن‌و دوا بڕاوی دەکردن. ئەوەش بەهۆی تاوانی گەورەو سنورشکێنی‌و یاخی بونیان لەخودا.

﴿وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا الْكِتَابَ مِن بَعْدِهِمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ بێگومان ئەوانەی ئەهلی کیتابن‌و تەورات‌و ئینجیلیان لەپێش خۆیانەوە بۆ ماوەتەوە، لەشك‌و گوماندا دەژین، چونکە شوێن حەق‌و ڕاستی نەکەوتوون ئایینی ئاسمانی خۆیان گۆڕیوە، شوێن بیروباوەڕی ماڵ‌و فەشە فێڵبازەکانی خۆیان کەوتوون، ئەوانە بەئارەزوی خۆیان تەفسیری دەقە ئاسمانییەکان دەکەن، کوێرانە لاسایی باوك‌و باپیرو پیاوە ئایینیە فێڵبازەکانیان دەکەنەوە، سەریان لێ شێواوەو سەراسیمەو سەرگەردانن. هەر لەبەر ئەوەش ئیمان بەپەیامی قورئان ناهێنن موحەممەد بەدرۆ دەخەنەوە.

بەکورتی گەل‌و نەتەوەکان حەق‌و حەقیقەتیان پێگەیشت‌و بەسەریدا ئاگادار بوون، تەفرەقەیان تێکەوت، دووبەرەکی‌و پەرتەوازەییان هەڵبژارد لەشوێنی یەکیەتی‌و تەبایی، بۆ ئەوەی ستەم لە خۆیان‌و خەڵکی تریش بکەن، دونیا خۆری ئەنجام بدەن، بۆیە پێویستە موسوڵمانان یەکپارچە بن‌و هەوڵ بدەن یەکیەتی‌و تەبایی خۆیان بپارێزن‌و واز لەدەمارگیری‌و ڕەگەزپەرستی‌و ناوچەپەرستی بێنن.

**بانگەوازی بۆ ئایینی خوداو بەردەوام بوون لەسەر بەجێهێنانی ئەرکە ئایینیەکانو پوچاندنەوەی بەڵگەی کافرەکانو بۆڕدانیان ئەرکی سەرشانی هەموو ئەردێکی موسوڵمانەو هەرکەسە بەگوێرەی خۆی**

﴿ فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ ۖ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ۖ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ۖ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ۖ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ٱسْتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ۗ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴿١٧﴾ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِى ٱلسَّاعَةِ لَفِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ

﴿ اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴿١٩﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی راگەیاند: کە هەموو ئایینە ئاسمانییەکان لە بنەمادا یەکێکن‌و جوداوازییان تێدا نیە، ئیتر فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکا کە بانگەوازی ئادەمیزادەکان بکا بۆ یەکدیگیربوون لەسەر ئایینی حەق‌و پەسەندو بەردەوام بوون لەسەر پابەندبوون پێوەی، جڵەوگیری دەکا لەوەی کە موسوڵمانان دەمە دەمێ‌و جەدەل لەگەڵ موشریکەکاندا بکەن، چونکە بەڵگەکان ئاشکران، ئەوانە بەناحەق جەدەل بەرپا دەکەن‌و ئایانەوێ حەق دەرکەوێ بەڵکوو بۆ چەواشەکاری‌و شێواندنی حەقیقەتە، ئەوانە بەڵگەکانیان پوچ‌و بەتاڵ‌و بێ بناغەن، قیامەت نزیکە رابێ‌و موشریکەکانیش لە هاتنی بەپەلەن‌و گاڵتەیان پێ دێ. موسوڵمانەکان بڕوایان پێیە‌و خۆی بۆ ئامادە دەکەن.

دەفەرموێ: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾ ئەی پێغەمبەر! لەبەر خراپی تەفرەقەو پەرتەوازەیی‌و زیانگەیاندنی بەکۆمەڵ بانگەوازی مەردوم بکە بۆ ئەو ئایینە حەق‌و راستە، پەروەردگار ئایینی ئیسلامی بۆ داناوی. بەردەوام بە لەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکانی ئەو ئایینەو پەیامی خۆت بگەیەنەو چۆنت فەرمان پێ کراوە ئاوا هەڵس‌وکەوت بکە، ئادەمیزاد لەسەر ئایینی حەق گرد بکەرەوە، خۆت‌و شوێنکەوتوانت خەریکی خوداپەرستی بن‌و وازی لێ مەهێنن.

﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! شوێن هەواو هەوەسی موشریکەکان مەکەوە، لەوەدا کەبەناحەق چەند خودا درۆزنەیەکیان داتاشیوەو بەندایەتییان بۆ دەکەن، هەروەها شوێن جوولەکەو فەلەکانیش مەکەوە لەوەدا کە بە ئەنقەست دەقی کتێبە ئاسمانییەکانی خۆیان گۆڕیوەو کەوتونە شک‌و گومانەوەو سەریان لەخۆیان‌و لەخەڵکانی تریش شێواندووە.

﴿وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! بە ئادەمیزاد رابگەیەنە: من بڕوام بەهەموو ئەو نامانەیە هەیە: کە خودا ناردوونی بۆ پێغەمبەران، کەبریتین لەتەورات‌و ئینجیل‌و زەبورو صحوف، جوداوازی ناخەمە نێوانیانەوە وە هەموویان بەکەلامی خودا دەزانم، ناچمە پێڕی ئەوانەوە کەبڕوایان بەهەندێکیان هەیەو هەندێکیان رەت دەکەنەوە وەکوو جوولەکەو نەصارا.

﴿وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ فەرمانم پێ کراوە کەبە عەدالەتکاری کاروبارو کێشەتان یەکالا بکەمەوە، مافی هیچ کەس نادەم بەیەکێکی تر، چیم فەرمان پێ کراوە ئەوەتان پێ رابگەیەنم‌و زیادو کەمی تێدا نەکەم.

﴿اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ﴾ خودا خودای ئێمەو ئێوەشە. بەدیهێنەرو بەخێوکەرمانە، هەر ئەو خودای حەق‌و راستە کەسی تر شیاوی خودایەتی نیە.

﴿لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ﴾ سزاو پاداشتی کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانە، سزاو پاداشتی کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە ئێمە لەکردەوەی ئێوە دوورە پەرێزین‌و لێی بەرپرسیار نین، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ – سبأ/٢٥﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ – يونس/٤١﴾.

بیروباوەڕو کردەوەی خۆم بۆ خۆم بۆ خۆم بیروباوەڕی خۆتان بۆ خۆتان.﴿لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾ کێشەو دەمە دەمێ نیە لەنێوانماندا پێویست ناکاو نایکەین، چونکە حەق ئاشکراو عەیانە وەکوو خۆر لەکاتی نیوەڕۆدا.

﴿اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ خودا رۆژی قیامەت لەسارای مەحشەردا ئێمەو ئێوە کۆ دەکاتەوە، عادلانە نێوانمان دەکا، هەرکەسە بە سزاو پاداشتی خۆی دەگا. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ – سبأ/٢٦﴾ سەرەنجام گەڕانەوە بۆ لای خودایە، رۆژی قیامەت

حیساب و لێکۆلینەوە لەگەڵ هەموو کەس دەکاو هەر کەسە بەگوێرەی خۆی سزاو پاداشتی دەدرێتەوە.

﴿وَالَّذِينَ يُحَاجُّونَ فِي اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا اسْتُجِيبَ لَهُ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوانەی دەمە دەمێ دەکەن دەربارەی ئایینی خودا دوای ئەوەی هەندێ خەڵك بەپیریەوە چون و موسوڵمان بوون، بەڵگە دەهێننەوە لەسەر بۆچونەکانیان، بەڵگەکانیان لای خودا پوچن، بە بەڵگە ناژمێردرێن، هیچیان پێ ناچەسپێ، ئەوانە لەسەر ئەو هەڵوێستانەیان عەزابی خودایان لەسەرە، رۆژی قیامەتیش عەزابی سەختیان بۆ ئامادەکراوە.

موجاهید دەفەرموێ: مەبەست بەم ئایەتە کەسانێکە بەهیوا بوون بەچەواشەکاری موسوڵمانەکان لەئیمان هێنان پەشیمان بکەنەوە.

قەتادە دەفەرموێ: مەبەستی جوولەکەو نەصارایە، کە دەیانگوت: پێغەمبەرمان پێش پێغەمبەرتانەو نامەی ئاسمانیمان پێش قورئان نازڵ کراوە.

ریوایەتێکی تر دەڵێ: جوولەکەکان بە موسوڵمانەکانیان گوت: ئێوە دەڵێن: شتێك کۆڕای لەسەربێ باشترە لەوەی راجیایی لەسەربێ، دەی پێغەمبەرێتی موسا کۆڕای لەسەرە، ئێمەش و ئێوەش پێمان وایە کە مووسا پێغەمبەرە. بەڵام پێغەمبەرێتی موحەممەد کۆڕای لەسەر نیە، کەوابێ جوولەکایەتی و شوێنکەوتنی مووسا باشترە لە موسوڵمانیەتی و شوێنکەوتنی موحەممەد. ئیتر پەروەردگار بەم ئایەتە رەددی بیر و بۆچونەکەی دانەوەو فەرمووی: ﴿اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ﴾ ئەڵڵا خودایەکی وەهایە کتێبە ئاسمانییەکانی نازڵ کردون بۆسەر پێغەمبەرانی بەحەق و راستی، بە بەڵگەو موعجیزەوە، لە نامە ئاسمانییەکاندا یاسای پڕ عەدالەت و ویژدانی رون کردونەوە، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەکان کێشەی ناو خۆیانیان پێ یەکالا بکەنەوە، مافی هەموو کەس پارێزراو بێ، ویژدان و عەدالەت بەرامبەر بەیەك بەکاربهێنن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا

رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ – الحديد/٢٥﴾ خودا نامەی ئاسمانی نازڵ کردووه بە حەقو عەدالەت کردویەتی بە حەکەمو دادوەر لە یەکالا کردنەوەی کێشەو نیزاعی خاوەن بیروباوەڕە جیاجیاکان.. شەریعەتو یاساکانی لەسەر بنەمای عەدالەتکاری دامەزراندون، عەددالەتی بەراستیو تەواو دەق وەکوو تەرازو وایە، قییەمو رەوشتی پێ دەکێشرێن، مافو مامەڵەی پێ دیاری دەکرێن.

دوای ئاراستە کردنی ئەو حەمکە بەڵگەو نیشانانە، ئەمجار موشریکە سەر رەقەکان دەترسێنێو دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ﴾ ئەتۆ چوزانی ئەی پێغەمبەر هەروەها هەر کەسێك کە شیاوی خیطاب لەگەڵ کردن بێ، ئەتۆ چوزانی لەوانەیە رابوونی قیامەت نزیك بێ، دەیسا کەوابێ ئەی خاوەن باوەڕان خۆتانی بۆ ئامادە بکەن پتر خوداپەرستی بکەنو هەوڵی ئەوە بدەن کەلەو رۆژەدا سەربەرز بن، ئەمجار هەڵویستی بێ باوەڕو نیماندارانی دەربارەی قیامەت دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا﴾ ئەوانەی موشریكو بێ بڕوان، پەلە لە هاتنی قیامەتدا دەکەنو بەگاڵتەو قەشمەری پێ کردنەوە دەڵێن: ئەوە کوا بۆ قیامەت نەهات؟! کەی دێ؟

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا الْحَقُّ﴾ ئەوانەی ئیمانیان بە خوداو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر هێناوە، دڵنیان لەرابوونی، ترسیان هەیەو دەزانن هەردێو خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، دڵنیان لەوەی بۆ لای خودا دەگەڕێنەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ – المؤمنون/٦٠﴾ ئەمە هەڵویستی ئیماندارانە، لە روداوی قیامەت ترسیان هەیەو خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، هەمیشە لەنێوان خەوفو رەجادا ژیان بەسەر دەبەن.

﴿أَلَا إِنَّ الَّذِينَ يُمَارُونَ فِي السَّاعَةِ لَفِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ ئەی بیسەر ئاگادار بەرەوەو بزانـە ئەوانـەی لەشـكو گومانـدان لـەبارەی زیندوبوونـەوە دەمـە دەمـێ دەكـەن دەربارەی هاتنی قیامەتو بڕوایان بەڕابوونی نیەو گاڵتەی پێ دەكەن لـەگومڕاییو سەر لێ شێوانێكی ئاشكرا دانو بەتەواوی لە ڕێگای حەقو ڕاست لایـان داوە، ئەگـەر بیرێك لەخۆیان بكەنەوە، چاوێك بگێڕن بە دەوروبەری خۆیاندا بۆیان ئاشكرا دەبێ كە ئەو خودایەی ئەوانی لە نەبووەوە هێناوەتـە وجـود، دەتوانـێ جارێكی دی پـاش مـردن زینـدویان بكاتەوە، بەڵكوو زۆر ئاسانترە بەلایەوە. هەرچـەندە بـەلای خـوداوە هەموو شتێك ئاسانە، وەكـوو لـە ئایـەتێكی تـردا ئـامـاژە بـەوە دەكـاتو دەفـەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُـمَّ يُعِيـدُهُ وَهُـوَ أَهْـوَنُ عَلَيْـهِ – الـروم/٢٧﴾ ئـەمجار لەباسـی قیامەتو ترسان لـە ڕوداوەكـانی دەگوێزێتـەوە بـۆ باسـی ڕزقو ڕۆزی: كـە خـود بـە فەضلو گەورەیی خۆی دەیدا بە بەندەكانیو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَـادِهِ يَـرْزُقُ مَن يَشَاء وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ﴾ خودا خاوەن ڕەحمو بەزەییە بۆ بەندەكانی، بەویستی خۆی ڕزقو ڕۆزییان بەسەردا دەڕێژێو پێداویستیان دابین دەكا، خودا خاوەن هێزو تواناو عیززەتە هەرچی بیـەوێ دەتوانـێ بیكـاو كـەس نیـە بتوانـێ ببێتـە كۆسـپو تەگەرە لەبەردەم بەدیهێنانی ویستەكانیدا، ئادەمیزاد بۆخۆی ڕزقو ڕۆزی خۆی پێ دەسـتەبەر نـاكرێ خـودا بـە ڕەحـمو بەزەییـە ڕزقو ڕۆزی دەدا بەصالحو ناصالح، بـەكافرو موسـوڵمان، خـودا ژیـانی پێـداون، هۆكـارە سـەرەتاییەكانی بـۆ دەسـتەبەر كردوون، ئەگەر ڕزقو ڕۆزی خۆی لە كافرو سەرپێچیكار بگرێتـەوە، نـاتوانن، ڕزقو ڕۆزی بۆخۆیان دابین بكەنو لەبرسان دەمردنو لـەتینوان دەخنكان، نەیانـدەتوانی هۆكـارە سـەرەتاییەكانی ژیـان بۆخۆیـان دەسـتەبەر بكـەن، حیكمـەتی خـودا لەدروستكردنیان نەدەهاتەدی لەوەدا كە هەلی بـۆ ڕەخسـاندون بـۆ ئـەوەی لـەژیانی دونیایاندا كار بكەنو لەقیامەتدا بۆیان حسێب بكرێ، بـەقازانج یـان بـەزیان، بۆیـە لەپێـدانی ڕزقو ڕۆزیـدا پـەروەردگار لایـەنی صـاڵحیو ناصـاڵحی بەرچـاو

نەگرتووە، لەرزق‌و رۆژی پێداندا جوداوازی نەخستۆتە نێوان کافرو موسوڵمانەوە، بەڵکوو رزق‌و رۆژی‌و دەوڵەمەندی‌و هەژاری پەیوەست کردووە بەهۆکاری تایبەتی خۆیەوە، بەگوێرەی حیکمەت‌و دانایی خۆی‌و هەوڵدانی ئادەمیزاد لەپێناو دەست خستنیدا، بەم رزق‌و رۆژی پێدانەش خودا بەندەکانی تاقی دەکاتەوە، رۆژی قیامەتیش لەئەنجامی ئەو تاقی کردنەوانەدا سزاو پاداشیان بۆ دیاری دەکا...

## پاداش‌و سزا بۆ موسوڵمانان‌و کافرەکان لە قیامەتدا شتێکی حەتمییە

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّـٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا۟ وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِ ۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٢﴾ ذَٰلِكَ

ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی رونکردەوە؛ کە خودا خاوەنی رەحمو بەزەییە لەدونیادا بەرامبەر بەندەکانی، هەڵێنان بۆئەوەی کاری چاکە بکەنو خۆیان لەخراپە بپارێزن، یاسای کردەوەی رون کردەوە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا هۆکاری گومرایی موشریکەکانو سزادانیان لەقیامەتدا لەسەر هاوەڵدانانیان بۆ خوداو بڕوانەبوونیان بەرابوونی قیامەتو دواخستنی عەزابی کۆ کوژی لەسەریان لەدونیادا لەبەر حیکمەتێکی ئەزەلی دیاری دەکا.

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە هەواڵ بدا بە گەلو نەتەوەکەی، کە ئەو لەپاساوی بانگەوازییەکەیدا هیچ پاداشو کرێیەکی لەوان ناوێ، بەڵکوو دەیەوێ

صیلەی ڕەحم بەرچاو بگرنو دڵنیابن کە ئەو دڵسۆزیانەو دمیەوێ لەبەدبەختیو سەرگەردانی بیانپارێزێ، پێویستە ئەوانیش ئەو خزمایەتییە بەرچاو بگرنو پارێزگاری بکەنو شوێنی بکەون. واز لەو قسەو باسانە بێنن. کە دەڵێن: قورئان هەڵبەستراوی موحەممەدەو کەلامی خودا نیە، چونکە کەسێ دڵی مۆر نەکرابێ درۆ بەدەم خوداوە هەڵنابەستێ، ئەگەر موحەممەد درۆ هەڵبەست بوایە، خودا زوو درۆکانی ئاشکرا دەکرد! دوا بەدوای ئەوە ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ تۆبەکردنو پەشیمان بوونەوە لە هەڵوێستی ناشیرینو کوفر ئامێز، وادەش بە موسوڵمانان دەدا کە لێی بپاڕێنەوەو داوای لێ خۆشبوونو سەرفرازی لێ بکەن بۆ ئەوەی دوعایان گیرا بکاو بەهانایانەوە بێ. بەشوێن ئەوەدا هەڕەشەی توندی ئاڕاستەی کافرەکان کرد.

دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ﴾ کەسێك بەکردەوەی دونیای مەبەستی قیامەت بێ، ئەوە هێزو توانای دەدەینێ بۆ ئەوەی کردەوەکانی ئەنجام بدا، لەقیامەتیشدا بەدە چەندانە پاداشی باشی دەدینەوە تا دەگاتە حەوت سەد هێندەو زیاتریش!

﴿وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ کەسێك هەوڵدانی بۆ دونیا بێ، سەرقاڵی دەستەبەرکردنی لەززەتو خۆشییەکانی بێ، لایەنی قیامەتی فەرامۆش کردبێ، ئەو خۆشیو لەززەتو ماڵو سامانو منداڵەی بەحیکمەتی خۆمان بۆمان دیاری کردووە پێی دەبەخشین، بەڵام لەقیامەت هیچی نادەینێ، چونکە لەدونیادا هیچ هەوڵێکی نەداوە، هیچی نەچاندووە تا لە قیامەت دروێنەی بکا.

پێویستە بۆ تێگەیشتن لەمانای ئەم ئایەتەی نێرە مانای ئایەتی ژمارە (١٨ - ١٩)ی سورەتی ئیسرا بەرچاو بگرین، کە دەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا، وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ

وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا﴾ چونكە ئایەتەكەی ئێرە موطلەقو رەهایە، ئایەتەكانی سورەتی ئیسرا (مقید)ن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: كەسێك دونیا بەسەر قیامەتدا هەڵبژێرێ، پەروەردگار لەقیامەتدا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچی تری ناداتێ، لەدونیاش دا جگە لەو رزقو رۆژییەی بۆی دانراوە هیچی تری ناداتێ.

حاكمو بەیهەقی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان كردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئایەتی ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ﴾ی خوێندەوەو پاشان فەرمووی: پەروەردگار دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد خۆ تەرخان بكە بۆ عیبادەت بۆ كردنم دڵو دەروونت پڕ دەكەم لەبێ ئاتاجیو دڵت دەوڵەمەند دەكەم، هەژاریت لەسەر لادەبەم، ئەگەرنا سەرقاڵت دەكەم بەدونیاوەو هەمیشە خۆت بەهەژار دەزانیو هەڵپە دەكەی بۆ دونیا كۆكردنەوە.

ئیمامی عەلی دەفەرموێ: بەروبوومو دەسمایە دوو جۆرن، ژنو منداڵو سامان بەروبوومی جیهانن، دەسمایەو بەروبوومی قیامەت كردەوەی چاكو خوداپەرستیە.

ئەمجار دوای باسكردنی ئەوە: كە خودا بۆخۆی شەریعەتی بۆ ئادەمیزاد دەست نیشان كردووە پێویستە پابەندبن پێی، نا رەزامەندی خۆی دەردەبڕێت لەوە كە ئادەمیزاد شەریعەت بۆخۆی دابنێو شەریعەتی خودا پشت گوێ بخا.

دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾ یان بەڵكوو ئەوانە هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو شەیاتینیو مالمو قەشەیان كردوون بەیارمەتیدەری خۆیانو بەگوێرەی یاساو شەریعەتی ئەوان هەڵسوكەوت دەكەن، پەیڕەوی شەریعەتێك دەكەن خودا پێی رازی نییە، ئەی پێغەمبەر! ئەوانە شوێن شەریعەتی خودا ناكەون كە تۆ پێیان رادەگەیەنێ، بەڵكوو شوێن یاساو قانوونی شەیاتینی كەوتوون، شتێك: كە خودا لێی حەرام كردوون ئەوان بەحەلاڵی دەزانن، ئەوەی بۆیان حەلاڵە لەخۆیان یاساغ كردووە. (بەحیرەو سائیبەو حام) بەبێ بەڵگە

لەخۆیان حەرام دەکەن، گۆشتی مردارەوە بوو خوێنی ڕەوان‌و گۆشتی بەرازو کردنی قومار بە حەلاڵ دەزانن!

لەصەحیحی موسلیم‌و بوخاریدا هاتووە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: عەمری کوڕی لوحەی کوڕی قومەعەم بینی لەناو ئاگردا ریخۆڵەی خۆی رادەکێشا. چونکە ئەو ملهوڕە یەکەم کەس بووە یاسای (سائیبە)ی داهێنا، بتپەرستی بۆ عەرەب ڕەچاو کرد.

﴿وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەگەر ئەو بڕیارە ئەزەلییە خوداییە نەبوایە: کە خودا وای داناوە عەزابی کۆکوژی لەسەر ئوممەتی موحەممەد هەڵگری‌و سزایان دوابخا بۆ قیامەت، کێشەی نێوان ئیمانداران‌و بێ باوەڕان یەکالا دەکرایەوە، هەر لەدونیادا زوو بەعەزابی ریشە کێشکەر کافرەکانمان لەناو دەبردن. بەلام خوا لەبەر حیکمەتێکی خۆی وای بڕیار داوە: کە سزای ئوممەتی پێغەمبەر دوابخا بۆ قیامەت، بێگومان ئێمە لە قیامەتدا بۆ ستەمکاران سزای بە ئێشمان داناوە، بەئاگری دۆزەخ سزایان دەدەین، دواخستنی عەزابی کۆکوژ لەسەریان بەپێی ئەو ئایەتەیە: کە دەفەرموێ: ﴿بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ – القمر/٤٦﴾ ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامی کۆمەڵی کافرو کۆمەڵی موسوڵمانان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿تَرَى الظَّالِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ﴾ ئەتۆ دەبینی ئەی پێغەمبەر! یان هەرکەسێ ئامادەباشی دیتنی تێدابێ، دەبینی ستەمکاران ڕۆژی قیامەت لەترسی عەزاب زەندەقیان چووە، ترسی سزای کردەوەکانی دونیایان هەیە، لێوەلەرمیان پێ کەوتووە، بترسن یان نەترسن بەتەئکید سزای کردەوەکانی دونیایان دێتەوە ڕێیان‌و یەخەیان دەگرێ!

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ لَهُم مَّا يَشَاؤُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەتاك‌و تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد هێناوە، پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی پەروەردگارن

ئەوانە لەقیامەتدا لەناو باخ و باخاتی بەهەشتدا ژیان بەسەر دەبەن، لەخۆشترین شوێن جێگایان بۆ دانراوە تێیدا رادەبوێرن و چییا بوێ بۆیان ئامادەیە. هەرچی نازو نیعمەتێکی حەزیان لێ بێ بەبێ ماندوبون بۆیان دەستەبەر دەبێ. ئەو پاداشەی دەبەخشرێ بە ئەوان پاداشی گەورەو مەزنە، لەهەموو نازو نیعمەتێك گەورە ترە، نیعمەتێکی تەواو بێ خەوشە، بێ برانەوەو بێ کەم و کورییە، ئەوانە لای خوا بەرێزن، ئەمەش لەزووری هەموو نێعمەتێکەوەیە.

﴿ذَلِكَ الَّذِي يُبَشِّرُ اللَّهُ عِبَادَهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ئەم پاداش و نازو نیعمەتە زۆرو گەورەو هەمە جۆرە لەبەهەشتی بەریندا هەیەو دەبێ و شك و گومانی تێدا نیە، خودا مزگێنی دەدا بەو بەندانەی کە بیروباوەڕی راست و کردەوەی چاك و پەسەندیان هەیە.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە نەفس بەرزی خۆی لەکالاو پیتاڵی جیهان رابگەیەنێ، دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ ئەی پێغەمبەر! بە قورەیشییەکان بڵێ: من لەپاساوی بانگەوازی کردن و تێکۆشانمدا بۆ ئەوەی ئێوە بێنمە سەر رێگای راست چ پاداش و نەفعێکی دونیایی لەئێوە داوا ناکەم، نامەوێ کرێ و موکافەئەیەکم بدەنێ، وەلێ ئەوەی من داواتان لێ دەکەم بریتیە لەوە تەقدیری صیلەی رەحمم لەگەڵ بکەن، ئەرکی خزمایەتیم بۆ ئێوە بەرچاو بگرن رێزی خانەوادەم بگرن و شەڕو ئەگبەتی خۆتانم لێ لابدەن و وازم لێ بێنن بانگەوازی خۆم بکەم ئەمن مەبەستم وەدەستهێنانی پارەو پول نیە لەئاکامی بانگەوازی کردنم بۆتان، بەڵکوو خزمایەتی و صیلەی رەحم پاڵم پێوە دەنێ بۆ ئەوەی بانگەوازیتان دەکەم و هەوڵ دەدەم لەم هیدایەتەی هێناومە بەشی خۆتان وەربگرن و بەختەوەری دونیاو قیامەت بەدەست بێنن، ویژدانی خۆم رازی بکەم و ئەرکی سەرشانم بەجێ بێنم...

بەکورتی من داوا لەئێوە ناکەم پاداشی دونیاییم بدەنێ پارەو پول و پلەو پایەم بۆ بڕیار بدەن بەڵکوو ئەوەی داواتان لێ دەکەم ئەوەیە ئەزیەتم نەدەن و

لایەنی خزمایەتیم بۆتان بەرچاو بگرن‌و گوێم لێ بگرن‌و لەسەرەخۆو هێمنانە دڵم بۆ بکەنـەوە بـزانن چـیتان پـێ دەڵـێم، تـەنها ئـەوەتان لـێ داوادەکـەم‌و هـیچ داخوازییەکی ترم لەئێوە نیە.

لەحـەدیثـی صـەحیحدا چەسـپاوە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: «إِنِّي تَارِكٌ فِيكُمُ الثَّقَلَيْنِ: كِتَابُ اللَّهِ وَعِتْرَتِي، وَإِنَّهُمَا لَنْ يَفْتَرِقَا حَتَّى يَـرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ».

لەریوایەتێکـدا کـە تیرمیـذی ریوایـەتی کـردووە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ) بۆ خۆی وشەی (عترتی) بە (ئال‌و بەیت) تەفسیر کردووە...

ئەمجار پـەروەردگار موسوڵمانان هەڵدەنێ بـۆ چاکەکاری‌و دەفـەرموێ: ﴿وَمَـن يَقْتَرِفْ حَـسَنَةً نَـزِدْ لَـهُ فِيهَـا حُـسْنًا إِنَّ اللَّـهَ غَفُـورٌ شَـكُورٌ﴾ کەسێك چاکەیەك بکا، چاکەکەی بـۆ دەنووسـرێ‌و فەرامۆشـی ناکـەین پاداشـی بـۆ زیـاد دەکـەین، بێگومـان خودا لەزۆر خراپە خۆش دەبێ‌و چاو پۆشی دەکا، چاکەی کەمیش زیـاد دەکـاو دوو چەندانەو چەند چەندانەی دەکاتەوە، ئـەمجار سەرزەنـشتی کافرەکان دەکـا لەسـەر ئەوە: کە بەدەم پێغەمبەرەوە درۆ هەڵدەبەستن‌و بوختـانی بـۆ دەکـەن، دەفـەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ: افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ بـەڵکوو دەڵێن: موحەممـەد لەسـەر خـودا درۆی هەڵبەسـتووە، راسـت ناکـا: کـە دەڵـێ: مـن پێغەمبـەرم‌و پـەیامم بـۆ هـاتووە. ئـەم هەڵوێستەی کافرەکان لە هاوەڵدانان تاوانترە، یـان بـە ئەنـدازەی هاوەڵدانان تاوانـە. پەروەردگار لە کەلامی پێشەوە گواستیەوە بەبێ ئەوەی پووچی بکاتـەوە، بەشـێوەی پرسیاری ئینکار ئـامێز سەرزەنـشتی کـردن، وەکـوو بفـەرموێ: چۆن پیـاوی وەکـوو موحەممەد درۆی پاڵ دەدرێ؟ ئێـوە بـۆ خۆتـان پـێش ئـەوەی ببێتـە پێغەمبـەر بـە دەستپاك‌و راستگۆتان داناوە، چۆن ئێستا بە درۆی دەخەنـەوە؟ ئـەمجار پـەروەردگار رەدیان دەداتەوەو دەرکەوتنی درۆ لە پێغەمبەر بەدوور دادەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿فَـإِن يَشَإِ اللَّهُ يَخْتِمْ عَلَى قَلْبِكَ وَيَمْـحُ اللَّـهُ الْبَاطِـلَ وَيُحِـقُّ الْحَـقَّ بِكَلِمَاتِـهِ إِنَّـهُ عَلِـيمٌ بِـذَاتِ

الصُّدُورِ﴾ ئەگەر تۆ ئەی موحەممەد درۆ لەسەر خودا هەڵبەستی، خودا ئەگەر بیەوێ دڵت مۆردەکا، هەرچی زانیاری یەك پێت دراوە لێمان دەستاندییەوە کێ جورئەت دەکا درۆی وا هەڵبەستێ، مەگەر کەسانێك وەکوو خۆیان گومڕاو دڵ مۆر کراوو نەفام، ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی پێغەمبەرو راستی پەیامەکەی، چونکە ئەگەر درۆی لەسەر خودا هەڵبەستایە خودا مەنعی دەکردو دڵی مۆر دەکردو هیچ مانایەکی لە قورئان لەدڵدا نەدەهێشتو نەیدەتوانی وشەیەك لە نیگاو سروش بە خەڵکی رابگەیەنێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەداتو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ، فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ – الحاقة/٤٤ – ٤٧﴾ پەروەردگار بەتاڵ پوچ دەکاتەوەو حەق دەچەسپێنێ، جا ئەگەر ئەو پەیامەی موحەممەد هێناویەتی پوچو بێ بناغە بوایە خودا زوو دەی پوچاندەوە، خودا ئایینی ئیسلام دەچەسپێنێو بە قورئان رونی دەکاتەوە، بە موعجیزەی گەورە پشتگیری دەکا، بێگومان پەروەردگار زانیاری بەرفراوانەو دەزانێ چی لە دڵو دەروونی بەندەکانیدا هەیە. ئەمجار پەروەردگار دەرگای هیوا لەسەر بەندەکانی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ پەروەردگار تۆبەو پەشیمانی لە بەندە گوناهبارەکانی وەردەگرێ، لەتاوانی رابوردویان خۆش دەبێ، دەزانێ چی دەکەن لەخێرو شەڕ. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا – النساء/١١٠﴾.

لەصەحیحی موسلیمدا فەرموودەیەك هەیە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت کراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ حِينَ يَتُوبُ إِلَيْهِ مِنْ أَحَدِكُمْ كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِأَرْضِ فَلَاةٍ فَانْفَلَتَتْ مِنْهُ وَعَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَأَيِسَ مِنْهَا فَأَتَى شَجَرَةً فَاضْطَجَعَ فِي ظِلِّهَا قَدْ أَيِسَ مِنْ رَاحِلَتِهِ فَبَيْنَا

هُوَ كَذَلِكَ إِذَا هُوَ بِهَا قَائِمَةً عِنْدَهُ فَأَخَذَ بِخِطَامِهَا ثُمَّ قَالَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ اللَّهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ». لەخۆشیان ئەم هەڵەیە دەكا.

ئەمجار پتر هیوا دەخاتە دڵیانەوەو جەخت لەسەر قبوڵ كردنی تۆبەكەیان دەكاتەوە بەوە: كە دوعایان گیرا دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَجِيبُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِ﴾ پەروەردگار وەڵامی ئەو ئادەمیزادانە دەداتەوە: كە بڕوایان بە تاك و تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی موحەممەد هێناوەو فەرمانبەرداری فەرمان و جڵەوگیرییەكانی خودای خۆیانن، كردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، ئەوەی داوای لێ دەكەن بەزیادەوە پاداشیان دەداتەوە. ئەم مانایە كاتێك دەكرێ: كە وشەی (الذين) لە ئایەتەكەدا (مفعول بە) بێ و (فاعل) مەزەندە كراوبێ، تەقدیرەكەی (الله) بێ ئەگەر وشەی (الذين) فاعیل بێ. ماناكەی بەم جۆرە دەبێ، واتە: (ئەوانەی ئیمانیان هێناوە وەڵامی خودا دەدەنەوە، ئەوەی خودا داوایان لێ دەكا ئەوانە ئەنجامی دەدەن و بەپیر بانگەوازی خودای خۆیانەوە دەچن، ئەو كاتە (يستجيب) بەمانا (يجيب) دەبێ، (الزجاج) دەڵێ: (استجاب) و (أجاب) یەك مانایان هەیە. ﴿وَالْكَافِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ بۆ بێ بڕواو موشریكەكان لەڕۆژی قیامەتدا عەزابی دژوار ئامادەكراوە، تۆڵەی كوفرو بێدینییەكەیان لێ دەستێنین.

## برێ دیاردەو حیكمەت و دەسەڵاتی خودا

﴿ ۞ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٣١﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُواْ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند: کە خودا دوعای موسوڵمانان گیرا دەکا. ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە: کە فەضڵو ئیحسانی خودا بێ سنورەو لە حسێب نایەن، لە قیامەتدا بە رەهایی بەشی خودا پەرستانی لێ دەدات، وەلێ رزق‌و رۆزی بۆ بەندەکانی لە ژیانی دونیادا سنوردارو بە ئەندازەیە، چونکە خودا بۆ خۆی دەزانێ

وزەی بەندەکانی لەژیانی جیهاندا بەرگەی ئەوە ناگرن، خودا رزق‌و رۆزییان بەبێ سنور پێ ببەخشێ، ئەگەر بێ سنوور رزق‌و رۆزییان پێ ببەخشێ بوغرا دەبن‌و لەخۆیان بایی دەبن، ویژدان‌و بەزەییان نامێنی، دەست دەکەن بە تاوانکردن‌و خراپە کاری. بۆیە پەروەردگار بە ئەندازە رزق‌و رۆزی بۆ دیاری کردوون، ئەمجار بەڵگەو نیشانە لەسەر خودایەتی خودا دەهێنێتەوە بەدیهێنانی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیاندایە دەکاتە شایەت لەسەر خودایەتی خۆی. دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ وَلَكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَاءُ إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ ئەگەر پەروەردگار لە دونیادا زیاد لەپێویست رزق‌و رۆزی بۆ بەندەکانی دەستەبەر بکا لەخۆیان بایی دەبوون‌و ویژدان‌و مرۆڤایەتییان نەدەما، شتی وایان داوا دەکرد: کە شیاوی داواکردن نەبێ، هەڵس‌و کەوتی وایان ئەنجام دەدا لە هەڵس‌و کەوتی ئادەمیزاد نەچێ، وەلێ خودا بە حیکمەت‌و دانایی خۆی بە ئەندازەو دەسەندە رزق‌و رۆزی دەدا بە بەندەکانی، ئەوەندەیان دەداتێ لە بەرژەوەندییان بێ‌و حیکمەتی خودایی داخوازی بێ، کەسێك شیاوی دەوڵەمەند بوون بێ، دەوڵەمەندی دەکا، کەسێك هەژاری لە بەرژەوەندی بێ هەژاری دەکا، بێگومان خودا خەبەردارە بە بەندەکانی‌و دەزانێ چی لە بەرژەوەندییانە، بینایە بەوەی شیاوە بۆیان. لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە، خودا فەرموویەتی: (ان من عبادی من لا یصلحه الا الغنی ولو أفقر لأفسدت علیه دینه وان من عبادی من لا یصلحه الا الفقر ولو أغنیته لأفسدت علیه دینه) هەندێك لە بەندەکانم دەوڵەمەندی لە بەرژەوەندییانە ئەگەر هەژاری بکەم ئایینەکەی لێ دەشێوێ، بەندەی واشم هەیە هەژاری بۆی باشە ئەگەر دەوڵەمەندی بکەم ئایینەکەی لێ تێك دەچێ.

قەتادە دەڵێ: باشترین ماڵ‌و سامان ئەوەیە هێندە کەم نەبێ یان ئەوەندە زۆر نەبێ خودات لەبیر بەرێتەوە. ﴿وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِن بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُ وَهُوَ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە باران دەبارێنێ لەکاتی

پێویستدا، دوای ئەوەی ئادەمیزادەکان ناهومێد دەبنو لەبەر بێ ئاوی تینیان بۆ دێ، دونیای روناکیان لەبەرچاو تاریك دەبێ، ئیتر پەروەردگار بارانیان بۆ دەبارێنێو فەیضو رەحمەتی خۆی دەرژێنێ بەسەریاندا، پێویستیان دابین دەکاو زەویو زارو ئاژەڵیان تێر ئاو دەبن بیرو کانیاویان دەتەقنو پێداویستی ژیانیان بۆ دەستەبەر دەبێ، پەروەردگار خاوەنو کار هەڵسورێنەرێکی داناو زانایە، شیاوی هەموو حەمدو سوپاسێکە.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَابَّةٍ﴾ برێك لە بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتو توانای خودا بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوییە بەو شێوە رێكو پێکە. هەروەها بەدیهێنانو بڵاوکردنەوەی ئەو حەمکە زیندەوەرو گیانلەبەرانەی لە ئاسمانەکان دانو ئەوەی بەناو زەویدا دێنو دەچن. بە فریشتەو ئادەمیزادو جندۆکەو ئاژەڵو باقی گیانلەبەرانی زۆرو هەمە جۆر بەهەموو شێوەو شکلو روخسارو سروشتیانەوە... لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ – لقمان/١٠﴾ جا بەگوێرەی ئەم ئایەتەی سورەتی لوقمان هەندێ رایان وایە: مەبەست بە (فیها) زەوی بێ، ئاسمانەکان داخڵ نەبێ.

بەڵێ تەنها مەسەلەی ژیانو دیاردەی زیندەوەرانی سەرگۆی زەوی بۆ خۆیان نیشانەیەکی فرەمەزنن لەسەر خودایەتی خودا. ئەتۆ باسی زیندەوەرانی ناو ئاسمانەکان هەر مەکە چونکە ئێستا هیچی لێ نازانین.

ژیان بۆ خۆی نهێنییەکی نەزانراوە، کەس نازانێ لە کوێوە هاتووە، چۆن پەیدابووە، چۆن پەیوەندی بە ماددەوە کردەوەو زیندەوەر هاتوونەکایەوە، هەموو هەوڵو تێکۆشانێك بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی ژیانو سروشتی ژیان پەردە پۆش کراوەو دەرگای لەسەر گاڵ دراوە، هەموو توێژینەوەکان باسی گەشە کردنو گۆڕانکاری لە ژیاندا دەکەن (دوای پەیدابوونی) لەم بوارە تەسکەشدا بیرو بۆچوون

زۆرو زەبەندەن، خودی ژیان بۆ خۆی نهێنییەکەو هیچی لێ نازانرێ، ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي – الإسراء/٨٥﴾ کەوابێ ئادەمیزاد چی بکا ناتوانێ بزانێ ژیان چیەو لەچییەوە پەیدابووە، بە دەقی قورئان خودا زانیاری لەو بوارەدا عائید بەخۆی کردووە. بەڵام زیندەوەرەکان بۆ خۆیان نیشانەی قودرەتی خودان، بەڵگەن لەسەر دەسەڵاتو کار دروستی پەروەردگار، ئەم حەمکە زیندەوەرانەی سەر زەویو ناو زەوی هی ناو هەواو قوڵایی دەریاکان، ئەمە جگە لەو زیندەوەرانەی ناو ئاسمانەکانو سەر ئەستێرەکانی تر کەهەر خودا دەزانێ ئاخۆ هەنو چەندو چۆنن. ئەم حەمکە زیندەوەرانەی ناو هەموو بوونەوەر لە رابوردوو داهاتوودا خودا کۆیان دەکاتەوە، هەرکاتێ بیەوێ کۆیان دەکاتەوەو تاکە یەکێکیشیان لێ تەرە نابێ، بە پێچەوانەی ئادەمیزادەوە: کە هەرکاتێ کۆمەڵە باڵندەیەکی ماڵیو کەوی لێ پەرتەوازە بوون ناتوانێ بە ئاسانی هەموانیان کۆبکاتەوە. کۆمەڵانی ماسی ناو دەریاکان: کەهەر خودا ژمارەیان دەزانێ، کۆمەڵانی مێروو هەنگو زەردەواڵەو ژەنگە سوورەو مێشوولەو میکرۆبو فایرۆسو هاو وێنەکانیان: کەهەر خودا شوێنو ژمارەو چۆنیەتی ژیانیان دەزانێ، کۆمەڵانی باڵندەو پێروو خشۆک: کە هەر خودا ژمارەیان دەزانێ، گەلێ گیانلەبەری تر کە بەخودا نەبێ لە هەژمار نایەن ئەمانە هەموویان هەر کاتێك خودا بیەوێ گردیان دەکاتەوە، چۆن توانیویەتی بڵاویان بکاتەوە، ئاوایش دەتوانێ کۆیان بکاتەوە. بۆ حەشرو حیسابو لێکۆڵینەوە.

﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾ هەرچی توشتان دێ ئەی ئادەمیزادینە! لەبەڵاو ناخۆشی لەئێشو ئازارو نەخۆشی، لەگرانیو شەڕو هەراو ترسو بیم... هتد. هەمووی بەهۆی بڕێ کردەوەی خۆتانەوەیە لەئاکامی هەندێ هەڵوێستی نالەبارو تاوانکاریتانەوە یەخەی گرتوون، ئەو بەڵایانە تۆڵەی تاوانو قەرەبووی خراپەکاریتانە، وێڕای ئەوەیش لەزۆر تاوانتان خۆش بووەو چاوپۆشی لێ کردوون.

شایانی باسە جاری وا دەبێ بەڵاو موصیبەت بۆ زێدە ئەجرو پاداشو بەرزکردنەوەی پلەو پایەی قیامەتە... ئایەتەکە عەداڵەتکاریو بەرەحمو لێبوردەیی خودا را دەنوێنێ، هەر ناخۆشییەکی تووشی ئادەمیزاد دەبێ سوچی خۆیەتی، وەلێ خودا لەسەر هەموو تاوانێکیان توشی بەڵایان ناکا، چونکە دەزانێ ئەم ئادەمییە چەند بێ وەجو زەعیفە، زۆر جار خۆی بۆ راناگیرێو تاوانێك دەکا، دوایی پەشیمان دەبێتەوە، خودا بە رەحمو ئیحسانی خۆی چاوپۆشی لێ دەکا.

نمونەی ئەم ئایەتە زۆرن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ – النساء/١٢٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ – فاطر/٤٥﴾ لە فەرموودەیەکی صەحیحدا: کە لەموسلیمو بوخاریدا لەئەبو سەعیدی خودریو ئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە: هەروا لە (الموطأ)یشدا هاتووە دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «والذي نفسي بيده مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمّ وَلاَ حُزْنٍ وَلاَ أَذًى وَلاَ غَمّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا» سوێندم بەو کەسەی گیانی منی هاوەدەس هەرچی تووشی موسوڵمان دەبێ لەناخۆشیوماندوبوونو ئێشو ئازارو خەمو خەفەت هەمووی دەبێتە کەفارەتی تاوانو گوناحی پێ لێ هەڵدەوەرێ، تەنانەت چقڵێك کە لەجەستەی رادەچێ دەبێتە کەفارەتی گوناهی. ئیمام ئەحمەد لەخاتوو عائیشەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: هەرکاتێ بەندە تاوانی زۆر بوونو چاکەیەك نەبوو ببێتە کەفارەتی تاوانەکانی، پەروەردگار غەمو خەفەتی دەداتێ تا ببێتە کەفارەتی تاوانەکانی.

﴿وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ ئێوە ئەی تاوانبارو کافرو بێ بڕواکان ناتوانن خودا دەسەوەسان بکەن لە هەر بەڵاو موسیبەتێك خودا بیەوێ یەخەتان بگرێو بێگومان تووشتان دەبێو دەتانگرێتەوە،

جگە لەخودا کەس نییە بتوانێ لێتانی بگێڕێتەوە، هەر خودا وەلیو یارمەتیدەری ئێوەیەو کاروبارتان هەڵدەسوڕێنێ.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ﴾ بڕێکە لەبەلگەو نیشانەی قودرەتی خودا ڕۆیاندنی کە شتی زەبەلاحو کێو ئاسا، گەمێ بەو قورسییو زەبەلاحییەی بەویستی خودا بەناو دەریادا دێو دەچێو خۆتانو کالاتانی پێ دەگوێزنەوە.

﴿إِن يَشَأْ يُسْكِنِ الرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَى ظَهْرِهِ﴾ ئەگەر خودا بیەوێ کەشتییەکان بووەستێنێ، با هەڵناکا کە (با) نەبوو کەشتییەکانیش لە ڕۆیشتن دەکەون بەسەر ئاوەکەوە دەمێننەوە.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بێگومان لە هاتو چۆی کەشتییەکاندا، بەلگەی گەورە هەن لەسەر دەسەلاتو توانای پەروەردگار بۆ کەسێك خاوەن صەبرو ئارام بێ، خۆگرو ورە بەرزبێ لەسەر بەلاو موصیبەت پشوو درێژ بێ بۆ ئەنجامدانی کاری چاكو خودا پەرستی، زۆر شوکرانە ژمێربێ لەسەر نیعمەتەکانی خودا.

﴿أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ﴾ یان ئەگەر مەیلی هەبێ ئەو کەشتیانە نقوم دەکا بەهۆی تاوانی ئێوەی سەرنشین، لەزۆر تاوانیشتان خۆش دەبێ، یان لەزۆر تاوانبار خۆش دەبێ. لە خنکان ڕزگاریان دەکا، خۆ ئەگەر بەگوێرەی تاوانەکانیان لەگەڵ بکا دەبوایە هەرچی سواری کەشتی بوو لەناوی بەرێ!

﴿وَيَعْلَمَ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ با ئەوانەی دەربارەی ئایاتی ئێمە دەمە دەمێ دەکەنو پەیامی ئیسلام ڕەت دەکەنەوە، بڕوا بە قورئان ناکەنو پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، با چاك بزانن: کە هەرکاتێ خودا بیەوێ تووشی چورتمیان دەکا کەس نیە بتوانێ بەرگرییان لێ بکا. قوتاریان نابێو ڕزگار بوونیان نیە.

ئەمجار پەروەردگار بەندەكانی هەڵدەنێ كە بەژیانی دونیا بوغرا نەبن‌و هەوڵی ئەوە بدەن خودا لەخۆیان رازی بكەن، دەفەرموێ: ﴿فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ هەرچی پێتان دراوە لە ماڵ‌و سامان‌و خێزان‌و منداڵ‌و پلەو پایەو تەندروستی، كاڵاو مەتاعی كەم‌و كەمخایەنی دونیایە. ماوەیەك لەززەتی لێ وەردەگرن‌و خێرا بەسەر دەچێ، چونكە نازو نیعمەتی دونیا تەمەنیان كورتەو بەرقەرار نابن، زوو بەسەر دەچن‌و دەپوچێنەوە پێویستە ئادەمیزاد پێیان هەڵەوگێڕ نەبێ‌و بە تەواوی خوویان نەداتێ، وانەكا بەهۆی هەڵەو گیربوون پێیانەوە قیامەتی لەبیر بچێتەوە.

﴿وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەوەی لای پەروەردگارە لەپاداشی تاعەت‌و خودا پەرستی ئەوەی خودا بۆ خاوەن باوەڕی كردار پەسەندی پەزمەندە كردووە زۆر باشترە لە مەتاعی بێ بەقای دونیا، نازو نیعمەتی دونیا كەم تەمەن‌و روو لەبڕانەوەن، نازو نیعمەتی قیامەت بۆ هەتا هەتایەو بڕانەوەیان بەسەردا نایە، كەواتە ژیرو خاوەن فام كەسێكە بۆ دونیا قیامەت لەكیس خۆی نەدا. پاداش‌و نیعمەتی قیامەت چاكترو هەمیشەیین بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو پشتیان بەخودا بەستووە. بۆ هەموو كاروبارێكیان وزەو توانا لەخودا وەردەگرن!

## ڕەوشتی موسوڵمانانی راستاڵ

﴿ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ

يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤٣﴾

لەوەپێش بەڵگەی جۆراو جۆری لەسەر تاكو تەنهایی خودا هێنانەوە، دیاردەی دەسەڵاتو توانای خودای نواند، دونیای بە پووچ داناو نەفرەتی لێ کرد، قیامەتی بەهەند گرتو ئادەمیزادانی هەڵنا بۆ کار بۆکردنی. ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئادەمیزادی باشو پەسەندو بەختەوەر کەسێکە چەند رەوشتێکی تێدابن، سەرەتا دوو لەو رەوشتانەی باس کردن: کە بریتین لە ئیمان بەخوداو پشت بەستن پێی. ئەمجار رەوشتەکانی دی: کە خۆپاراستنە لە تاوانی گەورەو پابەندبوون بە فەرمانی خوداو جڵەوگیرییەکانی، ئەنجامدانی نوێژو دەرکردنی زەکات لەماڵو سامانو بەرچاو گرتنی راوێژ لە کاروباری گشتیو تایبەتیدا، جەنگانو ئازایەتی بۆ پاراستنو وەرگرتنەوەی مافی زەوت کراو. دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ﴾ ئەو خاوەن باوەڕانەی خۆیان دەپارێزن لە تاوانی گەورەی وەکوو هاوەڵدانان بۆ خوداو کوشتنی ئادەمیزاد بە ناحەقو ئەزیەتدانی باوكو دایك،

هەروەها خۆیان دەپارێزن لەکاری فاحیشە ئامێزی وەکوو زیناو درۆزنیو غەیبەتو دزیو چەتەییو ئاژاوە نانەوە لەسەر زەوی.

﴿وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ﴾ ئەگەر خراپەیەکیان لەگەڵ کرا ڕقیان هەڵساو دەسەڵاتیان بوو تۆڵە بسێنن ڕقی خۆیان دەخۆنەوە، لێبوردن ڕەچاو دەکەن لەبەرخاتری خودا تاوانکار عەفوو دەکەن. لە حەدیثی صەحیحدا هاتووە دەڵێ: (مَا انْتَقَمَ النَّبِيُّ لِنَفْسِهِ قَطُّ، حَتَّى تُنْتَهَكَ حُرُمَاتُ اللَّهِ) هەرگیز پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر خودی خۆی تۆڵەی نەستاندۆتەوە، مەگەر دەستدرێژی کردنەکە شکاندنی سنوری خودای تێدابووبێ.

﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ﴾ ئەوانەی بەپیر بانگەوازی خوداوە چوونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیری خودا بوونو هاوەڵیان بۆ دانەناوەو بەبێ شەریکیان زانیوە، شوێن پەیامی پێغەمبەرەکانی کەوتوونو بڕوایان بەزیندوو بوونەوە هەبووە.

﴿وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾ بە ڕێکوپێکی نوێژەکانیان ئەنجامداوەو ئەنجام دەدەن، بە خوشوعو خوضوعەوە لەکاتی خۆیاندا بەجێیان دەهێنن!

﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ هەر کارێکی گرنگیان بێتە پێش بە ڕاوێژو ڕاوو تەگبیر لێی دەکۆڵنەوەو پلانی بۆ دادەنێنو جێبەجێی دەکەن، دانانی ڕابەرو فەرمانڕەواو کاربەدەستی گەورە بە ڕاوێژو دەنگدان دیاری دەکەن.

بێگومان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەهەموو کەس زیاتر ڕاوێژی بە هاوەڵانی کردووە، هەرکارێکی گرنگی بهاتایە پێش ڕاوێژو گفتو گۆی لەسەر دەکردو دوایی ئاکامی ڕاوێژی تەنفیذ دەکرد. هاوەڵانیشی دوای لەدونیا دەرچوونی، هەمان ڕێبازیان پەیڕەو کردووە، بۆ هەموو کارێکی گرنگ ڕاوێژیان ئەنجام داوە، کاتێك حەزرەتی عومەر بریندار کرا لەسەر جێگای مردن شەش کەسی دیاریکردنو وەسییەتی کرد بە ڕاوێژ یەکێکیان بکەن بەجێ نشین، ئەو شەش کەسە بریتیی

بوون لە: (عوسمان و عەلی و طەلحەو زوبەیرو سەعدو عبدالرحمانی کوڕی عەوف) خودایان لێ رازی بێ، لە ئاکامدا بەڕاوێژ بڕیاریاندا عوسمان بکەن بەجێ نشین.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکات: کە کار بەڕێوەبردن بەشێوەی راوێژ رەوشتێکی هەمیشەیی موسوڵمانانەو هەموو کارێکیان بەوجۆرە بەڕێوە دەبەن. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکوو لە ئایەتێکی تردا راستەوخۆ فەرمانیان پێ دەکا، کە کارەکانیان بە راوێژ ئەنجام بدەن دەفەرموێ: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ – آل عمران/١٥٩﴾.

تیرمیذی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکات و دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا كَانَ أُمَرَاؤُكُمْ خِيَارَكُمْ وَأَغْنِيَاؤُكُمْ سُمَحَاءَكُمْ وَأُمُورُكُمْ شُورَى بَيْنَكُمْ فَظَهْرُ الْأَرْضِ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ بَطْنِهَا وَإِذَا كَانَ أُمَرَاؤُكُمْ شِرَارَكُمْ وَأَغْنِيَاؤُكُمْ بُخَلَاءَكُمْ وَأُمُورُكُمْ إِلَى نِسَائِكُمْ فَبَطْنُ الْأَرْضِ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ ظَهْرِهَا».

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: هەر گەل و نەتەوەیەك راوێژ بکەن، بەرێك و پێك ترین شێوە کارەکانیان بەڕێوە دەچێ.

رەوشتێکی تری موسوڵمانان ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ لەو رزق و رۆزییەی پێمان بەخشیون لەپێناو رازی بوونی خودا لێیان ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن، خێرو خێرات دەکەن، بێگومان ماڵبەخشین دەبێتە مایەی هێزو توانای گەل و وڵات، حکوومەت پێی بەهێز دەبێت، کەم و کوڕی ناو کۆمەڵ کەم دەکاتەوە، یەکیەتی و تەبایی کۆمەڵی پێ دەستەبەر دەبێ، خۆشەویستی دەخاتە نێوان دەوڵەمەندو هەژارانەوە. رەوشتێکی تری موسوڵمانان ئازایەتی و چاو نەترسییە. دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾ هەرکاتێ ئەو خاوەن باوەڕانە دەست درێژییان کرایە سەر بە ورەی بەرزو چاو نەترسیەوە بەرەنگاری ستەمکار دەبنەوەو بەگژیدا دەچنەوە، چونکە بەگژدا چوونەوەی دەستدرێژیکار پێویستەو نابێ موسوڵمان ژێر دەستەیی و چەوسانەوە قبوڵ بکا، چونکە قبوڵکردنی ستەم، ستەمکار بوغرا دەکاو رێگە دەکاتەوە بۆئەوەی ستەم لە

خـەڵکی تـریش بکـا، کەسـانی تـریش بـچەوسێننەوە، ئەمـەش لەگـەڵ عیـززەتو شکۆمەندی موسوڵمانان ناگونجێ، موسوڵمان دەبێ مـاڵو سامانو نـاموسو خـاكو خوێنی خۆی بپارێزێ، لە پێناویاندا خۆی بەخت بکا ئەگەر لەو پێناوە بکوژرێ بـە شـەهید حـسێبە. سـەر داخـستن بـۆ ستەمکارانو بەگـژدا نەچـوونەوەیان ڕەوشـتی موسوڵمان نیە، تەنانەت: کە ستەمکار ستەم لەژێر دەسـتەکانی دەکـا ئەگـەر بتـوانن پێویستە بەگژیدا بچنەوە، خۆ ئەگـەر توانایـان هـەبوو هێـزو توانـای خۆیـان بـەکار نەهێناو ستەمیان قبوڵ کرد، ئەوە بە ئەندازەی ستەمکارەکە تاوانبارن.

هەڵبەتـە دژایـەتی نیـە لـەنێوان ئایـەتی پێـشوودا: کـە فـەرمووی: ﴿وَإِذَا مَـا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ﴾ لەگەڵ ئەم ئایەتەدا، چونکە لێبوردنو چاو پۆشین دوو جۆرە:

١- عــەفوو لێبــوردەیی کاتێــك ببێتــە هۆکــاری کوژاندنــەوەی ئاشــوبو ئارامبوونەوەی ڕەقو کینەو ژیوان بوونەوەی تاوانکار لـە تـاوان، ئـەم جـۆرە عـەفوو لێبوردنە پەسەندەو خودا پێی خۆشە.

٢- ئەگەر لێبوردن ببێتـە هۆکاری ئـەوە ستـەمکار لـەخۆی بـایی ببـێو زیـاتر سـوربێ لەسـەر تـاوانو سـتەمکاری بەکـەم زانینـی گـەلو نەتـەوە، ئەمـە تاوانـەو ناپەسەندە، کەوابێ کاتی وا هەیە عەفوو لێبوردن پەسەندەو پێویستە خۆمانی پـێ ئارایشت بدەین، جاری وایش هەیە نابێ نەرمی نیشان بدەین دەبێ سووربین لەسەر تۆڵە ستاندنەوە لە تاوانبارو عەفوو نەکردنی بەمەرجێ هێزی بەگژدا چوونەوەمان هەبێ.

لەسەرگورشتەی پێغەمبەرانو مێژووی ئیـسلامیدا زۆر نمونـە هـەن، هـەردوو هەڵوێستەکان روون دەکەنەوە. ئەوەتا حەزرەتی یوسف (دروودی خوای لەسـەر بـێ) براکانی ئەو ستەمەیان لێ کرد، کەچی: کە دوایی دەسەڵاتی پەیـداکرد چاوپۆشـی لێ کردن، وەکوو قورئان لێوەی دەگێڕێتەوە فەرمووی: ﴿لاَ تَثْرِيـبَ عَلَـيْكُمُ الْيَـوْمَ، يَغْفِـرُ اللَّهُ لَكُمْ – یوسف/٩٢﴾ لەکاتێك دا ئـەوان ناحـەقییان لێ کردبـوو دەشـی تـوانی بـە

تەواوی تۆڵەیان لێ بکاتەوە بەڵام عەفووی کردن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وێڕای ئەوەی دانیشتوانی مەککە ئەزیەتیان دابوو، ئەوەندەیان تین بۆ هێنا ناچاربێ مەککە جێ بێڵێ، دەی کە دوایی مەککەی رزگار کرد هەمووی عەفوو کردن.

هەشتا کەس ساڵی حودەیبییە پیلانیان داناو ویستیان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو بەرن، بۆیان نەکراو پیلان سەری نەگرت. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وێڕای ئەوەی دەسەڵاتی بەسەریاندا پەیداکرد عەفووی کردن!

غەورەثی کوڕی (الحارث) پێغەمبەری بینی لەژێر دارێکدا نوستووەو شمشێرەکەی بەدارەکەدا هەڵواسیوە شمشێری دەستدایە بۆ ئەوەی شەهیدی بکا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خەبەری بووەو، غەورەث وتی: کێ لەدەست من ڕزگارت دەکا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا، ئیتر کابرا لەرزیو شمشێری لەدەست کەوتە خوار، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شمشێری کەوتەوە دەستو بانگی هاوەڵەکانی کردو ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە! ئەمجار عەفووی کرد.

بەکورتی عەفوو کردن لەگەڵ توانادا ڕەشتی بەرزو پیاوەتییە، ڕەوشتی پێغەمبەرانو خۆشەویستانی خودایە، تۆڵەستاندنەوە هەر ئەوەندەیە مەشروعە، ئەگینا خودا ئادەمیزادانی بۆ ئەنجامدانی هەڵنەناوە. پەروەردگار بەمەرجی داناوە: کەلەکاتی تۆڵەستاندنەوەدا زێدەڕەوی نەکرێو زیاد لەمافی خۆی تۆڵە نەستێنێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا﴾ تۆڵەی خراپە خراپەیە بە ئەندازەی خۆی، نابێ زیاد لەئەندازە تۆڵە بستێنێتەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ – البقرة/١٩٤﴾

یـان دەفـەرموێ: ﴿وَإِنْ عَـاقَبْتُمْ فَعَـاقِبُواْ بِمِثْـلِ مَـا عُـوقِبْتُم بِـهِ – النحـل/١٢٦﴾ یـان دەفەرموێ: ﴿وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا – الأنعام/١٦٠﴾.

بـەگوێرەی یاسـای ئیـسلام هـەموو تـاوانێکی مـەدەنی یـان جینـایی دەبـێ بەیەکسانی تۆڵەی وەربگیرێتـەوە، بکوژی بەئەنقەسـت دەکوژرێتـەوە بریندارکـەر بریندار دەکرێتەوە، بەئەندازەی تاوان تۆڵەی لێ وەردەگیرێتەوە، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَلَكُـمْ فِـي الْقِـصَاصِ حَيَـاةٌ يَـاْ أُولِـيْ الأَلْبَـابِ – البقـرة/١٧٩﴾ یـان دەفـەرموێ: ﴿وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ – المائدة/٤٥﴾.

جا هەرچەندە تۆڵە مەشـروعە، پـەروەردگار ئـادەمیزادی هـەڵناوە بـۆ عـەفوو لێبوردنو دەفـەرموێ: ﴿فَمَـنْ عَفَـا وَأَصْـلَحَ فَـأَجْرُهُ عَلَـى اللَّـهِ﴾ کەسێك ستەمکارو تاوانبـار عـەفوو بکـات، بەچاکەکاریو خۆشەویستی نێـوان خـۆیو دوژمنـانی رێـك بخاتـەوە، ئـەوە پاداشـی لەسـەر خودایـە، خـودا پاداشـی باشـی دەداتـێ. هـەروەکوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لـە فەرموودەیەکدا کـە موسـلیمو ئەحمـەدو تیرمیزیو ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: (وما زاد الله عبداً يعفـو إلاّ عـزّاً) چـەندێك بەندە لێبوردەو عەفوو مەشرەب بێ خودا شکۆمەندی بۆ زیاد دەکا.

لەئایەتێکی تردا: کە قورئان وەصفی تەقواکاران دەکا، یـەکێ لەرەوشـتەکانیان رق خواردنەوەو چاوپۆشیکردنە وەك دەفـەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء وَالضَّرَّاء وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ – آل عمران/١٣٤﴾.

ئەمجار جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە پێویستە لەکاتی تۆڵە سـتاندنەوەدا زێدەرەوی نەکرێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لَا يُحِـبُّ الظَّـالِمِينَ﴾ خـودا سـتەمکارانی خـۆش ناوێن، نە ئەوانەی سەرەتا دەست دەکەن بەتاوان، نە ئەوانـەی لەتۆڵـە سـتاندنەوەدا زێدەرەوی دەکەن!

﴿وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُوْلَئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ﴾ بێگومان کەسێ دەستدرێژی بکرێتە سەرو ستەمی لێ بکرێو تۆڵە بکاتەوە هیچ تاوانێکی لەسەر نیەو گوناهی ناگاتێ، چونکە تۆڵە ستاندنەوەی بەحەق شتێکی مەشروعە، لەجێنایاتی بەئەنقەستدا بەقیصاصو لەجینایەتی هەڵەدا بەضەمانو بژاردنو باربەها.

﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ نەوەکوو تاوانو سزا هەیە ئیللا: کە هەیە لەسەر ئەوانەیە ستەم لەخەڵك دەکەن، دەستدرێژی دەکەنە سەر ماڵو گیانو نامووس، مافی خەڵك پێشێل دەکەن، بوغرا دەبنو لوتبەرزی دەنوێنن، ستەمکاری دەکەنە پیشەو خەڵکی دەچەوسێننەوە.

﴿أُوْلَئِكَ لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانە سزای توندیان بۆ ئامادەیە، تۆڵەی ستەمکاریو تاوانکارییان لێ دەسێندرێ.

﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ واتە: وێڕای ئەوەی: کە تۆڵە ستاندنەوەی عادلانە ڕەوایەو کەسێ پەیڕەوی بکا تاوانبار نابێ. بەڵام کەسێك خۆبگرێ لەسەر ئەزیەتی ستەمکارانو لە هەڵەی تاوانباران خۆش ببێ، بێگومان ئەو صەبرو خۆڕاگرییە کاری پەسەندو ڕەوشتی بەرزو پیرۆزە پاداشی باشی لەسەر وەردەگرێتەوە.

## حاڵو وەزعی کافرەکان لەبەردەم دۆزەخدا

﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن

طَرْفٍ خَفِيٍّ وَقَالَ الَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ الْخَـٰسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَـٰمَةِ أَلَآ إِنَّ الظَّـٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ﴾

لەوەپێش باسی ئەوەی کرد: کە ئەوانەی ستەم لەخەڵك دەکەن‌و ئاشوب‌و ئاژاوە لەسەر زەوی بەرپا دەکەن عەزابی بەئێش دەیانگرێتە خۆی، ئەمجار لێرەدا حاڵ‌و وەزعی کافرەکان لەبەردەم دۆزەخدا دیاری دەکا. ئەوکاتەی ئەوان چاویان بەئاگر دەکەوێ ئاواتەخوازی ئەوەن بگەڕێنەوە بۆ ژیانی دونیا بۆ ئەوەی تۆبە بکەن‌و کاری چاك ئەنجام بدەن‌و کە مردن‌و زیندو بوونەوە لەئاگر رزگاریان بێ.

بەڵێ ئەوکاتەی چاویان بەدۆزەخ دەکەوێ دۆش دادەمێنن لەئاستیدا زەلیل‌و ترساوو حەبەساو رادەوەستن، دەزانن کە حسابیان بیتی یە، بۆ هەتا هەتایە لەدۆزەخدا دەمێننەوە، کەس نیە بتوانێ یارمەتیان بدا.

دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن وَلِيٍّ مِّن بَعْدِهِ﴾ کەسێك خودا ریسوای بکا بەهۆی ئەوەوە کە گومڕای کردووە، چونکە هەرکەسێ ئامادەباشی بۆ ئیمان‌و کاری چاك تێدا نەبوو، ئەوە ئەو کەسە سەری لێ شێواوەو کەس نیە بتوانێ سەرپەرشتی بکاو لە چورتم رزگاری بکا، شارەزایی بکا بۆ رێبازی سەربەرزی‌و هیدایەت. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُّرْشِدًا – الکهف/١٧﴾ ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کە هیچ شتێك نیە لەبونەوەردا بێتە جێ بەبێ ئیرادەی خودا، هەموو شتێك بەویست‌و مەشیئەتی پەروەردگار پەیدا دەبێ. ئەمە نیشانەی خودایەتی خودایە.

ئـەمجار حـاڵو وەزعـی کافرەکـان روون دەکاتـەوە کەلـە قیامەتـدا دەکەونـە چ تەنگانەو چورتمێکەوە، دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الظَّالِمِينَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَى مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ﴾ تـۆ دەبینـی ئـەی محمـد! ئـەو کاتـەی موشـریکەکان ئـاگری دۆزەخ دەبیـنن، لێیـان عەیانـە: کـە ئـەوە شـوێنو جێگایانـەو بـۆ ئـەوان ئامـادە کـراوە، پەشیمانی حاسڵ دەکەن، ئاواتەخوازی ئەوەن بەهەر شـێوەیەك بـێ بگەڕێندرێنـەوە بۆ ژیانی دونیا، بەئاشکرا دەڵێن: ئەرێ هـیچ رێگایـەك هەیـە ئێمـە بگەڕێینـەوە بـۆ ژیانی جیهان؟ کەس هەیە یارمەتییەکمان بدا، قسەیەکی خێرمان بۆ بکا؟! هەڵبەتە وەڵامی پرسیاریان ئەگەر بشدرێتەوە هـەر نائومێـد کردنـەو ریـسواکردنە، چونکە لەفەرزی مەحاڵدا ئەگەر بیـشیان هێننـەوە ژیـانی دنیـا دەسـت دەکەنـەوە بـەکوفرو بێدینی. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ -الأنعام/٢٧ – ٢٨﴾ ئەوانـە بەسروشـت کـافرو بـێ بـاوەڕن، ئەگـەر بەچاوی خۆیـان رۆژی قیامـەت ببیـنن، ئـاگری دۆزەخو دیمەنە سامناکەکانی ببینن ئـەوجار بیانگێڕنـەوە بـۆ دونیـا ئـیتر دەسـت دەکەنـەوە بەکردەوەی ناپەسەنـدو دەچنەوە سەر بیروباوەڕی پوچیان!!

﴿وَتَرَاهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَاشِعِينَ مِنَ الذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ﴾ تـۆ دەبینـی ئـەی پێغەمبـەر! ئـەو کـافرە سـەرڕەقانەی دونیـا، رۆژی قیامـەت بەسـەر ئـاگردا رادەنوێنرێن، ئاگریان نیشان دەدرێ، ترسیان لێ دەنیشێ بەدزییـەوە بەتیلـەی چاو سەیری دۆزەخ دەکەن، لەترسانو لەهەیبـەتو سامی دیمەنەکـە نـاوێرن پـڕ بەچـاو سەیرکەن.

بەپێچەوانەوە خاوەن بـاوەڕان لەوکاتـەدا سـەربەرزو دڵخۆشـن، تـانووت لـەبێ باوەڕان دەدەن، سەرگەرمی قسەو گفتوگۆن، دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ موسوڵمانان کە کافرەکان بەو حاڵە دەبینن دەبێژن: بێگومان خەسارەتمەندی تەواو بەفەتار چوو ئەوانەن: کە خۆیانو ماڵو منداڵیان فەوتاندووە، خۆیانو شوێنکەوتووانیان وا لێ کردووە شیاوی دۆزەخ بن، ئەم مانایە کاتێك وێ چووە کە ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ پەیوەست بێ بە(قال...)وە بەڵام ئەگەر پەیوەست بێ بە (خَسِرُوا) وە ئەوکاتە گفتوگۆ کردنی موسوڵمانەکان دەبێ لەدونیادا بووبێ بەڵام مانای یەکەمی وێچوو ترە.

خەسارەتمەندی خۆیان ئاشکرایە، ئەوەتا بوونە دۆزەخێ بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوەو هیوای رزگار بوونیان نیە، خەسارەتمەندی ماڵو خێزانیشیان ئەوەیە: کە ئەوانیش لەگەڵیاندان لەدۆزەخدا هیچ سودێکیان لێ نابینن، خۆ ئەگەر خێزانو منداڵیان بەهەشتی بن دووبارە چ سودێك بەوان ناگەیەنن: کەوابێ لەهەموو حاڵێکدا هاوەڵو خێزانو منداڵی خۆیان لەدەست داوە.

﴿أَلَا إِنَّ الظَّالِمِينَ فِي عَذَابٍ مُّقِيمٍ﴾ هۆشیار ببنەوە، باش بزانن: کە ستەمکاران لەعەزابی بەردەوامدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە. ئەم ڕستەیە دەگونجێ کەلامی تەواوکەری قسەکەی موسوڵمانان بێ. دەشگونجێ کەلامی خودا بێو پشتگیری قسەی ئیماندارەکان بکا.

﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَاءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ ئەو کافرە ماڵ وێرانو بەدبەختانە جگە لەخودا یارمەتیدەرێکیان نیە فریایان بکەوێ لەعەزابی خودا رزگاریان بکا!

﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن سَبِيلٍ﴾ کەسێك رێگای هیدایەتی لێ ببرێ ئیمان نەهێنێ، بەسروشت کافرو بێ بڕوابێ ئیتر رێگای سەرفرازی نادۆزێتەوە، کارێك ناکا بەرەو بەهەشت بچێ، شیاوی عەزابی سەخت دەبێ بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێران کردووە.

## بەپیرەوە هاتنی بانگەوازی خودا

﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۚ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾

لەوەپێش وادەی بە موسوڵمانان داو هەڕەشەی لەکافرەکان کرد، وەزعو حاڵی ستەمکارانی رونکردەوە، ئەمجار لەژێر تارمایی ئەو دیمەنە سامناکەدا کە چاوەڕوانی ستەمکارانە خیتابی ئاراستە کردن بۆ ئەوەی واز لەکوفرو سەرڕەقی خۆیان بێنن، بەپیر بانگەوازی پەروەردگارەوە بێن پێش ئەوەی بە ناگەهانی ئەو ئاکامە ترسناکە یەخەیان بگرێو کەلێنی رزگاریان بوونیان نەبێ، بە پێغەمبەریش

رادەگەیەنێ،، کە هەر راگەیاندنی پەیامی لەئەستۆیە. ئەگەر ئەوان هەرنەهاتنە سەر ڕێو پەیامەکەتیان قبووڵ نەبوو ئیتر وازیان لێ بێنەو تۆ بەرپرسیار نیت لەئیمان هێنان. دەفەرموێ: ﴿اسْتَجِيبُوا لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّـهِ﴾ وەڵامی بانگەوازی خودای خۆتان بدەنەوە ئیمان بهێنن، بڕوا بەتاكو تەنهایی خوداو بە راستی پێغەمبەرو رابوونی قیامەت بكەن، شوێن پەیامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بكەون، پێش ئەوەی لەناكاو ڕۆژی قیامەت پەیدابێو كەس نەیگێڕێتەوە، تەنانەت خوداش نایگێڕێتەوە چونكە خۆی بڕیاری هاتنی دەداو خۆی هەڵیدەسێنێ.

﴿مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ﴾ نیە بۆ ئێوە هیچ دەرەتانو پەنایەك هانای بۆ بەرن، كەسنیە بتوانێ نارەزایی دەرببڕێ، دەربارەی عەزابدانتان، ناتوانن ئینكاری هیچ تاوانێك بكەن كە ئەنجامتان داوە. هەرچی كردوتانە لای خودا نمایانەو لەنامەی عەمەلدا تۆمارەو فریشتە شایەتە بەسەرتانەوە، جەستەی خۆشتان شایەتیتان لێ دەدا!

﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ﴾ ئەگەر موشریكەكان هەر سووربوون لەسەر كوفرو بێدینی خۆیان، بەپیر بانگەوازییەكەتەوە نەهاتن گوێیان بەپەیامەكەت نەدا، ئەوە خۆت دڵگیر مەكە، خۆیان بەرپرسیارن، ئێمە تۆمان ناردووە پەیامی خودایان پێ رابگەیەنێ، نەك چاودێرو ژمێریاری كارو كردەوەیان بی. حیسابو لێكۆڵینەوەیان لەگەڵ بكەی، ئەوە ئەركی سەرشانی تۆ نیە، تۆ لێی بەرپرس نیت. وەكوو لە نایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـٰكِنَّ اللَّـهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ – البقرة/٢٧٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ – الرعد/٤٠﴾ یان دەفەرموێ: ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ – الغاشیە/٢٢﴾ ئەم نایەتانە هەموویان بۆ تەسەللاو دڵدانەوەی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) هەروەها بۆ هەموو بانگخوازانی

ئیسلامە؛ کە ئەوانیش چاو لە پێشەوایان بکەن، بانگەوازی خۆیان بکەن گوێ بەوە نەدەن خەڵك بەگوێیان دەکەن یان نا، هیدایەتو کاریگەری بانگەوازی کردنەکەیان بەدەست خودایە!

ئەمجار پەردە لەسەر سروشتی ئەو ئادەمیزادە سەرڕەقە سەرپێچیکارە لادەداو حەقیقەتی روون دەکاتەوە: ئەو ئادەمیزادەی بەدەستی خۆی خۆی دەخاتە ناو تەنگژەو عەزابو سەر ئێشەوە، خۆشی بۆ راناگیرێ!!

بەنازو نیعمەت لەخۆبایی دەبێ، بە بەڵاو ناخۆشی دەکەوێتە هاوارو بەرامبەر بەخودا سنووربەزێنی دەکا.

دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّا إِذَا أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ الْإِنسَانَ كَفُورٌ﴾ واتە: ئێمە ئەگەر لە لوطفو ئیحسانی خۆمانەوە نازو نیعمەت بە ئادەمیزاد دەبەخشین ساماندارو لەش ساغو بێ ترس بێ، لەناو نازو نیعمەتی ئێمەدا بە تەندروستیوئارامی ژیان بەسەر بەرێ کەیف خۆشو تەردەماغە، شا بەسەپانی خۆی نازانێو لەخۆی بایی دەبێ، خۆ ئەگەر بەهۆی کردەوەی ناپەسەندی خۆی تووشی چورتمێکی بکەین، هەژاریو گرانیو نەخۆشیو ترسی تووش دەبێ، ئیتر دەست دەکا بەناشوکریو کردنو نازو نیعمەتی لەوەپێشی لەبیر دەچێتەوە کوفرانی نیعمەتەکانی خودا دەکا! ئەوە سروشتی ئادەمیزاد، بێ چڵێدانەو سپڵەو پێ نەزانە، لەخۆشیدا لە خۆی بایی دەبێ، بەناخۆشی هیوا بڕاو دەبێو کوفرو ناشوکوری دەکا.

ئەم دیاردەیە بەزۆری لەنافرەتانەوە دیاری دەدا، ئەوان بێ چڵێدانە ترو تەنگەتیزە ترن، فەرموودەیەکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەیە، موسلیمو ئیبنو ماجە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ریوایەتیان کردووە، فەرموویەتی: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ وَأَكْثِرْنَ الإِسْتِغْفَارَ فَإِنِّي رَأَيْتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ جَزْلَةٌ وَمَا لَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ. قَالَ « تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ

وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ – الزوج – لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطٌّ». ئەی پێری ئافرەتان: چاکە کاربن، دەستو دڵ فراوان بن، ئەمن لەشەوی ئیسرادا کە دۆزەخم بینی زۆرترینی دۆزەخیەکان ئافرەت بوون، ئافرەتێك وتی: ئەوە بۆچی وایە ئەی پێغەمبەری خودا! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چونکە نێوەی ئافرەت زۆر بە بەش و باری خۆتان نارازین، بەرامبەر مێردەکانتان سپڵەن، ئەگەر مێرد بەدرێژی تەمەنی خزمەتی ژنەکەی بکاو بۆی باش بێ، رۆژێك لەرۆژان وەکوو پێویست نەهاتە پێشەوە، یەکسەر پێی دەڵێ: من لەژیانما چاکەیەکم لە تۆ نەدیوە!!

موسوڵمانی صالح و راستاڵ ئەوەیە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکدا: کە موسلیم و ئەحمەد لە صوهەیبەوە ریوایەتیان کردووە: چونکە موسوڵمان هەموو کارێکی مایەی خێرو پاداشە بۆی، ئەگەر تووشی بەڵاو ناخۆشی بوو خۆگرو پشوو درێژە، ئەمەش دەبێتە خێر بۆی، ئەم بەهرەیە هەر بۆ موسوڵمانە، ئەگەر تووشی خۆشی بوو سوپاسگوزارەو دەبێتە خێر بۆی، ئەم بەهرەیە هەر بۆ موسوڵمانە! ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزاد دەترسێنێ لەوە: کە بەدونیا لەخۆی بایی ببێ، چونکە هەموو شتێك لەبوونەوەردا هی خودایە، بوون و نەبوونی بەدەست پەروەردگارە، دەفەرموێ: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ پەروەردگار بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، خاوەن و هەڵسوڕێنەریانە، چۆنی بوێ ئاوا رەدامیان دێنێ، ئەوەی بیەوێ ببێ دەبێ، ئەوەی حەز بکا نەبێ هەرگیز نابێ، هەرچی ببەخشێ کەس نیە مەنعی بکا، هەرچی بگرێتەوە کەس نیە بتوانێ بیدا.

دەفەرموێ: ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاء يَهَبُ لِمَنْ يَشَاء إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاء الذُّكُورَ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَن يَشَاء عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ پەروەردگار هەرچی بیەوێ بیهێنێتەدی لەماڵ و منداڵ دروستی دەکاو دەیهێنێتە کایەوە، لەروانگەی ئەم

دەسەڵاتە ڕەهایەوە بەویستی خوای بۆ هەندێ کەس تەنها کچ دەبەخشێ، بۆ هەندێ کەسیش تەنها کوڕ دەبەخشێ، بۆ هەندێکیش کوڕو کچ دەدا، هی وایش هەیە وەجاخکوێرەو منداڵی ناداتێ، بەگوێرەی حیکمەتو دانایی خوای ئەم تەقسیمو دابەشکردنە ئەنجام دەدا، هەرکەسەو بەشی خوای دەداتێ، ئەوەی پێی دەبەخشێ شیاوی خۆیەتیو لە بەرژەوەندییەتی لەحیکمەتو دانایی خوداوە سەرچاوەی گرتووە، ئایەتەکە گشتییەو هەموو کەس دەگرێتەوە، بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزاد بۆ هەموو کاتو شوێنێکەو مەبەست ئەوەیە هەموو شتێك بەقودرەتی خودا دێتە جێو چۆنی بوێ ئاوا پەیدایە.

## جۆرەکانی وەحییو نیگای خودا بۆ پێغەمبەرانی

﴿ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾ ﴾

دوای بەیانکردنی دەسەڵاتو حیکمەتو زانیاری خوداو ڕانواندنی دیاردەی خودایەتی، ئەمجار لە کۆتایی سورەتەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕونکردنەوەی ئەو حەقیقەتەی: کە سورەتەکە لە تەومریدا دەسوڕێتەوە، حەقیقەتی نیگاو پێغەمبەرێتی شی دەکاتەوە، شێوەی ئەو پەیوەندییە ڕووندەکاتەوە: کە لەنێوان خوداو بەندە هەڵبژاردەکانیدا ڕووی داوەو ڕوودەدا، بەتایبەتی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: کە نیگاو سروش لە خوداوە بە چەند شێوەیەك بۆ پێغەمبەری ئیسلام هاتووە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاء إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ بۆ هیچ ئادەمیزادێك دەستەبەر نابێ: کە قسە لەگەڵ پەروەردگار بکا، مەگەر لەڕێگەی نیگاوە یان بە بیستنی پەیام لەدوا پەردەوە، یان بەهۆی فریشتەوە، پەیوەندی نێوان خوداو بەندە هەڵبژاردەکانی بەم سێ جۆرە دەبێو بەس!

بوخاری لە صەحیحەکەیدا لەخاتو عائیشەوە ریوایەت دەکا، دەفەرموێ: حاریثی کوڕی هیشام پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بەچ شێوەیەك نیگات بۆ دێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جاری واهەیە نیگام بۆ دێ بەشێوەی زڕەی جەرەس، ئەمەم زۆر لەسەر گران بوو، جاری وایش دەبێ فریشتە لەشێوەی پیاوێکدا دێتە لامو قسەم لەگەڵ دەکاو تێی دەگەم، خاتوو عائیشە دەفەرموێ: بەچاوی خۆم دیتم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نیگای بۆ هات ڕۆژەکە زۆر سارد بوو، ناوچەوانی ئارەقی لێ دەچۆڕایەوە. ئەمجار پەروەردگار لێکچوونی نیگاو سروش بۆ پێغەمبەران دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾ ئەی محمد! وەکوو چۆن نیگامان بۆ پێغەمبەرانی پێشوو کردووە، بەو جۆرەش قورئانمان بۆتۆ ناردووە، قورئان ئەمری خودایە، لە خوداوەیەو گیانە بۆ ئادەمیزاد، چونکە هۆی هیدایەتە، کوفر دەمرێنێو گیان دەخاتە دڵانەوە، نازڵبوونی قورئان

یەکالآ کەرەوە بوو لەنێوان حەق و بەتاڵدا. بەختەوەرانی وەئاگا هێناو لەخەوی غەفڵەت راستی کردنەوە، زیاری پێشکەوتووی بۆ دروست کردن!

﴿مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر پێش ئەوەی نیگات بۆ بنێرین نەتدەزانی قورئان چیەو ئیمان چیە (واتە: نەتدەزانی قانونو نیظامی ئیسلامی چیەو چی نیە، چونکە هەموو پێغەمبەران پێش (وحی)یش ئیمانیان هەیە. وەلێ ئێمە نیگامان بۆ کردوی و ئەم قورئانەی: کە بە نیگا بۆمان ناردووی نوورو روناکییە، کەسێ بمانەوێ بەختەوەری بکەین بەم قورئانە هیدایەتی دەدەین لە نەفامیو نەزانیو گومڕایی رزگاری دەکەین، دەیخەینە سەر رێبازی هیدایەتو زانیاری، دڵی مردووی زیندوو دەکەینەوە ویژدانی نووستوی وەئاگا دێنن، ئاکاری مرۆڤانەی تێدا دەخولقێنین! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ – یونس/٥٧﴾.

ئایەتەکەی ئێرە دەق ئەوە دەگەیەنێ: کە هیچ ئادەمیزادێ بۆی نیە: کە راستەوخۆ قسە لەگەڵ خودا بکا، تەنانەت لەخاتو عائیشەوە ریوایەتێ کراوە: فەرموویەتی: هەرکەسێ پێی وابێ: کە موحەممەد بەچاوی سەری خودای بینیوە، ئەوە بێگومان بوختانێکی گەورەی لەسەر خودا هەڵبەستووە. تەنانەت حەزرەتی مووسا: کە داوای دیتنی خودای کرد بە (لن ترانی) وەڵامی دایەوە.

﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ، صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ بێگومان تۆ ئەی محمد! بەم قورئانە: کە بەرنامەی ئیسلامە هیدایەتی ئادەمیزاد دەدەی بۆ رێبازی خودا پەسەندو حەق و راستی، ئادەمیزاد فێری مەنهەج و پەیڕەوو پرۆگرامێك دەکەی خودا نازڵی کردووە، خودا فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی رێبازی ئیسلام رێبازی هەڵبژێراو لەلایەن خودایەك: کە خاوەنی

ئاسمانەکانو زەوییە، بەدیهێناون چاودێرو هەڵسوڕێنەریانە، خۆی لە بونەوەردا فەرمانڕەوای موطلەقەو کەس نیە بتوانێ بڕیاری ئەو هەڵبوەشێنێتەوە!

﴿أَلَا إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الأُمُورُ﴾ ئەی خەڵکینە ئاگادار ببنەوە هەموو کاروبارێك، سەرەنجامی هەموو هەڵوێستو کردەوەیەك بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، ڕۆژی قیامەت بە عەدالەت حیسابو لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدا، بە حەقو ڕاستی کێشەکان یەکالا دەکاتەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الزخرف)

ئەم سورتە ناوی سورەتی زوخرفە چونکە وەصفی بڕێ دیاردەی ژیانی دونیای تێدایە، باسی زێڕو خانووبەرەو ناو ماڵو دیاردەی ڕازانەوەو جوانی ژیانی جیهانی براوە دەکا، لەگەڵ ژیانی قیامەتدا بەرامبەری دەکاو پێکیان دەگرێ وەکوو لە ئایەتی (٣٤ - ٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَابًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِؤُونَ، وَزُخْرُفًا وَإِن كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ﴾.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی (الشوری) لەدوو لاوەیە:**

١- سەرەتای ئەم سورەتە دەشوبهێتە سەرەتاو کۆتایی سورەتی پێشوو: کە لە هەرسێك شوێندا باسی قورئانی پیرۆزو سەرچاوەی نیگاو سروش هەیە.

٢- لەهەردوو سورەتەکەدا لێکچونێکی تەواو هەیە لەبارەی ئاڕاستەکردنی بەڵگەی جۆراوجۆر لەسەر هەبوونی خواو تاكو تەنهایی زاتی پاکیو باسی قیامەتو ڕووداوەکانی، هەروەها ئەو چورتەو ناخۆشییەی توشی کافرەکان دەبێ. ئەمجار بەراورد کردنیان بە حاڵو وەزعی موسوڵمانان. ناوەرۆکی سورەتەکە وەکوو هەموو سورەتە مەککیەکانی تر لەتەوەری چاندنو چەسپاندنی بنەمای بیروباوەڕی

ئیسلامیدا دەخولێتەوە: کە بریتیە لەئیمان بەخوداو بە پێغەمبەرایەتیو بەزیندوبوونەوەی رۆژی قیامەت.

سەرەتا ئەوە رون دەکاتەوە: کە سەرچاوەی قورئان نیگاو سروشتی خودایيەو بەزمانی عەرەبی نازڵ بووە، خودا کردویەتی بە موعجیزەی حەزرەتی موحەممەدو تا رۆژی قیامەت ئەم موعجیزە بەردەوامەو کاریگەری خۆی هەیە، هەڕەشەو ئینزارە بۆ قورەیشییەکانو هەموو ئەوانەی بڕوا بە تاکو تەنهایی خودا ناکەنو حەزرەتی موحەممەد بە پێغەمبەر نازاننو بڕوایان بە زیندوو بوونەوە نیە. بەدونیاوە هەڵەوگیر بوونو قیامەتیان بە خەیاڵدا نیە.

ئەمجار بەڵگەی گورچکبڕو بەهێز دێنێتەوە لەسەر هەبوونی خوداو تاکو تەنهایی زاتی پاکی، دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی دەکاتە بەڵگە لەسەر تاکو تەنهایی خوداو دەسەڵاتی رەهای، هەروا دروستکردنی زەویو رامکردنی بەشێوەیەك: کە گونجاوێ بۆ تێدا ژیان، ئاوو هەوای گونجاوی، حەجمو جوڵەی لەباری، هەبوونی ساراو شیوو دۆڵو کێوی بەرزو سەرکەشی تێدا، دروستکردنی نێرو مێ لەهەموو صنفو جۆرێك، ئەم نیشانانەو جۆرەها نیشانەی تر کە لەهەژمار نایەنو هەموویان بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودایەکی تاکو تەنهاو خاوەن دەسەڵاتی رەهاو زانیاری بەرفراوان.

عەرەبەکان بڕوایان بە هەبوونی خودا هەبوو، پێیان وابوو، کە خودا بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، وەلێ ئەم باوەڕەیان تێکەڵاو بە بتپەرستیو ئەستێرە پەرستیو فریشتە پەرستی کردبوو، تەنانەت پێیان وابوو فریشتەکان کچی خودان، ئەم بیروباوەڕە فاسیدانە یان لاسایی کردنەوەی کوێرانەی باوكو باپیرانیان بوو، قورئان هەڵەی بۆ راستکردنەوە، هەڕەشەی جۆراو جۆری لێ کردنو ترساندنی لە عەزابی بەشیدەت.. ئەگەر چیرۆکی هەندێ لە پێغەمبەرانی گێڕانەوە بۆئەوەی پەندو ئامۆژگارییان لێ وەرگیرێ، بەشوێن سەرگورشتەی ئیبراهیمدا شوبهەو گومانی موشریکەکانی مەککەی رەتکردەوە، بڕوبیانووی

پوچاندنەوە، موشریکەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد: کە دەبێ نیگاو سروش بۆ کەسێك بێ خاوەن پلەو پایەو ماڵو سامان بێ. دەیانگوت دەبێ نیگا بۆ یەکێك لە گەورە پیاوی مەککەو طائیف بێ. خودا رەددی دانەوە فەرمووی: تەرازووی هەڵبژاردن بۆ پێغەمبەرێتی رەوشتی بەرزو بەهرەو ئەدەبە، ماڵو سامانو بەها مادییەکان نیە. ناردنی قورئان رێزو شەرەفە بۆ پێغەمبەرو نەتەوەکەی.

ئەمجار کۆتایی سورەتەکە دێنێ بە نمایشکردنی نازو نیعمەتی بەهەشتێك کە خودا ئامادەی کردووە بۆ خاوەن باوەڕان ئەمجار هەندێ روداوی قیامەت رادەنوێنێ کە حاڵو وەزعی کافرەکانی تێدا رونکردۆتەوە.

ئەوەش رادەگەیەنێ: کە ئەو موشریکانە ئیمان ناهێننو پێویست ناکا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کۆڵیان پێوە هەڵگرێو بە ئیمان نەهێنانیان دڵگیر بێ.

## قورئان کەلامی خودایەو بەزمانی عەربی نازڵ بووە

﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا أَن كُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّسۡرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمۡ أَرۡسَلۡنَا مِن نَّبِيّٖ فِي ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ

يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ ﴾

﴿حم﴾ مانای ئەم جۆرە پیتە پچڕ پچڕانە لەوەپێش چەند جارێك قسەمان لێ کردووە. باسکردنی دووبارە کردنەوەی پێشووە.

﴿وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ سوێندم بە قورئان: کە کەلامێکی بێ پێچو پەناو مانا روون و ئاشکرایە، وشەی شیرین و رستەی رەوانن، رێگای هیدایەت روون دەکاتەوە دەرمانی دەردی دڵە نەخۆشەکانە، کەتەلۆکی بوونەوەرەو بەرنامەی ژیانی بەختەوەری و سەرفرازییە، هەرچی پێویست بێ بۆ دونیاو قیامەت تێیدا نمایش کراوە. هەرکەسێ شوێنی بکەوێ بە مراز گەیشتووە.

﴿إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئێمە ئەم قورئانەمان نازڵ کردووە بە زمانی عەرەبی، کە زمانێکی فەصیح و گونجاوە بۆ قسە پێکردن، زمانێکە قاعیدەو یاسای رەسای خۆی هەیە، هەموو وشەیەکی کێش و یاسای خۆی هەیە، بۆئەوەی سەرەتا عەرەبەکان لێی حاڵی بن و وەری بگرن، ئەمجار بەهەر چوار لای جیهاندا بڵاوبێتەوە بۆیە بەزمانی عەرەبی ناردومانە بۆئەوەی عەرەب تێی بگەن.

ئایەتەکە وەڵامی سوێندی ﴿وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ە ئەم جۆرە سوێند خواردنەش لەزمانی عەرەبیدا بە سوێندی بەدیع و ڕازاوەو جوان حسێب دەکرێ کە سوێند پێ خوراوو سوێند لەسەر خوراو یەك بابەت بن.

﴿وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ ئەم قورئانە بۆ ئێوە نێردراوە لە لەوحولمەحفوظدا لای خۆمان ڕێزو نرخی خۆی هەیە، بەلاغەت و رەوانی خۆی هەیە، بە پاك و خاوێنی نەبێ نابێ دەستی بکرێتێ رێك و پێك و موحکەم و دامەزراوە بەهیچ شتێك هەڵناوەشێتەوە، قورئانی پیرۆز هۆکاری هیدایەتە، دەیسا

پێویستە ئێوەش چی زووە بیکەنە مەنهەجی ژیانی خۆتان و پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی بن.

﴿أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ الذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ؟﴾ ئایا پێتان وایە ئێمە هێندە بێ ڕەحم و بێ بەزەییبین وازتان لێ بێنین و ئێوە ئاگادار ناکەینەوە؟ ئایا پێتان وایە هەر لەبەرئەوەی گەل و نەتەوەیەکی سەر ڕەق و ڕۆچوون لە خراپەکاریدا ئێمە قورئانتان بۆ نانێرین و هەڕەشەتان لێ ناکەین؟ نانا وامەزانن ئێمە لە روانگەی ڕەحمەت و فەضل و چاکەکاری خۆمانەوە فەرامۆشتان ناکەین و بانگەوازیتان ئاراستە دەکەین، هەڵتان دەنێین بۆ ئیمانهێنان و خودا پەرستی، قورئانتان بۆ نازڵ دەکەین و بەڵگەو نیشانەتان لەسەر ڕاست دەکەینەوە.

ناردنی پێغەمبەران و بانگەوازیکردنی ئادەمیزاد بۆ ئیمانهێنان و شوێنکەوتنی پەیامی حەق، داب و نەریتێکی کۆنی ئێمەیە.

﴿وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي الْأَوَّلِينَ﴾ چەند پێغەمبەرو فرستادەمان لە گەل و نەتەوەکانی ڕابوردو ناردون و بەدرۆ خرانەوە. بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك پێغەمبەرمان بەزمانی خۆیان ناردووە، بانگەوازییان کردون و گەلەکان پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستونەتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ کەوابێ بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەران داب و نەریتێکی کۆنینەی گەل و نەتەوەکانی ڕابردووە، هەموو پێغەمبەرێك وەکوو تۆ ئەی محمد! بەدرۆ خراوەتەوە، وەکوو تۆ بەدەست گەل و نەتەوەکەیەوە ئەزیەت و ناڕەحەتی چەشتووە.

﴿فَأَهْلَكْنَا أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ الْأَوَّلِينَ﴾ گەل و نەتەوەی وامان تێکشکاندووە زۆر لە قوڕەیشییەکان بەهێزو تواناتر بوون، لەوەپێش لە قورئاندا زۆر سەرگورشتەو بەسەر بردەی گەل و نەتەوە پێشینەکانمان بۆ گێڕاوێتەوە. دەزانی داب و نەریتی ئێمە لەگەڵ سەرپێچیکاراندا چۆنەو چۆن بووە! کەوابێ

گەلەکەت بترسێنە لەوەی وەکوو گەل و نەتەوە رابوردووەکانیان لێ نەیە، ئەوەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئەمانیش نەیە. چونکە عادەتی خودا گۆڕانی بەسەردا نایە. چی بڕیارداوەو تەقدیری کردووە، هەر ئەوە دێتە کایە.

## دروستکردەی پەروەردگارو هەندێ نیعمەتەکانی

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾ وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾

بیروباوەڕی بتپەرستەکان جێگای سەرسوڕمانە، ئەوانە دانیان دەنا بە هەبوونی خودادا، بەوەش: کە بەدیهێنـەری ئاسمانـەکانو زەوی هـەر خودایـە، کەچـی ئاکامی ئـەم دان پیانانـەی خۆیـان نەدەسـەلماند، بڕوایـان بـە تـاکو تـەنهایی خـودا نـەبوو، هاوەڵیان بۆ دادەنا، پێچەوانەی سروشتو واقیع دەجوڵانەوە.

عەرەبـەکان پاشمـاوەی ئـایینی حەنیفیـەی کۆنیـان بـۆ مـابووەوە، هەنـدێ بیروباوەڕی تێکەڵو پێکەڵ بە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمیان پـەیڕەو دەکـرد، بـەڵام هێندە بەشێواوی‌و گۆڕدراوی بەکاریان دەهێناو ئەوەنـدە چیرۆکە کۆنو ئەفسانەی تێکەڵاو بـوو بـوو، بـەحاڵ بـۆنی ئـایینی ئاسمـانی لێ دەهـات، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـا هەندێ لایەنی ئیجابی تێدا مابوونەوە: کە لەگەڵ فیطرەتدا یەك دەکەوتنەوە. هەر لـەم روانگەیـەوە پێیـان وابـوو: کـە بەدیهێنـەری ئاسمانـەکانو زەوی خـودای تـاكو تەنهایە، دەیانزانی کە ئەم بوونەوەرە بەدیهێنەرێك هێناویەتە وجود، ئەویش ناوی (الله)یە، کەچی لە واقیعدا پابەنـدی ئـەو داخوازییـە سروشـتییەی بیروباوەڕەکـەیان نەبوون، یەکتاپەرست نەبوون، لەجیاتی خودا بتیان دەپەرست، بڕوایـان وابـوو ئـەو بتانە لای خودا شەفاعەتیان بۆ دەکـەن، بەتـەواوی سـەریان لێ شـێوابوو، لـە ئـایینی سروشی لایان دابوو.

دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویـست ئەگـەر پرسـیار لـەو موشـریکە سـەر رەقانـە بکەی بلێی: کێ ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناون؟یەکسەر دان بەوەدا دەنێن: کە خودا دروستی کردوون، بی مینجە مینـجو وەستان دەڵێن: بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی خودای خاوەن تواناو زانایە، خودایەك بـەدی هێنـاون: کـە کـەمالی قـودرەتی هەیـە، زانیاری بێ سنوری هەیە. جا کـە شـتێك کـەمالی قـودرەتو کـەمالی زانیـاری هـەبێ، بێگومان دەتوانێ هەموو شتێك دروست بکا.

﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا﴾ ئەو خودایەی زەوی بۆ ئێوە کردووە بەلانەی تیدا ژیان، گونجاوە بۆئەوەی گیانـداران ژیـانی خۆیـانی تێـدا بەسـەربەرن. زەوی بـۆ

خۆی هەڵدەسوڕێ، کێوەکانی تێدا چەقیونو لەنگەریان تێدا راگرتووە بۆئەوەی گیانەوەران بتوانن لەسەری بژین.

هەموو ئادەمیزادێك ئەو حەقیقەتە دەزانێ، کە زەوی لانەی ئادەمیزادە، هەموو چینێك بەشێوەیەك لەشێوەکان هەستی پێ دەکا، ئەوانەی یەکەم جار ئەم قورئانەیان بەسەردا خوێنرایەوە ئەم زەوییەیان بینیوە لەژێر قاچیاندا وەکوو فەرش راخراوە، بۆیان خۆشکراوە پێیدا بڕۆن کشتوکاڵی تێدا بکەن، تێیدا بخۆنو بخۆنەوەو بخەون. بەشێوەیەکی گشتی گونجاوو لەبارە بۆ ژیان. ئێمە ئەمڕۆ پاش هەزار چوار صەدو ئەوەندە ساڵە ئەم راستییە بە قوڵترو فراوانتر دەزانین، زانیاریمان دەربارەی زەوی وردترو پترە، پشکنینو توێژینەوەمان دەربارەی سروشتی زەوی پێشکەوتو ترە. هەڵبەتە ئەو ئادەمیزادانەی دوای ئێمە دێنە گۆڕەپانی ژیانەوە، دەربارەی زەوی زانیاری وا بەدەست دێنن کە ئێمە پەیمان پێ نەبردووە، هەتا زانیاری پێش بکەوێ توێژینەوە زیاتربێ مانای ئەم دەقە قورئانییە باشترو قوڵتر دەردەکەوێ، لەگەڵ زانستو زانیاری هەموو چاخو چینەکان گونجاوەو هەرچینە بەگوێرەی زانیاری خۆی لەمانای حاڵی بووە.

ئەمڕۆ ئێمە لەڕوانگەی ئەم حەقیقەتەوە: کەزەوی کراوەتە لانەی ئادەمیزاد ئەوەمان بۆ دەرکەوتووە: کە ئەم گۆی زەوییە بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوەو چەندجار گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە تا وای لێ هاتووە بەکەڵکی ئەوەبێ کە لانەی ئادەمیزاد بێ، لە گڕکانەوە بووەتە پارچە شاخێکی وشكو رەقو ئەمجار دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر کە هەر خودا دەیزانێ بووەتە زەوییەکی گونجاو بۆ کشتوکاڵو تێدا ژیان، لە ئاکامی پەیدابوونیو بەیەکگەیشتنی ئایدرۆجینو ئۆکسجین ئاو پەیدابووە. لەئاکامی سووڕانەوەی بەدەوری خۆیداو بەدەوری خۆردا شەو رۆژ پەیدا بووە، گەرمو ساردی بەجۆرێکە ژیانی تێدا دەستەبەر بووە. نە ئەوەندە ساردە دونیا ببێتە بەستەڵەكو سەهۆڵ بەندان، نە ئەوەندە گەرمە شتەکان گڕیان تێ بەربێ. بەڵێ زەوی لانەی ژیانەو بەڕاستی گونجاوە بۆ ژیان.

﴿وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ پەروەردگار لەناو زەویدا ڕێگاو بانی بەدی هێناوە بۆئەوەی ئێوە سوودیان لێ وەربگرن، پێیاندا تێپەڕبن و بگەنە مەبەستو ئامانجی خۆتان، خۆتان گەشتو گوزار بکەن بازرگانی بکەن، کاڵای خۆتان ئاڵو گۆڕ بکەن. هەروەها گەلێ شتی تریش. ﴿وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە باران لە ئاسمانەوە دەبارێنێ بە ئەندازە، ئەوەندە دەبارێنێ کە لە بەرژەوەندی کشتوکاڵو بۆ ژیان پێویست بێ، ئەوەندە زۆر نابارێنێ زەوی سەر ئاو بکەوێ، ئەوەندەش کەم نابارێنێ بەشی خواردنەوەی گیانلەبەرانو ئاودێری کشتوکاڵو دارو درەخت نەکا. بەو بارانە خاكو وڵاتی مردوو سوتەمەڕۆو وشكو ڕەق هەڵاتوومان زیندوو کردۆتەوە، زەوی وشكو برینگو بێ گیاو گژ، بێ شیناوەردو زەرد هەڵگەڕاو کە ئاوی بارانی لێ باری وە جمو جووڵ کەوتو فشەڵ بوو، لەهەموو جۆرە گژوگیاو درەختێك نێرو مێ پەیدابووە. جا وەکوو چۆن زەویمان بەوشێوە زیندوو کردۆتەوە بەوجۆرە ڕۆژی قیامەت مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، چۆن گژوگیا لەزەوی دەردێنین ئاوا ئێوە لە گۆڕەکانتان دەرتان دێنینو گیانتان بەبەردا دەکەینەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ — الفاطر/٩﴾.

بەڕواڵەت ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا کە باران لە ئاسمانەوە دەبارێ، وەلێ واقیع ئەوەیە تیشکی خۆر لە دەریاکان دەداو هەڵمیان لێ پەیدا دەبێ، هەڵم بەرزدەبێتەوە بۆ بەرزاییو هەور دروست دەبن ئەمجار لە هەورەکەوە باران دەبارێ، واتە: هەڵمەکە دەبێتەوە ئاوو قەترە قەترە دەڕژێتەوە سەر زەوی کەوابوو مەبەست بە ئاسمان بەرزاییە، دەگوترێ: (كل ما سماك أو علاك فهو سماء) هەرچی لەژوورتەوە بێ ئەوە ئاسمانی تۆیە.

بەكورتی خودا ئێوە دوای مـردن زینـدوو دەكاتـەوە، وەكوو چۆن دوای وشـك بوون و رەق هـەڵاتنی زەوی بـەهۆی بارانـەوە ئـەو زەوییـە سوتـەمەڕۆیە سـەرلەنوێ سەوز دەبێتەوەو ژیانی تێدەگەڕێتەوە!

﴿وَالَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا﴾ پـەروەردگار خودایـەكی وەهایـە لەهـەموو جۆرە شتێك نێرو مێی خولقاندووە نێرو مـێ بنـەمای ژیـانن، هـەموو زینـدەوەرێك نێـرو مێی هەیە، تەنانەت هەموو خانەیەك تایبەتمەنـدی نێـرو مێـی تێدایـە، نـەك هـەر ئەوە بەڵكوو گەردیلە پێكهاتووە لە ئەلكترۆن و پرۆتۆن. كە (سالب و موجب)ن.

یەكێكی تر لەنیشانەی خودایەتی پـەروەردگار ئەوەیـە: كـە هۆكـاری سـواری بـۆ رەخساندوون، دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُـونَ﴾ پـەروەردگار خودایەكی وەهایە بۆ ئێـوەی رەخـساندووە هۆكـاری سـواری، لـەدەریادا كەشـتی و لـە هەوادا باڵە فـڕو لـە وشـكانیدا ترۆمبێـل و شـەمەندەفەرو گالیسكەو چـەند شـتێكی تـریش. هـەروەها لـە ئاژەڵیـشدا حوشـتری بـۆ ئێـوە رام كـردووە بۆئـەوەی بیكەنـە ئامێری سواری و بارەبەر.

دەڵێن: وشەی (الأنعام) مەجازە، زیكری كوللە مەبەست جوزئـە. چـونكە لـەناو ئاژەڵدا تەنها حوشـتر بەكـەڵكی سـواری دێ، ئاژەڵـەكانی تـر: كـە رەشـە وڵاغ و بـزن و مـەڕە بەكـەڵكی سـواری نایـەن پـەروەردگار بـە قـودرەت و فـەضل و ئیحسانی خـۆی حوشتری بۆ ئادەمیزاد رام كردووە سواری دەبن شیری دەخۆنەوە، گۆشـتی دەخـورێ، كەڵك لە كوڵكی وەردەگیرێ.

لـە ئایەتەكـەی ئێـرەدا ئامـاژە بـۆ ئـەوە كـراوە كـە هۆكـاری سـواری، حوشـتر و كەشتییە. وەڵێ لە ئایەتێكی تردا ناوی چەند شتی تر دەهێنـێ و ئاماژە بـۆ ئـامێری تازە پەیدابووی سواری دەكا. دەفەرموێ: ﴿وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِـيرَ لِتَرْكَبُوهَـا وَزِينَـةً وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ – النحل/٨﴾. ئەوەتا بەڕسـتەی ﴿وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُـونَ﴾ ئامـاژە بۆ باڵەفڕەو ترومبێل و شەمەندەفەرو هەموو جۆرە ئامێرێكی تازە پەیدابوو دەكا.

﴿لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾ بۆئەوە لەسەر پشتی حوشترو لەسەر ئامێرەکانی تری سواری جێگیر ببن ئەمجار نیعمەتی خوداتان بێتە یادو بەتەعظیمەوە یادی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خودا بکەن! تێبگەن: کە خودا دەریای وا گونجاندووە کە بەکەڵکی گەمی پێدارۆین بێ. عەقڵو زیرەکی بە ئادەمیزاد بەخشیوە بتوانێ ئەو ئامێرانە بەدی بێنێ، جا ئەوکاتە کە ئێوە سواریان بوون بڵێن: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾ پاكو مونەزەهی بۆ ئەو خودایەیە کە ئەمەی بۆ ئێمە رام کردووەو دەتوانین بە ئاسانی کەڵکیان لێ وەربگرین ئەگەر تواناو دەسەڵاتی خودا نەبوایە کەی ئێمە دەمانتوانی ئەو ئامێرانە دروست بکەین یان بەکاریان بێنین.

﴿وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ بێگومان هەمووممان دوای مردنمان بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە، هەرکەسەمان بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشتو سزا وەردەگرێتەوە، ئیمامی موسلیمو ئەبو داودو نەسائیو تیرمیزی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە فەرموودەیەکیان ریوایەت کردووە دەبێژێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەرکاتێ سواری وڵاخەکەی دەبوو سێ جار (الله أكبر)ی دەکردو ئەمجار ئایەتی ﴿سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ی دەخوێندەوە، ئەمجار دەیفەرموو: خودایە! من داوات لێ دەکەم ئەم سەفەرەم مایەی خێرو تەقوا بێ، کردەوەکانم جێگەی رەزامەندی تۆ بێ، خودایە! سەفەرم بۆ ئاسان بکەی، دوورم بۆ نزیك بکەیەوە، خودایە! ئەتۆ هاو دەنگو هاوەڵمی لەسەفەردا چاودێرو پارێزگاری ماڵو منداڵمی، خودایە هاودەنگمان بە لەسەفەردا، پارێزگارمانبە لەماڵەوە ئاگات لە خاوو خێزانمان بێ...

## هەندێ لە موشریکەکان فریشتە دەپەرستن

﴿ وَجَعَلُوا۟ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ۚ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَكَفُورٌ
مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ
﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَـٰنِ مَثَلًا ظَلَّ
وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى
ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ
ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ
شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَا عَبَدْنَـٰهُم ۗ مَّا
لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَـٰهُمْ
كِتَـٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا
وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾
وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ
إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾

﴿قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾﴾

لەوەپێش ئەوەی رونکردەوە: کە موشریکەکان دان بەوەدا دەنێن کە خودا بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، ئەمجار ئەوە بەیان دەکا، کە ئەو موشریکانە هەڵوێستیان پێچەوانەی ئەو ئیعترافو دان پیانانەیە، ئەوەتا ئیدیعای ئەوە دەکەن: کە فریشتە کچی خودان، هەر بەوەندە نەوەستاون: کە منداڵیان پاڵ خودا داوە، بەڵکوو لە دیدگای ئەو بارە کۆمەڵایەتییەی خۆیانەوە کە کچیان لەکوڕ نزمتر دەبینی، کچیان پاڵداوە!! ئیتر لەم کۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار رەدیان دەداتەوە، ئەمجار شوبهەو گومانێکی تری موشریکەکان باس دەکا: کە دەڵێن: عیبادەتکردنی ئێمە بۆ فریشتەکان بەویستی خودایە، لەم رووەوە پەروەردگار رەتیان دەداتەوە بەوە: کە دەعواکەیان بێ بناغەیەو هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە جگە لەلاسایی کردنەوەی سەتحیو کوێرانە بۆ باوكو باپیرانیان. ئەوانە نەفامو درۆزنن، دەق دەشوبهێنە ئەو گەلو نەتەوانەی پێشوویان: کە خودا لەناوی بردنو ئاسەواری بڕینەوە، دەفەرموێ:

﴿وَجَعَلُوا لَهُ مِنْ عِبَادِهِ جُزْءًا إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ﴾ ئەو موشریکە نەفامو سەر رەقانە هەرچەندە دان بەوەدا دەنێن: کە بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی (الله)یە کەچی منداڵیان پاڵداوە، دەڵێن: فریشتە کچی خودان لەم رووەوە: کە منداڵ بەشێکە لەباوکی!

بەڕاستی ئادەمیزاد سپڵەو پێ نەزانە بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا، کافرو بێ ویژدانە، ئینکاری دیاریترین نیعمەتی پەروەردگار دەکا. نەفامو نەزانە بەرامبەر

پلـەو پایـەی خودایـەتی، زاتو صـیفاتی خـودا نازانـن، لـەڕێزی فریـشتەش کەمدەکەنەوە بەوە کە بـە مێینـەیان حـسێب دەکـەن، چونکە لەدیـدگای ئەوانـەوە پلەو نرخی مێینە لەهی نێرینە کەمتر بووە!

بۆیە پـەروەردگار بەتونـدی نارەزامەنـدی خـۆی رادەگەیـەنێو دەفـەرموێ: ﴿أَمِ اتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَاكُم بِالْبَنِينَ﴾ واتـە: کە ئێـوە منـداڵ وەپـاڵ خـودا بـدەن، ئەوەی لێ وەدی دێ: کە لـەنێوان نێـرو مێـدا بەشـە مێینەکـە بـۆ خـۆی هـەڵبگرێو بەشە باشەکە کە رەگەزە نێرینەکەیە بۆ ئێوەبێ! جـا چـۆن ئەمـە دەگونجێو کـەی ڕاسـتو ڕەوایـە خـودا بـۆ خـۆی بەدیهێنـەر بـێو لـەناو دروسـتکراوەکانیدا بەشـە خراپەکـەی بـۆ دابنـرێ! وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەوە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى، تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَى – النجم/ ٢١ – ٢٢﴾. دابەشکردنێکی سـتەمکارانەیە، شـتێك بـۆ خـۆت بـەخراپی بزانـی، بـۆ خـودای بـەڕەوا بزانـی، لـە دیدگـەی عەرەبـەکانی ئـەو رۆژگـارەوە، بـەڵکوو لـە دیـدگای زۆربـەی کۆمـەڵانی ئـادەمیزادی ئـەو رۆژگـارەو پێـشوو تریـشەوە ئـافرەت بـە رەگـەزێکی بـێ نـرخ سەیردەکرا، تەنانەت لەهەندێ کۆمەڵگاو وڵاتدا پێیـان وابـوو ئـافرەت مـرۆڤ نییـەو نابـێ مامەڵـەی ئادەمیزادانـەی لەگەڵـدا بکـرێ. لەهەنـدێ کۆمـەڵگادا ئـافرەت بەڕەگـەزێکی پـیسو زیانـەخرۆ لەقەڵـەم دەدراو مـافی قـسەکردنیان لێ یاسـاغ کردبـوون. موشـریکەکانی عـەرەبیش هـیچ ڕێـزو نرخێکیـان بـۆ ئـافرەت دانـەدەناو پێیـان وابـوو هـەبوونی کـچ لەخێزانـدا مایـەی سـوکایەتیو پەسـتییە بـۆ بنەماڵـە، ڕەوایە زیندە بەچاڵ بکرێ.

﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ئەگـەر مزگێنی بـدرێ بەیـەکێ لـەو موشـریکە عەرەبانـەو پێیـان بگوتایـە: خێزانـت کچی بەوەلەد هێناوە، ئەوەی بـۆ خـودای بـەڕەوا دەزانـی پـاڵ خـودی خـۆی بدرایـە، دەمو چـاوی رەش هەڵدەگـەڕاو جـۆش دادەمـا، خـەمو خەفـەت دایـدەگرتو رونـاکیی

لەدەروونى دەبڕاو ژيانى لەپێش چاو تاڵ دەبوو لەداخى ئەوە كە كچى بووە، دەى چۆن شتێك بۆ خۆتان پێتان ناخۆش بێ بتان بێ وەپاڵ پەروەردگارى دەدەن؟!

لە ئايەتێكى تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ، يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ – النحل/٥٨ – ٥٩﴾. لەژێر چەترى ئەم ياسا ڕزيوەدا چەند ستەم لەئافرەت كراوە؟ چەندان كچۆڵەى شلك و ناسك، زيندە بەچاڵ كراون؟! ئاوا بەدرێژايى مێژوو هەر چەرخەو بە ناوێكەوە ستەم لە ڕەگەزى ئافرەت كراوە، مەگەر ئەوكاتانە كە ياساى ئيسلام باڵا دەست بووبێ و بەپێى بەرنامەى خودا مامەڵەى لەگەڵدا كرابێ.

﴿أَوَمَن يُنَشَّأُ فِي الْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ﴾ ئەوە بەچ عەقڵێك منداڵ وەپاڵ خودا دەدەن؟ كە لەناو منداڵيشدا جۆرێك وەپاڵ خودا دەدەن: كە بێ كارەو بێ وەچ و بێ دەسەڵاتە، تواناى شەڕو بەرگرى نييە، لەكاتێكدا ئەوان لە كۆمەڵگايەكدان شانازى دەكەن بە كوڕو كوڕو سيمينار دەگێڕن بۆ پاڵەوان و شەڕكەرانيان، هەڵبەتە پەروەردگار لە ديدگاى خۆيانەوە موناقەشەيان دەكا، بەوە خەجاڵەتيان دەكا: كە شتێك بۆ خۆيان پێيان ناخۆشە، پاڵ خوداى دەدەن ئەوان كە هەر منداڵ پاڵ خودا دەدەن با جۆرە باشەكەى وەپاڵ بدەن!! ئاى كە نەفام و كەودەنن، كە بێ هەست و شعورن!؟!

ئايەتەكە ئاماژە بۆ دڵ نەرمى ئافرەت دەكاو لايەنى هەستى ناسك و سۆزو خۆشەويستى تێدا زەق دەكاتەوە، ئەوە دەچەسپێنێ: كە هەميشە ئافرەت حەزى لە خۆ جوانكردن و ئارايش هەيە، ئەوەش دەگەيەنێ: كە خۆ خشڵ دار كردن بە زێڕو زيوو پۆشينى ئاوريشم بۆ ئافرەت دروستەو بۆ پياو حەرامە!

ئەمجار پەروەردگار بەجۆرێكى تر تەنگيان پێ هەڵدەچنێ و خۆيان و بيرو بۆچوونە گەندەڵەكەيان لە قاقۆزە دەپێچێ و بەدرۆيان دەخاتەوە. ئەوان ئيديعاى ئەوە دەكەن: كە فريشتە مێينەن دەى دەبێ ئەم بيرو بۆچوونە نادروستەيان

لەچییەوە سەرچاوەی بەستبێ؟ بەچ عەقڵێك فریشتەكان بە مێینە دەزانن‌و بەكچی خودایان لەقەڵەم دەدەن؟!

بەڕاستی ئەم بیرو بۆچوونەی موشریكەكان لە بوختانە هەرە گەورەكانیانەو بەناڕەواترین هەڵوێستیان حسێب دەكرێ.

دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثًا﴾ ئەوانەی وایان داناوە ئەو فریشتانە: كە بەندەی خودان مێینەن، چ بەڵگەیەكیان بەدەستەوەیە بەچ عەقڵێك ئەو بیرو بۆچوونە رادەگەیەنن؟! چۆن جەسارەت دەكەن‌و دەوێرن ئەو بوختانە گەورەیە بكەن؟! چاویان پێكەوتوون؟! ئاگاداری دروستكردنیان بوون؟ كوا بەڵگەیان؟

﴿أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ﴾ ئایا ئەوانە ئاگایان لێ بووە: كە خودا فریشتەكانی دروست كردوون، هەتا بتوانن شایەتی بدەن! دەی با تاوانی ئەم داوا بێ بناغەیان لەئەستۆ بگرن.

﴿سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾ ئەو شایەتی دان‌و قسە بێ بناغەیەیان لەنامەی عەمەلیاندا دەنوسرێ‌و رۆژی قیامەت پرسیاریان لێ دەكرێ، لەسەر ئەو شایەتی دانەیان حسابیان لەگەڵ دەكرێ‌و سزایان دەدرێ.

ئەمە هەڕەشەیەكی توندە لە كافرە قورەیشییەكان‌و هەموو ئەوانەی درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن‌و شتی نەگونجاوی وەپاڵ دەدەن. لەهەمان كاتدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە داوای بێ بەڵگەو نیشانە تاوانەو سزای لەسەرە! ئەمجار قورەیشییەكان بیانوویەكی تر دەهێننەوەو بوختانێكی تر هەڵدەبەستن‌و پاساو بۆ ئیمان نەهێنانی خۆیان دەهێننەوە. دەیانەوێ بەهەر جۆرێك بێ خۆیان لە ئیمان هێنان بدزنەوە!

دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْ شَاءَ الرَّحْمَنُ مَا عَبَدْنَاهُمْ﴾ كافرەكان وتیان: ئەگەر خودا بیویستایە ئێمە فریشتە نەپەرستین پەرستشمان بۆ نەدەكردن، دیارە خودا دەیەوێ

ئێمـه بەندایـەتی بـۆ فریـشته بکـەین، ئـەکینا لەمپـەری دەخـسته بـەردەممان‌و نەیدەهێشت ئـەم پەیکـەرە لـەدارو بـەرد تاشـراوانه بپەرسـتین کـه لەسـەر شـێوەی فریشتەن. بەم جۆرە فـرت‌و فێڵ دەخەنـە ڕوو، چاو بەسـتەکی دەکەن‌و دەیانـەوێ بەو قسه حەقـە شتێکی بـەتاڵ بچەسپێنن. چونکه ئاشکراو نمایانـه هەرچی لـەم بوونەوەرەدا دێتە کایەوە بەویستی خودایەو خودا ویستی لەسەر پەیدابوونی نەبێ نابـێ. ئەمــه حەقیقەتــەو بەڵگــه نەویــسته، وەڵێ هــەر خــودا بەویــستی خــۆی ئـادەمیزادی وا دروسـت کـردووە کـه بتوانـێ ڕێگـای هێدایـەت یـان ڕێگـای گومڕایی بگرێته بەر، فەرمانی پێ کـردووە لـەوە کـه ڕێگـای کوفرو گومڕایی بگرێتـە بـەرو هەرگیز پێـی ڕازی نیـه، هەرچـەندە مەشیئەتی خـودا وا هـاتووە: کـه ئـادەمیزاد وا دروست بکاو توانای هیدایەت وەرگرتن‌و گومڕابوونی تێدابێ، ئەوانە: کە ئەو جۆرە ئیدیعایانه دەکەن، چەواشەکاری بـەرپا دەکـەن، ئـەوان دڵنیـانین: کـه خـودا ویـستی وایـه ئـەوان فریـشته بپەرسـتن، چـی دڵنیایـان دەکـا؟! موشـریکەکان بـەم قـسەو بوختانەیان چەند تاوانێکیان ئەنجام داوە.

١- منداڵیان بۆ خودا داناوە! خودا پاك‌و مونەزەهه لەوە.

٢- ئیدیعای ئەوەیان کردووە: کە خودا کچی هەن نەك کوڕ.

٣- بەبێ بەڵگەو نیشانه ملیان لەبتپەرستی‌و فریشتەپەرستن ناوە.

٤- ئیـدیعای ئـەوەیان کـردووە: کـه بتپەرسـتیەکەیان بەویـستی خوایـه، ئەگـەر خودا بیویستایه فریشته نەپەرستن ئەوکارەیان نەدەکرد.

بەڕاسـتی ئەمــه ئەوپــەڕی جـەهل‌و نـەفامییان بـووە، چـونکه پـەروەردگار بەدرێـژایی مێـژووی ئـادەمیزاد پـەیتا پـەیتا پێغەمبـەرانی نـاردوون، هـەموویان پـەیامی یەکتاپەرستییان دووپـات کردۆتـەوە، جڵەوگیرییان لەبتپەرسـتی کـردووە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ – النحل/٣٦﴾ یان دەفـەرموێ: ﴿وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن

رُسُلِنَا أَجَعَلْنَا مِن دُونِ الرَّحْمَنِ آلِهَةً يُعْبَدُونَ – الزخرف/٤٥﴾. ئەو موشریکانە هەرکاتێ بەڵگەیان بەدەستەوە نەمابێ‌و بۆڕیان خواردبێ پەنایان بۆ ئەم پاساوە بێ جێیە بردووەو وتوویانە بەویستی خودا ئێمە فریشتەپەرستی دەکەین... وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەداو دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا – الأنعام/١٤٨﴾.

ئیتر پەروەردگار رەدی ئەم جۆرە بۆچونە هەڵەیەیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿مَّا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾ ئەوانە هیچ بەڵگەو زانیاریێکیان لەوبارەوە بەدەستەوە نیەو ناتوانن ئەو ئیدیعا ناڕەوایە بچەسپێنن، تەنها ئەوەندەیە ئەوان درۆ دەکەن‌و لەخۆیانەوە قسەی پڕوپووچ‌و بێ بناغە هەڵدەبەستن، بێگومان پەروەردگار فەرمان بەحەق دەکاو جڵەوگیری لە خراپەکاری‌و قسەی دەست هەڵبەست‌و بێ بناغە دەکا، قەت رازی نابێ بەندەکانی کافر بن‌و فاحیشەو تاوانیان تێدا بڵاو بێتەوە!

﴿أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَابًا مِّن قَبْلِهِ فَهُم بِهِ مُسْتَمْسِكُونَ﴾ چ بەڵگەیەکیان بە دەستەوەیە لەسەر ئەم ئیدیعایە بێ بناغەیان؟ ئایا ئێمە لە پێش قورئاندا نامەیەکی تری ئاسمانیمان بۆ ناردوون پشتی پێ ببەستن؟ بەڵگەیەکی بڕوا پێ کراویان لایە ئیعتیمادی بکەنە سەر؟ چ ئایین‌و رێساو یاسایەك فەرمان بەوان دەکا: کە غەیری خودا بپەرستن؟! هەڵبەتە ئەوان هیچیان بەدەستەوە نیە، هیچ بەڵگەیەکیان نیە!

﴿بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّهْتَدُونَ﴾ بەڵکوو هەر ئەوەندەیان بەدەستەوەیە: کە دەڵێن: ئێمە باوك‌و باپیری خۆمانمان دیوە بتپەرستییان کردووە، فریشتەیان پەرستووە، ئێمە لاسایی ئەوان دەکەینەوە، شوێنیان کەوتووین، بست بەبست پەیڕەوی رێبازی پێشینانی خۆمان دەکەین!! ئای لەم نەفامییە! ئای لەو بێ عەقڵی‌و کەودەنییە! بیر و هۆشیان جام بووەو چاوی دڵ‌و هێزی بیری خۆیان لەکار خستووە!!

ئیسلام دژی ئەم جۆرە هەڵس‌وکەوتانەیە، هەرگیز لاسایی کوێرانە پەسەند ناکا. ئیسلام پەیامی ئازادیخوازیو بیرفراوانیو تێفکرینە، رازی نیە مرۆڤ بیروهۆشی خۆی داخاو کوێرانە بکەوێتە پێ مەلەو لاسایی باوكو باپیرانی بکاتەوە! پێویستە هەموو شتێك بە بەڵگەو دەلیل وەربگرێو هەمیشە هەوڵی گەیشتن بە حەقو حەقیقەت بدا، بۆ زانینو زانیاری تێبکۆشێ، لە بوونەوەر وردبێتەوەو بەڵگەو دەلیل بدۆزێتەوە! بەم جۆرە بیروباوەڕی خۆی رەچاو بکا...!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕوون دەکاتەوە: کە ئەم لاسایی کردنەوەو کوێرانە شوێنکەوتنە کارو پیشەی گەلو نەتەوەکانی رابردوشە، هەموو گەلو نەتەوەکانی پێشوو ئەوە بیروبۆچوونو هەڵس‌و کەوتیان بووە! دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ﴾ قسەو بیروبۆچونی ئەم قوڕەیشیە موشریکانە دەق دەشوبهێتە قسەو بیروبۆچونی گەلو نەتەوەکانی پێشویان، چونکە هەروا بووە هیچ کاتێ ئێمە پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆ سەر گەلو نەتەوەیەك، بۆ سەر شارو هەرێمێك ئیللا کەناردومانە بانگەوازی مەردومگەلەکەی کردووە بۆ خوداناسیو یەکتاپەرستی، خێرا دەوڵەمەندو دەرەبەگو بەنازپەروەرد بووەکانیان، وتوویانە ئێمە باوكو باپیری خۆمانمان لەسەر ئەو بتپەرستیو کوفرو گومڕاییە بینیوە، ئێمە شوێن پێی ئەوان دەکەوینو بە بست لەڕێبازی ئەوان لانادەین!

بۆیە لەئایەتەکەدا بەتایبەتی ناوی (مترفین) بەنازپەروەردەکانی هێنا، چونکە بەزۆری ژیانی خۆشو بێ چورتەمو تەنگو چەڵەمە ئادەمیزاد بوغرادەکاو وای لێ دەکا لەخۆی بایی ببێو بیر لە حەقیقەت نەکاتەوە، لەپەیامی خودا ورد نەبێتەوە، لەئایەتێکی تردا مانای ئەم ئایەتە دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ، أَتَوَاصَوْا بِهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ – الذاريات/٥٢ – ٥٣﴾.

ئـەمجار پـەروەردگار وەڵامـی پێغەمبـەرەکان بـۆ نەتـەوەکانیان بـەیان دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿قَـالَ: أَوَلَـوْ جِئْـتُكُم بِأَهْـدَى مِمَّـا وَجَـدتُّمْ عَلَيْـهِ آبَـاءكُمْ﴾ واتـە: پێغەمبەرەکـەیان پێـی گـوتن: ئەگـەر مـن پـەیامێکم بـۆ هێنـابن زۆر لـەئایینی باوکوباپیرانتـان باشـتر بـێ، هـەر ئێـوە شوێن ئـایینی ناڕاسـتی بـاوكو باپیرانتـان دەکەون؟! ئەوانیش بێ روماپایی وەڵامی پێغەمبەرەکەیان دایـەوەو ﴿قَالُوا: إِنَّـا بِمَـا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ﴾ وتیان: بەڵێ ئێمە بڕوا بەو پەیامە ناکەین کە بۆتـان هێنـاوین، هیچ شتێك بەگوێی ئێـوە ناکـەینو بانگەوازیتان رەت دەکەینـەوە، تەنانـەت ئەگـەر راسـتیش بکـەن ئێمـە بڕواتـان پـێ ناکـەین، دەسـتی خۆتـان بـن سـەری خۆتـان بدەنویەخەمان لە یەخە بکەنەوە.

﴿فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَانظُرْ كَيْـفَ كَـانَ عَاقِبَـةُ الْمُكَـذِّبِينَ﴾ سـەرەنجامی سووربوونیان لەسەر کوفرو بێدینی ئـەوەبوو ئێمـە تۆڵـەمان لـەو گـەلو نەتـەوە بەدرۆخەرەوانـە کردەوە، بەجۆرەها سزای کوشندە گیرۆدەمان کردن، هەیانبوو بەتۆفان خنکاندمانن، هـەیانبوو بـەردەباران و ئـاگر بارانمـان کـرد! دەفـەرموێ: ئـەی موخـاطەب بڕوانـەو سەرەنج بدە سەرەنجامی ئەو پەیام رەتکەرەوانە چی بوو، چۆن بەهیلاکمان بردنو ئاسەوارمان بڕینەوە، ئێستایش پاشماوەو کەلاوە کۆنی هەنـدێ شـارو گونـدی ئـەو گەلە لەناوبراوانە بەچاو دەبینـرێن، پێویستە پەندو عیبرەتی لێ وەربگرن.

ئەمـە هەڕەشـەیەکی تونـدە لـە موشـریکەکانی مەککـەو تەسـەللا دانـەوەی پێغەمبەرە: کە بـە رەتکردنـەوەی پەیامەکەی دڵتـەنگ نـەبێ. ئەمـە دابو نـەریتی هـەموو گـەلو نەتەوەکانـە بەرامبـەر پێغەمبـەرەکانیان بـەدرۆیان خـستنەوە، پەیامەکـەیان رەتکردنـەوە، پـەروەردگاریش لەتۆڵـەی ئـەوەدا غـەزەبی لێ گـرتنو ئاسەواری بڕینەوە.

**بیروباوەڕ دەبێ لەناخەوە بنج بەست بووبێ، نابێ لاسایی کردنەوەی کوێرانە بێ، هەرخودا دەزانێ کێ شیاوی پێغەمبەرایەتییە**

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا

وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٣١ - ٣٢) ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: عەرەبەکان وتیان: ئەگەر بگونجێ ئادەمیزاد ببێتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوە غەیری موحەممەد شیاوترە بە پێغەمبەرێتی، ئەوەبوو وەکوو قورئان لێیان دەگێڕێتەوە. دەیانگوت: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ – الزخرف/٣١﴾. مەبەستیشیان بەگەورە پیاوی ئەو دوو شارە (وەلیدی کوڕی موغەیرە) لەمەککەو (مەسعودی کوڕی عەمری (الثقفي)) لەطائیف بوو، ئیتر پەروەردگار رەدی دانەوەی فەرمووی: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ﴾.

ئیبنو لمونزیر لەقەتادەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: وەلیدی کوڕی موغەیریان ناو نابوو ریحانەی قورەیش، ئەو لەخۆبایی بووە دەیگوت: ئەگەر ئەوەی موحەممەد دەیڵێ راست بێ، دەبوایە قورئان یان بۆ من بهاتایە خوارێ، یان بۆ مەسعودی عەمری (الثقفي) نازڵ بوایە. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ﴾ی نازڵ کرد.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم رووەوەیە: لەوەپێش پەروەردگار پشت بەستنی بەلاسایی کردنەوەو چاولێکەری لەبواری بیروباوەڕدا پوچ کردەوەو بەکارێکی نەفامانەی لەقەڵەمدا، ئەمجار لێرەدا بەشێوەیەکی تر دیاردەی لاسایی کردنەوە رەت دەکاتەوە، گەندەڵی ئەو جۆرە باوەڕە دەچەسپێنێ، ئەوەتا حەزرەتی ئیبراهیم: کەبابە گەورەی پێغەمبەرانەو عەرەبەکان بە بابە گەورەی خۆیانیانی دەزانن، بەبەڵگەوە لەئایینی باوك و باپیری خۆی دەستەبەردار بوو بڕیاری دا کە شوێنکەوتنی بەڵگەو دەلیل شیاوە نەك لاسایی کردنەوە، ئەمجار

ئەوەش روون دەکاتەوە: کەپشت بەستنی قورەیشییەکان بەلاسایی کردنەوە کارێکی ناشایستەیە، دەبوایە تێفکرینو ورد بوونەوەلەدروستکراوانی خودا بکەنە ئاگاری خۆیانو بیروباوەڕیان لەسەر بنەمای بەڵگەو دەلیل دابمەزرایە.

بەڕاستی ئەوانە هەڵخەڵەتاون، بەتەمەنی درێژو نازو نیعمەتو شوێنکەوتنی شەهوەتو ئارەزۆ لەخۆیان بایی بوون، لەجیاتی یەکتاپەرستی شوێن رێبازی شەیتان کەوتوون، پێغەمبەری خودا بەدرۆ دەخەنەوە تانەو تەشەری ناشیرینی لێ دەدەن، بوختانی بۆ هەڵدەبەستن، دەمێك دەڵێن شاعیرە، جاری وا هەیە دەڵێن: جادوبازە، کاتی وایش هەیە دەڵێن: کەی موحەممەد شیاوی پێغەمبەرێتیە؟ کەسێك شیاوی پێغەمبەرێتیە، ساماندارو خاوەن پلەو پایە بێ. ئیتر پەروەردگار رەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: خودا بۆخۆی رزقو رۆژیو پلەو پایەو شانسو بەخت دابەش دەکا. پێوەرو تەرازووی هەڵبژاردن بەدەست خودایە، کەسێك شیاوی پلەی پێغەمبەرایەتییە کەبەها ئەدەبیو گیانیو رەوشتە جوانەکان تێیدا بەرجەستە بووبن... کاڵای دونیاییو نازو نیعمەت چ دەورێکیان نیە لەبەخشینی پلەو پایەی پێغەمبەرێتیدا، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە: کە لەوانەیە کوفرو بێدینی هەموو عالەم دابگرێ، پەروەردگار ماڵو سامانی بێ شوماری دەبەخشێ بەکافرەکان، قاڵدرمەو سەکۆو دیوارو هەلاشی خانووەکانیان لەزێڕو زیو دەستەبەر دەکرد، بەڵام کاڵای دونیایی لای خودا چ بایەخێکی نیە نازو نیعمەتی نەبڕاوەو بایەخدار نازو نیعمەتی قیامەتە. ئەوەش تەنها بۆ خوداناسانو یەکتاپەرستانە.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاء مِّمَّا تَعْبُدُونَ إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەوە بۆ گەلەکەت باس بکە: کە ئیبراهیم بەباوکیو گەلەکەی خۆی گوت من بێ بەریم لەو بتو صەنەمانەی دەیانپەرستنو بەندایەتیان بۆ دەکەن، من کەس بەخودا نازانمو بەندایەتی بۆ کەس ناکەم جگە لەو خوایەی کەمنی دروست کردووە، نەك هەر من بەڵکوو هەموو بونەوەری بەدیهێناوە، تەنها ئەو دەپەرستمو بەس، بێگومان ئەو خودایە هیدایەتی من دەدا

بۆ ڕێبازی حەق‌و لەسەر ئایینی حەق ڕاگیرم دەکا؛ (ئەمە کاتێك ئەم مانایە پەسەند دەکەین کە (استثناء)ەکە (متصل) بێ. ئەگەر (استثناء)ەکە (منقطع) بێ، ئەو کاتە ماناکەی بەم جۆرە دەبێ، من بێ بەریم لەو خودا درۆزنانەی ئێوە دەیانپەرستن، وەلێ ئەو خوایەی دروستی کردووم ئەو هیدایەتم دەداو لەسەر حەق‌و ڕاستی ڕاگیرم دەکا.

﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ ئیبراهیم بەردەوام بوو لەسەر یەکتاپەرستی، ئامۆژگاری نەوەکانی خۆی کرد: کە بەردەوام بن لەسەر یەکتاپەرستی پەیڕەوی ڕێبازەکەی بکەن، دەی دانیشتوانی مەککە: کە خۆیان بەوەچەی ئیبراهیم دەزانن بۆچی لەو ڕێبازە ڕاستە لایان داوە؟ خۆ هەمیشە لە نەتەوەی ئیبراهیم کەسانێك هەن بەردەوامن لەسەر یەکتاپەرستی‌و هاوەڵ بۆخودا دانانێن. جا ئەوان کە ئیدیعای شوێنکەوتنی باوك‌و باپیرانیان دەکەن، دەبا شوێن ڕێبازی باوکە گەورەی خۆیان بکەون، یەکتاپەرستی ڕەچاو بکەن. ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لە قوڕەیشییەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿بَلْ مَتَّعْتُ هَؤُلَاءِ وَآبَاءَهُمْ حَتَّى جَاءَهُمُ الْحَقُّ وَرَسُولٌ مُبِينٌ﴾ بەڵکوو من ژیانی خۆش‌و تەمەنی درێژو ڕزق‌و ڕۆژیم بەخشیوە بە ئەوانەو باوك‌و باپیرانیان، ئەوەتا وێڕای کوفرو بێدینیان نازو نیعمەتمان داونێ، ئەوانیش بەوە لەخۆیان بایی بوون، سەرگەرمی ڕابواردنن. خۆیان داوەتە دەست شەیتان‌و گوێ بیستی فەرمانەکانی، لەخوداپەرستی بێ ئاگا بوون هەتا قورئانی پیرۆزیان بۆ هات‌و پێغەمبەری دڵسۆزو خاوەن موعجیزەی ئاشکرا هاتە سەریان، بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنان‌و یەکتاپەرستی. جا ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِ كَافِرُونَ﴾ کاتێك قورئانیان بۆ هات‌و بەسەریاندا خوێندرایەوە، وتیان: ئەمە سیحرو ئەفسانە کۆنی پێشینانەو سروشی خودا نیە، ئێمە هەرگیز بڕوا بەشتی وا ناکەین، بەئەنقەست‌و لەڕووی لوتبەرزی‌و عینادییەوە پەیامی قورئانیان ڕەت کردەوە، بەهۆی بوغرایی‌و حەسودی‌و سەرڕەقی خۆیانەوە

بڕوایان پێ نەکرد، وێڕای گومڕایی‌و هاوەڵدانانیان بۆ خودا ئەو پەیامە حەق‌و ڕاستەشیان بەدرۆ خستەوە، بەئاشکرا ئینکاری سروشی خوداو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیان کرد. بە مەندەشەوە نەوەستان بەڵکووکوفرو بێدینیەکی تریان خستە سەرکوفرو گومڕاییەکەیان.

﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ وتیان: ئەگەر موحەممەد ڕاست دەکاو پێغەمبەرەو نیگای بۆ هاتووە، ئەوە بۆچی ئەو قورئانە نازڵ نەبووە سەر یەکێك لەو دوو گەورە پیاوەی مەککەو طائیف: کە وەلیدی کوڕی موغەیرەو مەسعوودی کوڕی عەمری (الثقفي)یە، هەر یەکێ لەو دووانە خاوەن ماڵ‌و جاهو شان‌و شەوکەتن، لەناو هۆزو عەشیرەتیان قسە ڕۆیشتوون، هەرچی بیڵێن بەگوێیان دەکرێ، بەم جۆرە ڕەخنەیان لەخودا گرت‌و پێیان وابوو حەزرەتی موحەممەد شیاوی پێغەمبەرایەتی نیە. ئیتر پەروەردگار ئەم شوبهەو قسە نابەجێیەیانی ڕەتکردنەوە فەرمووی: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ؟﴾ بۆچی ئەوان ڕەحمەتی خودا دابەش دەکەن، پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی بەدەست ئەوانەو ئەوان دەیدەن بەکەسێکی خۆیان هەڵی بژێرن؟! نەخەیر ئەو کارە بەدەست ئەوان نیە، ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ﴾ خودا دەفەرموێ: ئێمە رزق‌و ڕۆزیی‌و شانس‌و بەخت‌و پلەو پایە بەسەر ئادەمیزاددا دابەش دەکەین، بەرزو نزمی لەناویاندا ئەنجام دەدەین هەرکەسە بەپێی خۆی‌و بەگوێرەی حیکمەت‌و دانایی خۆمان بەشی دەدەین، هەرکەسەو لەڕوانگەی حیکمەتی خۆمانەوە هێزو تواناو ماڵ‌و سامان‌و زانیاری‌و بەهرەو شکۆمەندی‌و خێرو فەڕی بەسەردا دەڕێژین. کەسانێك بەرز دەکەین‌و هەندێك نەوی، ئەم زانا دەکەین‌و ئەو نەزان، فلان هەژار دەخەین‌و فلان دەوڵەمەند... هتد. ئەم بەرزی‌و نزمی‌و جوداوازییە بۆچی؟ ﴿لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾ بۆ ئەوەی هاوکاری یەکتر بکەن، بەیەکەوە کاروباری خۆیان ئەنجام بدەن، چونکە ئەگەر ئێمە یەکسانیمان

بخستایەتە نێوانیانـەوە، لـەنێوان خۆیانـدا هاریکارییـان نـەدەکرد، کەسـیان بـەگوێی کەسـیان نـەدەکرد، ئەوکاتـە یاسـای کۆمەڵایـەتیو پێکـەوە ژیانیـان تێـك دەچـوو! مەبەست لەبەکارهێنانو کار پێ کردنو چەوسانەوە نیە، چونکە لـەنایینی خـودادا خـاوەن ئـیش وەکـوو ئیـشکەر ئـەرکو واجبـاتی ئـەخلاقیو مـادی لەسـەرە، نابـێ ئەزیەتی کارکەر بداو ستەمی لێ بکا!

جا کە ئەوان دەربارەی گۆڕانی یاسای دونیایی دەسەوسانو نـاتوانن یاسـای جیهان بگۆڕن، ئەدی بۆ ڕەخنە لەکاری ئێمە دەگرن، کە پلەو پایـەی پێغەمبـەرێتی دەدەین بەبڕێك لەبەندەکانمان، نایدەین بەکەسانی تـر. ئـەوان نـاتوانن رزقو ڕۆژی بەیەکسانی بۆخۆیان دابین بکەن، چۆن پلەی پێغەمبەرێتی دابین دەکەن.

﴿وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ بێگومان ڕەحمەتو نیعمەتی خودا: کە لە بەهەشـتدا بـۆ بەنـدەکانی دانـاوە زۆر باشـترو بـەنرخترە لـەو مـاڵو سامانەی کـۆی دەکەنەوە، بەڵکوو هەموو نازو نیعمەتی دونیا لەچاو نازو نیعمەتی قیامەت بەهیچ دەژمێـرێ. جـا ئەگـەر پـەروەردگار هەنـدێ لـە بەنـدەکانی خـۆی هەڵبـژێرێو پلـەو پایـەی پێغەمبـەرێتیان پـێ ببەخـشێ، لـەو فـەیزو ڕەحمەتـە بەهرەمەنـدیان دەکـا، ئەوە بێگومان ئەو ڕەحمەتە لەهەموو نـازو نیعمـەتی دونیـا باشـترە، چـونکە دونیـا بەخۆیو نازو نیعمەتیـەوە بەسـەر دەچێو تێیدەپـەڕێ، ڕەحمـەتو فـەضلی خـودا بـەردەوامو نەبڕاوەیـە، قـەت نـەمانی بەسـەردا نایـە. بێگومـان دونیـا بـێ نرخـەو نیعمەتەکانی پایەدار نین.

﴿وَلَوْلَا أَن يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً لَجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِالرَّحْمَنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فَضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ، وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَابًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِؤُونَ، وَزُخْرُفًا﴾ ئەگـەر لەبـەر ئـەو نەبوایـە: کـە هـەموو ئادەمیزادەکـان لەسـەر ڕێبـازی کـوفرو بێـدینی یەکدیگیر دەبـوونو هـەموویان ڕێبـازی کـوفرو گومڕاییـان دەگرتـە بـەرو دەبوونـە دونیا پەرستو قیامەتیان بەلاوە دەناو کەس موسوڵمان نەدەبوو ئەگەر لەبـەر ئـەم هۆیانـە نەبوایـە، کـافرو بێدینـەکانمان هێنـدە دەوڵەمەنـد دەکـرد بـەجۆرێك کـە

سەقف و هەلاشی خانووەکانیان، پەیژەو پلیکانەو بەر بێلای ماڵەکانیان، دەرگاو پەنجەرەی خانووەکانیان، کورسی و قەنەفەی لەسەر دانیشتن و ئارام گرتنیان لەزێڕو زیوی پاڵفتە بۆ دەستەبەر دەکردن، دەسەلاتمان دەدانێ بەجۆرەها نەقش و نیگار ماڵەکانیان برازێننەوەو تێیاندا رابوێرن و بگوزەرێنن و ژیان بەسەر بەرن!

﴿وَإِن كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ هەموو ئەو نازو نیعمەتانە جگە لەوە: کە مەتاعێکی ژیانی دونیایەو زوو بەسەر دەچێ چی تر نیە، کەمێ لەززەتی لێ وەردەگرن و دەبڕێتەوە، تەمەن کورت و کەم بایەخە، قیامەت بەهەموو نازو نیعمەتەکانیەوە بۆ ئەو کەسانەیە خۆیان لەشیرك و بێدینی پاراستبێ، ئیمانی تەواویان هێنابێ و یەکتاپەرستیان کردبێ، فەرمانبەرداری خودا بووبن، بێگومان نازو نیعمەتی خودا هەمیشەییەو قەت نابڕێتەوە، تایبەتە بەخوداپەرستان و بەمیرات دەیاندرێتێ!

تیرمیزی و هی تریش لەسەهلی کوڕی سەعیدەوە ریوایەتیان کردووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: «لَوْ ان الدُّنْيَا تزن عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ». ئەگەر دونیا لای خودا نرخی باڵە مێشولەیەکی ببوایە قومە ئاوێکی لێ نەدەدا بەکافران... ئیمامی طەبەرانی ریوایەتێك دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: کاتێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سوێندی لەخێزانەکانی خوارد، عومەری کوڕی خەتتاب چووە خزمەتی، دیتی وا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر حەسیرە شڕێك پاڵی داوەتەوە، حەسیرەکە شوێنکەی لە لاکەلەکەی کردبوو، حەزرەتی عومەر غوڵبەتی هەڵساو فرمێسك لە چاوەکانی هەڵڕژانە خوار، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە قەیصەری رۆم و کیسرای ئێران لەو نازو نیعمەتەدا دەژین، خۆ تۆ هەڵبژاردەی ئادەمیزادانی و ئەم ژیانە زبرە بۆ؟ لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئانیشکی دادابوو، دانیشت و فەرمووی: ئەوە کوڕەکەی خەتتاب گومانت هەس؟ ئەمجار فەرمووی: ئەوانە گەل و نەتەوەیەکن لە ژیانی

دونیادا نازو نیعمەتیان بۆ پێش خراوە، لەریوایەتێکی تردا هاتووە، ئەی عومەر ئەوە تۆ رازی نابی ئەوان دونیایان هەبێ‌و ئێمە قیامەتمان هەبێ؟

## وەزعو حاڵی ئەوانەی روو لەذیکری خودا وەردەگێڕن، دڵ دامەزراندنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر بانگەوازییەکەی

﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ

وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بە ئایەتەکانی پێشەوە ئەوەیە: لەوە پێش پەروەردگار ئەوەی بەیان کرد: کە ماڵ و سامان مەتاعی دونیایەو زوو بەسەردەچێ، ئەمجار ئادەمیزادەکان ئاگادار دەکاتەوە: کە وریابن ماڵ و سامان زیکری خودایان لەبیر نەباتەوە، چونکە هەرکەسێ باوەشی بە دونیادا کرد، خودای لەبیر دەچێتەوە دەبێتە هاونشینی شەیاتینیو گومڕابوو گومڕاکەر، بۆ خۆی لە ڕێبازی هیدایەت لادەداو کەسانی دیکەش گومڕا دەکات، جا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ئادەمیزادە کافرو گومڕایە لە شەیتانەکەی خۆی دەستبەردار دەبێ، پەخەی خۆی لێ دادەدڕێ بەڵام ئەم دەستبەرداربوونە لە یەکتری دادیان نادا، هەردووکیان لە دۆزەخدا عەزاب دەچێژن.

وێڕای کوێریو بێ ئاگاییان لە زیکری خودا کەڕو کوندیشن، هیچ نابیسنو هیچ نابینن، لەهەموو رویەکەوە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان، بانگەوازی پێغەمبەر کاریان تێ ناکا، چونکە ئامێری دیتنو بیستنیان لەکار کەوتووە، ئەمجار پەروەردگار دڵنەوایی پێغەمبەر دەکاو دڵنیای دەکا: کە تۆڵەی ڕوو وەرگێڕان لە زیکری خوداو لاسارییان لێ دەستێنێ، درەنگ یا زوو لەماوەی ژیانی پێغەمبەردا یان دوا لە دونیا دەرچوونی ئەو تۆڵەیەیان لێ دەکاتەوە...

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە پابەندی فەرمانی خودابێو بەردەوام بێ لەسەر بانگەوازییەکەی، چونکە ڕێبازەکەی ڕێبازێکی حەقو ڕاستە، پەیڕەوو پرۆگرامەکەی قورئانی پیرۆزە، ئەمەش نیشانەی شکۆمەندییە بۆ خودی پێغەمبەر خۆیو نەتەوەو ئوممەتەکەی ڕۆژی قیامەتیش پرسیار لە ئوممەتەکەی دەکرێ دەربارەی قورئان چۆن ڕێزیان لێ گرتووەو بە پیریەوە چوون.

ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە: کە بتپەرستی هەر لە یاسای ئیسلام و پەیامی پێغەمبەر یاساغ نیە، بەڵکوو لەهەموو ئاینێکی ئاسمانیدا، لەسەر زوبانی هەموو پێغەمبەران بتپەرستی یاساغ بووە، هەموو شەریعەتێکی ئاسمانی و گشت فروستادەکانی خودا دژی وەستاون دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾ هەرکەسێك روو لە پەیامی قورئان وەرگێڕێ و خۆی بێ ئاگا بکاو لە ماناو مەبەستەکانی قورئان ورد نەبێتەوە، پابەندی پەیامی قورئان نەبێ و نەیکاتە پەیڕەوو پرۆگرامی ژیانی خۆی، ئەوە ئێمە شەیتانێکی بۆ راست دەکەینەوە دەنە دەنەی بداو گومڕای بکا، ئەو شەیتانە بەدفەڕە هەمیشە لەگەڵیدایە، لێی جیا نابێتەوە، خراپەی لەپێش چاو جوان دەکا، هەڵیدەدێرێ، لەناو زلکاوی گومڕایی و کوفرو بێدینیدا هەمیشە پەلە کوتەی دەبێ!

مەبەستەکە ئەوەیە: کەسێك بزانێ قورئان حەقەو خۆی لێ گێل بکا، ئەوە لە گومڕایی دایەو ڕێبازی هیدایەتی لێ گوم بووە، ماکی هەموو تاوانێك دونیا پەرستییەو باوەش بە دونیادا کردن و تێکەڵاو بوون لەگەڵ دونیا پەرستان نیشانەی گومڕابوون و کارێکی خەتەرە! ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە هەموو ئادەمیزادێك شەیتانێکی هەیە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاء فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ – فصلت/٢٥﴾. لەحەدیثی صەحیحی موسلیمدا هاتووە، دەفەرموێ: لەگەڵ هەموو موسوڵمانێکدا شەیاتینییەك هەیە، دەنە دەنەی دەدا بۆ خراپەکاری بێگومان شەیتان وەکوو خوێن بەناو جەستەی ئادەمیزاددا دێوو دەچێ.

﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ ئەو شەیاتینیانەی: کە هاوەڵی ئادەمیزادن و خودا دایناون ببنە هاوشانی ئەوانەی خۆیان لەیادی خودا گێل دەکەن، گوێ بەپەیامی قورئان نادەن و خۆیانی لێ غافڵ دەکەن. ئەو شەیاتینیانە ئادەمیزادەکان بە وەسوەسەو ختوکە لەڕێبازی حەق و ڕاستی لادەدەن، بەفرت و فێڵ

کـافرو گومڕایـان دەکـەن، ئـادەمیزادە کـافرو گومڕابووەکـانیش وادەزانـن لەسـەر حـەقن و ڕێبـازی ڕاسـتیان گرتۆتەبـەر. ڕۆژ دوای ڕۆژ پـتر کـوفرو بێـدینییان لـەلا شیرین دەبـێ ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ﴾ هەتا ڕۆژی قیامەت رادەبێ و ئەو کافرە ماڵ وێرانە دێتە بەردەستمان و دەزانێ چۆن قوڕی بەسەر خۆیدا کردووەو چۆن بەدبەختی و چارەڕەشی بۆخۆی کێش کردووە، جا ئەوکات یەخـەی خـۆی لەشـەیتانەکەی دادەدڕێ و پەنجـەی پەشـیمانی دەگـەزێ و ڕوو دەکاتە شەیتانەکەی و دەڵێ: ئـای خۆزگـە نێـوان مـن و تـۆ بـە ئەنـدازەی دووری خۆرهەڵات و خۆرئاوا بووایە. هیچم بەقسە نەکردیتایە، بەڕاستی شەیتان هاوەڵێکی خراپ و ناپەسەندە بۆ ئادەمیزادو لەشەڕ بەولاوە خێری لێ نابینی! ئەمجار بۆ زێدە تەعزیب و ریسواکردن بەو ئادەمیزادە چارەڕەشانە دەگوترێ: ﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ ئـەمڕۆ ئـەو خۆزگـە بریـا گوتنـە هـیچ سـودو قازانجێکتـان پـێ ناگەیـەنێ، چـونکە ئێـوە لـەدونیادا سـتەمتان لـەخۆتان کـردووەو ڕێگەی گومڕاییتان گرتبووە بەر، هاوبەشی بوونتان لەسزادا سوودتان پێ ناگەیەنێ، تۆزقاڵێك عەزابتان لێ کەم ناکرێتەوە، هەریەکـەتان سـزای خـۆی وەردەگـرێ و لـەتاو ئازاری ئاگای لەحاڵی ئەوی تر نیە مادام لـەهۆکاری سـزاکەدا هاوبـەش بـوون، دەبـێ لـەخودی سزادانەکەشـدا هاوبـەش بـن. ئـەمجار پـەروەردگار دڵنـەوایی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکـاو ئـەوەی بـۆ ڕوون دەکاتـەوە: کـە بانگەوازییـەکەی کار لەو دڵڕەقانە ناکاو ئیمانی پێ ناهێنن، دەفەرموێ: ﴿أَفَأَنتَ تُسْمِعُ الصُّمَّ أَوْ تَهْدِي الْعُمْيَ وَمَن كَانَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویسـت! ئـەو کافرانـە کـەڕو کوێرن، قسەی حەق نابیستن، کوێرن مـوعجیزەی تـۆ نـابینن، جا کـەوابێ ئایـا تـۆ دەتوانی پەیامی خۆت بگەیەنی بەوجۆرە کەسانەو هیدایەتیان بدەی؟! ئەوان کەڕو گومڕان، لەگومڕایـەکی ئاشـکرادان، تـۆ کـەی دەتـوانی شـارەزایان بکـەی بـۆ ڕێبـازی پیرۆزی ئیسلام، ئەمانە: کە ئەوە حاڵ و وەزعیانە ئەتۆ ناتوانی هیدایەتیان بدەی.

ئەو کافرانە چاوی دڵیان کوێرە، هیچ نابیستنو هیچ نابینن، چەندێك تۆ بانگەوازیان بکەی بۆ ئیمان هێنان، ئەوان پتر شێلگیر دەبن، گومڕابوونەکەیان زیاد دەکا! بەڵام دڵنیابە ئێمە لەبیریان ناکەینو تۆڵەیان لێ دەستێنینو بەسەریانەوە ناچێ!

﴿فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ، أَوْ نُرِيَنَّكَ الَّذِي وَعَدْنَاهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ﴾ زوو یان درەنگ تۆڵەیان لێ دەکەینەوە، بەم جۆرە یان بەتەواوی تۆ لەناو ئەوان هەڵئەگرینو دەتمرێنین ئەوسا ئێمە تۆڵەیان لێ دەکەینەوە، یاخود پێش ئەوەی گیانت بکێشین هەندێ لەو هەڕەشانەی لێمان کردوون دەیان هێنینە دیو نیشانت دەدەین، بێگومان ئێمە هێزو توانای ڕەهامان هەیە بەسەریاندا، ئێمە دەسەڵاتی ڕەهامان هەیە، هەرکاتێك بمانەوێ سزایان دەدەین، کەس نیە بتوانێ کۆسپو تەگەرە بخاتە بەر ویستەکانمان!

﴿فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ پابەندی ئەو قورئانە بە کە بەنیگا بۆت نێردراوە، بێگومان تۆ لەسەر ڕێبازێکی ڕاستو حەقی، پەیڕەو پرۆگرامت مایەی بەختەوەری ژیانی دونیاو قیامەتە، خۆشیو سەرفرازی هەردوو جیهانت بۆ دەستەبەر دەکا، تۆ پەیامی خۆت بگەیەنەو بانگەوازی خۆت بڵاو بکەرەوە، ئەوەی لەئەستۆی تۆدایە گەیاندنەو بەس!

﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ﴾ بێگومان قورئان مایەی شەرەفو شکۆمەندییە بۆ خۆتو بۆ قورەیشییەکان بەتایبەتیو بۆ هەموو عەرەب بەگشتی، چونکە بەزمانی ئەوان نازڵ بووە، لەوەبەو لاوە لەقیامەتدا پرسیارتان لێ دەکرێ دەربارەی ئەم قورئانە، چۆن بەپیریەوە چوونو چۆن کارتان پێ کردووە، وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ – الأنبياء/١٠﴾.

ئیمامی بوخاری‌و تیرمیزی فەرموودەیەکیان لە معاوییەوە ریوایەت کردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ هَذَا الآمْرَ فِي قُرَيْشٍ، لاَ يُعَادِيهِمْ أَحَدٌ إِلاَّ كَبَّهُ اللَّهُ عَلَى وَجْهِهِ، مَا أَقَامُوا الدِّينَ» واتە: خەلافەو فەرمانڕەوایی بۆ قورەیشە، کەس رکابەریان لەگەڵ نەکا، بەمەرجێ پابەندی ئایین بن، کەوابێ قورەیشییەکان‌و عەرەبەکان بەتایبەتی دەبوایە لەهەموو کەس زیاتر پابەندی بەرنامەی قورئان بوونایە، چونکە عەرەبەکان پێش هاتنی قورئان نەتەوەیەکی خێڵەکی حوشتر لەوەڕێن بوون، نەخوێندەوارو بێ ژیارو بێ مێژوو بوون، لەناو خۆیاندا هەمیشە شەڕو هەرایان بوو، ئافرەتیان زیندەبەچاڵ دەکردن، هەمیشە ترسی ئەوەشیان هەبوو بێزنتیەکان پەلاماریان بدەن، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە وڵاتەکەیان رەش‌و رووت‌و بێ کشتوکاڵ‌و رەقەن‌و چەقەن بوو، زۆر جار دەکەوتە بەر چەپۆکی داگیرکەران، سەرباری شەڕی خێڵەکیانەی ناو خۆیان، شەڕی دەرەکیشیان بۆ پەیدا دەبوو، ئەوەندەی تریش باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتییان دوا دەکەوت، لە مێژوودا بەتەواوی دەسڕانەوە، بەهۆی قورئانەوە هاتنە سەر مەسرەحی ژیان‌و ناویان بەرز بووە، بوون بە فەرمانڕەوای جیهان‌و ئیمپراتۆریەتی فارس‌و رۆمیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. ژیارو مێژوویەکیان بۆ دروست بوو حەسوودییان پێ ببرێ. بەڵێ راستە قورئان شکۆمەندی‌و شەرەفە بۆ پێغەمبەرو نەتەوەکەی!! ئەوەتا هەزارو چوار صەدو بیست‌و ئەوەندە ساڵەیە، رۆژانە سەدان ملیۆن زوبان مەدحی پێغەمبەر دەکا، صەڵاوەتی لەسەر لێ دەدا، بەرێزەوە ناوی دەهێنن، بە ئیعترافی دوژمنان پێش دۆست‌و خۆشەویستان حەزرەتی موحەممەد (درووی خوای لەسەر بێ) یەکەم کەسایەتی ئادەمیزادە، مرۆڤێکی ترنیە بگاتە ئاستی ئەو لەشکۆمەندی‌و پیرۆزیدا، هەڵبژاردەی ئادەمیزادەو خاوەنی رەوشتی جوان‌و گەورەیە. هەتا دونیا دونیایە ناوی پیرۆزی پێغەمبەر (درووی خوای لەسەر بێ) لەناو دڵی سەدان ملیۆن موسوڵماندا جێگیر بووەو جێگای خۆی کردۆتەوە، دڵەکانیان بەناوی پیرۆزی لێ دەدا.

لەبارەی نەتەوەکەشیەوە ئەوە مێژوو شاهیدە پێش ئەوەی قورئان نازڵ ببێ عەرەب هیچ نەبوون، کەس نەیدەناسین، ئەگەر ناسرابیشن لە پەراوێزی ژیاندا بوون، چ حسابێکیان بۆ نەکراوە، قورئان رۆڵی پێدان، مێژووی بۆ دروست کردن، قورئانیان هەزم کردو کردیانە پەیڕەوو پرۆگرامی ژیانیان، لەژێر ئاڵای ئەو قورئانەدا بەگژ هەموو عالەمدا چوون، دونیایان خستە ژێر دەستی خۆیانو بوونە فەرمانڕەوای جیهان، هەتا خۆیان پابەندی قورئان بوونو پەیڕەوی ئەو کەلامە ئاسمانییەیان کرد، هەموو جیهان گەردن کەچییان بوون، بە گەورەو فەرمانڕەوای خۆیانیان لە قەڵەم دەدان، بەڵام کاتێ: دەستیان لە قورئان بەردا، هەموو جیهان لێیان هەڵگەڕانەوەو لەسەر مەسرەحی ژیان دەوریان نەما، لە کاروانی مرۆڤایەتیو ژیارو شارەستانی دواکەوتن، فەرمانڕەواییان لەدەس داو بۆ خۆیان بوونە ژێر دەستەو موستەعمەرە، تەنانەت ئێستا بوونە (٢٢) دەوڵەتۆکەو ژمارەی نفوسیان (٢٠٠) ملیۆن دەبێ بە هەموویان ناوێرنە دەوڵەتۆکەی ئیسرائیل، نەك هەر ناوێرنێ بەڵکوو هەموویانی لە قاقۆزە پێچاوەو هەرچیان بڵێ لەر سەری دەکوتێتەوە، ئاشکراشە سەرۆكو پاشاکانی دەوڵەتە عەرەبیەکان بەبێ (استثناء) ئەڵقە لەگوێی صهیۆنیەتو ماسۆنیەتی عالەمیو وڵاتە زلهێزە کافرەکانن، نەخشەو پیلانی ئەوان بەسەر گەلەکانیاندا تەنفیذ دەکەن، هەرچی خودا پێی ناخۆشە ئەوان بە پەرۆشەوە ملی لێ دەنێن. هەرچی رەوشتێکی ناشرینی رۆژئاواو رۆژهەڵات بێ ئەوان قۆزتویانەتەوەو دەیقۆزنەوە، بەندیخانەکانیان پڕن لە موسوڵمانانی راستەقینە، کۆمەڵ کۆمەڵ گەنجانی خودا پەرست راپێچی زیندانو کونە رەشە سامناکەکانیان دەکەنو جۆرەها سزاو ئەشکەنجەدانیان تێدا تاقی دەکەنەوە، وڵاتی پیرۆزیان لە گەنجی موسوڵمانو دڵسۆزی خاكو نیشتیان کردۆتە دۆزەخ!

رەبی مۆی لێ بێو زوبانیو پەنجەکانی هەڵوەرێ

هەرکەسێ گوڵشەن بە میثلی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

ئـەمجار پـەروەردگار ئامـاژە بـەوە دەكـا كـە بانگـەوازی بـۆ یەكتاپەرسـتیو جڵەوگیری لە بتپەرستی ئەركی سەرشانی پێغەمبەران بووەو بەدرێژایی مێژوو ئەم بانگەوازییە بە گوێی ئادەمیزادا دراوە، دەفەرموێ: ﴿وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِـن رُّسُلِنَا أَجَعَلْنَا مِن دُونِ الرَّحْمَنِ آلِهَةً يُعْبَـدُونَ؟﴾ پرسیار بكـە لـە نەتـەوەكانی پێشوو؟ ئەوانەی پێغەمبـەرمان بـۆ ناردوون، زانـاو دوعـاتی ڕێگـای خـودا پەرسـتیمان تێـدا هەڵخستوون، لێیان بپرسە ئایا خودا ڕێگای داوە لەجیاتی پەرستش كردن بۆ خـودا، كەسێكی تر بپەرستریٚ؟ واتە: هـەموو پێغەمبـەرانو شـوێنكەوتوانیان بانگـەوازییان بـۆ یەكتاپەرسـتی كـردووە، دژی بتپەرسـتی وەسـتاون. وەكـوو لـە ئایـەتێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِـي كُـلِّ أُمَّـةٍ رَّسُـولاً أَنِ اعْبُـدُواْ اللّـهَ وَاجْتَنِبُـواْ الطَّـاغُوتَ – النحل/٣٦﴾.

هـەموو پێغەمبـەران، هـەموو بـانگخوازانی ئـایینی حـەق بانگـەوازییان بـۆ یەكتاپەرسـتی كـردووە، كـەوابێ حـەزرەتی موحەممـەدو بانگەوازییەكـەی شـتێكی ناوازەو تـازە قـەڵا نیـە، بـەڵكوو جەختكردنـەوەی پـەیامی پێغەمبـەرانی پێشووە، ڕێبازی ئەوانە ئەم پەیڕەوی دەكـا، ئـایینی ئەوانـەو ئـەم تـازەی كردۆتـەوە. ئـایینی خودا یەك ئایینەو بۆ یەك مەبەست هـاتووە، بنـەماكانی ئـایینی خـودا لـە پـەیامی هەموو پێغەمبەراندا یەك بنەمانو ئەركی ئەستۆی هەموو پێغەمبەرانە.

ڕیوایەتكراوە، جوولەكەكانو موشریكەكان بە پێغەمبەریان گوت: ئەی محمد! ئـەو ئایینـەی تـۆ هێناوتـە جوداوازە لـە ئـایینی پێغەمبـەرانی پێشوو، ئـیتر خـودا فـەرمانی بـە پێغەمبـەر كـرد: كـەبۆ زێـدە دڵنیـاییو تەئكیـدو تـەفریر پرسـیار لـە پێغەمبـەرانی پـێش خـۆی بكـا، واتـە شـتەكە ئەوەنـدە ئاشـكراو دیـارە ئەگـەر لـە فەرزێكدا بەشێوەیەك لە شێوەكان پرسیاریان لێ بكەی، وەڵامەكـەیان هـەر ئەوەیـە: كەهەر خودا شیاوی پەرستش بـۆ كردنـەو بـێ هـاوەڵو بـێ شـەریكە. جگـە لـە ئـەو هیچ خودایەكی تر نیە.

## پەندوەرگرتن لەچیرۆکی حەزرەتی موساو هارون

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَـٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ۖ وَأَخَذْنَـٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَـٰذِهِ ٱلْأَنْهَـٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَـٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ

أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ ﴿٥٦﴾

لەوە پێش ئاماژە بەوە كرا كە قورەیشییەكان رەخنەیان لە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد گرت و گوتیان: (محمد) بە كەڵكی پێغەمبەرایەتی نایە چونكە هەژارەو پیاو ماقوڵی هۆزو وڵات نیە. ئەمجار چیرۆكی فیرعەونی بۆ گێڕانەوە: كە وتی: من دەوڵەمەندو خاوەن جاهم. جا كە لە ئایەتی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر كرد كە پرسیار لە پێغەمبەران بكا، بەم بۆنەوە چیرۆكی حەزرەتی عیسای هێنا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ كە ئەوانیش بانگەوازی یەكتاپەرستییان كردووە، بەمەش ئەو حەقیقەتە دەسەلمێنێ: كە پەیامی پێغەمبەران یەك پەیامە، یەك رێبازو رێوو رەسمە، هەروەها لە روانگەی ئەم زنجیرە چیرۆكەوە سروشتی ملهوڕان و بوغڕاو دەرەبەگەكان دەردەكەوێ، چۆن پێشوازی بانگەوازی حەقیان كردووە، چۆن بە پلەو پایەی دونیایی لەبەر ماڵ و سامانی دونیای بێ بەقا لەخۆ بایی بوون، سروشتی جەماوەرو هەڵس و كەوتیان چۆن بووە لەگەڵ ئەو زوڵم و ستەمەی لێیان كراوە لەلایەن ستەمكارانەوە، كەواتە هەموو كاتێ بەرهەڵستكارانی پەیامی پێغەمبەران، سەرانی كوفرو بوغڕاو ستەمكاران بوون، چونكە پێیان وابووە شوێنكەوتنیان بۆ پێغەمبەران دەبێتە مایەی لەدەستدانی پلەوپایەی كۆمەلایەتی و سیاسییان. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ واتە: بێگومان ئێمە موسامان رەوانەكرد بۆسەر فیرعەون و دارو دەستەكەی و نەتەوەی ئیسرائیل بە موعجیزەو نیشانەی ئاشكراوە، نۆ موعجیزەمان پێ بەخشی بۆئەوەی گەواهیدەربن لەسەر راستی پەیامەكەی. بانگەوازیكردن بۆ خودا پەرستی و یەكتاپەرستی، جڵەوگیری لێ كردن لە هاوەڵدانان بۆ خوداو فیرعەون پەرستی. نۆ موعجیزەكەش

ئەوانەن کە لە سورەتی (الإسراء) ئایەتی (١٠١)دا تۆمار کراون. کەبریتین: لە تۆفان، کوللە، ئەسپێ، بۆق، خوێن، گرانی، کەمو کورتی لە نەفسو لە زەرعاتو کشتو کاڵدا. یەدی بەیضاو، عەصا...، وێڕای نواندنی ئەو حەمکە موعجیزە گەورەو ئاشکرایانە کەچی فیرعەونو دارو دەستەکەی لوتبەرزییان نواندو ملیان نەدا بۆ ئیمانهێنان، بەڵکوو حەزرەتی موسایان بەدرۆخستەوەو گاڵتەیان پێ کرد، بەگژیدا چوونەوە. ﴿فَلَمَّا جَاءَهُم بِآيَاتِنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ﴾ کاتێك حەزرەتی مووسا ئەو موعجیزانەی نیشاندان یەکسەر فیرعەونو جەماعەتەکەی پێکەنینیان پێ هاتنو گاڵتەیان پێ کردنو بەدرۆیان خستەوە، سەر رەقییان نیشاندا، سەرەنجام خودا تۆڵەی سەختی لێ ستاندنو لە دەریادا خنکاندنی! ئەمجار پەروەردگار دڵنەوایی پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنْ آيَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا وَأَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ هەر بەڵگەو نیشانەیەکمان نیشانی فیرعەونو دارو دەستەکەی دابێ دەربارەی راستی پێغەمبەرێتی موساو راستی پەیامەکەی، لە موعجیزەی پێشووی گەورەتر بووە، پتر گەواهیدەر بووە لەسەر راستی بانگەوازییەکەیو تاكو تەنهایی خودا! کەچی وێڕای راستو دروستی ئەو موعجیزانە، فیرعەونو تاقمەکەی لە بوغرایی خۆیان نەهاتنە خوارێو وازیان لە گومرایی خۆیان نەهێنا، ئیتر پەروەردگار عەزابی سەختو جۆراو جۆری بەسەردا دان بۆئەوەی بگەڕێنەوە، ئیمان بەخودا بهێننو شوێن پەیامی موسا بکەون. هەرکاتێ: حەزرەتی موسا موعجیزەیەکی بنواندایە فیرعەونو تاقمەکەی بە سیحریان لە قەڵەم دەداو موسایان بەجادو باز دەزانی، ئەوەبوو هەر: کە عەزابێکیان بۆسەر نازڵ دەبوو هانایان بۆ مووسا دەبردو ﴿وَقَالُوا يَا أَيُّهَا السَّاحِرُ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ﴾ دەیانگوت: ئەی جادو بازی لێزان بۆمان لەخودای خۆت بپاڕێوە: کە ئەو وادەو بەڵێنەی پێی داوی بیهێنێتە دی، ئەو عەزابەمان لەسەر هەڵبگرێ ئێمە ئیمان دەهێنینو شوێنت دەکەوین.

﴿فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ﴾ کەچی کاتێ کە عەزابمان لەسەر لابردن، پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوەو ملیان لە کوفرو بێدینی دنایەوە وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُّفَصَّلاَتٍ فَاسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ، وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُواْ يَا مُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَآئِيلَ، فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الرِّجْزَ إِلَى أَجَلٍ هُم بَالِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ – الأعراف/١٣٣ – ١٣٤ – ١٣٥﴾. ئەمجار باسی یاخی بوونی فیرعەون و لەخۆ بایی بوونی دەکا دەفەرموێ: ﴿وَنَادَى فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِ قَالَ يَا قَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَذِهِ الْأَنْهَارُ تَجْرِي مِن تَحْتِي أَفَلَا تُبْصِرُونَ؟﴾ حەزرەتی موسا بانگەوازیی خۆی بڵاوکردەوە، فیرعەون هەستی کرد ڕەشە خەڵکەکە مەیلیان بەلای موسادا هەیە، خەریکن موسوڵمان بن، ئیتر فیرعەون فەرمانی دا خەڵکەکە کۆبکەنەوە، جەماوەر گرد کرانەوە، فیرعەون دەستی کرد بە وتاردان و خۆ هەڵکێشان و هەڕەشەکردن، وتی ئەی خەڵکینە! ئەوە نازانن و نابینن ملك و سامانی ئەم وڵاتە گەورەیە کە میصرە هەمووی هی منە و خۆم فەرمانڕەوام تێیدا، کەس هاوبەشم نیەو دەسەڵاتی ڕەهام هەیە، چۆمی نیل بەژێر قەصرو باڵەخانەو باخ و باخەتماندا دەڕوا، هەموو بەروبوومی میصر لەژێر کۆنترۆڵی خۆمدایە. ئەوە نابینن من لە چ فەخفەخەو ڕێزو شکۆمەندییەکدا دەژیم؟ نازانن، کە ئەم هەموو دەسەڵات و ماڵ و سامانە نیشانەی ئەوەیە: کەمن شیاوی ئەوەم فەرمانڕەواو خوداتان بم، لەهەمان کاتدا سەیری هەژاری و بێ دەسەڵاتی موسا بکەن بزانن خۆی و شوێنکەوتوانی چەند بێ وەج و هیچ لەبارا نەبوون!! بەهیچ جۆرێك ناتوانن بەرهەڵستی من بکەن!

لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَحَشَرَ فَنَادَى، فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى، فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَى – النازعات/٢٣ – ٢٤ – ٢٥﴾.

ئیتر پەرە بەخۆ هەڵکێشانی خۆی دەداو شوڵی لێ هەڵدەکێشێ دەڵێ: ﴿أَمْ أَنَا خَيْرٌ مِّنْ هَذَا الَّذِي هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ بەڵکوو بەهۆی ماڵو سامانو جاهو سەڵتەنەتەوە من زۆر باشترم لەم کابرایە کە ناوی موسایەو هیچی لەبارا نییە، تەنانەت لاڵە پەتەو زمان فسکێکە نازانێ قسەو گوفتوگۆش بکا، هیچ شەرەفو شکۆمەندییەکی نیە، هەتیومیەکی رووتو رەجاڵە، هەڵبەتە فیرعەون لەدیدگای خۆیەوەو پشتی بەو زانیاریە بەستووە: کە لەرابوردودا دەربارەی مووسا هەی بوو، بێ ئاگا بووە لەوە: کە پەروەردگار گرێی زمانی لابردووەو پلەو پایەی پێغەمبەرێتی: کە بەرزترین پلەو پایەیەکە دەبەخشرێ بە ئادەمیزاد، پێی بەخشیوە، هەموو شەرەفو شکۆمەندییەکی بۆ دەستەبەر بووە.

فیرعەون درێژە بە لەخۆبایی بوونی خۆی دەداو وای دەردەخا: کە پێغەمبەرێتی بۆ کەسێك دەبێ کە خاوەنی جاهو دەسەڵات بێ، فەرمانڕەواو پاشابێ، دارای زێڕو زیو بێ، بازنگی ئاڵتوونی هەبن، وتی: ﴿فَلَوْلَا أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَاء مَعَهُ الْمَلَائِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ ئەگەر راست دەکا پێغەمبەرە بۆچی بازنەی ئاڵتونی نین؟ یان بۆچی فریشتە نایەن شایەتی بۆ بدەن کە پێغەمبەرەو لەخوداوە رەوانە کراوە؟ وای خستە دڵی جەماوەرەوە: پێویستە پێغەمبەران خاوەن جاهو حەشەم بن. فریشتە بەدەورو پشتیانەوە بنو ناپوڕەیان بدەن.

﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾ فیرعەون سوکایەتی بە گەلەکەی خۆی کرد، رێزو نرخی بۆ دانەدەنان، گاڵتەی بە عەقڵو بیرو بۆچونیان کرد، بانگەوازیی کردن بۆ گومڕایی‌و بێدینی، ئەوانیش بەپیر بانگەوازییەکەیەوە هاتنو فەرمانبەرداری فەرمانەکانی بوون، بەهیتی فیرعەون موسایان بەدرۆ خستەوە، بێگومان ئەوان گەلو نەتەوەیەکی فاسقو یاخی بوو بوون، سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو شیاوی عەزابی سەختی پەروەردگار بوون!

جا ﴿فَلَمَّا آسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ کەبێ فەرمانی ئێمەیان کردو رقی ئێمەیان لەخۆیان هەڵساند بەتوندترین شێوە سزامان دان، لەدەریادا خنکاندمانن، فیرعەون کە بەدەسەڵات بەسەر چۆمی نیلدا خۆی بادەداو لەخۆی بایی بوو دەیگوت: سەیری شکۆمەندیم بکەن، بڕوانن چەند خاوەن دەسەڵاتم، سەرنجی خەڵکەکەی بۆ لای چۆم و جۆگاکانی میصر رادەکێشاو دەیگوت: (وهذه الأنهار تجری من تحتي)... بەو ئاوە خنکاندمان! (سەیرە شتێك ئەوان خۆیان پێوە بادەدا بوو بەهۆی لەناوچونیان).

ئیمام ئەحمەدو طەبەرانیو بەیهەقیو ئیبنو ئەبی حاتەم لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا رَأَيْتَ اللَّهَ يُعْطِي الْعَبْدَ مِنَ الدُّنْيَا عَلَى مَعَاصِيهِ مَا يُحِبُّ فَإِنَّمَا هُوَ اسْتِدْرَاجٌ ثُمَّ تَلاَ رَسُولُ اللَّهِ (دروودی خوای لەسەر بێ) (فَلَمَّا آسفونا انتقمنا منهم فاغرقناهم أجمعين)». ریسوای دونیاو قیامەتمان کردن، ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِلْآخِرِينَ﴾ فیرعەون و شوێنکەوتوانیمان کردن بە پێشەنگ و نموونە بۆ هەموو ئەو کافرانەی کرداری ئەوان رەچاو دەکەن، وەکوو ئەوان سزا دەدرێن، هەروەها کردمانن بە پەندو عیبرەت بۆ ئەو کافرانەی لەدوا ئەوان دێنە گۆڕەپانی ژیانەوە! یان بەسەرهاتیانمان کردە چیرۆك و سەرگوزەشتەیەکی سەرسوڕهێنەر. چین لەدوا چین ئادەمیزاد لەناو خۆیاندا دەیگێڕنەوە.

## چیرۆکی حەزرەتی عیساو پەندوەرگرتن لێی

﴿ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ

إِلَّا جَدَلًا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَائِكَةً فِي الْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَاتَّبِعُونِ ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ الشَّيْطَانُ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَاءَ عِيسَىٰ بِالْبَيِّنَاتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِالْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ الَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ۖ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ اللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِن بَيْنِهِمْ ۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾

دەربارەی نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا...﴾ ئیمام ئەحمەدو طەبەرانی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خوای

لەسەر بێ) بە قورەیشییەكانی فەرموو: كەسێك نیە لەغەیری خودا بەولاوە عیبادەتی بۆ بكرێو خێری تێدابێو ڕێزی هەبێ، ئیتر قورەیشییەكان وتیان: ئەی تۆ نالێی عیسا پێغەمبەر بووەو بەندەیەكی صالحو راستاڵ بووە؟ دەی خۆ لەجیاتی خودا پەرستراوە! ئەمە چەندی بەچەندە؟ ئەوەبوو پەروەردگار ئایەتی: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ﴾ی نازڵ كرد. ئەمەش جۆرێكی ترە لەسەر ڕەقیو یاخی بوونو سەرپێچیكاریی قورەیشییەكان، كە هەمیشە خەریكی جەدەلو كێشەو چەواشەكاری بوون، ئەوەبوو كاتێ ئایەتی ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ – الأنبياء/٩٨﴾ نازڵ بوو قورەیشییەكان (وەكوو نۆ هەنگیان لەدارێكدا دۆزیبنەوە) دەنگیان بەرزكردەوە، وتیان: بەم پێیە دەبێ عیساو عوزێرو فریشتەكان ببنە دەستە چیلەی دۆزەخ. عەقڵیان بەوە نەشكا: كە پیتی (ما) لە ئایەتەكەدا عاقڵمەند ناگرێتەوە، بەڵكوو مەبەست بە (وما تعبدون) بتو صەنەم دەگرێتەوە، حەزرەتی عیساو حەزرەتی عوزێرو فریشتەكان ناگرێتەوە، بەڵكوو ئەوانە بەندەی راستاڵو خودا پەرستو یەكتا پەرستن، نە خۆیان بەخودا زانیوە، نە خۆیان بە هاوەڵی خودا حسێب كردووە.

﴿وَقَالُوا أَآلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾

كافرەكانی قورەیش لەڕوانگەی سەر ڕەقیو جیدالچیەتی خۆیانەوە وتیان: ئایا خوداكانی ئێمە باشترن یان عیسا؟ واتە خوداكانی ئێمە لەعیسا باشتر نین، جا كە عیسا بچێتە ناو ئاگرەوە با ئێمەشو خوداكانمان لەگەڵ عیساو فریشتەكاندا بچینە ناو ئاگرەوە، كافرەكان ئەم قسەیە ناكەن بۆئەوەی بگەنە حەقو لەڕاستی حاڵی بن، بەڵكوو مەبەستیان جەدەلو بۆڕدانی بەرامبەرەكەیانە، دەیانەوێ بەتاڵو پوچی خۆیان بچەسپێنن، پەیامی ئیسلام ڕەت بكەنەوە، بەڵكوو ئەوان گەلو نەتەوەیەكی كێشەكارو جەدەلخوازن، بەربەرەكانی حەق دەكەن.. ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذیو ئیبنو ماجەو ئیبنو جەریر لەئەبو ئومامەوە ڕیوایەت دەكەن دەڵێ: پێغەمبەر

(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلاّ أُوتُوا الْجَدَلَ». هەر گەلو نەتەوەیەك دوای هاتنی هیدایەت بۆ لایان گومڕابن ئیللا جەدەل و مقۆ مقۆیان تێدەکەوێ دەکەونە جەدەل و کێشەوە.. ئەمجار پەروەردگار ئەوە دەچەسپێنێ: کە عیسا بەندەی راستاڵی خودا بووە. دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ عیسا تەنها بەندەیەکی ئێمە بووە، نیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشیو کردمانە فروستادەی خۆمان، کردمانە نیشانەو عیبرەت بۆ نەتەوەی ئیسرائیل، کردمانە بەڵگەو دەلیل لەسەر خودایەتی خۆمان، چونکە بەبێ باوك هێنامانە دی، موعجیزەی گەورەمان بۆ دەستەبەر کردن: موعجیزەی مردوو زیندوو کردنەوەمان پێ بەخشی!

کوردی دەڵێ:

گەر وەکوو عیسا لەپاش مردن بەسەرما رابری
تجمع العظم الرميم تحييني بعد العدم

هەموو نەخۆشییەکی بە ئیزنی خودا چاك دەکردەوە، موعجیزەکانی لەبواری پزیشکیدا بوون، ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَائِكَةً فِي الْأَرْضِ يَخْلُفُونَ﴾ ئەگەر بمانویستایە ئێوەی ئادەمیزادمان دەفەوتاندو لەجیاتی ئێوە فریشتەمان دەخستە سەر زەویو ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی زەویمان دەخستە ئەستۆی ئەوان.

نەحوییەکان دەڵێن: وشەی (من) بۆ بەدەلییەتە واتە: لەشوێن ئێوە، لەجیاتی ئێوە فریشتەمان لەسەر زەوی بەدی دەهێنان.

هەندێکیش پێیان وایە: بۆ (تەبعیضە) واتە: ئەگەر بمانویستایە بڕێ لەئێوەمان دەکردە فریشتەو ببونایە جێگیری ئێوەو جێگای ئێوەیان پڕ بکردایەوە.

بەکورتی مەبەست ئەوەیە بفەرموێ: هەرچەند حاڵو وەزعی عیسا سەرسوڕهێنەرە، بەڵام خودا دەتوانێ لەوەش سەرسوڕهێنەر تر بەدی بێنێ،

هەمووشیان چ عیساو چ فریشتەکان بەندەی خودانو شیاوی ئەوەنین پەرستشیان بۆ بکرێ.

﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَاتَّبِعُونِ هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ بێگومان عیسا نیشانەی نزیکبوونەوەی رابوونی قیامەتە، هیچ شكو گومانتان نەبێ لە رابوونیدا، شوێن پەیامی من بکەونو ئەمە بە رێگای راستو رەوان بزانن. دەربارەی هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا بۆ سەر زەوی فەرموودەی جیا جیا هەنو ریوایەت کراون، ئەم ئایەتەش ئاماژەی پێ دەکا.

ئایەتەکە دوو قیرائەتی هەیە (لعِلْمٌ للساعة) یان (لَعَلَمٌ للساعة) هەردوو قیرائەتەکە ماناکەیان لێك نزیکە.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ ، لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلاً ، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ ، وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ ، وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ ، وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ ، حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ». سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە نزیکە عیسای کوڕی مەریەم وەکوو فەرمانڕەوایەکی عادڵ نازڵ بێتە سەرتان، صەلیب دەشکێنێ، بەراز دەکوژێ، جزیە دەستێنێ، ماڵو سامان بڵاودەکاتەوە، بەجۆرێك کەس نابێ وەری بگرێ بیروباوەڕی خەڵك وای لێ دێ سوجدەیەکیان لەلا لەهەموو دونیا بەنرختر دەبێ.

لە جابیرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ – قَالَ – فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ –صلى الله عليه وسلم– فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ تَعَالَ صَلِّ لَنَا. فَيَقُولُ لاَ. إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ. تَكْرِمَةَ اللَّهِ تعالى لِهَذِهِ الأُمَّةَ». اخرجه مسلم

هەڵبەتە نازڵبوونی عیسا نهێنییەکە لەو نهێنییانەی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆی گێڕاوینەوەو قورئان ئاماژەی پێ کردووە!

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: لە پێغەمبەرەوە هەواڵی (متواتر) ریوایەت کراون، هەموویان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە پێش رابوونی قیامەت عیسا دێتەوە سەر زەوی، فەرمانڕەوایی دەکا بە شێوەیەکی دادپەروەرانە.

﴿وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ الشَّيْطَانُ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ نەکەن بەگوێی شەیتان بکەن، وریا بن بە وەسوەسەو فرتو فێڵ لە شوێنکەوتنی حەق لاتان نەدا، رێگای گومڕا بوونتان لەپێش چاو جوان نەکا. بێگومان شەیتان دوژمنێکی سەرسەختی دێرینەی ئێوەی ئادەمیزادە، دوژمنایەتیەکەی بۆ ئێوە ئاشکرایە!

ئەمجار دوای ئەم لاکردنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ بەیانکردنی حەقیقەتی عیساو پەیامەکەی، دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَ عِيسَى بِالْبَيِّنَاتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِالْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ الَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کاتێك عیسا (عَلَيْهِ السَّلَام) کرا بە پێغەمبەرو هاتە سەرگەلەکەی، بانگەوازی خۆی راگەیاندو موعجیزەی ئاشکراو نومایانی لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی خۆی نواند، بەنەتەوەی ئیسرائیلی گوت: ئەمن پەیامی خودام بۆ هێناون، شەریعەتو یاسای گونجاو بۆ ژیانی دونیاو قیامەتم بۆ هاوردوون، شەریعەتێك پڕە لەحیکمەتو دانایی، ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ چاکەو نەهی لێ دەکا لەخراپە، بانگەواز دەکا بۆ خوداناسیو یەکتاپەرستی، بۆ ئیمان هێنان بەنامە ئاسمانییەکانو شوێنکەوتنی پێغەمبەرانی خودا، بۆ بڕواهێنان بەفریشتەو بەهاتنی رۆژی قیامەت، بەحیسابو لێکۆڵینەوەو پاداشو سزای رۆژی قیامەت، هەروەها بۆیە رەوانەکراوم تا برێ ئەحکامی تەوراتتان بۆ روون بکەمەوە، هەندێ شەریعەتو یاسای تەورات کە تێیدا کەوتوونە کێشەوە بۆتان یەکلا بکەمەوە، خۆتان لەتاوانو سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا بپارێزن، ئەوەی فەرمانتان پێ دەکەم لە یەکتاپەرستیو پابەندبوون بەشەریعەتو یاسای خوداوە بەگوێم بکەن. ئەمەش ناوەڕۆکی پەیامەکەیە:

﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ بێگومـان (الله) خـودای منو خودای ئێوەشو هەموو بونەوەرە، بەدڵسۆزی عیبـادەتی بـۆ بکەنو هـەر ئـەو بەخودا بزانن‌و پەرستش هەر بۆ ئەو بکەن. ئەمەیە ڕێگای ڕاستو سەرفرازی، هەر شوێنکەوتنی شەریعەتی خودا بەختەوەری دونیاو قیامەتی لێ وەدی دێ.

بێگومان عیسا بۆسەر گەلی جوولەکە ڕەوانەکرابوو، ئەوان پێش ئەوەی عیـسا بێتـە سـەریان‌و پـەیامی خودایـان بـۆ بێنـێ، زۆر کێـشەیان تێکـەوتبوو دەربـارەی شەریعەتی تەورات، لەبارەی سیاسیو کۆمەڵایەتیشەوە گیرۆدەی حوکمی ڕۆمانـەکان بووبوون. ژێردەستەو چینی چەوساوە بوون، چاوەڕوانی ڕەهبەرێك بوون ڕزگاریـان بکـا، چاوەڕوانییەکەیان درێـژەی کێـشا، کەچـی کەحـەزرەتی عیـسا هاتـە سـەریان‌و پەیامی خـودای پـێ ڕاگەیانـدن، دژی وەسـتان‌و بڕوایـان پـێ نـەکرد، ئەزیـەتیان دا، ویستیان لەخاچی بدەن!!

﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِن بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ ئەو تاقم‌و گرۆیانەی عیسایان بۆ سەر نێردرابـوو لـەناو خۆیانـدا کەوتنـە مقۆمقـۆو کێـشەوە، شـیوی وەیـل‌و عـەزابی بەشـیدەت بـۆ ئەوانـەی سـتەمکارن‌و پـەیامی خـودا ڕەت دەکەنەوە.

ئەوکاتە عیسا هاتە سەر گەل‌و نەتەوەی ئیسرائیل، بینی چەند گـرۆو تـاقم‌و خاوەن بیروباوەڕی جودا جودان، هـەرە تاقمـە سـەرەکیەکانیان چـوار تـاقم‌و تایەفـە بوون!

١- تایەفـەی (صـەدوقییەکان): کـە نیـسبەت دەدرێـن بـۆ لای (صـدوق): کـە بنەماڵەو خێزانێك بوون روتبەی (کەهانە)و وەزیفە ئایینیەکان بۆ ئەوان گـۆنترۆڵ کرابوو، ئەم بنەماڵە لە وەچەو نەوەی حـەزرەتی (هـارون)ی بـرای حـەزرەتی موسـا بـوون، پیـاوانی هەڵبـژاردەی ئـەم بنەماڵەیـە سـەروکاری هەیکـەلیان دەکـرد، بـەپێی وەزیفەو ئەرکە ئایینیەکـەیان تـا ئەندازەیـەك لـە ئەنجامـدانی عیبـادەت‌و طقوسـە ئایینیەکاندا توندڕەو بوون، بەڕواڵەت خۆیان بە پابەندبوو (ملتزم) دەخستە پـێش

چاو، بیدعەو تازەگەرییان رەت دەکردەوە، بەڵام لە واقیعدا خەریکی رابواردنو دونیا خۆری بوونو بەئارەزوی خۆیان رایان دەبوارد هیچ بڕوایان بەرابوونی قیامەت نەبوو.

٢- گروپی دووەم؛ فیریسییەکان بوون، ئەمانە بەپێچەوانەی صەدوقییەکان بوون، دژی توندڕەوی ئایینی بوون، زێدەڕەوی روالەتیو شەکلیاتی (طقوس)و عیبادەتیان نەدەکرد، بڕوایان بەزیندوبوونەوەو رابوونی قیامەتو حەقو حیساب هەبوو، دیاردەو نیشانەی سەرەکی ئەوان سۆفیلکەییو دونیا نەویستی بوو، هەرچەندە هەندێکیان حەزیان لەزانستو زانیاری هەبوو، بەزانیاریو زمانڕەوانی خۆیان دەنازین، حەزرەتی عیسا ئەم رەوەشتەی ئەوانی لا پەسەند نەبوو.

٣- گروپی سامیرینیەکان: ئەم تاقمو پێڕە پێکهاتەی جوولەکەو ئاشورییەکان بوون، بڕوایان بەپێنج کتێبە کۆنەکان هەبوو کە بە (کتێبە موسەوییەکان) دەناسران، هەرشتێکی لەسەر ئەم کتێبە زیاد کرابوو ئەوان رەتیان دەکردەوە.

٤- گروپی ئاسیین یان ئەسیینییەکان؛ ئەمانەش موتەئەثیر بوون بە بڕێ راو بۆچوونی رێبازە فەلسەفییەکانی پەیڕەو کراوی ئەو رۆژگارە. تا ئەندازەیەکی زۆر لەباقی گروپەکانی تر گۆشەگیر بوون خۆیان بەژیانی زبرو تەقەشوف راهێنابوو، بەباشی پەیڕەوکارانی خۆیانیان پەروەردە کرد.

جگە لەمانەش چەند گروپو تاقمو پێڕی تر هەبوون پەیڕەوکارانیان کەمو بە پەنجەی دەست دەژمێردران، خاوەنی بیروباوەڕی جیاجیاو سەیرو سەمەرە بوون، زۆربەی ئەم بیروباوەڕە جیاجیایانەیان بەهۆی بارگرانیو زبرو زەنگی رومانەکانەوە لەلا خولقابوو، هەموو ئەو گروپومیلەلو نیحەلو خاوەن رێبازانە چاوەڕوانی رزگار بوون بوون، دەیانویست فریادڕەسێکیان دەست کەوێو لەو ستەمو دەردە سەریو بیروباوەڕە جیاجیایانە رزگاریان بکا.

کە حەزرەتی مەسیح هاتوو پەیامی خۆی راگەیاند، بانگەوازی خۆی بڵاو کردەوە، وتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ رَبِّيء رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ﴾ شەریعەتی لێبوردەییو ئاسانکاریو

پوختەکردنی گیانو دەرونی راگەیاند، داوای کرد ئادەمیزادەکان پێش شەکلیاتو (طقوس)ەکان گرنگی بدەن بەدڵو دەرونو لەناوەوە خۆیان پاك بکەنەوە، رواڵەتکارە فێڵبازەکان بەگژیدا چوونەوە، بەر بەرەکانیان کرد، پەیامەکەیان رەت کردەوە.

پاشان کە حەزرەتی عیسا دونیای جێهێشتو بۆ لای پەروەردگاری خۆی گەڕایەوە، شوێنکەوتوانی دەربارەی کەوتنە کێشەو مقۆمقۆوە، بوون بەچەند تاقمو گروپو پێڕ، هەندێکیان کردویانە بەخودا، برێکیان بەکوڕی خودای لەقەڵەم دەدەن، تاقمێکیشیان دەیکەن بە ئالوثو دەڵێن: یەکێکە لە سێ ئوقنومەکان: واتە، دەڵێن: خودا لە سێ شت پێکهاتووە یەکێکیان عیسایە!! ئیتر پەیامی حەزرەتی عیسایان گۆڕیو هیچی بەسەر هیچەوە نەما، یەکتاپەرستیو دڵسۆزی لەخودا پەرستیدا بووبە عیسا پەرستیو کردنی بەهاوەڵی خودا، یان بەکوڕی خودا، ئایینەکەشی بووەتە (طقوس)و شەکلیاتی بێ ناوەڕۆك، کار گەیشتۆتە ئەوە: کابرا تا دەتوانێ تاوان دەکاو رادەبوێرێ، پاشان دەچێتە لای مامە قەشەو دان بەتاوانەکانیدا دەنێ، مامە قەشەش پسوڵەی لێخۆشبوون (صك غفران)ی پێ دەفرۆشێ گوایە بەو پسوڵە لەتاوانەکانی پاك دەبێتەوە!! ئەمجار دەست پێ دەکاتەوەو پاش ماوەیەك دەچێتەوە خزمەت مامە قەشەو هەر بەشێوەی جاری پێشوو سەوداو مامەڵەکەیان دەکەنەوە (وهلم جرا) کەوابێ عەزابی بەئێشو شیوی دۆزەخ بۆ ئەوانەیە کە پەیامی عیسایان بەو مەرەدە بردووە، بۆ ئەوانەیە، کەوتوونەتە کێشەوە دەربارەی سروشتی عیسا ئایا ناسوتییە یان لاهوتییە!!

ئەمجار موشریکەکانی قوڕەیشیش کەهاتوون کێشەو نیزاع دەنێنەوە لەگەڵ پێغەمبەردا دەربارەی عیسا، شوێنکەوتوانی عیساو موشریکەکانی عەرەب هەردوولایان ستەمکارن، لەحەق لایان داوەو گومڕان، حەتمەن سزایان لێ

دەسێندرێ، ئەویش لەرۆژی قیامەتدا بەتەواوی ئەنجام دەدرێ، رابوونی قیامەتیش چەندێك بووە غرێ چونكە هەردێ، هاتنی نزیكە.

﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ ئایا ئەوانەی پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنەوە چاوەڕوانی چین؟ جگە لەهاتنی قیامەت بەناگەهانیو ئەوان ئاگایان لەخۆ نابێ لەناكاوێك یەخەیان دەگرێو رزگاربوونیان نابێ. یان لەبەر هەڵەوگیربوونیان بەدونیاوە نازانن كەی قیامەت رادەبێ!!

بەكورتی هەموو پێغەمبەران بەئاشكرا بەگەلو نەتەوەكانیان راگەیاندووە: كە ئەوانیش وەكوو هەموو ئادەمیزادێكی تر بەندەی بێ دەسەڵاتی پەروەردگارن، نابێ هیچ ئادەمیزادێك لە پلەو پایەی ئادەمیزادییەتی خۆی بەرزبكرێتەوە.

كەوابێ حەزرەتی عیسا ئادەمیزادەو سروشتی ئادەمیزادی هەیە، رایەی ناكەوێ بگاتە پلەو پایەی خودایەتی، نەهاوەڵی خودایە، نەكوڕی خودایە، نە ئالوثە. ئادەمیزادێكە خودا روتبەی پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیوە، بەبێ ئەوەی باوكی هەبێ بەدیهێناوەو كردویەتی بەنیشانەی دەسەڵاتی خودایەتی خۆی. موعجیزەی گەورەو جۆراوجۆری لەسەر دەستی ئەو ئاشكرا كردووە، تا گەواهیدەر بن لەسەر راستی پەیامەكەی!

## جۆرەكانی نازو نیعمەتی بەهەشت بۆ خوداپەرستانو خۆپارێزان

﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَـٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدْخُلُوا۟

ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی کرد بەوە: کە لەوانەیە قیامەت کتوپڕ لەناکاوێك رابێ، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا بڕێ حاڵو وەزعی ئادەمیزادەکان بەیان دەکا: کە لەو رۆژەدا تێی دەکەون، هەروەها باسی نیعمەتە جۆراوجۆرو رازاوەکانی بەهەشتیش دەکا، ئەمجار باسی حاڵی دۆزەخییەکان دەکا، دیمەنی تێك هەڵچوونو دەمە دەمێی برادەرو خزمو دۆستو ناسیاوی دونیایی: کە لەناو دۆزەخدان رادەنوێنێ، لەهەمان کاتدا خواپەرستان لەناو نیعمەتەکانی بەهەشتدا رادەبوێرن!

دەفەرموێ: ﴿الآخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾ دۆستە دونیاییەکان، ئەوانەی لەونیادا دۆستو برادەر بوون، هەندێکیان دەبنە دوژمنو ناحەزی یەکتری جگە لەخواپەرستانو تەقواکاران ئەوان دۆستایەتیو خۆشەویستی دونیایان لەقیامەتدا بەردەوامو پایەدارە! واتە: هەموو خۆشەویستیو دۆستایەتییەك، کە لەسەر بنەمای خواپەرستی نەبێ دەبێتە دوژمنایەتیو بوغضاندن، مەگەر خۆشەویستیو دۆستایەتییەك لەبەر خاتری خودا بێ، ئەوە دەمێنێتەوە بۆ هەتا هەتایە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ

هُـمُ الظَّـالِمُونَ – البقـرة/٢٥٤﴾. یـان وەکـوو ئـەوەی: کـە حـەزرەتی ئیـبراهیم بـە نەتەوەکەی خۆی فـەرموو: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّـهِ أَوْثَانـًا مَّـوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِـي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَاكُمُ النَّـارُ وَمَـا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ – العنكبوت/٢٥﴾.

ئەمجار دێتە سەر باسکردنی نـازو نیعمـەتی خوداپێداوان و دەفـەرموێ: ﴿يَـا عِبَادِي لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ﴾ ئـەی بەنـدە راسـتاڵ و خۆپارێزەکـانم، ئـەی ئەوانـەی لـەدونیادا لەبـەر خـاتری خـودا یـەکترتان خـۆش دەویـست، ئـەمڕۆ لەعیقابی خودا مەترسن، ترسی داهاتووتان نەبێ، غەم و خەفەت بۆ نـازو نیعمـەتی دونیا مەخۆن، چونکە ئەوەی لە بەهەشـتدا بـۆ ئێـوە دەسـتەبەر کراوە نەبڕاوەیـەو زۆر لەنازو نیعمەتی دونیا بەلەززەت ترە.

﴿الَّـذِينَ آمَنُـوا بِآيَاتِنَـا وَكَـانُوا مُـسْلِمِينَ﴾ ئـەو نـازو نیعمەتـە نـەبڕاوە، ئـەو رەواندنـەوەی تـرس و غـەم و خەفەتـە بـۆ هـەموو کـەس نیـە، بـەڵکوو بـۆ ئـەو موسوڵمانانەیە بـڕوای تـەواویان بـە قورئـان هـەبووە، گەردنکەچی فـەرمانی خـودا بوون، بەدڵسۆزی عیبادەتیان بۆ خودا کردووە، واتە ئیمانی تـەواو لەدڵیانـدا بـووەو بەکردەوەش تەصدیقی ئیمانەکەیان کردووە!

موعتەمیری کوڕی سولەیمان لەباوکیـەوە ریوایـەت دەکا، دەڵێ: کـە قیامـەت رادەبێ و ئادەمیزاد زیندو دەکرێنەوە، هەموو کەس ترسیان لێ دەنیشێ، ئیتر یەکێك بانگ دەکا ﴿يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُـونَ﴾ ئادەمیزادەکان تـەماعی ئـەوەیان بەردەکـەوێ، کـە ئـەو بڕیـارە هـەموویان بگرێتـەوە، بـەڵام کـە بەشـوێنیدا دەگوترێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ﴾ ئیتر جگە لە موسوڵمانە راسـتاڵەکان ئەوانی تر ناهومێد دەبن!!

ئەمجار موژدەی کۆتاییان دەداتێ و دەفـەرموێ: ﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُـمْ تُحْبَـرُونَ﴾ ئـەی بەنـدە خـاوەن بـاوەڕو کـردەوە چاکەکان! بـچنە نـاو بەهەشـتەوە

خۆتان‌و خێزانە موسوڵمانەکانتان، لەناو بەهەشتدا بەخۆشی رابوێرن‌و بگوزەرێنن! بەختەوەرو شادمان بن، هەرچی حەزتان لێ بێ‌و ئارەزووی بکەن بۆتان ئامادەیە!

﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەبەهەشتدا جۆرەها خواردن‌و خواردنەوە، لەدەفری زێڕدا خواردنیان بەسەرا دەگەڕێنرێ، خواردنەوەشیان لەپیاڵەی زیودا بەسەردا دەگەڕێ. لەبەهەشتدا هەرچی دڵ بیخوازێ‌و چاو حەزی لێ بێ لەخواردن‌و خواردنەوە، لەبەرگ‌و پۆشاك‌و راخەرو قەصرو باڵەخانە، لەئامێرو قاپ‌و قاچاغ، لەدیمەنی رەنگاورەنگ‌و شوێنی حەوانەوە بەبێ وەغران بۆیان حازرە!!

﴿وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەو بەهەشتە رازاوە، بەهەموو ئەو نازو نیعمەتانەی تێیدایە بەمیراتی بۆ ئێوە دانراوە، خەلاتی ئێوە کراوە بەهۆی کردەوەی چاك‌و پەسەندی خۆتانەوە. کە لەدونیادا ئەنجامتان داوە، ئەرك‌و ماندوبوونتان کێشاوە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو دۆزەخیەك شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێ، بۆ ئەوەی پتر خەفەت بخوا، دەڵێ: ئەگەر خودا هیدایەتی بدامایە، لەپێڕی ئەو خوداپێداوانە دەبووم، هەموو بەهەشتییەکیش شوێنی خۆی لەدۆزەخدا دەبینێ، دەڵێ: ئەگەر خودا هیدایەتی نەداینایە هەرگیز ئێمە ئەم بەختەوەریەمان دەست نەدەکەوت. سوپاسی خودا دەکا: کە هیدایەتی داوەو لەو سزاو عەزابە رزگاری بووە. ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو کەسێك دوو شوێنی هەیە مەنزڵێك لەبەهەشتداو مەنزڵێك لە دۆزەخدا، کافر: کە دەچێتە دۆزەخەوە شوێنی موسوڵمان دەگرێ، موسوڵمانیش شوێنی کافرەکە لەبەهەشتدا دەگرێ. کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئاماژەیە بۆئەوە.

ئەمجار دوای باسکردنی خواردن و خواردنەوە باسی میوەهاتی بەهەشت دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ بۆ ئێوە ئامادەو بەیدەستە لەبەهەشتدا جگە لەخواردن و خواردنەوە جۆرەها میوەهات، بۆ خۆتان بەویستی خۆتان هەڵدەبژێرن و لێی دەخۆن، هەر میوەیەك لێ بکەنەوە میوەیەکی تری لەشوێن دێتە دی!!

## سزای دۆزەخییەکان

﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ (٧٤) لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ (٧٥) وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ (٧٦) وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ (٧٧) لَقَدْ جِئْنَاكُمْ بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ (٧٨) أَمْ أَبْرَمُوا أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ (٧٩) أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ (٨٠)﴾

ئوسلوبی قورئان وایە هەر کاتێ باسی شتێکی کرد بەرامبەرەکەشی دێنێ، کەباسی بەهەشتی کرد باسی دۆزەخیش دێنێ، هەڕەشەی کرد موژدەش دەدا، باسی دونیا بکا، قیامەت پاشگوێ ناخا، هەر لەم روانگەوە لەئایەتەکانی پێشوودا حاڵ و وەزعی بەهەشتییەکانی رانواندو بەشوێن ئەوەشدا حاڵی دۆزەخیەکانی خستە ڕوو.

لەوەپێش وادەی دا بەخوداپەرستان بەدوی ئەوەدا هەڕەشەی لەتاوانباران کرد، لەوەپێش باسی ئەو نازو نیعمەتەی کرد: کە بۆ بەهەشتییەکان ئامادە کراوە

ئـەمجار لێـرەدا باسـی ئـەو عـەزابو سـزایە دەکـا: کـە بـۆ کافرەکـان ئامـادە کـراوە، دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ﴾ بێگومـان ئەوانـەی کـافرو بـێ بـڕوان، ئەوانـەی لـەونیادا هاوەڵیـان بـۆ خـودا دانـاوە، پـەیامی پێغەمبـەریان رەت کردۆتەوە ئەوانە دۆزەخینو لەعەزابی دۆزەخدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە.

﴿لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ ئـەو سـزا سـەختەیان لەسـەر سـوك نـاکرێ، ساتەوەختێك لەکۆڵیان نابێتەوە، ئەوانە ناهومێدن لەوەی رزگاریان بێ، خەفەتبارو دڵتەنگو جەستە بەئازارن، ناهومێد بوونەکەیان ئەوەندەی تر عەزابەکەیانی گران کردووە ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِن كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ﴾ ئێمە بەبێ هۆ بەبێ تـاوان سـزایان نادەین ستەمیان لێ ناکـەین، بـەڵکوو ئـەوان بۆخۆیـان سـتەمیان لـەخۆیان کـردووە، خۆیان تاوانبـار کـردووەو بەدەسـتی خۆیـان وایـان لـەخۆیان کـردووە شـیاوی سـزای دۆزەخ بن، بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیان ئەو عەزابـە دەچێژن، ئـەوان لـەدونیادا بڕوایـان بـەخودا نـەبووە، پـەیامی پێغەمبـەرانیان رەتکردۆتـەوە، لەپاسـاوی ئـەو بیروباوەڕو هـەڵسو کەوتانەیانـدا خـودا لـە دۆزەخـدا بـۆ هـەتا هەتایـە سـزایان دەدا. سزاکەیان پڕاوپڕی کردەوەکانیانە، خودا ستەم لەکەس ناکا وەڵێ ئەوانـە بـۆ خۆیـان ستەمیان لەخۆیان کردووە.

﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ﴾ تاوانباران بانگ دەکـەنو دەڵـێن: ئـەی حـازینو کاربەدەسـتی دۆزەخ! بـا خـودا بمـانکوژێو ئـەم ژیانـەمان لێ وەربگرێتەوە، بەڵکوو بۆ خۆمان ئیسراحەت بکەین، ئەم عـەزابو ئـێشو ئازارەمـان لەکۆڵ بێتەوە، هەڵبەتـە ئەمـە هـاوارو دادو فیغانێکـە بـۆ رزگـاربوونو فریادرەسـی نیـە، ئەوانـە ناهومێـدو بـێ دەرەتـانن، دڵنیـان: لـەوە کـە رزگاریـان نابـێ، بـەڵکوو بانگکردنەکەیان بۆ مردنو لەناوچوونە، دەیانەوێ بمرنو لـەکۆڵ ببنـەوە، داواکـاری ئەوەن زوو گیانیان دەرچێو ئیسراحەت بکەن!

بەراستی بەسە بۆ سەختی سزایان، کە مردن بەئاوات بخوازن. دیارە عەزابەکەیان هێندە سەختو دژوارە هەموو سەنتەرێکی لێ ون کردوون، لەوە دەرچووە بتوانن خۆی بۆ رابگرنو تەحەمولی بکەن!

بۆیە ئەم هاوارە تاڵو دژوارەیان لێوە دەردەچێ، ئەوان دەرگایان لێ گاڵ دراونو سزایان بۆ سەخت کراوە، عەزاب بەدەوامو نەبڕاوەیە، تا خودا حەزبکا دژوارو بەئازارە، نامرنو رزگاریان نابێ، عەزاب لەسەریان سوك نابێ تا پشوویەك بدەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا – فاطر/٣٦﴾. ئەوانە نە ژیانیان ژیانەو نەدەمرنو ببڕێتەوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَى – الأعلى/١٣﴾.

بەڵێ سزایان هێندە دژوارو بەئازارە، هاوار دەکەنە فریشتە بەرپرسەکانی دۆزەخ: کە لەخودا بپاڕێنەوە تەنها رۆژێك عەزابیان لەسەر سوك بکرێ، فریشتەکانیش رەدیان دەدەنەوە ئەوەندەی تر ناهومێدیان دەکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ الْعَذَابِ، ﴿قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ – غافر/٤٩ – ٥٠﴾

بەڵێ هاوار دەکەن مالیکی دۆزەخ داوا بکا خودا بیانمرێنێ، بەڵام وەڵامی هاوارو دادو فیغانیان وەڵامێکی گورچکبڕە، ئەوەندەی تر مەئیوسو ریسوایان دەکا، هێندەی تر عەزابەکەیان سەخت دەکا!! پێیان دەگوترێ: چیتر چەڵتەچەڵت مەکەن ئێوە لەم عەزابەدا هەتا هەتایە دەمێننەوە.

دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جِئْنَاكُم بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ﴾ بێگومان ئێمە حەقو راستیمان بۆ روونکردنەوە، پێغەمبەرمان بۆ سەر رەوان کردن، نامەی ئاسمانیمان بۆ ناردوون، پێغەمبەرانو بانگخوازانی ئایینی خوا بانگەوازییان کردن بۆ رێگای راست، بۆ ئیمان بەخوداو بە پێغەمبەرایەتیو بە زیندوبوونەوەو

رابوونی قیامەت. کەچی ئێوە پشتتان هەڵکردو پێغەمبەرانتان بەدرۆخستەوە، کافر بوونو سەرپێچیتان کردو پەیامی خوداتان رەتکردەوە. هەموو ئێوەی دۆزەخی دژی حەق بوونو ئایینی خوداتان رەت کردۆتەوە.

ئەمجار پەروەردگار چۆنیەتی فرتو فێڵو خراپەکاریی کافرەکان بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿ أَمْ أَبْرَمُوا أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ﴾ بەڵکوو ئەو موشریکانە هەوڵیان داوە پیلانی خەتەرناكو توندوتۆڵ دژی پێغەمبەر دابڕێژن، وەکوو ئەو موئامەرەی لە (دار الندوة)دا. قورەیشییەکان نەخشەیان بۆ کێشاو پیلانی کوشتن یان بەندکردن، یان وەدەرنان لەمەککەیان بۆ داڕشت. واتە: هەرکاتێ موشریکەکان پیلانێك دژی موحەممەد دابڕێژن، ئێمە پیلانی سزادانیان بۆ دادەڕێژین، هەتا ئەوان خراپەکاریی رەچاو بکەن ئێمە عەزابیان بۆ ئامادە دەکەین، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ – النمل/٥٠﴾. ئەوانە دەرەقەتی ئێمە نایەن، چەندێك خراپەکاریی بکەن ئێمە سزایان توند دەکەینو عەزابی سەختیان بۆ ئامادە دەکەین!

﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ بەڵکوو ئەوان پێیان وایە ئێمە ئاگاداری نهێنیو چپەکانیان نین، ئایا وا دەزانن کە بەنهێنیو ئاشکرا پیلان دادەڕێژن ئێمە لێیان بێ ئاگاین، نا نا باوا نەزانن، ئێمە ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتێکیانین؟ بەڵێ: ئێمە ئاگامان لەهەموو شتێکیان هەیە فریشتە چاودێرەکانمان بەسەریانەوەنو ئاگایان لەهەموو هەڵسوکەوتێکیانە، چی دەڵێنو چی دەکەنو چییان بەسەر دڵدا رادەبورێ ئەوان دەینووسن، هیچ شتێکیان فەرامۆش ناکەن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ، مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ – ق/١٧ – ١٨﴾.

جا كە ئەوە واقیعی حاڵە، دەبێ ئەوانە بە چ عەقڵێك خۆیان لەخودا بشارنەوە، دڵنیا بن ئەوانە هەر پیلانو فێڵێك نەخشەكێش بكەن بەسەر خۆیاندا دەشكێتەوە.

**پەروەردگار بەرزو پاكو بێگەردە لەوەی منداڵو هاوەڵی هەبێ**

﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾

دوای بەیانکردنی حاڵو وەزعی تاوانبارە کافرەکان لەدۆزەخدا، ئەمجار ئەوە بەیان دەکا: کە پەروەردگار بێ هاوسەرو بێ منداڵو بێ هاوەڵە، خودایەکی تاكو تەنهاو بەرزو پیرۆزە، هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ کردنە، هەر ئەو خودای بوونەوەرە، هەموو بڕیارێك لە بوونەوەردا، بەدەست خودایە، ئەو بتو صەنەمانەی کە بتپەرستەکان بەخودایان دەزانن و عیبادەتیان بۆ دەکەن هیچ سودو زیانێکیان بەدەست نیەو هیچیان بۆ ناکرێ، ئەو کافرانە خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە، ئەگەر لێیان پرسیار بکرێ کێ ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە، دەڵێن: خودا دروستی کردوون، کەچی هاوەڵی بۆ دادەنێن!!

دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾ ئەی محمد! بەو موشریکانە بڵێ: ئەگەر پەروەردگار کوڕی هەبێ ئەوە من یەکەم کەس دەبم عیبادەتم بۆ ئەو کوڕە دەکرد.

موشریکەکان فریشتەیان دەپەرست لەم رووەوە کە پێیان وابووکچی خودان، جا ئەگەر خودا کوڕی هەبوایە شیاترین کەس بۆ بەندایەتیکردن بۆ ئەو کوڕەو زانیاری لەو بارەوە پێغەمبەرە ئەو لەهەموو کەس زیاتر لەخوداوە نزیکەو لەهەموو کەس خێراترە بۆ بەندایەتیکردنی خواو ڕێزگرتن لەکوڕەکەی، ئەگەر لەفەرزێکدا کوڕی هەبێ. دەی خۆ پێغەمبەر جگە لەخودا کەسی تر ناپەرستێ کەوابوو ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە خوداکوڕو کچی نین، ئەو بیروباوەڕەی موشریکەکان بێ ئەصڵو ئەساسەو هیچ بەڵگەو دەلیلێك پشتگیریی ناکا.

ڕستەی ﴿إِن كَانَ لِلرَّحْمَنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾ جوملەیەکی شەرتییە لەبارەی لەفظو مەعناوە، پێکهاتەی شەرتو جەزایە، شەرتەکە نابێو دروستیش نیە ببێ، کەوابێ جەزاکەشی نایەو نابێ. ئەم جۆرە ئوسلوبە بەلیغترین ئوسلوبە بۆ نەفی کردن، وەکوو ئەوە تۆ لەکاتی دەمە دەمێو موناقەشەدا بە بەرامبەرەکەت

دێژی: ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێی بەڵگەی لەسەر بێ من یەکەم کەس دەبم: کەبڕوات پێ دەکەم.

ئەم ئایەتە وەکوو ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّـهُ لَفَسَدَتَا – الأنبياء/٢٢﴾. دەی خۆ فەساد نەبووە، کەوابوو جگە لەخودا خودای تر نین!!

هەندێ لە موفەسیرین پێیان وایە (العابدین)، لە (عَبِدَ يَعْبَدُ) وەرگیراوە، واتە: بەگوێرەی عیلمی صەرف لە (بابی دووەمە) نەك (بابی یەکەم). ئەوکاتە (العابدین) بەمانا (الأنفین)ە، واتە: ئەگەر خودا کوڕی هەبێ من یەکەم کەس دەبم: کە لەبەندایەتی بۆ کردنی خۆم بگرمەوەو بەندایەتی بۆ نەکەم!!

وەڵێ ئەم مانایە رەخنەی زۆری لێ گیراوەو لەتەفسیرەکاندا بەدورو درێژی لەسەری نووسراوە.

﴿سُبْحَانَ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاكو مونەززەهی بۆ خودایە لەهەموو عەیبو خەوشێك، لەهەموو ئەو شتانەی موشریکەکان وەپاڵی دەدەنو شیاوی خودایەتی نیە، بەرزیو پیرۆزیی بۆ خودایە لەوەی کە منداڵی هەبێ، هاوەڵی هەبێ، خودا خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییە، خاوەنی عەرشی بەرینە، کە بوونەوەری دەورەداوە، خودا زۆر دوورە لەوەی وەپاڵی دەدەنو دەڵێن: خودا هاوەڵو منداڵی هەن!!

﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! وازیان لێ بێنە با لەنەزانیو گومڕایی خۆیاندا بمێننەوە، با لەدونیادا رابوێرنو لەززەتو خۆشی بچێژن، هەتا تووشی رۆژی قیامەت دەبن، ئەو رۆژەی هەڕەشەیان پێ لێ کراوە، جا ئەوکاتە بەبرینی خۆیان دەزاننو بۆیان دەردەکەوێ چەند ماڵوێرانن، چەند بەدبەختو چارە رەشن.

﴿وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاء إِلَهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَهٌ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ﴾ ئەو زاتەی من دەیپەرستم‌و بەخودای دەزانم هەر ئەو لەئاسماندا خودایەو لەسەر زەوی خودایە، هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆ کردنە، کەسی تر شیاوی خوایەتی نیە، هەر ئەو زاناو دانایە لەبەڕێوەبردنی مەخلوقاتی خۆیدا، بێ هاوەڵ‌و منداڵە بێ جێگەو مەکانە، لەشوێنێکی تایبەتیدا نیە، بەڵکوو خوداو پەروەردگاری هەموو بوونەوەرە، لەهەموو شوێنێکە، زەمان‌و مەکان کۆنترۆڵی ناکاو لەخۆی ناگرن.

﴿وَتَبَارَكَ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ بەرزو گەورەو پیرۆزە ئەو خودایەی خاوەنی ئاسمانەکان‌و خاوەنی زەوی‌و ئەو شتانەی لەناویاندایە بەئاوو هەواو گیانلەبەرو ئادەمیزادیەوە، زانینی کاتی رابوونی قیامەت تایبەتە بەخۆیەوەو هەر ئەو دەزانێ کەی قیامەت هەڵدەستێ، گەڕانەوەی هەموو شتێك بۆ لای ئەوە، هەر خۆی فەرمانڕەواو خاوەنی رۆژی جەزایە، حیساب‌و لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەموو کەس دەکا، سزاو پاداشی هەموو کەس دەداتەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە! دەی ئەم دەسەڵات‌و فەرمانڕەواییە رەهایە، دژی ئەوەیە خودا منداڵی هەبێ، یان هاوەڵی هەبێ، چونکە خودا ئاتاجی هیچ کەس نیە، پێویستی بەیارمەتیدانی هیچ مەخلوقێك نیە. دەسەڵاتی رەهاو بێ سنوری هەیە، هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا، کەس نیە ببێتە لەمپەڕو کۆسپ لەبەردەمیدا.

﴿وَلَا يَمْلِكُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەوبت‌و صەنەمانەی ئەو موشریکانە بەندایەتییان بۆ دەکەن، هەروەها هەموو پەرستراوێك جگە لەخودا دەسەڵاتی هیچیان نیە، شەفاعەتیان بۆ ناکرێ‌و لێیان وەرناگیرێ، وەڵێ کەسێك ئیمانی بەخودا هێنابێ، بەدڵنیایی‌و لەناخەوە بڕوای کردبێ، کەخودا تاك‌و تەنهاو بێ هاوەڵ‌و بێ منداڵە، ئەوە بەئیزنی خودا شەفاعەتەکەی لای خودا وەرگیراوەو پەسەندە، کە دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾

ئاماژەیە بەوە: کە بیروباوەڕ دەبێ لەناخەوە بنچی داکوتابێ‌و لەروانگەی زانستو بەرچاو رونییەوە سەرچاوەی گرتبێ.

ئەمجار پەروەردگار باسی ئەوە دەکا: کە موشریکەکان بۆ خۆیان خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە، دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ سوێندبێ، ئەگەر تۆ ئەی پێغەمبەر! پرسیار لەو موشریکانە بکەی کێ ئەوانی دروست کردووە؟ کێ بەدیهێنەرە؟ یەکسەر وەڵام دەدەنەوە دەڵێن: خودا ئێمەی دروست کردووە، بەدیهێنەر هەر ئەوە، هەموو شتێك خودا دروستی کردووە، کەچی لەهەمان کاتدا لەتەك خودادا بەندایەتی بۆ شتی تر دەکەن! شتێك دەکەنە هاوەڵی خودا: کە دەسەڵاتی هیچی نیە، خاوەنی هیچ نیە، دەی چۆن لەگەڵ عیبادەت کردن بۆ خودا بەندایەتی شتی تر دەکەن؟ بەڕاستی ئەوانە بەم جۆرە هەڵوێستانەیان خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە لەوپەڕی نەفامی‌و گومڕاییدان!

جێگای سەرسوڕمان‌و سەرمنجدانە، بەچ عەقڵێك دان بەوەدا دەنێن کە خودا بەدیهێنەرە، کەچی هاوەڵی بۆ دادەنێن! ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ، کە ئاگاداری شکواو پاڕانەوەی پێغەمبەرە، کە قورەیشییەکان ئیمانی پێ ناهێنن، دەفەرموێ: ﴿وَقِيلِهِ يَارَبِّ إِنَّ هَؤُلَاء قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: خودا زانایە بەوتەی پێغەمبەرو گوێی لێیە: کە هاوار دەکاو دەڵێ: ئەی خودایە! ئەمانەی بۆسەریان رەوانە کراوم گەل‌و نەتەوەیەکن ئیمانم پێ ناهێنن، بڕوا بە پێغەمبەرێتیم ناکەن، بەشێت‌و جادوبازم لەقەڵەم دەدەن، گاڵتە بەپەیامەکەم دەکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا – الفرقان/٣٠﴾.

﴿فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! رویان لێ وەرگێڕە، بیانبوغزێنە گوێ مەدە بەو قسەو بوختان‌و بیروباوەڕانەیان، دڵتەنگ مەبە بەوەی پێت دەڵێن شاعیرو ساحیرە، صەبر بگرە لەسەر بانگەوازی خۆت، هەتا

وادەی خودا دێتەجێ، پێیان بڵێ: مـن دەمـەوێ لەگـەڵتان بەئاشـتەوایی هەڵبکـەم‌و بەتەبایی بمێنمەوە، لەوە بەولاوە سەرەنجامی کوفرو بێدینی خۆتان دەزانـن، بۆتـان دەردەکەوێ چەند بەدبەخت‌و چارە ڕەشن! ئەمە هەڕەشەیەکی توندە لـەکافرەکان‌و وادەو بەڵێنـە بـە سـەرکەوتنی موسـوڵمانەکان، وادەو هەڕەشـەی خـودا هاتـە دی، پێغەمبـەرو موسـوڵمانانی بـاڵا دەسـت کـرد، قـەڵای کـوفرو شـیرکی روخانـد، نیـوە دورگەی عەرەبی لە بیروباوەڕی پیسی ئەوان پاك کردەوە، خـەڵك پـۆل پـۆل دەسـتە دەستە دەهاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە، هێندەی پێ نەچوو هـەردوو ئیمپراتۆریـەت‌و زلهێـزی جیهـانی ئەوکاتـە: کـە بریتـی بـوون لـەفارس‌و ڕۆم لێکـی هەڵوەشـاندن‌و خستنیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی (الدخان)

ئەم سورەتە ناوی نراوە سورەتی (الدخان) چونکە هەڕەشەی لە موشـریکەکان دەکا بەگرانی‌و بێ بارانی‌و برسیایەتیەك، برسییەکان هـەواو فـەضـای زوور خۆیـان وەکوو دوکەڵ دێتە بەرچاو، هەروا هەڕەشە لەچینەکانی داهاتووی ئـادەمیزاد دەکا بە پەیـدابوونی دوکەڵێك بـۆ مـاوەی چـل ڕۆژ، ئەمـەش دەبێتـە نیـشانەی ڕابـوونی قیامەت.

سورەتەکە هەمووی یەکپارچەیی پێوە دیارەو لەیەك میحوەردا دەسوڕێتەوەو هەموو هێڵەکانی دەچنەوە سەر یەك جەمسەرو بۆ یەك مەبەسـت ئاڕاسـتە کـراون، ئـەویش وشـیارکردنەوەی دڵەکانــە بـۆ بـەپیرەوە چـوونی حەقیقـەتی ئیمـان‌و چەسـپاندنی بنــەما سـەرەکیەکانی ئیمـان: کـە لەسـێ خـاڵی سـەرەکیدا خۆیـان دەبیننــەوەو بــریتین لــە (تەوحیــد، پێغەمبەرایــەتی، ڕابــوونی قیامــەت‌و زیندوبوونـەوە). بـۆ چەسـپاندن‌و سـەلماندنی ئـەم سـێ بنـەما سـەرەکییانە چیرۆك

دەگێڕێتەوە، دیمەنەکانی قیامەت رادەنوێنێ، لەناوچوونو فەوتانی ستەمکارانی بوغراو گومڕا نمایش دەکا، دیمەنە کەونییەکان دەخاتەڕو بەڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ لەوەتەری دڵەکان دەداو وەئاگایان دێنێتەوە.

**پەیوەندی ئەم سوورەتە بە سورەتی پێشەوەی لەچەند روویەکەوەیە :**

١- هەردوو سورەتەکە بەسوێند خواردن بە قورئان دەست پێ دەکەن!

٢- کۆتایی سورەتی پێشوو سەرەتای ئەم سورەتە زۆر لێک دەچن، ئەوەتا سورەتی (الزخرف) بە هەڕەشەو ترساندن کۆتایی دێ فەرمووی: ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ – الزخرف/٨٣﴾ چۆنیەتی ئەو رۆژە ترسناکە هەڕەشە پێ لێکراوەی بەیان نەکرد بەڵام لە سورەتی (الدخان)دا چۆنیەتی رۆژەکەی دیاریی کرد، فەرمووی: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ – الدخان/١٠﴾.

٣- لێکچوونی وتەی پێغەمبەری ئیسلام بە نەتەوەکەی کە لەسورەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿يَارَبِّ إِنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ – الزخرف/٨٨﴾ لەگەڵ وتەی حەزرەتی مووسا کە لەم سورەتەدا پەروەردگار دەربارەی ئەو زاتە دەفەرموێ: ﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ – الدخان/٢٢﴾ هەروەها حەزرەت مووسا فەرمووی: ﴿وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ، وَإِنْ لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ – سورة الدخان/٢٠-٢١﴾.

سورەتەکە بە باسکردنی قورئانو چۆنیەتی نازڵبوونی لەشەوێکی پیرۆزو پڕ خێرو بێردا دەست پێ دەکا: کە شەوی قەدرەو لە مانگی رەمەزاندایە.

ئەوە رادەگەیەنێ: کە لەو شەوەدا هەموو فەرمانو بڕیارێك یەکالا دەکرێتەوە. نازڵبوونی قورئان بەو شێوەو لەو شەوە پیرۆزەدا رەحمەتی خودایە بۆ بەندەکانی، هەروەها هەڕەشەو ئینزارە بۆئەوەی لەسەرەنجامی سەرڕەقی خۆیان بترسن، تۆبە

بکەنو بۆ لای خودای خۆیان بگەڕێنەوە. ئەمجار هەوڵی ئەوە دەدا بە ئادەمیزادان بناسێنێو تاكو تەنهایی ئەو زاتە لە زاتو لە صیفاتدا بسەلمێنێ.

ئەمجار هەڵوێستی نادروستی کافرەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ – الدخان/٩﴾ پاشان هەڕەشەیان لێ دەکا سزای شكو گومانەکەیان دیاری دەکا، دەفەرموێ: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ، يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ – الدخان/١٠-١١﴾.

ئەمجار باسی موشریکەکانی مەککە دەکا بەوە: کە گەلو نەتەوەیەکن ئیمان بە تاكو تەنهایی خودا ناهێننو بەتەمانین دوای مردن زیندوو ببنەوە. دەڵێن: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا مَوْتَتُنَا الْأُولَى وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ – الدخان/٣٥﴾ کۆتایی سورەتەکە بە هەڕەشەیەکی ترسناك دێنێو دەفەرموێ: ﴿فَارْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ – الدخان/٥٩﴾.

بەکورتی سورەتەکە کە لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی لەوەتەری دڵەکان دەدا، هێرش دەباتە سەر دڵو دەروونەکانو دەیانترسێنێ، دیمەنی جۆراو جۆریان نیشان دەدا، بەنێو بوونەوەردا هاتوو چۆیان پێ دەکا، ئاسمانەکانو زەوییان پێ دەگێڕێ، دونیاو قیامەتیان نیشان دەدا بەهەشتو دۆزەخیان بۆ رادەنوێنێ، رابوردوو داهاتوویان بۆ شی دەکاتەوە، نهێنیو ئاشکرا، مردنو ژیان، یاساو نیظامی خودا لە بونەوەردا، ئەمانە هەموو تاووتوێ دەکاو دەیانکاتە بەڵگەو نیشانەی تاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرێتیو زیندو بوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو پاداشو سزا بەگوێرەی کردەوەی بەندەکان لەژیانی دونیایاندا چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە.

## نازڵکردنی قورئان لەشەوی قەدردا

﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ يَلۡعَبُونَ ﴿٩﴾ ﴾

ئەم سورەتە بە دوو پیت دەست پێ دەكا (حا، میم) پەروەردگار سوێند دەخوا بەو دوو پیتەو بەو قورئانەی لەجۆری ئەو پیتانە پێك هاتووە، لەوەپێش چەند جارێك ئاماژەمان بۆ ماناو مەبەست لەو جۆرە پیتە پچڕ پچڕانەی سەرەتای سورەتەكان كردووە، تەفسیری پەسەندمان دیاری كردووە، هەڵبەتە: كە پەروەردگار سوێند بەو پیتانەو بە قورئانی پێكهاتوو لەو پیتانە دەخوا، ئاماژە بۆ مەسەلەیەكی گرنگ دەكا، ئەویش ئەوەیە: كە هەموو پیتێك خۆی لەخۆیدا موعجیزەیەكی حەقیقیو نیشانەیەكی گەورەو گرنگە لە پێكهاتەی ئادەمیزاددا، كە دەتوانێ قسە بكا، ئەو پیتانەی وشەو رستەكانیان لێ پێك دێ ریزیان بكاو یەك بەدوای یەكداو هەریەكەیان لە مەخرەجی خۆیەوە دەربچێ، تێگەیشتن لە پەیوەندی نێوان ناوی

پیتەکەو دەنگەکەی و دەسەلاتی ئادەمیزاد بەسەر ئەوەدا: کە دەتوانێ زانیاری لەو پیت و شانە وەربگرێ، ئەمانەو گەلێکی تر نیشانەی دەسەلاتی رەهای پەروەردگارن!

﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾ ئێمە ئەو قورئانەمان نازڵ کردووە، لە شەوێکی پیرۆزو پڕ پیت و بەرەکەتدا: کە شەوی (قەدرە) وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ – القدر/١﴾ ئەو شەوە پیرۆزە شەوێکە لە مانگی رەمەزان، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ – البقرة/١٨٥﴾ لێرەدا دوو تەفسیر هەیە:

١- دەتوانین بڵێین: لەو شەوەدا سەرەتای قورئان نازڵ بووە، ئەمجار سورەت سورەت و ئایەت ئایەت لەماوەی (٢٣) ساڵدا هەمووی نازڵ بووە.

٢- یان هەموو قورئان لەشەوی قەدردا لە (لوح المحفوظ)ەوە نازڵ بووە بۆ ئاسمانی دونیا. ئەمجار لەوێوە بەگوێرەی روداوو پێویستی لەماوەی (٢٣) ساڵدا نازڵ بووە.

ئێمە بەو قورئانە ئادەمیزاد دەترسێنین لە سزای بەئێش و دژوار، پێمان راگەیاندون خۆیان لە عەزابی ئێمە بپارێزن، نەچن هاوەڵ بۆ خودا دابنێن و تاوان ئەنجام بدەن، ئەو قورئانەمان بۆ کردوون بە بەرنامەی ژیانیان، لەوێدا هەموو شتێکمان بۆ روون کردونەوە، چاك و خراپمان بۆ دەستنیشان کردوون، حەق و بەتاڵمان بۆ لێك جیاکردونەوە هەندێك لە موفەسیرین پێیان وایە ئەو شەوە پیرۆزەی قورئانی تێدا هاتۆتە خوار شەوی نیوەی مانگی شابانە، بەلام ئەم رایە پەسەند ناکرێ چونکە ئایەتی ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ – القدر/١﴾ مانای واضیحەو دەقە لەوەدا: کە ئەو شەوە پیرۆزە شەوی قەدرە. ئایەتی ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ﴾یش هەر رێگە نادا ئەو شەوە پیرۆزە بە شەوی نیوەی شابان

دابنێین. بەڵێ بەڕاستی ئەو شەوە شەوێکی پیرۆزو پڕ فەڕو بەرەکەتە، چونکە ئەو دەرگا خێرە لە مرۆڤایەتی کرایەوە، ئەو پەیامە پیرۆزەی تێدا دابەزیو ئەو پەیامە خوداییە لە ژیانی ئادەمیزاددا چەسپا، ئادەمیزادی لەخەوی غەفڵەت وەئاگا هێناو لە کۆیلەو بەندایەتی رزگاری کرد، یاسایەکی گونجاو لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد بەتایبەتیو لەگەڵ بوونەوەردا بەگشتی هێنایە کایەوە، لەژێر سایەی ئەو یاساو شەریعەتەدا ئادەمیزاد لەسەر زەوی دەژیاو پەیوەستە بە ئاسمانەوە، لەو شەوەدا پەیامێك لە ئاسمانەوە دابەزی پەیڕەوکردنی مایەی بەختەوەریی ژیانی دونیاو قیامەتە، مەنهەجو یاسایەکی تێرو تەسەلو تۆکمەو بێ کەمو کوڕییە، دەصولحێ بۆ دامەزراندنی ژیانێکی مرۆڤانەی نموزەجی لەهەموو کاتو شوێنێکدا، ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ لەشەوی قەدردا هەموو کاروبارێکی بوونەوەر بەگشتیو هی ئادەمیزاد بەتایبەتی یەکالا دەکرێتەوە، هەرچی لە ساڵدا روو دەدا لە مردنو ژیانو رزقو رۆژیو خێرو شەڕو خۆشیو ناخۆشی... هتد دەست نیشان دەکرێ!

یان لەو شەوەدا هەموو کاروبارێکی موحکەمو نەگۆڕ دیاری دەکرێن، هەر بڕیارو حوکمو یاسایەك لەو شەوەدا ئاشکرا بکرێ گۆڕانی بەسەردا نایە، لەو شەوەدا ئەحکامی گونجاو بۆ هیدایەتدانی ئادەمیزادو مایەی بەختەوەریی دونیاو قیامەت نازڵ بووە سەر زەوی، بێگومان نازڵبوونی قورئان بەگرنگترین رووداوی بوونەوەر دەژمێردرێ، ئەو شەوەش پیرۆزترین شەوە چونکە قورئانی تێدا نازڵ بووە، هەر لەو شەوەدا هەموو کاروبارێکی حیکمەت ئامێز لێك هەڵدەهاوێرێنو دەستنیشان دەکرێن.

﴿أَمْرًا مِّنْ عِندِنَا إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ﴾ پەروەردگار قورئانی نازڵ کردووە لەلایەن خۆیەوە، نیگاو شەریعەتی خودایە بۆ وەئاگا هێنانەوەی ئادەمیزاد، بۆ ترساندنو مژدە پێدانی، پێغەمبەری ئیسلامو هەموو پێغەمبەرانی ترمان رەوانە کردووە بۆ سەر ئادەمیزاد بۆئەوەی ئایاتی خودایان پێ بگاو بیخوێننەوەو تێی بفکرن.

﴿رَحْمَـةً مِّـن رَّبِّـكَ﴾ نـاردنی پێغەمبـەران بـۆ سـەر ئـادەمیزاد رەنگدانـەوەی رەحمەتو بەزەیی خودایە بۆ بەندەکانی، بۆ رونکردنەوەی چاكو خراپە بۆیان، بۆ دیاریکردنی قازانجو زیانیانـە، بـۆ ئەوەیـە رۆژی قیامـەت بیانوویـان نـەبێو نـەڵێن خودایە ئێمە بێ ئاگابووین، پەیامی پێغەمبەران رەحمەتێکی بـەردەوامی خودایيـە، کاکڵەی ئەو پەیامانە پەیامی قورئانەو سەرداری پێغەمبەرانیش موحەممـەد کـوڕی عەبدوڵڵایە.

﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان خودا؛ کە پەیامی نازڵ کردوونو پێغەمبەری رەوانـە کـردوون لـەم روانگەوەیـە: کـە خـودا شـنەوایە بـە گوفتـارو ئاخـاوتنی بەنـدەکانی، زانـاو ئاگـادارە بـە حـاڵو وەزعـی ئـادەمیزاد، دەزانـێ چـی لـە بەرژەوەندییانە، ئەو رەحمەتەی بۆ ناردوون چونکە زۆر پێویستیان پێ بوو.

﴿رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ ئـەو خـودا شـنەواو زانـاو ئاگادارە خوداو خاوەنو بەدیهێنەری ئاسمانـەکانو زەویو ئـەوەی لەناویانـدا هەیـە، ئەگەر ئێوە دەتانەوێ ئەوە بزانن دڵنیابن؛ کە گومانی تێدانیەو چۆنتان پێ دەڵێین گومانی تێدا نیە.

﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ﴾ (الله) خودایەکە تـاكو تەنهاو فەردو صەمەد، هیچ خودا نین شیاوی بەندایەتی بۆ کردن بـن جگـە لەئـەو، ژیان دەبەخشێو ژیانی بەردەوام دەبێ، هەر بەویستی خـۆی گیـان وەردەگرێتـەوەو دەمرێنـێ، پـەروەردگار کـە ئـەوە بەشـێکە لـە دەسـەڵاتی رەهـاو بـێ سـنووری پـەروەردگاری ئێـوەشو بـاوكو باپیرانتانـە، هـەر ئـەو بـەدیهێناونو ژیـانی پـێ بەخشیونو دوایی مراندوونی، هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆ کردنە، هیچ کەسـێ تـر خودا نیەو شیاوی بەندایەتی بۆ کردن نیە!

﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ﴾ بـەڵکوو ئـەو موشـریکانە دەربـارەی تـاكو تـەنهایی خـوداو زینـدوو بوونـەوەو خالقیـەتی خـودا لـە شـكو گومانـدان، ئـەوان لەڕاسـتیدا

گاڵتەچیو کەمتەر خەمو بێ ئاگان، بیروباوەڕی راست بەجیددی وەرناگرن، کە دان بە بەدیهێنەریەتی خودادا دەنێن بەراستیان نیە، لەوەشدا کوێرانە لاسایی باوكو باپیرانیان دەکەنەوە، لە دڵنیاییو بەڵگەو نیشانەوە دان بە خالقیەتی خودادا نانێن هەرچەندە خۆیان بەخاوەن باوەڕ دەزانن، وەلێ ئەوان ئاینیان بەفشە گرتووە، ئاینیان کردۆتە گاڵتەو گەپو هەواو هەوەس!

## هەڕەشە لە موشریکەکان بەهاتنی عەزاب بۆ سەریان

﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

دەربارەی (سبب نزولی) ئایەتی ژمارە (١٠) بوخاریو موسلیمو هی تریش لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەتیان کردووە، دەڵێ: کە قورەیشییەکان پەیامی پێغەمبەریان رەتکردەوە، پێغەمبەر دوعای لێ کردن: کە خودا بێ بارانیو گرانییان بەسەردا بێنێ، وەکوو قاتو قڕی سەردەمی حەزرەتی یوسف، گرانیو وشکە ساڵی یەخەی گرتن برسیایەتی برستی لێ بڕین، هەتا وایان لێ هات ناچاربوون ئێسقان

ورد بکەن بیخۆن. دەیانڕوانیە ئاسمان بۆشایی نێوان خۆیانو ئاسمانیان وەکوو دوکەڵ دەهاتە بەرچاو پەروەردگار ئایەتی ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ی نازڵ کرد هاتنە خزمەت پێغەمبەرو وتیان: ئەی رەوانەکراوی خودا داوای بارانمان بۆ بکە، هیچمان نەما، دوعای بۆ کردنو باران باری.

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (١٥-١٦) ئیمامی بوخاری لەکۆتایی ریوایەتی پێشوودا دەفەرموێ: کە قورەیشییەکان بارانیان بۆ باریو هەرزانییان بۆ هاتەوە، دەستیان کردەوە بە سەرپێچیکردنو ئەزیەتدانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنتَقِمُونَ﴾ی نازڵ کرد!!

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: لەوەپێش خودا وەصفی موشریکەکانی کرد بەوە کە لەشكو گوماندان، ئەمجار بۆ مەبەستی هەڕەشەکردن لێیانو دڵدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) حاڵو وەزعی ئەو رۆژو ساتانەیان دیاری دەکا: کە عەزابی خودا یەخەیان دەگرێ، ئەوەش ئاشکرا دەکا: کە ئەوانە تەمبێ نابنو موعجیزەو ئامۆژگاری کاریان تێ ناکاو ئیمان ناهێنن.

دەفەرموێ: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! چاوەڕوانی ئەوڕۆژە بە کە بەرزایی (ئاسمان) بەشێوەی دوکەڵ دێتە بەرچاو، ئەم شێوە دوکەڵە دەربارەی رابردوو بریتیە لەو بێ بارانیو نەهامەتیەی تووشی قورەیشییەکان بوو بۆ ماوەی حەوتساڵی رەبەق، ئەمەش لە ئاکامی ئەو دوعایەی پێغەمبەر لە قورەیشییەکانی کرد، تەنانەت لەبرسان وایان لێ هاتبوو: کە دەیانڕوانیە ژوور خۆیان بۆشایی نێوان ئاسمانو زەوییان وەکوو دوکەڵ دەهاتە بەرچاو!

بەنیسبەت داهاتوشەوە ئەو دوکەڵە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت، چل شەو دەوام دەکاو بریتییە لە تەپو تۆزێکی چڕوپڕ وەکوو دوکەڵ وایەو تاریکایی بەسەر بوونەوەردا دەهێنێو دەبێتە نیشانەی کۆتایی دونیا.

زانایـان دەڵـێن: رونـاکی خـۆر کـەم دەبێتـەوەو تاریکـایی سەرانـسەری دونیـا دادەپۆشێ.

﴿يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەو دوکەڵو تاریکیە هەموو کەس دەگرێتەوەو لەهەموو لایەکەوە شتدادەپۆشێ. خەڵکەکە تینیان بۆ دێو دەکەونە هاوارو گریـانو دەڵێن: بەڕاستی ئەمە عەزابێکی سەختو دژوارە. یان خودا خۆی دەفەرموێ: ئەمە عەزابێکی بەئێشو ئازارەو بیچێژنو (ئەوە گۆڕتان بێ).

جا ئەوکاتـە خەڵکەکـە دەسـت دەکـەن بـە پاڕانـەوەو لالانـەوە. دەڵـێن: ﴿رَبَّنَـا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ﴾ ئەی خودایە عـەزابی خۆتـمان لەسـەر لابـەرە، ئێمـە ئیمان دەهێنین، بڕوا بە تـاكو تـەنهایی خوداو پێغەمبـەرێتی پێغەمبـەر دەکـەین. یان ئەگەر ئـەم عەزابـەمان لەسـەر هـەڵگری پابەنـدی فـەرمانو جڵەوگیریـیـەکانت دەبینو ئیمانت پێ دەهێنین!

ریوایەتکراوە: موشریکەکان: کە تووشی ئەو قاتو قڕیو گرانییە هـاتن چـوونە خزمەت پێغەمبەرو وتیان: ئەگەر دوعا بکەی بۆمانو خودا ئەم عەزابەمان لەسـەر لابەرێ موسوڵمان دەبـین. ئەمـە بەنیـسبەت رابـردووەوە، بەنیـسبەت داهاتووشـەوە ئـەو دوکەڵە بریتییـە لـە تاریکاییـەکی گشتی هـەموو عالـەم دادەگـرێو عـەزابێکی سـەختو دژوارە پـێش رابـوونی قیامـەت پەیـدادەبێو یەکێکـە لـە نیـشانەکانی قیامەت.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفـەرموێ: ﴿وَلَـوْ تَـرَىَ إِذْ وُقِفُـواْ عَلَـى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُـؤْمِنِينَ – الأنعام/٢٧﴾ یـان ئایـەتی ﴿وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيـبٍ نُّجِـبْ دَعْوَتَـكَ وَنَتَّبِـعِ الرُّسُـلَ أَوَلَـمْ تَكُونُـواْ أَقْـسَمْتُم مِّـن قَبْـلُ مَـا لَكُـم مِّـن زَوَالٍ – ابراهيم/٤٤﴾.

بەڵام کوا ئەوانە وەعدو پەیمانیان هەیە؟ ﴿أَنَّى لَهُمُ الذِّكْرَى وَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ، ثُمَّ تَوَلَّوْا عَنْهُ وَقَالُوا مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ﴾ کەی یاد خستنەوەو ترساندنو ئامۆژگاری کار لە ئەوانە دەکا، کەی ئەوانە وەفا بەوادەی خۆیان دەکەن، کوا ئەوانە دوای لابردنی عەزاب لەسەریان ئیمان دەهێنن وەلحاڵ ئەوانە پێغەمبەرێکی خاوەن موعجیزە هاتۆتە سەریانو پەیامی خوای پێڕاگەیاندون کەچی پشتیان لە پەیامەکەی هەڵکردو بەدرۆیان خستەوە، وتیان: درۆ دەکا ئەم کابرایە لەخوداوە پەیامی بۆ نەهاتووە، ئادەمیزاد فێری دەکەن، دەچێ لای مامۆستاکەی دەخوێنێو بەدرۆ دەڵێ: لەخوداوە نیگام بۆ هاتووە!

هەروەها دەربارەی ئەو پێغەمبەرە: کە یەکێك لە موعجیزەکانی قورئانی پیرۆزە وتیان: شێتو وێتە، عەقڵو هۆشی تەواو نیەو خۆی لێ کردووین بە پێغەمبەر!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى – الفجر/٢٣﴾ ئەمجار قورئان ئەوە دەچەسپێنێ: کە ئەو کافرانە بە سروشت گومڕان تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەك عەزابیان لەسەر هەڵگرین خێرا دەگەڕێنەوە بۆسەر کوفرو بێدینی خۆیان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كَاشِفُو الْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَائِدُونَ﴾ ئێمە بۆ ماوەیەك عەزابتان لەسەر لادەبەین، ناردنی عەزاب بۆ سەرتان هەندێك دوا دەخەین هەرچەندە هۆکارەکانیشی دەستەبەر بووبن، ئەوکاتە ئێوە دەگەڕێنەوە بۆسەر کوفرو بێدینیو دەست دەکەنەوە بە سەرپێچیکردنی خۆتان.

یان ئەگەر لە فەرزێکدا ئێمە ڕۆژی قیامەت ئێوە بگێڕینەوە بۆ ژیانی دونیا یەکسەر دەچنەوە سەر حاڵی پێشووتانو مل لە کوفرو بێدینی دەنێنەوە!! بەهەر

حـاڵ عـەزابی ئێـوە دواخـراوە بـۆ ڕۆژی قیامـەتو بڕیارمـان واداوە لـەو ڕۆژەدا تۆڵەتان لێ بکەینەوە.

ڕیوایەتێك لـە ئیبنـو مەسـعودەوە هـاتووە دەڵـێ: ئـەم تۆڵـە سـتاندنەوە ڕۆژی بەدر بووە، ئەوەبوو: کـە دوای لابردنـی گرانـیو نـەهاتی لەسـەر کافرەکان یەکسەر دەستیان کردەوە بە دژایەتیکردنی پێغەمبەرو موسوڵمانەکان، ئـیتر خـودا لـە ڕۆژی بەدردا تۆڵەی لێ ستاندن.

وەلێ: ئیبنو جەریرو ئیبنو کەثیر پێیان وایە ئەو تۆڵە لێ سـتاندنەوەیە ڕۆژی قیامـەت دەبـێ. هەڕەشـەیان لێ دەکـاو دەفـەرموێ: ئـەی محمـد! لێیـان بگـەڕێو چاوەڕوانبە ئەو ڕۆژەی ئاسمان دوکەڵێکی دونیا داگری لێ پەیدا دەبێو هەموو کەس دەگرێتـەوە، داوای لابردنـی عـەزاب دەکـەنو وەڵامیـان نادرێتـەوە، ئـەمجار لـەژێر تارمـایی دیمـەنی ئـەو عـەزابو ناڕەحەتیـە دا خـۆی بـۆ ڕانـاگرنو داوای لابردنـی دەکـەن، پێیـان دەفـەرموێ: ئێـستا ئێـوە تووشـی ئـەو ڕۆژە نـەهاتوون، هـەلتان لەبەردەمدا ماوەو لـە کیـستان نەچووە، ئـەو عەزابـە ترسناکە کەمێك دواخـراوە، ئێستا ئێوە وا لەجیهاندان، ئەو عەزابە نەهاتووە. دە ئیمان بێنن پـێش ئـەوەی ئـەو ڕۆژەبێو ئەو عەزابە یەخـەتان بگرێو هـاوار بکـەنو وەڵامتـان نەدرێتـەوە، ئێـستا ئێوە لە ژیانی دونیادانو زۆر پایەدار نابێ واز لە گاڵتەو گەپ بهێنن، چی تر شـكو گومانتان نەبێ ڕۆژی قیامەت بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوەو تۆڵەتان لێ دەستێنن، هەروا بە ئاسانی بەسەرتانەوە ناچێ!

## پێویستە پەندو عیبرەت لە قەومی فیرعەون وەربگیرێ

﴿ ۞ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓاْ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾

وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا ۖ إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾

لەوەپێش ئەوەی روون کردەوە: کە موشریکە قورەیشییەکان سوورن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، ئەمجار ئەوە بەیان دەکا: کە زۆربەی زۆری گەلو نەتەوە پێشینەکان هەمان هەڵسو کەوتیان بووەو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستۆتەوە، بۆ

نموونـە فیرعـەونو نەتەوەکـەیو دەسـتەو تاقمێـك حـەزرەتی مووسـایان بـەدرۆ خـستەوە، خـودا پێغەمبـەری خـۆی بەسـەردا زاڵ کـردن مووسـاو شـوێنکەوتووانی رزگارکردنو فیرعەونو تاقمەکەی لە دەریای نیلدا خنکانـدنو کردنـی بـە پەنـدو عیبرەت بۆ دوا خۆیان دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَاءهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ﴾ بێگومان لەپێش ئـەم موشـریکانەی قورەیـشدا قـەومی فیرعـەونمان بـەتاقی کردەوە، خودا پێغەمبەرێکی دڵسۆزو رێزدارو خاوەنی رەوشتی بەرزو کرداری چاکی بۆ ناردن، ئەم زاتە لای خودا رێزدارەو لای گەلەکەشی خـاوەن پلـەو پایەیـە، دڵسۆز بوو بۆ گەلەکەیو بەجوانی ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجامدا، پێغەمبەرێکی کـەریم بوو هاتە سەریانو پێی گوتن: ﴿أَنْ أَدُّوا إِلَيَّ عِبَادَ اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ ئـەی قەومی فیرعەون چی تر نەتەوەی ئیسرائیل مەچەوسێننەوە واز لـە ئاغایـەتیکردن بەسەریانەوە بێننو من بۆ خۆم رێنومووییان دەکـەم، مـن پێغەمبـەرو فروسـتادەی خودام بۆ لای ئێوە، ئەمیندارم لەسەر فروستادەیی تۆمەتی خیانەتکاریم لێ ناکرێ.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفـەرموێ: ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكَ وَالسَّلَامُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى – طه/٤٧﴾.

دەگونجـێ (عبـاد الله) مونادابـێو حـەرفی لێ قرتابـێ. واتـە: ئـەی بەنـدەکانی خودا ئەوەی ئەرکی سەرشانتانە بەرامبەر بەمن ئەنجامی بدەن، ئیمـانم پـێ بێـننو بــەپیر بانگەوازییەکەمــەوە وەرن، شــوێن پــەیامی مــن بکــەون، چــونکە مــن پێغەمبـەرێکی ئـەمینو بتمانـە پێکـراوم، ئـەمینم لەسـەر نیگـاو پـەیامی خـودا بـە دڵسۆزی دەیگەیەنمو هیچی لێ زیادو کەم ناکەم.

﴿وَأَنْ لَّا تَعْلُوا عَلَى اللَّهِ إِنِّي آتِيكُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾ خۆتـان لـە شوێنکەوتنی ئایەتی خودا گەورەتر مەگرن، وامەزانن ئێوە لەوە بەرێزترن کە شوێن پێغەمبەری خـودا بکـەون، گەردنکەچـی مـوعجیزەی پێغەمبـەری خـودابن، پابەنـدی فـەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن، بەندایـەتی خۆتـان بـۆ خـودا رابگەیـەنن، چونکە هـەر کەسـێ

لەئاستی پەیامی خودا خۆ بەزل بزانن‌و تەکەببورو تەجەببوری هەبێ رۆژی قیامەت بە زەلیلی‌و داماوی دەخرێتە ناو دۆزەخەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ - غافر/٦٠﴾ پێی راگەیاندن: کە پێغەمبەری خودایەو موعجیزەی گەورەو ئاشکرای هێناون‌و ناتوانن ئینکارییان بکەن، موعجیەکانی خۆی رانواندن، عەصای دەستی: کە دارێکی رەق‌و تەق‌و بێ گیان بوو بە فەرمانی خودا دەبوو بە ئەژدیهایەکی گورج‌و گۆڵ، دەستی ئاسایی خۆی دەخستە باخەڵیەوە دەبووە یەکپارچە نورو دەدرەوشایەوە، هەروا زۆر موعجیزەی تری سەرسوڕهێنەری تری نیشاندان، کەچی لەجیاتی ئەوەی ئیمانی پێ بێنن، هەڕەشەیان لێ کرد بە کوشتن‌و بەردەباران کردن‌و ئەزیەتدانی جۆراو جۆر. وەکوو پەروەردگار لەسەر زمانی حەزرەتی مووسا: دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ﴾ ئەمن پەنا دەگرم بەخودای خۆم‌و خودای ئێوەش لەو هەڕەشانەی لێم دەکەن بە کوشتن‌و بەردەباران کردن‌و سوکایەتی پێ کردن.

﴿وَإِنْ لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ﴾ ئەگەر بڕوام پێ ناکەن‌و دان بە پێغەمبەریەتیمدا نانێن‌و شوێنم ناکەون دەوازم لێ بێنن‌و هەوڵی ئەزیەتدانم مەدەن تا خودا ناوانی من‌و ئێوە دەکاو کێشەکانمان یەکالا دەکاتەوە، هەرچەندی بانگەوازی کردن‌و هەوڵی لەگەڵ دان بێ سوود بوو. جا کە لە ئیمانهێنانیان نائومێد بوو، دڵنیابوو: کە ئەوان سوورن لەسەر کوفرو سەر رەقی خۆیان، هانای بۆ بارەگای پەروەردگار برد.

﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنَّ هَؤُلَاء قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ﴾ لەخودا پاڕایەوە، وتی: خودایە ئەمانە گەل‌و نەتەوەیەکی تاوانبارن، بڕوایان بە تاک‌و تەنهایی زاتی پاکت نیە، پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخەنەوە، خودایە غەزەبیان لێ بگرە، ماڵ‌و سامانیان بفەوتێنە، دڵیان رەق بکە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى! رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ

عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ – یونس/٨٨﴾. دوعای حەزرەتی مووسا گیرا بوو، هەموو ئەو بەڵاو نارەحەتیانەیان بەسەر هاتن، وەكوو لە ئایەتێكی تردا ئاماژەی پێ دەكاو دەفەرموێ: ﴿قَالَ: قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلاَ تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ – یونس/٨٩﴾ ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بە حەزرەتی مووسا كرد: كە شەو رەو بە نەتەوەی ئیسرائیل بكا، فەرمووی: ﴿فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾ ئەی مووسا! چی تر مەهێڵە فیرعەون بەنو ئیسرائیلییەكان بچەوسێنێتەوە، شەورەو بكەن، بەشەو بەنهێنی لەشار دەرچن، چونكە ئەگەر فیرعەونو نەتەوەكەی بەوە بزانن: كە ئێوە شار چۆڵ دەكەنو كۆرەو ئەنجام دەدەن شوێنتان دەكەون ناهێڵن دەربچن، كۆسپو لەمپەرتان بۆ دادەنێن! لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَافُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَى – طه/٧٧﴾ ئەمجار فەرمانی پێ دەكا: كە بەناو دەریادا بڕۆنو ترسییان لەوە نەبێ فیرعەون پێیان بگا، یان ئاوەكە وێك بێتەوە.

﴿وَاتْرُكْ الْبَحْرَ رَهْوًا إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ﴾ ئەی مووسا واز لە دەریا بێنە با بەكراوەیی بمێنێتەوە، نەچی بە عەصاكەت لێی بدەی بۆئەوەی وەكوو خۆی لێ بێتەوە، لێی گەڕێ با ڕێبازەكانی ئاچوخ بن بۆئەوەی فیرعەونو تاقمەكەی تەماعیان بەربكەوێو خۆیانی پێدا بكەنو شوێنتان بكەون، بێگومان فیرعەونو دارو دەستەكەی لە دەریادا دەخنكێندرێن، لە خنكاوانن بەم شێوە قەزاو قەدەری خودا دێتە دی. بەمەش مژدەی رزگار بوونی دا بە مووساو فەوتانی فیرعەونو تاقمەكەی راگەیاند، حەزرەتی مووسا دڵی داسەكناو بەرچاوی رووناك بوونەوە، هیچ خەمو خەفەتو ترسو ختوكەی لە دڵدا نەما. ئەمجار پەروەردگار دیمەنی خانوو بەرەی بەجێ ماوی فیرعەونو قەومەكەی رادەنوێنێ، باخو باغچەو كانیاوو جۆگاو جۆباری بێ خاوەنو كەس تێدانەماوی وڵاتی میصر تۆمار دەكاو دەفەرموێ:

﴿كَمْ تَرَكُوا مِن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ، وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ﴾ وادەی خوداهاتە جێ و فیرعەون و دارو دەستەکەی لە دەریادا خنکان، زۆریان باخ و کانیاوو زەوی و زاری پڕ کشت و کاڵ و خانووبەرەو قەصرو باڵەخانەی رازاوەو هەوارگەو شوێنی رابواردنیان بەجێ هێشت، ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی تێیدا دەتلانەوەو پێیەوە دەنازین بێ خاوەن مانەوە، کەس بۆیان نەگریاو دادو فیغانی بۆ نەکردن.

﴿كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ﴾ بەو شێوە ئەو گەل و تاقمەمان لەناو بردن و هەرکەسێک و هەر هۆزو تاقمێک پەیامی ئێمەی رەتکردبێتەوەو پێغەمبەرەکانمانی بەدرۆ خستبێتەوە هەمان هەڵس و کەوتمان لەگەڵ کردوون، ئیتر ئەو جۆرە مڵک و سامانەمان بە میراتدا بە نەتەوەی ئیسرائیل کە لەوەپێش ژێر دەستەو چەوساوە بوون، نێرینەیان سەر دەبڕاو مێینەیان بۆ کارەکەری و لە لەچیەتی مەرەخەس دەکران و دەهێڵدرانەوە. ئەو دارو دەستە ستەمکارانەمان لە دەریادا خنکاندو لەناومان بردن ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ﴾ ئاسمان بە سەریاندا نەگریاو دایە زەمین رۆڵە رۆی بۆ نەکردن، کەس خەفەتی بۆ نەخواردن و بۆیان بە پەرۆش نەبوو. بەڵکوو زوو بە سزای خۆیان گەیشتن ئەمەش بەهۆی زێدەڕەوی کردنیان لە کوفرو گومڕاییدا، مۆڵەت نەدران بۆئەوەی تۆبە بکەن، چونکە چاوەڕوانی تۆبە کردنیان لێ نەدەکرا! هەتا بمانایەوە پتر زێدە رەوییان ئەنجام دەدا، بڕوانە ئەو ستەمکارو بەخۆ نازیوانە، ئەو خۆ بەزلزان و لوتبەرزانە چۆن لەناوچوون و کەس حیسابی بۆ نەکردن، کەس بۆیان نەگریا، ئاسمان و زەوی فرمێسکی بۆ نەڕشتن، دونیایان جێ هێشت و هیچ رێزێکیان لێ نەگیرا! هێندەی مێشوولەو مێرولەیەکیش حیسابیان بۆ نەکرا. دەبیا هەموو ملهوڕو دەرەبەگ و ستەمکارێک باشباش بزانن کەلای خودا هیچ رێزو نرخێکیان نیە، تا بڵێی قێزمون و تووڕ دراون لە ویژدانی وجوودا...

﴿وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنَ الْعَذَابِ الْمُهِينِ، مِن فِرْعَوْنَ إِنَّهُ كَانَ عَالِيًا مِّنَ الْمُسْرِفِينَ﴾ بێگومان ئێمە نەتەوەی ئیسرائیلمان لەژێر دەستەیی و چەوسانەوە رزگار کرد، دوژمنی سەرسەختیان: کە فیرعەون بوو فەوتاندمان لە راستیدا فیرعەون خۆ بەزلزان و ملهوڕو ستەمکارێکی زێدە ڕەو بوو، خۆی کردبوو بە خودای میصرو دانیشتوانی، جۆرەها عەزاب و نارەحەتی بە نەتەوەی ئیسرائیل دەچەشت، ئەرکی خستبووە سەریان، نێرینەکانیانی بە زارۆکی سەردەبڕین، مێینەکانی دەهێشتنەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ – القصص/٤﴾ دوای لەناوبردنی فیرعەون و دەستەکەی و بنەبڕکردنی زیان لەسەر نەتەوەی ئیسرائیل. رێزو شکۆمەندیمان پێ بەخشین ﴿وَلَقَدِ اخْتَرْنَاهُمْ عَلَى عِلْمٍ عَلَى الْعَالَمِينَ، وَآتَيْنَاهُم مِّنَ الْآيَاتِ مَا فِيهِ بَلَاء مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی نەتەوەی ئیسرائیلمان بەسەر نەتەوەکانی جیهانی ئەو سەردەمەدا هەڵبژاردو ئەم هەڵبژاردنەشمان بۆیان لە زانیارییەوە سەرچاوەی گرتبوو، شیاوی ئەو رێزە بوون، چونکە پێغەمبەریان زۆر تێدا هەڵکەوتبوون، شوێن حەزرەتی مووسا کەوتن و جیهادو تێکۆشانیان کرد خۆڕاگرو پشوو درێژ بوون لەپێناو ئایینی خودادا نارەحەتیان چەشت، کاتێکیش لە ئایینی خودا هەڵگەڕانەوە، لەشوێنی ئیمان کوفرو بێدینییان رەچاو کرد، لەجیاتی چاکسازیی خراپەکارییان دەست پێکرد خودا غەزەبی لێ گرتن، کردنی بە مەیمون و بەرازو لەعنەتی لێ کردن، لەسەر دەستی مووسا زۆر موعجیزەی ئاشکراو گەورەی نیشان دان، تاقیکردنەوە بوو بۆ ئەوانەی هیدایەتیان وەرگرت، تاقیکردنەوەمان لەگەڵ ئەنجام دان بۆئەوەی دەری بخەین چۆن هەڵس و کەوت دەکەن بەرامبەر ئەو هەموو موعجیزەو نیعمەتانەی پێمان دان. شوکرانە ژمێرو خودا پەرست دەبن، یان بوغڕاو لەخۆیان بایی دەبن. دەی با کافرەکانی قوڕەیش و هاو وێنەکانیان پەندو عیبرەت لە

بەسەرهاتی فیرعەون‌و نەتەوەی ئیسرائیل وەربگرن، بەهێزو تواناو لەشساغی خۆیان نەنازن، ئەوەتا خودا زۆر لەوان بەهێزترو ساماندارترو خاوەن دەست‌و دائیرەتری فەوتاندووە، هەرکەسێ تاوانکارو ستەمکار بێ خودا تۆڵەی لێ دەستێنێ، داب‌و نەریتی خودا ناگۆڕێ‌و یاسایەکی تایبەتە.

## موشریکەکان ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن

﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ أَهْلَكْنَٰهُمْ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار چیرۆکی فیرعەون‌و قەومەکەی لەگەڵ موساو نەتەوەی ئیسرائیل گێڕانەوە بۆئەوەی قورەیشییەکان پەندو عیبرەتی لێ وەربگرن، لەهەمان کاتدا قورەیشییەکانی بەوە تاوانبار کرد کە بڕوایان بە زیندوبوونەوەو هاتنی قیامەت نیە، ئەوانە لەبارەی سوربوونیان لەسەر کوفرو بێدینی وەکوو فیرعەون‌و تاقمەکەی وەهان، ئەمجار لێرەدا بە ئاشکرا ئەوە رادەگەیەنێ: کە قورەیشییەکان ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن، دەبیا لەو هەڵوێستەی خۆیان لابدەن چونکە خودایەك بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوی بێ دەتوانێ دوای مردن ئەوانە زیندو بکاتەوە. لەهەمان کاتدا هەڕەشەی لەناوبردن‌و فەوتانیشی لێ کردن وەکوو چۆن

لەوەپێش قەومی (توببەع)ی لەناوبرد، کە زۆر لە قوڕەیشییەکان بەهێزتر بوون، کەواتە: با قوڕەیشییەکانو گەلانی تریش وانەکەن بەدەردی قەومی فیرعەونو قەومی توببەع بچن.

بەڵێ دوای ئەم جەولە کورتەی ئەنجامیدا دەربارەی فەوتانی فیرعەونو تاقمەکەیو رزگاربوونی حەزرەتی موساو نەتەوەی ئیسرائیلو تاقیکردنەوەیان بەجۆرەها ئایاتو موعجیزەی گەورەو ئاشکرا، سەر لەنوێ گەڕایەوە بۆ رانواندنی هەڵوێستی موشریکە قوڕەیشییەکان دەربارەی زیندوبوونەوەو شكو گومانیان تێیداو ئینکاریی کردنیان بۆ ئەو روداوە گەورەو یەکالاَ کەرەوەیە، سەر لەنوێ گەڕایەوە بۆ ئەو مەوزوعە تا روداوی زیندوبوونەوە ببەستێتەوە بە نەخشەو بەدیهێنانی بونەوەرو دامەزراندنی لەسەر حەقو راستی، هەر ئەو حەقو راستییەی بوونەوەری لەسەر دامەزراوە داخوازی زیندوبوونەوەو رابوونی قیامەتن!

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَؤُلَاء لَيَقُولُونَ: إِنْ هِيَ إِلَّا مَوْتَتُنَا الْأُولَى وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ﴾ قوڕەیشییەکان زۆر بەبێ شەرمانە دەڵێن: سەرەنجام هەر ئەم مردنەمانەو بەس: هەر کەمردین ئیتر جارێکی تر تازە زیندوو نابینەوە، زیندوو ناکرێینەوە، ژیان هەر ئەم ژیانی دونیایەیەو ﴿فَأْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ دە ئەگەر راستە زیندوبوونەوە هەیە با باوكو باپیرانمان بۆ بێننەوە، ئەوان شایەتی لەسەر ئەو مەسەلەیە بدەن، دەی ئەوەتا ئەو حەمکە ئادەمیزادە مردونو کەسمان نەدی بگەڕێتەوە هەواڵێکمان لەو بارەوە بۆ بگێڕێتەوە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ – الأنعام/٢٩﴾.

ریوایەتکراوە: قوڕەیشییەکان داوایان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد: کە خودا بەزوویی مردووەکانیان بۆ زیندوو بکاتەوە، بەتایبەتی (قصی) کوڕی (کلاب)یان بۆ زیندوو بکاتەوە تا لەبارەی راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدو رابوونی قیامەتەوە گفتو گۆی لەگەڵ بکەن، وەڵێ پەروەردگار وەڵامی نەدانەوە.

بەڵگەیـەکی هـیچو پوچـیان بەدەسـتەوە بـوو، ئـەم جـۆرە بیانوانـەیان ڕەنگدانەوەی سەر ڕەقیو نەفامییان بوو، ئەگینا زیندوبوونەوە لـە قیامەتـدا دەبـێ نەك لە دونیادا، پاش دونیـا وێرانبـوونو مردنـی هەموو گیانلەبـەرانو تێکچوونی بوونەوەر جارێکی تر پـەروەردگار سـەرلەنوێ مـردووان زینـدوو دەکاتـەوەو حـەقو حیسابیان لەگەڵ دەکاو سزاو پاداشیان بەگوێرەی کردەوەکانیان دەداتەوە.

ئەمجار هەڕەشەی توند لە قوڕەیشییەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ ئایا ئەوانە: کە هـۆزی قـوڕەیشو عـەرەبو عـەدنانی نـژادن بـەهێزو توانـاترن یـان هـۆزی (توببـەع): کـە عـەرەبو قەحطانی نژادنو پێش قوڕەیشییەکان لە کۆڕی ژیانـدا بـوون؟! زۆر لـەمان خـاوەن دەسـەڵاتو سـامانداراتر بـوون، خـاوەن ژیـارو شارەسـتانی بـوون، هـەروا زۆر گـەلو نەتەوەی تر: کە پێش ئەمانیشو ئەوانیش بـوون، وەکوو گـەلی عـادو ثـەمودو هـی تـریش. هـەموویانمان بـەهۆی کـوفرو تاوانیـان قەلاچـۆ کـردن، بـە عـەزابی کۆکـۆژ لـەناومان بـردن، بەڕاسـتی ئەوانـە هـەموویان سـتەمکارو تاوانبـار بـوون. بێگومـان لەناوبردنی گەلو نەتەوەیەك: کـە لـەوان بـێ هێزتـرو کـەم دەرامـەتترین ئاسـانترە، هەرچەنـدە بۆ خودا هەموو شتێك ئاسانەو کارێك نیە لای خودا قورسو گـران بـێ. ئەمانە لە هۆزی (توببەع) بـەهێزترو زۆرتـرنین، لەگـەلی عـادو ثـەمود بەدەسـەڵات تـرنین. دەبـێ بەسـەرهاتی گـەلی (توببـەع) لای قوڕەیـشییەکان ئاشـکرابووبێو ئـەو چیرۆکەیان پـشتاو پـشت بـۆ گێڕدرابێتـەوە، بۆیـە قورئـان وا بـەگورجی بەسـەریدا تێدەپەڕێو بەسـەر پێییـەوە ئامـاژەی بـۆ دەکـا. بـەخێرایی لەوەتـەری دڵیـان دەداو چاوەڕوانی ئاکامە.

(تبّع) پیاوێکی چاك بووە سوپایەکی بـەهێزی هـەبووە بـەو سـوپایەوە بـەناو جیهاندا گەڕاوەو لەگەڵ زۆر نەتەوەو هـۆز جـەنگاوەو وڵاتیـانی کـۆنترۆڵ کـردووەو دانیشتوانی گەردنکەچ کردووە! طەبەرانی لە ئیبنـو عەبباسـەوە ڕیوایـەتی کـردووە

دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لا تسبوا تبعاً فأنه قد اسلم) کە نامەیەکی دەنووسی لە سەرەتاکەیەوە دەینووسی (بسم الله ملك برا وبحراً) لەدوای مردنی (تبع) (حیمیریەکان) کە قەومی (سبأ)ن هەرکەسێکیان بووبێتە پادشاو مەلیك نازناوی (تبع)یان بۆ بەکارهێناوە، وەکوو چۆن فارسەکان نازناوی (کیسرا)و رۆمەکان نازناوی (قەیسەر)و میصریەکان نازناوی (فیرعەون)یان بۆ پاشاکانیان بەکارهێناوە. لەمێژوودا ئەم پاشایانەی حیمیریەکان بە (تەبابیعە) مەشهورن. مەڵبەندی فەرمانڕەواییان نیوە دورگەی عەرەبی بووە.

ئەمجار پەروەردگار بەڵگە لەسەر دەسەڵاتو قودرەتی خۆی دەهێنێتەوە. بۆئەوەی ئەو دەسەڵاتە رەهایەی خۆی بکاتە بەڵگە لەسەر رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە. دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ﴾ ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لەناویان دایە بە هەوانتەو بێ هۆ دروستمان نەکردوون، بە گاڵتە ئەم بوونەوەرەمان نەهێناوەتە دی، ئەو موشریکانە بە چ عەقڵێك ئینکاری زیندوو بوونەوە دەکەن، ئەی بۆ ئەوان دیاردەی دەسەڵاتو توانای ئێمە نابینن؟ ناڕوانن بۆ ئاسمانو زەویو مانگو خۆرو تێیان نافکردن؟! با دڵنیابن ئەم بوونەوەرەمان بە گاڵتە نەهێناوەتە دی، بەڵکوو بەوپەڕی جیدییەتو دەستڕەنگینیو وردەکاریو پتەوییەوە دروستمان کردوونو بۆ مەبەستێکی پیرۆزو حیکمەت ئامێز هێناومانەتە کایەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ - ص/٢٧﴾. بەبێ شك دروستبوونی ئاسمانەکانو زەوی بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر رابوونی قیامەتو زیندو کردنەوەی دوای مردن.

﴿مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ، وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لەناویاندایە بە حەقو جیدییەت نەبێ دروستمان نەکردوون، بە حەق دروستمان کردوون، لەسەر حەقو بۆ دەرخستنی حەقو نیشانە لەسەر هەبوونی

بەدیهێنـەری حـەق دروسـتمان کـردوون، وەڵێ زۆربـەی زۆری ئـەو موشـریکانە ئـەو حـەقو راسـتیە نـازانن، چـونکە وردبـینو خـاوەن فـام نـین، کـەودەنو سـەر رەقو گومڕان بەتەما پاداش نین لەسزای دۆزەخ ناترسن.

## جۆرەکانی سزای ناو دۆزەخ، کە رۆژی قیامەت تووشی کافرەکان دەبێ

﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَـٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَـٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾﴾

بێگومـان دروسـتکردنی ئـادەمیزاد لەسـەر ئـەو سروشـتە تایبەتیـەی؛ کـە ئامادەباشـی چاکەو خراپـەی تێدایـە، بـەدوور گرتنـی کـردەوەی پـەروەردگار لـە عەبەثو بەتاڵی، داخوازی ئەو حەقیقەتەن؛ کە بۆ ئادەمیزاد سەرەنجامو ئاکامێکی تایبـەتی هەیـەو دوای کـاروانی ژیـانی دونیـا پێـی دەگا، ئەمـەش بریتییـە لـەژیانی قیامـەت، بۆیـە دوابـەدوای راگەیانـدنی ئـەو حەقیقەتـە: کـە ئاسمانـەکانو زەویو

هەموو بوونەوەر بە بێهودە دروست نەکراوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بێگومان ڕۆژی قیامەت: کە ڕۆژی یەکالا کەرەوەی هەموو کێشەو نیزاعێکە، ڕۆژێکە سزای تاوانباران‌و پاداشی خودا پەرستانی تێدا دیاری دەکرێ، ڕۆژی کۆبوونەوەو حیساب لەگەل کردنی هەموو ئادەمیزادانە، پەروەردگار هەموو ئادەمیزادەکانی تێدا زیندوو دەکاتەوە، چاك‌و خراپە لێك هەڵدەهاوێرێ، بەهەشتی‌و دۆزەخی لێك جیادەکاتەوە، پەردە دەخاتە نێوان موسوڵمانان‌و ئەوەی ناخۆشیان دەوێ، لەمپەڕ لەنێوان کافران‌و حەزو ئارەزووەکانیاندا دروست دەکا، باوك‌و ڕۆڵە لێك دەکا، ژن‌و مێرد لێك جیادەکاتەوە.

﴿يَوْمَ لَا يُغْنِي مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکە دۆست فریا دۆست ناکەوێ خزم قازانجی بۆ خزمی نیە، هیچ کەس عەزاب لەخۆی‌و کەسێکی تر دوور ناخاتەوە، کەس سوود بەکەس ناگەیەنێ، موسوڵمان سوودی بۆ کافر نیە، خزم شەفاعەت بۆ خزم ناکا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ – الممتحنة/ ٣﴾. برا لەبرا ناپرسێ کەس ناتوانێ یارمەتی کەس بدا. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً – البقرة/٤٨﴾. ڕۆژێکە برا لە برا هەڵدێ، پیاو خۆی لە دایك‌و خێزانی دەشارێتەوە، ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ اللَّهُ إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ وەلێ کەسێك خودا ڕەحمی پێ بکا، ئەوە یارمەتیدراو دەبێ، پێویستی بە هاریکاری کەس نیە، ڕەحمەتی خودای بەسە، بێگومان پەروەردگار بالا دەست‌و خاوەن بەزەیی بەرفراوانە بۆ بەندە موسوڵمانەکانی، ئیزن دەفەرموێ: کە هەندێکیان شەفاعەت بۆ هەندێکیان بکەن، کە ئیزن بدرێن شەفاعەت بۆ یەکتر بکەن لێشیان وەردەگیرێ. ئەمجار دوای ئاراستەکردنی بەڵگەی جۆراو جۆر لەسەر ڕابوونی قیامەت‌و وەصفکردنی ئەو ڕۆژە سامناکە بەشوێن ئەودا هەڕەشە لە کافرەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ طَعَامُ الْأَثِيمِ﴾

بێگومان ئەو درەختە رەزا گرانە نەفرین لێکراوەی خودا لە ناوقەدی دۆزەخدا دروستی کردووە، بەروبوومەکەی: کە تا بڵێی تفتو ناخۆشو تاڵە خۆراکی تاوانبارانە، خۆراکی ئەوانەیە لە خراپەکاریو کوفرو بێدینیدا رۆچوون، رەفتارو ئاکامیان ئەبو جەهل ئاسایە. هەرکاتێ ئەو دۆزەخیانە برسیان بوو لێی دەخۆن بەلام جێگای خواردن ناگرێ، برسیایەتی لانابا، ﴿كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ كَغَلْيِ الْحَمِيمِ﴾ ئەو خۆراکە وەکوو تواوەی زیوو ئاسنو خڵتەی زەیتی کوڵاو وایە، لە گەدەدا وەکوو ئاو دەکوڵێ. (مهل) هەرشتێك بخرێتە ناو ئاگرەوەو ماوەی بدرێتێ تا دەتوێتەوە، وەکوو خڵتەی زەیتی رەشو قەترانو تواوەی ئاسنو زیوو هەرشتێکی تری وابێ.

﴿خُذُوهُ فَاعْتِلُوهُ إِلَى سَوَاءِ الْجَحِيمِ﴾ فەرمان بە فریشتەکان دەکرێ: ئەم تاوانبارە بگرن، پاڵە پەستۆی بدەن بۆ ناو دۆزەخ، بە تۆپزیو چنگ لەسەر شان رایکێشن بۆ ناوەراستی ئاگرو هیچ بەزەییتان پێدا نەیەتەوە، ﴿ثُمَّ صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ﴾ پاشان ئاوی گەرمو کوڵاتووی بەسەردا بکەن، بەوە عەزابی سەختی بدەن، بۆئەوەی بەو ئاوە کوڵاتووە ناو سكو پێستیان داپڵۆخێ! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُؤُوسِهِمُ الْحَمِيمُ، يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ – الحج/١٩-٢٠﴾. ئەمجار بۆ زێدە سزادانو ریسوا کردن پێی دەگوترێ: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ﴾ دە بچێژە عەزابی سەختو دژوار ئەی بەخۆ نازیوی لوتبەرزی لەخۆ رادیو کە لەژیانی دونیادا پێت وابوو کەس دەرەقەتت نایەو خاوەن رێزو نرخی بێ پایانی!

﴿إِنَّ هَذَا مَا كُنتُم بِهِ تَمْتَرُونَ﴾ ئەم سزا سەختو دژوارە ئەوەیە: کە ئێوە لە دونیادا دەربارەی شكو گومانتان هەبوو، بڕواتان پێ نەدەکرد! وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَى نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا، هَذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ – الطور/١٣-١٤﴾.

**پاداشتی خودا پەرستانو جۆری نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بۆیان**

﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾

لەوەپێش باسی کافرو بەدبەختەکانی کرد، جۆرەکانی سزاو ئازاری سەختو دژواری ناو دۆزەخی نمایش کرد، ئەو عەزابەی خودا نەناسان تێی دەکەونو رزگاربونیان نیە، ئەمجار دێتە سەر باسی حاڵو وەزعی خودا پەرستان لە بەهەشتدا، نازو نیعمەتی جۆاو جۆرو هەمیشەو نەبڕاوەی بۆ ئامادەکراویان رادەنوێنیو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ، فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ بێگومان خودا پەرستان لە رۆژی قیامەتدا لە شوێنێکی ئەمنو ئارامدان، شوێنێکی خۆشو هەوا سازو دلگیر، باخی پڕ درەختی سەوزو گوڵو گوڵزاری جوانو کانیو کانیاوی روونو سازگار، کورسیو قەنەفەی رازاوەو پۆشاکی ئاوریشمو سوندس، پیاڵەو فنجانی ئاو خواردنەوەو بادە نۆشین. وەکوو لە شوێنێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الآبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ، عَلَى الآرَائِكِ يَنظُرُونَ، تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ، يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ، خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ، وَمِزَاجُهُ مِن تَسْنِيمٍ، عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ – المطففين/٢٢-٢٨﴾.

﴿يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ پۆشاکی ئاوریشمی تەنكو ئەستور لەبەر دەکەن: کە لەدورەوە بریسكو درەوشانەوەیان هەیە، دڵ کێش دەکەنو سەرنج رادەکێشن، دانیشتنیان رووبەڕوو بەرامبەر یەکترە، بە مەبەستی رابواردنو خۆشی بینین روو لەیەکتر دەکەنو بە گوفتو گۆو پێکەنین کات بەسەر دەبەن، لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ، عَلَى سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ – الصافات/٤٤﴾ هەموو ئەو نیعمەتانە چۆنیان بوێو چەندیان بوێ بە هەمیشەیىو بێ بڕانەوە بۆیان ئامادەیە.

﴿كَذَلِكَ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ﴾ وێڕای ئەو نیعمەتانە حۆری چاو رەشو جوانیان لێ مارە دەکەین، ئافرەتی جوانو ناسكو چاو رەشو شۆخو شەنگو دەست لێ نەدراو دەکەینە هاوسەرو خێزانیان.

﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَاكِهَةٍ آمِنِينَ﴾ لە بەهەشتدا بەهەشتییەکان هەرچی ئارەزۆ بکەن لە میوەو بەروبووم داوای دەکەنو بۆیان حازرە، ئەوان دڵنیان: کە ئەو میوەهاتە بڕانەوەی نیەو بەکۆتا نایە. دڵنیان لەوەی نەخۆش ناکەون نامرنو ماندوو نابنو ژیانیان لێ تاڵ نابێ.

بەم جۆرە شوێنی حەوانەوەو پۆشاكو خواردنو خواردنەوەو خێزانو رابواردنو دڵنیایی ئارامییان بۆ دەستەبەر دەبێ.

﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلَّا الْمَوْتَةَ الْأُولَى وَوَقَاهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾ لە قیامەتدا ئیتر مردن ناچێژنو ترسی مردنو ژیان لەدەستدانیان نامێنێ، وەلێ مردنی دونیاو مردنی یەکەمجار بەسەریاندا تیپەڕیو تەواو بوو، پەروەردگار بە فەضلو رەحمەتی خۆی لە عەزابی سەختی دۆزەخ پاراستونی! لە صەحیحەیندا هاتووە:

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «يُؤْتَى بِالْمَوْتِ فِي صـورة كَـبْشٍ أَمْلَحَ فَيُقف بين الجنة والنار ثُمَّ يذبح، ثُمَّ يقال: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ ، خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ ، وَيَا أَهْلَ النَّـارِ ، خُلُـودٌ فَـلاَ مَـوْتَ). رۆژی قیامـەت مـردن لەشـێوەی بەرانێکـدا دەهێنـدرێ، لـەنێوان بەهەشـتو دۆزەخـدا رایـدەگرنو پاشـان سـەر دەبـڕێ، ئـەمجار بـانگ هەڵدەدرێو دەگوترێ: ئـەی بەهەشـتییەکان! ژیانتـان ئەبەدییـە مـردن نـەما، ئـەی دۆزەخییەکان! ژیانتان بۆ هەتا هەتایەو مردن نەما.

ئیمامی موسلیمو عەبدو ڕرەززاق لە ئەبو سەعیدی خودریو ئـەبو هـورەیرەوە ریوایـەت دەکـەن دەڵـێن: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: بـە بەهەشـتییەکان دەگـوترێ: ئێـوە لەمـەودوا لەشـتان سـاغ دەبـێو نـەخۆش ناکـەون، دەژینو مردن نابینن، لـەززەت وەردەگـرنو ناهومێـدی روتـان تـێ ناکا، بـە گـەنجی دەمێننەوە پیر نابن.

ئەبوبەکری کوڕی ئەبو داوودی سەجستانی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایـەت دەکـا: دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (من أتقى الله دخل الجنة، ينعم فيها، ولا ييأس ويحيا فيها ولا يموت، ولا تبلى ثيابه ولا يفنى شبابه).

هەروەها ئەبولقاسمی طەبەرانیو ئەبوبەکری کوڕی مەردەویەیی لە جابیرەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر کرا: ئایـا بەهەشـتییەکان دەخـەون؟ لـە وەڵامدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (النـوم أخـو المـوت واهـل الجنة لا ينامون) خەو برای مردنە، ئەهلی بەهەشت ناخەون.

رزگاربوون لە ئاگری دۆزەخو بەمراز گەیشتن لە بەهەشتدا ﴿فَضْلًا مِّـن رَّبِّـكَ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ بەخششو فـەضلی خودایـە، خـودا بـە مـەحضی رەحمـەتی خۆی ئەو نـازو نیعمەتـەی پـێ بەخـشیوون، ئـەوەش بـە مـراز گەیـشتنێکی گـەورەو پیرۆزەو هیچ خۆشیو بەمراز گەیشتنێکی تری ناگاتێ.

له حەدیثی موسلیمدا هاتووه له جابیرەوه ریوایەتی کردووه دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «اعْمَلُوا وَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا واعلموا أَنَّ أَحَداً لَنْ يُدْخِلَهُ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي رَبِّي بِرَحْمَةٍ منه وفضل» ئەمجار لەژێر تارمایی ئەو دیمەنە سەرنج راکێشانەی دۆزەخییەکانو بەهەشتییەکاندا کۆتایی بە سورەتەکە دەهێنێو بەیاد خستنەوەی نیعمەتی ناردنی پەیامو نازڵکردنی قورئان بۆ سەر پێغەمبەر بەزمانی عەرەبیو ترساندنی ئادەمیزاد له ئاکامی رەتکردنەوەی پەیامی ئیسلامو بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بۆیە ئەم قورئانەمان ئاسان کردووه، بە ئاشکراو بێ غەلو غەش نازڵمان کردووەو بەزمانی تۆ: کە زمانی عەرەبییە دامان بەزاندووه بۆئەوەی تێی بگەنو بیکەنە بەرنامەی ژیانیانو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن، بەختەوەرییو سەرفرازی دونیاو قیامەت دەستەبەر بکەن! وێڕای ئەوەی: کە قورئان ئەوەندە ئاشکراو واضیحە کەچی قورەیشییەکان دژی وەستانو سەرپێچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانیان کرد. بە سیحرو جادویان لە قەڵەمدا، وتیان چیرۆکە کۆنو ئەفسانەی رابوردوانە، بۆیە پەروەردگار تەسەللای پێغەمبەری دایەوەو هەڕەشەی توندی له سەرپێچیکاران کردو فەرمووی: ﴿فَارْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ﴾ ئەی محمد! چاوەڕوانی یارمەتی ئێمەو سەرکەوتن بە بەسەر دوژمنانتدا چاوەڕێی تێداچوونو فەوتانیان بە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو سەرپێچیکاریی خۆیان، بێگومان ئەوان چاوەڕوانی ئەوەن تۆ تووشی بەڵاو ناخۆشی ببی یان بمری! لەوە بەولاوە بۆیان دەردەکەوێ سەرکەوتنو سەرفرازیی بۆ کێیە؟ دەردەکەوێ کێ حەقو باڵا دەستە کێ سەرفرازی دونیاو قیامەتە؟ بێگومان سەرکەوتن بۆ پێغەمبەری خوداو شوێنکەوتوانیەتی بڕیاری خودایەو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە، وەکوو

لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ – المجادلة/٢١﴾.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الجاثية)

ناونانی ئەم سورەتە بەو ناوە لەم رووەوەیە: کە وشەی (جاثیة) لە ئایەتی ژمارە (٢٨)ی داهاتووە دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَى إِلَى كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾.

سورەتەکە مەککیەو لایەنێك لەبەرەو پیرەوەچوونی موشریکەکانی مەککە بۆ بانگەوازیی ئیسلامی دەردەخا، چۆنیەتی بەرەنگاری کردنیان بۆ پەیامی پێغەمبەرو سەرەڕەقی فیرسیچمەییان لەبەرامبەر بانگەوازییەکەیدا بەیان دەکا، ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە چۆن ئەو قورەیشییە نەفامو موشریکانە شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوونو بەبێ بەڵگەو دەلیل پەیامی ئیسلامیان رەت کردەوە، لەهەمان کاتدا دەبینین قورئان چۆن دەرمانی دەردی دڵە یاخی بووەکانی دەکردن، چۆن بەئایاتی پڕ ماناو حیکمەتو کاریگەر روبەرویان دەبووەوە، سزاو عەزابی سەختی پەروەردگاری وەیاد دەهێنانەوە، پاداشو نیعمەتەکانی بەهەشتی بۆ شی دەکردنەوە، دابو نەریتی خودا لەبوونەوەرداو قانونو یاسای لەگەڵ ستەمکارانو سەرڕەقان لەرابردوودا رون دەکاتەوە.

**پەیوەندیو موناسەبەی ئەم سورەتە لەگەڵ هی پێشوودا لەم رووەوەیە:**

١- سەرەتای ئەم سورەتە بەباسی نازڵبونی قورئان لەخوداوە دەست پێ دەکات ئەمەش گونجاوە لەگەڵ کۆتایی سورەتی پێشوو کەباسی ئەوە دەکا: کە قورئان بەزمانی عەرەبی نازڵ بووە.

٢- هەردوو سورەتەکە لەمەبەستە سەرەکییەکاندا یەك دەگرنەوە: کە بریتیە لەچەسپاندنی تاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوەو رابوونی قیامەت.

لەخوێندنەوەی سورەتەکەو تێفکرین لەئایەتەکانی دەبینین کۆمەڵێك ئادەمیزاد هەن سورن لەسەر کوفرو بێدینی، بەناحەق دژی هەق دەوەستنو بڕوای پێ ناکەن، دەربارەی خوداو قورئانو پێغەمبەرەکەی بێ ئەدەبن، بۆیە هەڕەشەیان لێ دەکاو لەعەزابی سەختو دژوار دەیانترسێنێ. بڕوانە ئایەتی ژمارە (٧). ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾و ئایەتەکانی دواوەی.

دەبینین کۆمەڵێکی تر هەن، بیروبۆچوونو مەزندە کردنیان هەڵەو پووچە، حەقیقەتی ئیمانیان بۆ هەزم ناکرێو تێی ناگەن، جوداوازی نێوان خۆیانو کردەوەی خراپ لەسەرێکەوەو موسوڵمانانو کردەوەی چاکیان لەسەرێکی ترەوە ناکەن، بۆیە قورئانی پیرۆز ئەوەیان بەگوێدا دەدا کە بەگوێرەی تەرازوی خودا جیاوازیی بنەڕەتی هەیە لەنێوان پێڕی گومڕاو کۆمەڵی خوداناسان، لەنێوان کردەوەی چاكو کردەوەی خراپەدا.

هەروەها سورەتەکە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە: کە کۆمەڵێکی تر هەن ئارەزوبازو هەواپەرست، هیچ یاساو رێسایەکیان نیە کێشەکانی خۆیانی پێ هەڵبسەنگێنن، شوێن هەواو ئارەزوی خۆیان کەوتوونو هەوەسبازو ئارەزوپەرستن، هەواو ئارەزۆی خۆیان کردووە بەخودای خۆیانو ئامێری بیستنو دیتنو هەستو شعوری خۆیان لەکار خستووە. بەئاشکرا ئینکاری زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش دەکەن، دەڵێن: ژیان تەنها ژیانی دونیایەو کە مردین تازە زیندو نابینەوە.

وێدەچێ ئەم تاقمو پێڕانە هەموویان یەك کۆمەڵ بووبنو لەبوارە جیاجیاکاندا ئەم بیروباوەڕانەیان دەربڕیبن، لەوانەشە تاقمو پێڕی جیاجیابن،

وێـشدەچێ هـەموو ئـەم تـاقمەو پێڕانـە لـەناو خـودی مەککـەدا نـەبووبن، وەلێ کـە ئاماژەیان پێ کراوە بۆ ئەوە بووە قورەیشییەکان پەندی لێ وەرگرن.

بەهـەرحاڵ قورئـان بـەرەو رووی تـاقمەو پێـڕی ئـاوا بۆتـەوەو کەسـانی ئـاوا بەرەنگاری بوونـەوە، لـەم سورەتەدا لـەو تـاقمەو پێڕانـە دەدوێو بەڵگـەو نیـشانەی بۆڕدەریان لەسەر راست دەکاتەوە.

سەرەتا سورەتەکە سەرچاوەی قورئان بەیان دەکاو ئەوە دوپات دەکاتـەوە: کـە لـەخوداوە نـازڵ کـراوە، ئـەمجار هـەبوونو تـاکو تـەنهایی خـودا رادەگەیـەنێو دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویو ئادەمیزادو گیانلەبەرانی ترو گۆڕانی شەوو رۆژو بارینی بـارانو هـەڵکردنی (بـا) دەکاتـە بەڵگـە لەسـەر هـەبوونی خودایـەکی خـاوەن دەسەڵاتو زاناو داناو تاکو تەنها.

ئەمجار هەرەشە لەهەموو ئەوانە دەکا: کـە ئایـاتی خـودا بـەدرۆ دەخەنـەوەو گاڵتەی پی دەکەن.

ئەمجار هەندێك نیعمەتی خودا بەسەر بەندەکانی دەستنیـشان دەکـا، لـەپێش هەموو ئەو نیعمەتانەوە نازڵکردنی قورئانە: کە هـۆی هیدایـەتو شـارەزایی کردنـی مەردوومـە. ئـەمجار رامکردنـی دەریاکـان بـۆ ئـەوەی کەشـتیو گـەمێکان بەناویانـدا بڕۆنو بەهۆیانەوە بازرگانی بکەن.

ئـەمجار باسـی بـەرزی خودانـاسـان دەکـاو بـاری ئـەخلاقو کۆمەڵایـەتیو مرۆڤایەتیو ئاشتی خوازییان دیاری دەکا، ئەوە روون دەکاتـەوە کـە کـردەوەی چـاك یان خراپ ئاکامەکەی بۆ خاوەنەکەیەتی.

ئـەمجار نیعمـەتی مـاددیو گیانییـەکان رادەنوێنـێ کـە خـودا بەخـشیوونی بەنەتەوەی ئیسرائیل.

ئـەمجار فـەرمان بـە پێغەمبـەرو موسـوڵمانان دەکـا: کەباپەنـدی شـەریعەتی ئیسلام بن بەموو لێی لانەدەن، پـشت بـەخودا ببەسـتنو بتمانـەیان پێـی بـێ، داوای یارمەتی هەر لە ئەو بکەن.

ئەمجار پەروەردگار رەدی موشریکەکان دەداتەوە: کە ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن، ئەوە دەسەلمێنێ کە ژیانبەخش و مرێنەر و کۆکەرەوەی ئادەمیزاد لەقیامەت هەر خۆیەتی، ئەو خاوەنی توانای رەهاو خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، خۆی مالیك و فەرمانڕەوای رۆژی قیامەتە. پاداش و سزا هەمووی بەدەست خۆیەتی.

کۆتایی سورەتەکەش بەوە دەهێنێ: کە ئادەمیزادەکان پاداش و سزای عادلانە وەردەگرنەوە. هەروا ئادەمیزاد تێکڕا دەکرێنە دوو تاقمی سەرەکی، تاقمی بەهەشتییەکان ئەوانەی خاوەن باوەڕی راست و کردەوەی چاکن. تاقمی دۆزەخییەکان ئەوانەی بڕوایان بەخودا نەبووەو پەیامی پێغەمبەریان رەتکردۆتەوە، کردەوەی خراپیان ئەنجام داوە. بەژیانی دونیا بوغرابوون و گاڵتەیان بەئایاتی خودا کردووە.

## سەرچاوەی قورئان پەروەردگاری باڵا دەست و دانایە

﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَـٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَـٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَـٰحِ ءَايَـٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٥﴾ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَـٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ ﴾

(حم) - (حا - میم) دەست پێکردنی سورەتەکە بەم دوو پیتەو بەو شێوە ئاماژەیە بەوە: کە ئەم قورئانە موعجیزەی سەرئاسایەو لەو جۆرە پیتانە پێکهاتووە، دەبا قورەیشییەکانو هەموو ئادەمیزاد بتوانن لەو جۆرە پیتانە کتێبێکی تری ئاوا دابنێن. بێگومان نەیانتوانیوەو ناتوانن وێنەی ئەو کەلامە بخەنەڕوو! کەوابێ ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوە: کە ئەم قورئانە سەرچاوەی خودای پەروەردگارە، ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ بێگومان ئەم قورئانە لەخودای باڵادەستو داناوە نازڵ کراوە، خودایەکی خاوەن دەسەڵاتی وەها کە هیچ شتێك نەیوێرێتێ، داناو لێزان: کە هەموو کارێکی لەجێی خۆیدایە، هەموو شتێکی بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدایە، هەرچی بکرێ بێتە دی دەتوانێ بیهێنێتە دی. زانایە بەهەموو شتێك، بێ ئاتاجە لەهەموو شتێك، هەرچی عەبەثو بەتاڵ بێ لەو روونادا.

﴿إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان لەدروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا بەڵگەی بەهێزو ئاشکرا هەن لەسەر هەبوونی خوداو تاکو تەنهایی زاتی پاکیو توانای رەهاو بێ سنووری.

﴿وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ بێگومان لە بەدیهێنانی ئێوەی ئادەمیزاددا: کە لەنەبوونەوە خودا دروستی کردوون، دروستبوونەکەشتان بەچەند قۆناغێك بووە: سەرەتا گڵو ئەمجار دڵۆپە مەنیو پاشان خوێنپارەو دوایی گۆشتپارە. ئەمجار هەیکەلی ئێسقانو دوایی داپۆشینی بەپێستو بەمجۆرە تا دەبێتە ئادەمیزادێکی تەواو کامڵ لەزاتو لەصیفاتی ئادەمیزادیدا. هەروەها لە دروست کردنی ئەو حەمکە گیانلەبەرو پێڕۆو خشۆكو باڵندەیەدا کە بەناو زەویدا بڵاوبوونەوە، هەندێکی لە گەرمەسێرو برێکیان لەکوێستانداو هەندێکیان لەکەشو هەوای مامناوەندیدا درێژە بەژیان دەدەن، هەندێکیان لە وشکانیدا هەندێکیان لەناو ئاودا، هەندێکیانماڵیو برێکیان کێوی، لەهەموو ئەمانەدا ئایاتو نیشانەی گەورە هەن لەسەر قوردرەتی خوداو حیکمەتو دانایی لەهەموو کارو

کردەوەیەکدا، بۆکەسانێك ئەهلى يـەقين بـن، ئيمانيـان هێنابـێ و قبـووڵی حـەقيان کردبێ و ئیمانیان بەرەبەرە زیاد بووبێ و بەتەواوى دڵیان لەسەر ئیمـان دامـەزرابێ، بەجۆرێك دڵنیابووبن هیچ شك و گومان روویان تێ نەکا.

﴿وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاء مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومـان لـەگۆڕانی شـەوو رۆژو بەشـوێن يەکدى هاتنیاندا، لەجوداوازییان لەکورتی و درێژی و ساردی و گەرمیـدا، لـەروناکی و تاریکیـدا، هـەروەها لـەو بارانـەی کـە دەبێتـە هۆکـاری پەیـدابوونی رزق و رۆژی و لەبەرزاییـەوە خـودا دەیبارێنـێ و زەوی مـردوی پـێ زینـدو دەکاتـەوە، خـاکی سـوتەمەڕۆی پـێ شـین و زەنـوێر دەکاتـەوەو بـەگوڵ و گـژوگیای رەنگـاو رەنـگ دەیرازێنێتەوە، یان مەبەست ﴿مَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ...﴾ تیشکی خـۆرە چونکە لەراستی دا باران بارینیش بـەهۆی تیشکی خـۆرەوە دەستەبەر دەبـێ، گـەرمی خـۆر لـەدەریا دەداو بوخـار هەڵدەسـتێنێ و هـەور پەیـدا دەبـێ و بـارانی لێ دەبـارێ. هـەروەها لەهەڵکردنی باو هێنان و بردنیدا، لەگۆڕانکاریی تێیدا دەمێك لەباکورەوە هەڵی دەکا بەرەو باشورو دەمێکیش بەپێچەوانەوە، کاتێك ئەو بایـە سـارد دەبـێ و وەختێکیش گەرم، کاتی وا هەیە سودی هەیە بۆ زینگەو جاری وا هەیە زیانبەخشە، هەموو ئەم گۆڕانکـاریی و جوداوازییـەی دەبینـدرێ هەسـتی پـێ دەکـرێ نیـشانەی هـەبوونی خودایـەکی خـاوەن دەسـەڵات و بەتوانایـەو عاقڵمەنـدان تێیـان دەفکـرن و لێیـان ورد دەبنـەوە، لـەو دیمـەن و روداوانـەی سـود وەردەگـرن لـەدیاردەکانی بوونـەوەر ورد دەبنەوەو بەڵگەو نیشانە لەسەر خودایەتی دەدۆزنەوە، رۆژبە رۆژو سات لەدواسـات ئیمانیـان بـەهێزترو دامـەزراو تـر دەبـێ و یـەقینیان زیـاد دەکـا لـەززەت و خۆشـی لەخودا پەرستیدا دەبینن.

﴿تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ اللَّهِ وَآيَاتِهِ يُؤْمِنُونَ﴾ ئـەو شتانەی باسکران هەر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوییە وەبەگۆڕانی شەوو رۆژو

وەرزی ساڵو گۆڕانی ئاو هەوا... هتد. هەموو ئەمانەو زۆر شتی تریش بەڵکوو هەموو گەردیلەیەکی بوونەوەر بەگیاندارو بێ گیانیەوە بەدیارو نادیاریەوە بەڵگەو دەلیلی ئاشکرای ئێمەن ئاماژەیان پێ دەکەین‌و بەسەر تۆدا ئەی پێغەمبەری خۆشەویست دەیانخوێنینەوە، حەق‌و راستییان لەخۆ گرتووە بەحەق‌و راست ئەو قورئانەمان نازڵکردوە، بۆ چەسپاندنی حەق‌و پەیڕەوی کردنی حەق ناردومانەتە خوارێ، بۆ ئەوەمان ناردووە ئادەمیزاد سودی لێ وەربگرن‌و پێی بەهرەوەر بن. جا ئەگەر ئەوان بەم قورئانە ئیمان نەهێنن ئەدی بەچ ئایەتێك ئیمان دەهێنن؟ واتە کەسێك بە قورئان بەهرەمەند نەبێ‌و ئایاتی خودا نەبنە هۆی ئیمانهێنانی، بەهیچ نیشانەو نامەی تر موسوڵمان نابێ. کەوابێ قورئان نامەی هیدایەتەو بەڵگەی جۆراو جۆری لەسەر بنەمای عەقیدە لەخۆگرتووە. یەکتاپەرستی‌و راستی پێغەمبەرایەتی‌و راستی رابوونی قیامەت دەسەلمێنێ، هەروەکوو چۆن ئەحکامی فیقهی‌و ئەخلاقی‌و کۆمەلایەتی‌و رامیاری‌و ئابوری... هتد لەخۆگرتووە.

هەر کەسێ سەرەنج لەو کۆمەڵە ئایەتانە بداو بەوردی لەماناکەیان ورد بێتەوە بەناچاریی دەبێ دان بنێ بەهەبوونی خودایەکی بەدیهێنەری زاناو داناو بەتوانادا.

بێگومان ژیان لەبەصیتترین شێوەیدا تا (مقعد)ترین شێوەی موعجیزەیەو نیشانەی هەبوونی خودای بەدیهێنەرە، بەڵکوو تاکە خانەیەك لەجەستەی زیندو بچوکترین لەخانەو لە گەردیلەش موعجیزەن!! ئەی دەبێ چۆن ئادەمیزاد بەو پێکهاتە نەفسی‌و جەستەییەی موعجیزە نەبێ؟!

وێڕای ئادەمیزاد ئەو هەمکە گیانلەبەرانەی دەوروبەری، جۆرو شکڵ‌و روخسارو هەڵس‌وکەوتیان، شێوەی زاوزێ‌و ژیان‌و پەروەردەبوونیان، کە هەر خودا ژمارەو چۆنیەتییان دەزانێ، هەرچیان بگری‌و تێی بفکری، موعجیزەیەو سەرسوڕهێنەرە، جوداوازیی نێوان مێرولەیەك‌و فیلێك نیە، بچوك‌و گەورەیان زۆرو کەمیان موعجیزەن، سەیری ئەو تەنسیق‌و پلان‌و نەخشەیەی خودا لەنێوانیاندا دایناوە بۆ هەموو رەگەزێك ئەندازەیەکی داناوە، پێکهاتەی جەستەیی‌و

ژمارەو قەبارەیان لە رەگەزەکەی تر جیایە، دەستی قودرەت تەوازونی نێوانیانی راگرتووە، کەمو زیادییان بەسەردا دێنیو بە حیکمەتو تەقدیر تاوو توێیان دەکا.
سەیربکە باز کە باڵندەیەکی ئازاو باڵا دەستە بەسەر باڵندەکاندا تەمەنی درێژە بەڵام بەگوێرەی چۆلەکەو ریشۆڵە رێژەی هێلکەو بێچووی کەمە، خۆ ئەگەر هێلکەو بێچووی وەکوو چۆلەکە زۆر بوایە ژمارەی بازەکان زۆر بوایە، هەموو باڵندەیان قاڕە بڕ دەکردن!!

شێرو پڵنگ لەجیهانی جانەوەراندا ئەگەر وەکوو مەڕو بزنو ئاسکو کەرەکێوی زاوو زێیان زۆر بوایە گیانلەبەرانی تریان قاڕە بڕ دەکردنو هەموویان دەخواردن!

سەیربکە مێشێك بەجارێك سەدان هەزار بێچووی دەبێ، بەڵام تەمەنیان لەدوو حەفتە تێپەڕ ناکا، دەبێ حاڵو وەزع چۆن بوایە ئەگەر تەوازونەکە تێك بچوایەو تەمەنی مێشەکان چەند مانگێك یان چەند ساڵێك بوایە؟ بێگومان ئەو کاتە رەگەزی مێش هەموو شتێکی دادەپۆشیو چاوی گیانلەبەرانی تریان دەردێنان!

کەوابوو ئەوە دەستی پەروەردگارە ئەو تەوازونەی راگرتووەو رێژەی هەموو شتێکی دەست نیشان کردووە، هەموو شتێکی بە ئەندازەیەو بۆ هەموو شتێك حیسابی تایبەتی راگرتووە. هەر ئاواو بەو جۆرە لەهەموو زەڕاتێکی بوونەوەردا، لەهەموو بوارو حاڵو وەزعێکدا، لە جیهانی گیانلەبەراندا لەخودی دروستکردنەکەیاندا، لە تایبەتمەندیو پلانو مەزندەکردنیاندا، لەجیهانی ئادەمیزاددا، لەجیهانی پێڕۆو خشۆكو باڵندەو گیانلەبەرانی ناو دەریاو چۆمەکاندا... بەتاكو بەکۆ لەهەموویاندا نیشانەو بەڵگەی هەبوونی خودای خاوەن دەسەڵاتو زاناو دانا هەن، هەرکەسێك تێیان بفکریو لێیان وردبێتەوە یەقینی بۆ پەیدا دەبێو دڵو دەروونی پڕ دەبێ لە ئارامیو، شكو گومانی تێدا نامێنێ!

گۆڕانی شەوو رۆژ دوو دیاردەی سەرسوڕهێنەرو دوو نیشانەی گەورەی ناو بوونەوەرن، بەهۆی دووبارە بوونەوەی ئەو گۆڕانکارییە: کە هەموو بیستو چوار سەعاتێك ئەو دیاردە دووبارە دەبێتەوەو پێوەیان راهاتووین، ئەگینا لەڕاستیدا

گۆڕانی شەوو رۆژ دوو نیشانەی گەورەو گرنگی ناو بوونەوەرن‌و پێویستە هەڵوێستەیان لەسەر بکرێ، بەدڵێکی کراوەو هەستێکی ناسکەوە لێیان وردبینەوە. بۆئەوەی هەست بەو قودرەت‌و دەسەڵاتە بکەین: کە وەدییان دێنێ. بێگومان زانیاری ئادەمیزاد رۆژ دوای رۆژ زیاد دەبێ‌و لەبارەی دیاردەکانی بوونەوەرەوە زانستمان بەرفراوان دەبێ!

دەزانین: کە شەوو رۆژ دیاردەی بوونەوەرن‌و لە هەڵخولانی زەوی بەدەوری خۆیدا بەرامبەر بەخۆر هەموو بیست‌و چوار سەعاتێك پەیدا دەبن، هەڵخولانی زەویش بۆ خۆی شتێکی سەرسوڕهێنەری ترە، هەڵخولانی ئەو قەبارە زەبەللاحە، بەو شێوە رێك‌و پێکی‌و تەنظیمە، لەو بۆشاییە بەرفراوانەدا هەڵدەخولێ‌و مەلە دەکا بەبێ ئەوەی بەشتێکەوە هەڵواسرابێ لەسەر شتێك وەستێندرابێ، تەنها دەسەڵاتی خودا رایگرتووەو بەو شێوە مەلایین ساڵە هەڵدەسوڕێ‌و رۆژێك لەرۆژان چرکەیەك نەوەستاوەو خولەکێك دوا نەکەوتووەو سانتیمەترێك لە خولگەی خۆی لاینەداوە.

هەتا زانیاری ئادەمیزاد زیاد بکا، گرنگی دیاردەی شەوو رۆژ لایان زیاتر دەبێ، بۆیان دەردەکەوێ کە دابەشبوونی کات لەنێوان شەوو رۆژداو دابەشبوونی ساڵ بەسەر وەرزەکانیدا هۆکارێکی سەرەکیین بۆ پەیدابوونی ژیان لەسەر زەوی‌و بەردەوامبوونی. خۆ ئەگەر ئەم دوو دیاردانە بەو شێوە نەبوونایە بێگومان هەموو شتێکی سەر ئەم زەوییە دەگۆڕاو ژیان بەو شێوە ئاساییەی ئێستا نەدەبوو. بۆیە دەبێ بزانین ئەم دوو دیاردەیە (گۆڕانی شەوو رۆژ) دوو دیاردەی زۆر گرنگن‌و دوو نیعمەتی گەورەی پەروەردگارن بەسەر ئادەمیزاددا بەتایبەتی‌و بەسەر هەموو گیانلەبەرانی تردا بەگشتی، هەروەها دیاردەی (با) کە بەرەو باشوورو باکورو خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا هەڵ دەبێ، دەمێ ساردو چەڵ گەرم‌و جارێ توندو وەختێ هێدی، بەشێوەیەکی بەردەوام ئەم هەوایە لەئارادایەو دێ‌و دەچێ‌و پەیوەندییەکی سەرەکی بە گۆڕانی شەوو رۆژو بە هەڵخولانی زەوییەوە هەیە، هەروەکوو چۆن

پەیوەندی بەو هەورو بارانەوە هەیە کە مایەی رزق و رۆژیو هۆکاری بەردەوامبوونی ژیانە لەسەر زەوی، ئەو هەموو دیاردەو نیشانانەی باسکران پێکەوە گونجاون و بەگوێرەی ویستی خودا بوونەوەر پێك دەهێنن، هەموویان تێکڕا بەتاك و بەکۆ نیشانەی دەسەلاتی رەهای پەروەردگارن. بەلام بۆ کێ؟ بۆ کەسانێك عەقلیان هەبێ!

## هەرەشەکردن لەوانەی ئایاتی خودا بەدرۆ دەخەنەوە

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ ۖ وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدًى ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾

دوای ئەوەی هەندێ نیشانەی قودرەتی خۆی بۆ کافرەکان بەیان کردو ئەوەی راگەیاند: کە ئەگەر ئیمان بەو قورئانە پیرۆزە نەهێنن بڕوا بەو ئایات و موعجیزانە نەکەن ئیتر بڕوا بەهیچ شتێك ناکەن. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا هەڕەشەی توندیان ئاراستە دەکا، هەڕەشە بە عەزابی سەخت لەهەموو ئەوانە دەکا کە قورئان بەدرۆ دەخەنەوەو لەسەر کوفرو بێدینی سوردەبن. ئەوەیان پێ

رادەگەیەنێ: کە سزای ئەوان دۆزەخ دەبێ‌و بتەکانیان هیچ سودیان پێ ناگەیەنن، تەنیا قورئان نامەی هیدایەت‌و هەر ئەو بەکەڵکی ئەوەدێ بکرێتە بەرنامەی ژیان!

دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ شیوی وەیل کە شوێنێکە لەناو دۆزەخدا بۆ هەموو ئەوانەی ئایاتی خودا بەدرۆ دەخەنەوە، تا بینە قاقایان تاوان‌و سەرپێچیکارییە.

ئەففاك: بەکەسێك دەگوترێ:

١- سووربێ لەسەر کوفرو بێدینی خۆ بەزلزان‌و فیزمون بێ. ﴿يَسْمَعُ آيَاتِ اللَّهِ تُتْلَى عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا﴾ ئایاتی قورئانی بەسەردا دەخوێندرێتەوە، بەڵگەی ئاشکراو نمایانی تێدان لەسەر تاك‌و تەنهایی خودا لەسەر دەسەڵات‌و توانای رەهای، ئیمان ناهێنێ.

هەڕەشەی پەروەردگار دەبیسێ‌و خۆی لێ گێل دەکاو لە هەڵوێستی خۆی دانابەزێ. بەو ئایەتانەی بەسەریدا دەخوێندرێتەوە پەند ئامێز نابێ، بەخۆی دەنازێ‌و گوێ بە هەڕەشەی خودا نادا، هەر دەڵێی نایان بیسێ‌و گوێی لێ نیە. ﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر (بە تەوسەوە) موژدەی عەزابی بە ئێش بەو جۆرە کەسانە بدە، با باش بزانن خودا عەزابی دژواری دۆزەخی بۆ ئامادەکردون!

٢- گاڵتە بە قورئان بکاو گرنگی پێ نەدا ﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ ئەم بوختانکەرو تاوانبارو کافرە سەرڕەقە: کە ئایەتێکی قورئان دەبیستێ، شتێك دەربارەی قورئان دەزانێ ئیتر ئەوە دەکاتە قاوەو هەڵا، دەیکاتە شوێنی گاڵتە پێ کردن‌و لاقرتێ‌و قەشمەری. ئەوانە سزای بەئێش‌و ریسواکەریان بۆ ئامادەکراوە، لەتۆڵەی ئەوەی ئەوان گاڵتە بەپەیامی خوداو پێغەمبەری خودا دەکەن، سوکایەتی بە قورئان دەکەن خودا سزای ریسواکەرو ئابروبەری بۆ ئامادە کردون.

﴿مِن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاء وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لەپێش ئەو کافرو تاوانبارانەوە ڕۆژی قیامەت و دۆزەخ هەیە، بۆیان ئامادەکراوە، ئەوان لەئێستاوە بەرەو ڕووی دێن، پێی دەگەن و تێی دەکەون، تور دەدرێنە ناوی و ڕزگار بوونیان نابێ.

﴿هَذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ﴾ ئەم قورئانە هەمووی ئەو ئایەتانەی لەوەپێش لەم سورەتەدا باسکراون هیدایەتن، هیدایەتدەرن بۆ ڕێبازی حەق و ڕاستی، شارەزایی مرۆڤ دەکەن بۆ ڕێبازی بەختەوەری، ئادەمیزاد لەتاریکی و گومڕایی ڕزگار دەکا دەیخاتە سەر ڕێبازی نووڕانی. ئەوانەی بڕوایان بە ئایاتی قورئان نیە، ڕۆژی قیامەت کوشندەترین عەزابیان بۆ ئامادە کراوە. قورئان هیدایەتێکی خالص و پاڵفتەیە هیچ چەواشەکاری و گومڕا کردنی تێدا نیە، جا کەسێك بڕوای بەو هیدایەتە نەبێ دیارە شیاوی سەختترین عەزابی دۆزەخە!!

## هەندێ نیعمەتی خودا بەسەر بەندەکانیدا

﴿ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا

بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ ﴾

دوای ئەو هەڕەشە ترسناکەی ئاراستەی ئادەمیزادی کرد، بەجۆرەها سزاو عەزابی سەخت ترساندنی ئەمجار ئوسلوبەکە دەگۆڕێو بەهێدی لەوەتەری دڵیان دەداو نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خۆی دەخاتە بیریانو بە بەرچاویاندا رایاندەنوێنێ. رامکردنی کەشتی زەبەللاح کە بەناو دەریادا دەکەونە رۆیشتنو کاڵاو شتومەکیان پێ دەگوێزنەوە گەشتو گوزاریان پێ دەکەن، خودا ئەو کەش و هەوایەی خوڵقاندووە ئەو کەشتییە بارگرانو قورسو زەبەللاحانە لەناو دەریادا نقوم نەبن هێزی کێشندەی زەویو هەبوونی بای گونجاوو مولائیمو عەقڵو زانیاری ئادەمیزاد کە کەشتییەکەی رێکخستووەو لێی دەخورێ هەموویان نعمەتی خودانو خودا وەدی هێناون ئادەمیزاد سودیان لێ دەبینێ، هەروەها موسەخەر کردنی هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە بۆ سودی ئادەمیزادو کەڵك لێ وەرگرتنی.

ئەمجار فەرمان بە موسوڵمانان دەکا کە لەبەرامبەر کافرەکان لێبوردەیی بنوێننو چاوپۆشییان لێ بکەن. دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بێگومان ئەو خودایەی کە هەبوونو تاكو تەنهاییو بەتواناییو دانایی بە بەڵگەو نیشانەی جۆراوجۆر سەلمێندراوە، خودایەکی وەهایە دەریای بۆ ئێوە رام کردووە بۆ ئەوەی کەشتی بەناودا بڕوا، کاڵاو شتومەکی خۆتانی پێ بگوێزنەوە، بازرگانی لەنێوان وڵاتاندا ئەنجام بدەن، بەهۆی غەوواصەو ئامێری ترەوە بڕۆنە ناو دەریاوە بۆ دەرهێنانی دوڕو مەرجان بۆ ڕاوە ماسیو گەلێ شتی تر، بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکەن لەسەر رامکردنی دەریاو سود لێ بینینی!

رامکردنی دەریا لەرابوردودا بەسێ شت دەستەبەر دەبوو: بای گونجاو بۆ ڕۆیشتنی کەشتییەکە، توانایی ئاو بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو قورساییە لەسەر خۆی بگرێ، سروشتی دار کە سەراوەو نقوم نابێ. لەرابوردودا زۆربەی پێکهاتەی کەشتی لەدار دروستکراوە.

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ هەروەها بۆ ئێوەی رامکردووەو وای خولقاندووە خزمەتی ئێوە بکا، هەرچی لە ئاسمانەکاندا هەیە لەخۆرو مانگو ئەستێرەو شارە ئەستێرەو شتەکانی تری ناو ئاسمان. هەروەها هەرچی لەناو زەویدا هەیە لەخاکو ئاوو هەواو ئاگر، لەکێو کەژو دەشتاییو شاخو دۆڵ، لەباو بارانو گیانلەبەران بەهەموو جۆرەکانیەوە هەمووی بۆ خزمەتی ئێوەیەو سودو بەرژەوەندی ئێوەی تێدایە. رامکردنی ئەم حەمکە چتو متە رەحمەتو فەضلی خودایە بۆ ئێوەی ئادەمیزاد تا سودی لێ وەربگرنو بەندایەتی بکەن، بیر لەقودرەتی خودا بکەنەوە، بە بەڵگە تاکو تەنهایی خوا بدۆزنەوە، چونکە بێگومان لەو رامکردنو ژێر بار کردنەدا بەڵگەی جۆراوجۆر هەن لەسەر بەتواناییو تاکو تەنهایی خودا بۆ گەلو نەتەوەیەك خاوەن عەقڵو هۆش بنو بیر بکەنەوە، نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ – النحل/٥٣﴾ هەرچی لە بوونەوەردایە هی خودایەو بەدەست خودایەو ئەو رامی کردووەو هەڵیدەسوڕێنێ بۆ خزمەتی ئادەمیزاد پەروەردگار هێزو توانای وای داوە بە ئادەمیزاد کە شارەزای یاساو قانونی کەون ببێ بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بێنێ!!

ئەمجار دوای هێنانەوەی بەڵگە لەسەر تاکو تەنهایی خودا فەرمان بەخوداپەرستان دەکا: کە خۆیان بەرەوشتی جوان ئارایش بدەن دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ لِيَجْزِيَ قَوْمًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ، مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو

موسـولْمانە خوداناسـە یەکتاپەرسـتانە بلْـێ: چاوپۆشـی بکـەن لـە ئەزیەتـدانو خراپەکاریی ئەو موشریکانەی کە ترسی عەزابی خودایان لەدلْدا نیەو باکیان لەو رووداوە سامناکانە نیە. کە بەسەر ئادەمیزادی هێنـاونو بەسـەریان دێنـێ، ناترسن ئەو بەلاّو عەزابەی بەسەر گەلە ستەمکارەکانی هێناوە بەسەر ئەوانیشی بێنـێ، بـە موسـولْمانە راسـتاڵەکان بلْـێ: بـاخۆراگرو پـشوو درێـژبن بـۆ ئـەوەی خـودا پاداشـی صـەبرو خۆراگرییـان بداتـەوە، وەلاّمـی هـەموو شـتێکی کافرەکـان نەدەنـەوە، بەهەندیان وەرنەگرنو گرنگیان پێ نەدەن، خۆیان لـەوە بـەرزتر بگـرن کـە خۆیـان بەوەلاّمدانەوەی ئەوانەوە خەریك بکەن.

لەراستیدا ئەوانەی بڕوایان بەخودا نیەو ترسی عەزابی خودایان لەدلْدا نیـە، هەندێ جار موستەحەقی عـەطفو بـەزەیین، چونکە لـەو پشتیوانە بـەهێزە کـە پـەروەردگارە بـێ بەشـن لـەو هێـزو توانـا رەهایـە پـچڕاون، لـەو سەرچاوە صـافو بەخشندەو پەنا قایمو پتەوە دابڕاون، کەوابێ موسولْمانان شیاوی ئەوەن چاوپۆشی لە حەماقەتو خراپەکاری ئەو داماوانە بکەن. بێگومان کەسـێ کـردەوەی چـاك بکـا ئاکامەکەی بـۆ خـۆی دەگەڕێتـەوە، کەسـێکیش خراپـە بکـا زیانەکـەی بـۆ خۆیـەتی. پاشان (رۆژی بـەرێ) هـەمووتان بـۆلای خـوا دەگەڕێنـەوە، حیـسابو لێکۆلینـەوەتان لەگـەلْ دەکـا، هەرکەسـە بـەگوێرەی کـردەوەی خـۆی سـزا دەدرێو پـاداش وەردەگرێتـەوە!! خـودا کـە جلْـەوگیری لەخراپـە دەکـاو فـەرمان بەچـاکە دەکـا بـۆ قازانجی بەندەکانیەتی، بۆ بەرژەوەنـدی ئەوانـە، ئـەگینا ئەگـەر هـەموو جندۆکـەو ئـادەمیزاد چـاکەکاربن لەخودایـەتی خـودا زیادنابـێو خـۆ ئەگـەر هەمووشـیان خراپەکاربن تۆزقاڵێك لەخودایەتی خودا کەم نابێتەوە.

## ئاینو شەریعەتی خودا گەورەترین نیعمەتە

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾

لەوەپێش باسی نیعمەتەکانی خودای کرد: کە بەخشیونی بە ئادەمیزادو بریتی بوو لەنیعمەتە گشتییەکانی، ئەمجار لێرەدا باسی ئەو نیعمەتە تایبەتیانە دەکا: کەبەخشیونی بەنەتەوەی ئیسرائیل، جا چونکە نیعمەتی ئاین گەورەترو پیرۆزترە لەنیعمەتی دونیایی، سەرەتا نیعمەتە ئایینیەکان باس دەکا بەتایبەتی باسی شەریعەتی ئیسلامی دەکا: کە گەورەترین نیعمەتی خودایە بەسەر

ئادەمیزاددا و دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ وَآتَيْنَاهُم بَيِّنَاتٍ مِّنَ الْأَمْرِ﴾ سوێند بێ ئێمە چەند نیعمەتێکی تایبەتیمان بەنەتەوەی ئیسرائیل بەخشی هەندێك لەو نیعمەتانە.

١- نازلکردنی تەوراتە بۆ سەر موسا: کە پێغەمبەرو رزگاری خوازو پێشەوای نەتەوەی ئیسرائیل بوو لە چەوساندنەوەی فیرعەون و گومرایی رزگاری کردن.

٢- رۆشنبیری و تێگەیشتن لە شەریعەتی پێدان دەسەلاتی ئایینی و دونیاییان گەیە دەست، کێشەو نیزاعی ناو مەردومیان یەکالا دەکردەوە.

٣- پێغەمبەرمان بۆسەر ناردن.

٤- رزق و رۆزیی پاك و خاوێن و بەتاممان پێ دان، گەزۆو گۆشتی شەلاقەمان بۆ ناردنە خوارێ.

٥- بەسەر هەموو ئادەمیزادەکانی سەردەمی خۆیاندا پاساویان هەبوو رێزو شکۆمەندیمان پێ بەخشین. زۆر پێغەمبەریان تێدا هەڵکەوتوون، زۆر لە پێغەمبەرەکانیان دەسەلاتی ئایینی و دونیاییان هەبووە، پێغەمبەرایەتی و پاشایەتییان هەبووە، موعجیزەی گەورە گەورەیان هەبووە.

٦- بەڵگەو نیشانەی بەهێزو ئەحکامی شەریعەتیان لەلا هەبووە، حەلال و حەرامیان لێك جیا کردۆتەوە، کەچی وێڕای ئەو هەموو نازو نیعمەتە دونیایی و ئایینیانە شوکری خودایان نەکرد، بەگوێی پێغەمبەرەکانیان نەکرد، سپڵەو پێنەزان بوون، کێشەو نیزاعیان لە ئاییندا بەرپا کرد وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ﴾ واتە: کێشەو نیزاع دەربارەی ئایین لەناو نەتەوەی ئیسرائیل پەیدانەبوو مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان دەربارەی حەقیقەتی حاڵ بۆ دەستەبەر بوو، بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆریان لەسەر راست کرایەوە، واقیعی حاڵیان دەزانی، بەڵگەو دەلیلیان نیشاندرابوون، کەچی بە ئەنقەست و بۆ بەرژەوەندی تایبەتی و کورسی خۆشەویستی حەسوودی بەیەکتر بردن و

دوژمنایەتیکردنی یەکتری و چەوساندنەوەی هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان و سەرڕەقی و دڵرەقی یان دوبەرەکی و ئاژاوەیان تێدا دروست بوو، بوون بە تاقم تاقم و گروپ گروپ، لەسەر هیچ شتێك کۆڕایان نەبوو، هەمیشە پێکەوەیان شەڕو هەرا بوو! هەر تاقمەو بە ئارەزووی خۆی حەڵاڵ و حەرامی دیاری دەکرد!

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی پێغەمبەر! ڕۆژی قیامەت دادگاییان دەکاو کێشەکانیان یەکالا دەکاتەوەو چاك و خراپ لێك هەڵدەهاوێرێ، حەق و بەتاڵ لێك جیا دەکاتەوە پاداشی چاکەکار دەداتەوەو سزای خراپەکار دەدا.

﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ پاش پەیدابوونی ئەو کێشەو نیزاعە دەربارەی ئایین لەناو نەتەوەی ئیسرائیلدا، کاتی ئەوە هات شەریعەتێکی جوان و گشتی و تێرو تەسەل نازڵ بکەین ئەویش شەریعەتی ئیسلامەو کاکڵەی هەموو ئایینە ئاسمانییەکانی لەخۆ گرتووە، ئەی پێغەمبەری خۆشەویست تۆمان کردووە بە هەڵگری ئەو پەیامەو بڵاوکەرەوەی ئەو ئایینە، دەسا شوێنی بکەوەو پێوەی پابەند بە، بەگوێرەی ئەو شەریعەتە حوکم بکەو بڕیار بدە، شوێن هەواو هەوەسی ئەوان مەکەوە، کە نەفام و نەزان و بێ بەڵگەو دەلیل مل دەنێن، هیچ لەبنەماکانی ئایین نازانن، نایانەوێ بیزانن، بەکورتی ئەگەر مەیل وەلای ئەو نەفام و موشریکانە بکەی شوێن ئایینی بەتاڵ و پوچیان بکەوی شیاوی عەزابی سەختی خودا دەبی، ئەوکاتە ئەوان فریات ناکەون، ناتوانن عەزابی پەروەردگارت لێ لادەن.

﴿إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ بێگومان ئەو موشریکانە، ئەو نەفام و گێل کەزابانە ناتوانن هیچ جۆرە عەزابێکی خودات لێ دور بخەنەوە، ئەگەر شوێنیان بکەوی و خودا بیەوێ عەزابت بدا ئەوان هیچ یارمەتییەکی تۆیان پێ نادرێ! ﴿وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان ئەو ستەمکارو کافرو

ئەفامانە هەندێکیان یارمەتیدەرو هاریکاری هەندێکیانن، پشتگیری یەکتر دەکەن، دووڕووەکان هاریکاری جوولەکەکان دەکەن تێکڕا دژایەتی موسوڵمانان دەکەن، وەلێ ئەو هاریکاریو یارمەتیدانەیان بۆ قیامەت هیچ سودی نیە، جگە لەماڵ وێرانیو بەدبەختی هیچی تریان دەستگیر نابێ، یارمەتیدانەکەیان بۆ یەکتری تاوانو سزایان بۆ زیاد دەبێ. خودا پشتیوانی موسوڵمانو خاوەن باوەڕانی ڕاستەقینەیە، لەتاریکی گومڕایی دەریان دێنێ دەیانخاتە سەر ڕێبازی ڕاستو سەرفرازیی، کەسێك خودا لەپشتی بێ، کەسێك خاوەن تەقوا بێو خۆشەویستی خودا بێ، ڕزگار بوو بەمراز گەیشتووە بەپێچەوانەوە کافرەکان شەیتانو تاغوتو ملهوڕەکان خۆشەویستیانن ئەوانیش گومڕایان دەکەن، لەنورو ڕوناکییەوە بەرەو زەلکاوی گومڕایی ڕەهایان دەکەن.

ئەمجار بەیانی گەورەیی قورئان دەکاو دەفەرموێ: ﴿هَذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ ئەم قورئانە: کە یاسای خودایە بۆ ئادەمیزادو بەرنامەی ئیسلامی پیرۆزەو پوختەی هەموو ئایینەکانی لەخۆ گرتووە، تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامەو نەسخ نابێتەوە، ئا ئەم قورئانە بەڵگەو ئامۆژگاریو ڕێگا نیشاندەرە بۆ ئادەمیزاد بەگشتی، هەرچی ئەحکامی ئایینە تێیدایەو هەموو کێشەیەکی پێ یەکالا دەکرێتەوە، هیدایەتدەری ئادەمیزادە بۆ بەختەوەریو سەرفرازی بۆ بەمرازگەیشتن، شادبوون بەبەهەشت، هەرکەسێ پەیڕەوی بکا هیدایەتدراوو بەمرازگەیشتووە ڕەحمەتی خودایە بۆ بەندەکانی، بۆ ڕزگاربوون لەئاگری دۆزەخ لەقیامەتدا، ئەمە بۆ کەسانێك بڕوایان پێی بێو گومانیان لەڕاستی ئەو بەرنامە پیرۆزەدا نەبێ، ڕێزی لێ بگرنو پەیڕەوی بکەن. دڵنیابن ئەوە کەلامی خودایەو شەریعەتی یەزدانە، بێ منجەو منج بێ سێو دوو تەنفیذی دەکەن، جا کاتێك ئەو بڕوایە پەیدا بوو لای ئادەمیزادو ئەو متمانەیەی بۆ حاصڵ بوو بەرچاوی ڕون

دەبێ‌و ئاسۆی لێ روناكە، ئامانجی دیارەو بەرەو مەبەستی پیرۆز هەنگاو دەنێ، ئیتر ئەو كاتە قورئان نوورو هیدایەتو رەحمەتە.

## چاكو خراپ مردنو ژیانیان چوون یەك نیە

﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

دەربارەی هۆكاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٢١) (الكلبی) دەڵێ: ئەم ئایەتە دەرحەق بە عەلیو حەمزەو ئەبو عوبەیدەی كوڕی (الجراح) لە موسوڵمانەكانو سێ نەفەریش لە موشریكەكان (عوتبەو شەیبەو وەلیدی كوڕی عوتبە): كە بەموسوڵمانەكانیان گوت: ئێوە بیروباوەڕتان بۆشو هیچو پووچە، ئەگەر ئەوەی ئێوە دەیڵێن راست بێ‌و زیندوبوونەوە هەبێ، دڵنیابن حاڵو وەزعی ئێمە لەقیامەتیشدا لەحاڵو وەزعی ئێوە باشتر دەبێ، هەروەكوو چۆن ئێستا لەدونیادا

وەزعمان لەئێوە باشترە. ئیتر خودا ڕەدی دانەوەو بەدرۆی خستنەوە، ئەوەی بەیان کرد؛ کە هەرگیز نابێو ناگونجێ حاڵو وەزعی موسوڵمانانی راستاڵ وەکوو حاڵی کافری ستەمکار بێ؟!

دەربارەی هۆکاری نازڵ بوونی ئایەتی ژمارە (٢٣) ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ﴾ ئیبنولمونذیرو ئیبنو جەریر لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەت دەکەن؛ دەڵێ: هەندێ لە قورەیشییەکان بۆ ماوەیەك بەردێکیان دەپەرست، دوایی کە بەردێکی جوانتریان دەست دەکەوت وازیان لەبەردی پێشوو دەهێناو دەستیان دەکرد بەپەرستنی بەردی تازە بابەت ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد.

دەربارەی رستەی ﴿وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ﴾ لەهەمان ئایەتدا، موقاتیل دەڵێ: دەرهەق بەئەبو جەهل نازڵ بووە، ئەوەبوو شەوێك لەگەڵ (الوليد)ی کوڕی (المغيرە)دا بەدەوری کابەدا تەوافیان دەکردو گفتوگۆیان بوو، دەربارەی پێغەمبەرو ئایینی ئیسلام دەدوان، ئەبو جەهل وتی: فڵانی من سور دەزانم موحەممەد راست دەکاو پێغەمبەرە وەلید وتی: کوڕە دە ووسبە کەی ئەوە قسەی کردنە، چ بەڵگەیەکت بەدەستەوەیە؟ ئەبو جەهل وتی: کوڕە ئەی هەر ئێمە نەبووین، بەگەنجی ناومان نابوو (الصادق الأمين)وتی: دەی باشە کەوایە بۆچی بڕوای پێ ناکەی کێ رێگای لێ گرتووی؟ وتی: دوایی کچە قوڕەیشی لێم دەکەنە بەیتو بالۆرەو قاوەقاو دەڵێن: فڵانەکەس شوێن هەتیوەکەی ئەبو طالب کەوتووە. سوێندم بە (اللآت والعزى) قەت شوێنی ناکەوم. ئیتر ئایەتی ﴿وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ﴾ نازڵ بوو.

پەیوەندیی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەپێشەوە لەم رووەوەیە: کە لەوەپێش جوداوازی نێوان کافرانو خوداپەرستانی دەستنیشان کرد لەروی ویلایەتەوە ئەمجار لێرەدا جیاوازی نێوانیان دیاری دەکاو لەروی سزاو پاداشەوە لەقیامەتدا، پاشان ئەوە روون دەکاتەوە، کە بەڵگەو هۆکاری ئەو جوداوازییەی نێوان چاکەکارانو

خراپەکاران ئەوەیە: کە خودا بوونەوەری لەسەر بناغەی حەق‌و راستی بەدیهێناوە، حەقیش داخوازی عەدالەتە. ئەمجار لەروانگەی ئەم حەق‌و عەدالەتەوە سزاو پاداشی بەکردەوەوە بەستۆتەوە، کردەوەی باش پاداشی بەهەشتە، کردەوەی خراپ سزای دۆزەخە.

﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ واتە: یان ئەوانەی خراپەکارن‌و تاوان ئەنجام دەدەن، بڕوایان بەخودا نیەو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستۆتەوە، لەجیاتی پەروەردگار شتی تریان کردۆتە خوداو پەرستشیان بۆ کردووە، بەتەمای ئەوەن بیان بەنە ریزی ئەوانەوە: کە خاوەن باوەڕن‌و شوێن پەیامی پێغەمبەرانی خودا کەوتوون، کردەوەی پەسەندیان ئەنجام داوەو خۆیان لەخراپەکاریی پاراستووە؟؟

ئایا ئەو تاقمە تاوانبارە ستەمکارە بەهیوای ئەوەن پاداشیان وەکوو ئەو کۆمەڵە خاوەن باوەڕە خواپەرستانە بێ؟ بەتەمان لەدونیاو قیامەت وەکوو یەك رێزیان لێ بگرین‌و بەیەك چاو سەیریان بکەین؟ نەخەیر چون یەك نین، چونکە حاڵی خوداپەرستان لەقیامەتدا جوداوازە لەحاڵی کافران، ئەوان لەبەهەشتی رازاوەدا ژیان بەسەر دەبەن‌و لەوپەڕی خۆشیدا دەگوزەرێنن، بێ باوەڕان لەدۆزەخدا دەتلێنەوە، بێگومان بەهەڵەچوون، خراپ حاڵی بوون، ئەو حوکمەی داویانە کە گوایە ئێمە خواپەرستان‌و بێ باوەڕان وەکوو یەك سەیر دەکەین، لەدونیاو لەقیامەتدا پاداشتیان وەکوو یەك وایە! نە نە باوا گومان نەبەن، بەمردویی بەزیندویی وەکوو یەك نین، خاوەن باوەڕان ژیانیان بەخوداپەرستی بەسەر بردووە، بێ باوەڕان بەتاوانکاریی ژیاون‌و خەریکی خراپەکاریی‌و سەرپێچی کردن بوون. ئەوان لەکاتی مردندا موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە، کافرەکان هەڕەشەی دۆزەخیان لێ کراوە، ئەگەر بەڕواڵەت لەژیانی دونیادا بێ باوەڕان حاڵیان لەخودا پەرستان خۆشتر بێ ئەوە بەتەئکید لە دوا مردن، موسوڵمانان لەبەختەوەریدان‌و کافران لەوپەڕی ناخۆشی‌و عەزابدان... وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو

دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ – الحشر/٢٠﴾ یان دەفەرموێ: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ، مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ – القلم/٣٥-٣٦﴾ یان دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ – ص/٢٨﴾.

ئەمجار دوای بەیانکردنی هەبوونی جوداوازیی نێوان موسوڵمانانو کافران، بەڵگە لەسەر راستی ئەو مەبدەئە حیکمەت ئامێزە دەهێنێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ واتە: پەروەردگار ئاسمانەکانو زەوی لەسەر بنەمای حەق دروست کردوون، بۆ چەسپاندنی حەق بەدی هێناون، ئەوەش داخوازی عەداڵەتکارییە لەنێوان بەندەکاندا. چونکە ئەگەر زیندوبوونەوەو حەقو حیساب نەبوایە بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوی بحەق نەدەبوو، جوداوازی لە نێوان پاداشی چاکەکارو خراپەکاردا ئەوپەڕی عەداڵەتو دادپەروەرییە. کەواتە خودا ئاسمانەکانو زەوی بەحەق دروست کردون بۆ ئەوەی بیانکاتە بەڵگە لەسەر بەتوانایی خۆی.

﴿وَلِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی خۆی سزاو پاداش وەربگرێتەوە، بەندەکانی خودا ستەمیان لێ ناکرێ، هیچ کەس ستەمی لێ ناکرێ، نە پاداشی کەم دەکرێتەوە، نەسزای لەسەر زیاد دەکرێ، خۆ ئەگەر ستەمکارو چەوسێنەرەوەو تاوانبارانی دونیا پاشگوێ بخرانایەو لەقیامەت سزایان لێ نەستێندرێتەوە، ئەوکاتە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی بەحەق نەدەبوو. کەواتە مەبەست لەبەدیهێنانی بوونەوەر چەسپاندنی عەداڵەتە، عەداڵەت لەنێوان ئادەمیزاددا ناچەسپێ ئەگەر زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوە نەبێ.

ئەمجار پەروەردگار هەڵسوکەوتی کافرەکان بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ

غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! (هەروەها هەرکەسێك شیاوی خیطاب بێ) پێم بڵێ: ئایا کەسێك هەواو هەوەسی خۆی کردبن بەخودای خۆی، هیدایەتی ئاسمانی وەرنەگرێ، لەجیاتی بەندایەتی کردن بۆ خودا ملکەچی هەواو ئارەزوی خۆی بێ، هەرچی حەزی لێ بێ بیکا بەبێ ئەوەی لایەنی رەزامەندیی و پێناخۆشبوونی خودا بەرچاو بگرێ، وەلحاڵ خودا گومڕاو ریسوای کردبێ، دڵو گوێچکەی مۆر کردبن و پەردەی بەسەر چاودا دابێ، لەهیچ تێ نەگاو هیچ نەبیسێ و نەبینێ، گوێچکەی مۆر کرابن ئامۆژگاری نەبیسێ، دڵی مۆر کرابێ و نەزانێ هیدایەت چیە، چاوی پەردەی پێدا درابێ ئایاتی خودا لەبوونەوەردا نەبینێ، باشە کەسێك بەهۆی گومڕایی خۆیەوە ئەوە حاڵ و وەزعی بێ، دەبێ جگە لەخودا کێ هەبێ هیدایەتی بدا؟ ئەرێ بۆچی بیر ناکەنەوە، بۆ بەخۆتاندا ناچنەوە؟ بۆچی هەوڵ نادەن حەقیقەتی حاڵ بزان؟! زانایانی ئیسلام ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر کۆمەڵی (قەدەرییە): کە پێیان وایە ئادەمیزاد بۆخۆی خەڵقندەی کردەوەو بیروباوەڕی خۆیەتی بەچاك و خراپیەوە. بەم ئایەتە رەدیان دەدەنەوەو دەڵێن: خودا خەڵقندەی کردەوەو بیروباوەڕی بەندەکانیەتی، چونکە ئەوەتا خودا لەئایەتەکەدا ئەوەی رونکردۆتەوە، کە دڵو گوێچکەی کافرەکانی مۆر کردون و پەردەی بەسەرچاویاندا هێناوەو مەنعی هیدایەت وەرگرتنی لێ کردون، کەوابێ خودا بەدیهێنەرو خەڵقندەی کردەوەی بەندەکانیەتی، ئادەمیزاد کەسبی دکاو بەویستی خۆی لایەك لەخێرو لەشەڕ هەڵدەبژێرێ. ئەواب و عیقاب لەسەر هەڵبژاردن و کەسبی کردەوەکەیە!

## بەڵگە پوچو بێ بناغەکانی کافرەکانو هەندێ لەدیمەنە سامناکەکانی رۆژی قیامەت

﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾

لەوەپێش هەندێ هۆکاری گومڕابوونی کافرەکانی بەیان کرد: کەشوێنکەوتنی هەواو هەوەس یان خۆگێل کردن لەحەقائیقو راستییەکان، یان سەرڕەقیو عەنادی بوو ئەمجار هەندێ بیروباوەڕی پوچو نەفامانەیان دیاری دەکاو رەدیان دەداتەوە، دوابەدوای ئەوە هەندێ دیمەنو رِوداوی قیامەت رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا مَا

هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەزیندوبونەوەو هاتنی قیامەت نیە گوتویانە: (دەڵێن): ژیان تەنها ئەم ژیانی جیهانەیە دەژین‌و دەمرین، ئیتر دوای دەرچونمان لەژیانی دونیا زیندوبوونەوە نیەو ژیانێکی تر نابینین، چینێك دەمرێ‌و چینێکی تر دێتە شوێن‌و بەم شێوە کاروانی ژیان بەردەوام دەبێ، سروشت هاتوچۆی رۆژگار ئێمە لەناو دەباو دەمانفەوتێنێ، بەمەش ئینکاری رابوونی قیامەت دەکەن‌و بڕوایان بەهەبوونی خودایەکی زاناو بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر نیە!!

عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی بڕوایان وابوو: کە رۆژگار بکەرو کاریگەرە لەبوونەوەردا، ئەوەبوو هەرکاتێ تووشی زەرەرو ناخۆشیەك دەبوون پاڵ زەمانەیان دەدا، دەیانگوت: ئەوە چەرخی رۆژگار ئەوەی بەسەر ئێمە هێناوە جنێویان بەرۆژگار دەدا، ئیتر پێیان گوترا: جوێن بەزەمانە مەدەن وامەزانن کە ئەو ئەم کارانە دەکا! بەڵکوو خودا بەیهێنەرو بکەری ئەو کارانەیە کە پاڵ رۆژگاریان دەدەن!

بوخاری‌و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا، هەروەها ئەبوداوودو نەسائی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ ، يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الآمْرُ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ» لە ریوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێ: «لاَ تَسُبُّوا الدَّهْرَ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْرُ». شافعی‌و ئەبو عوبەیدەو هی تریش تەفسیری ئەم حەدیثەیان بەم جۆرە کردووە: فەرموویانە: عەرەبەکانی پێش هاتنی ئیسلام، کە بەڵاو ناخۆشییەکیان تووش دەهات دەیانگوت: (يا خيبة الدهر) دەك رۆژگار کوێرایت دابێ! واتە: ئەو کردەوانەیان پاڵ رۆژگار دەداو جنێویان پێ دەدا، لەراستیشدا بکەرو بەدیهێنەری ئەو شتانە خودایە، جا کە ئەوان جنێویان بەزەمانە دەدا لەم رووەوە، کە بکەرو بەدیهێنەرە بۆ ئەو رووداوانە، وەکوو ئەوە وایە جنێویان بەخودا دابێ، چونکە لەراستیدا بکەرو بەدیهێنەری حەقیقی خودا خۆیەتی، ئەمجار پەروەردگار قسەو

بیروبۆچوونەکەیان رەت دەکاتەوە، ئەوە بەیان دەکا کە ئەوان ئیعتیمادیان لەسەر بەڵگەو دەلیل نیەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ ئەوان: کە ئەو جۆرە قسانە دەکەن‌و ئەو بیروباوەڕانە دەردەبڕن لە زانیارییەوە نیە، واقیعی حاڵ نازانن‌و گومانیان هەیە، بەڵگەیان بەدەستەوە نیە جگە لەگومان‌و مەزندە کردن‌و رەمڵ هاویشتن، بیروباوەڕی کوێرانەو قسەی بێ بەڵگەو نیشانە ئیعتیباری پێ نیە، متمانەیان پێ ناکرێ.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەم ئایەتە گەورەترین‌و بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قسەی بێ دەلیل‌و شایەت پوچ‌و بێ بایەخە، شوێنکەوتنی شك‌و گومان لای خودا قێزەونە.

ئەمجار پەروەردگار هەندێ لە بەڵگە پوچەکانیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ هەرکاتێ ئایاتی قورئانیان بەسەردا بخوێندرێتەوە. وێڕای ئەوەی کە ئایەتەکان روون‌و ئاشکران لەسەر بەدەسەڵاتی خوداو هاتنی رۆژی قیامەت‌و زیندوبوونەوە، بەڵگەو دەلیل لەسەر تاك‌و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی‌و رابوونی قیامەت دەهێنێتەوە، ئەوە ئاشکرا دەکا: کە خودا دوای مردن‌و لەکاتی خۆیدا گیانەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ ناو جەستەکانیان... هتد. کەچی ئەو نەفامانە بڕواناکەن‌و ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن، هیچ بەڵگەو بیانوشیان بەدەستەوە نیە جگە لەوە دەڵێن: دە ئەگەر راستە زیندوبوونەوە هەیە باوك‌و باپیرانمان بۆ زیندو بکەنەوە، ئەوانەی مردوون بیانگێڕنەوە بۆ ژیان تا پێتان بڕوا بکەین. با شایەتیتان بۆ بدەن‌و حەقیقەتمان بۆ روون بکەنەوە لەراستیدا ئەمە قسەیەکی بێ بایەخ‌و بێ مانایە، چونکە زیندوبوونەوەی مردوان پاش کۆتایی هاتنی دونیایە، مەرج نیە شتێك ئەمڕۆ نەبێ سبەینێش نەیەتەدی باوك‌و باپیرانی ئەوان کە ئەمڕۆ زیندو نەبنەوە لە داهاتوودا زیندو دەبنەوە!

ئەمجار بەڵگە لەسەر رابوونی قیامەت دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلِ اللَّـهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکە نەفامانە بڵێ: بێگومان خودا ئێوەی لەنەبوونەوە هێناوەتە گۆڕەپانی ژیانەوە، ژیانی پێ بەخشیون، پاشان کە ئەجەلتان هات دەتانمرێنێ، ئەمجار لەرۆژی قیامەتدا هەموانتان زیندو دەکاتەوەو کۆتان دەکاتەوە بۆ حیساب و لێکۆلینەوە، دڵنیابن ئەو رۆژە دێتە دیو قیامەت رادەبێ، هیچ گومان لەهاتنەکەیدا نیە، چونکە ئاشکرایە ئەو خودایەی توانیویەتی ئێوە لەنەبوونەوە دروست بکا زۆر بەئاسانی دەتوانێ جارێکی دی دوای مردن سەرلەنوێ زیندوتان بکاتەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ – الروم/٢٧﴾ هەرچەندە بۆ خودا هەموو کارێك ئاسانەو هیچ شتێك لای خودا ئەستەم نیە.

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وەلێ زۆربەی زۆری ئادەمیزاد (ئەو موشریکە عەرەبانە) ئینکاری زیندوبونەوە دەکەن بەبێ لێ وردبوونەوەو سەرنج لێدان ئەو فیکرە رەت دەکەنەوە، پشت بەلایەنی ماددی دەبەستن و لایەنی غەیب پشت گوێ دەخەن، بەدیدی کورت بین و کەم بینی خۆیان دەڕوانن بوونەوەرو لەروانگەی زانیاری بێ بناغەی خۆیانەوە رەمڵ دەهاون و لەو روانگەوە رابوونی قیامەت بەدوور دەزانن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا، وَنَرَاهُ قَرِيبًا – المعارج/٦-٧﴾ ئەمجار پەروەردگار بەڵگەیەکی گشتی تر لەسەر بەتوانایی و خاوەن دەسەڵاتی رەهای خۆی دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّـهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ﴾ هەربۆخودایە خودایەتی و پاشایاتی ئاسمانەکان و زەوی، خۆی تێیاندا فەرمانڕەواو خاوەن دەسەڵاتە. کەس هاوشان و هاوبەشی نیە، ئەو رۆژەش قیامەت رادەبێ کافرو بەدرۆ خەرەوەکان خەسارەتمەند

دەبن، ئەو کاتە بە برینی خۆیان دەزانن و مایە پوچی خۆیان بۆ دەردەکەوێ، چونکە رەهێڵ دەکرێن بۆ ناو دۆزەخ و کەس ناتوانێ فریایان بکەوێ!

ئەمجار پەروەردگار بڕێ دیمەنی سامناکی دۆزەخ رادەنوێنێ و دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً﴾ تۆ دەبینی ئەی محمد! هەموو گەل و نەتەوەکان لە ترسان و لە عەیبەتان بەسەر ئەژنۆیاندا کەوتوون، بۆ حیساب و لێکۆڵینەوە! وای کە دیمەنێکی سامناک و مەوقیفێکی حەریجە!!

﴿كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَى إِلَى كِتَابِهَا﴾ هەموو گەل و نەتەوەیەك بانگ ەکرێ، بەناوی ئەو نامە ئاسمانییەی نازڵ کراوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەیان، یان بە ناوی نامەی عەمەلیانەوە بانگیان لێ دەکرێ، دیمەنەکە تا بڵێی ترسناك و سەرنج راکێشە، سارای مەحشەر لەمسەر بۆ ئەو سەر، ئەو هەموو چین و توێژەی ئادەمیزادی تێدا کۆبۆتەوە، ئەو هەموو گەل و نەتەوەو میلەل و نیحەلانە تاقم تاقم کراون لێك هەڵاوێراون ئەو هەموو ئادەمیزادەی لەسەر گۆی ئەم زەوییە چین دوای چین هاتوون رۆیشتوون ئێستا وا لەو سارای بێ سەروبن دا کۆکراونەوەو هەموویان لە ترسان بە چۆکا هاتوون و چاوەڕوانی حیساب و لێکۆڵینەومن.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ – الزمر/٦٩﴾ کێشەی نێوان ئادەمیزادەکان یەکالا دەکرێتەوە، هەموو کەس سزاو پاداشی خۆیان بەبێ زیادو کەم وەردەگرنەوە، بە ئاشکرا بەو حەشاماتە بە چۆکدا هاتووەی دەشتی مەحشەر دەگوترێ: ﴿الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەمڕۆ: کە رۆژی قیامەتە سزاو پاداشی کردەوەکانتان دەدرێتەوە، چاکە بە چاکەو خراپە بەخراپە. تۆزقاڵێك ستەم لەکەس ناکرێ.

﴿هَذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەوە نامەی کردەوەکانتانە لە ژیانی دونیاتاندا فەرمانمان بە فریشتەی چاودێرتان کردبوو کردەوەکانتان بنووسێ، ئەوەتا چیتان کردووە لەخێرو شەڕ تێیدا تۆمار کراوە،

شایەتە بەسەرتانەوەو بەحەق کردەوەکانتان دیاری دەکا، دڵنیابن ئێمە هەموو کردەوەیەکی ئێوەمان تۆمارکردووە هیچ شتێکی ئێوەمان پاشگوێ نەخستووە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا – الكهف/٤٩﴾.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: فریشتە کردەوەی ئادەمیزاد تۆمار دەکەن ئەمجار بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان، ئەمجار ئەو فریشتانەی بەرپرسی نامەی ئەعمالن نوسراوەکە لەگەڵ نووسراوی لەوحولەحفوظدا بەراورد دەکەن: کە لە ئەزەلدا خودا نوسیویەتی پیتێک کەمو زیادی تێدا نابێ، ئەمجار ئیبنو عەبباس بۆ پشتگیری قسەکەی خۆی ئایەتی ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ی خوێندەوە.

## پاداشتی خودا پەرستانو سزای کافرەکان

﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِۦٓۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ

كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾

پاش ئەوەی باسی قیامەتو دیمەنە سامناکەکانی کرد، ئەمجار دێتە سەر باسی سەرەنجامو شوێنی موسوڵمانانو ئەو پاداشەی بۆیان دیاری کراوە، هەروەها حاڵو وەزعی کافرەکانو ئەو عەزابو نارەحەتیەی بۆیان ئامادەکراوە، دەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ﴾

جا ئەوانەی بڕوایان بە تاكو تەنهایی خودا هەیەو باوەڕیان بە نامەی ئاسمانیو پێغەمبەرانی خوداو هاتنی ڕۆژی قیامەت هەیە، وێڕای ئەو باوەڕە کردەوەی چاكو پەسەندیان ئەنجام داوە، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگاریانن ئەوە ئەوانە پەروەردگاریان دەیانخاتە ناو بەهەشتی ڕازاوەی خۆیەوە سەر فرازو بەختەوەریان دەکا، ئەوەش بە مراز گەیشتنێکی ئاشکراو نمایانە، کەسێك خودا لە عەزابی دۆزەخ بیپارێزێو بیخاتە ناو بەهەشتەوە، ئیتر ئەوپەڕی بەختەوەری بەدەست هێناوە! ئاواتەکانی هاتوونە دی!

﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا أَفَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَاسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ﴾

ئەوانەیش: کە ئینکاری هەبوونو تاكو تەنهایی خودایان کردووە، پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوە، ئەوە بە تووڕەییەوە، پێیان دەگوترێ: ئەوە ئێوە نەبوون ئایاتی

قورئانتان بەسەردا دەخوێندرایەوەو رووتان لێ وەردەگێڕا لوتبەرزیتان دەنواند؟؟ ئێوە نەبوون بڕواتان بە پەیامی پێغەمبەرانمان نەکرد؟؟ ئێوە گەل و نەتەوەیەکی تاوانکارو تاوانباربوون، کردەوەکانتان ناشیرین و نابەجێ بوون، لە ناخیشدا بڕواتان بە زیندوبوونەوەو حیساب و لێکۆڵینەوە نەبوو!!

﴿وَإِذَا قِيلَ: إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ﴾ ئەگەر لەلایەن پێغەمبەرو خودا پەرستانەوە بەو کافرو بێدینانە بگوترێ: دڵنیابن وادەی خودا بە هاتنی قیامەت و هەبوونی حیساب و لێکۆڵینەوە حەقەو پاشگەز بوونەوەی تێدا نیە، هەموو وادەو بەڵێنێکی خودا دێتە جێ و قیامەت حەقەو شك و گومان لە هاتنیدا نیە، بڕواتان پێی هەبێ و چاوەڕوانی بن و کاری بۆ بکەن، هەوڵ بدەن خۆتان لە عەزابی بە ئێش و سامناکی دۆزەخ رزگار بکەن، ئەگەر ئەم ئامۆژگاریانەتان ئاراستە بکرایە، دەتانوت: نازانین قیامەت چەس؟ ئێمە شك و گومانمان لە هاتنیدا هەیە، ئێمە هەرچی شك و گومانێ زانستمان بۆ دەستەبەر بکا نیمانە جگە لە گومانێکی لاوازی وەها: کە هیچ شتێکی پێ دەستەبەر ناکرێ و هیچ یەقینێکی تێکەڵ نابێ!

ئەمجار دوای ئەم سەرکۆنە کردن و نیقاشە، پەروەردگار باسی ئەوەیان بۆ دەکا، کە ئاکامی کردەوەکانی خۆیان بۆ دەردەکەوێ، دەفەرموێ: ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُون﴾ ئاکامی کردەوە خراپەکانیان بۆ دەردەکەوێ، جەزای توندو تیژو ئەو دۆزەخەی گاڵتەیان پێ دەهات: کە لەدونیادا دەیانترساندن لێی، دەوریان دەداو لەهەموو لایەکەوە لەخۆیان دەگرێ. ئەمجار پەروەردگار لە رزگاربوون نائومێدیان دەکا، بۆئەوەی ئەوەندەی تر عەزابەکەیان کاریگەربێ، دەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا وَمَأْوَاكُمْ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ پێیان دەگوترێ: ئەمڕۆ مامەڵەیەکی واتان لەگەڵ دەکەین وەکوو ئەوە لەبیر خۆمان بردبنەوە، وەکوو شتێکی بێ بایەخ و لەبیرچووەوە

حیسابتان بۆ دەکرێ، فرێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوەو ئاوا پاشگوێ دەخرێن، چونکە ئێوە لەژیانی دونیادا رابوونی قیامەتتان لەبیر خۆ بردبوەوە. لە ئاست فەرمان و جڵەوگیرییەکانی خودا خۆتان کەڕو لاڵ کردبوو، هیچ هەوڵ و تەقەلایەکتان بۆ ئەم رۆژە نەدا، بۆیە شوێنی حەوانەوەتان ئاگری دۆزەخەو هیچ کەس نیە بتوانێ تۆزقاڵێك عەزابتان لێ دوور بخاتەوە. بەم شێوە عەزابیان لەسەر گران دەکرێ. ئەوەتا بەتەواوی رەحمەت و بەزەیی خوداتان لێ بڕاوە، شوێنتان دۆزەخەو یارمەتیدەریان نیە ئەمجار پەروەردگار هۆکاری ئەو عەزابە سەخت و دژوارە روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكُم بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ ئەو عەزابە سەخت و دژوارەتان بەهۆی ئەوەوەیە: کە ئێوە لە دونیادا قورئانی پیرۆزتان کردبووە ئامێری گاڵتەو گەپ و بەجوانی و رازاوەیی دونیا هەڵخەڵەتابوون، دڵتان پێوەی پەیوەست کردبوو، واتان دەزانی هەر بڕانەوەی نیە، دوای مردن زیندوبوونەوەو حەق و حیساب لێکۆڵینەوە نابێ، جا لە تۆڵەی ئەوەدا ئەمڕۆ ئێوە دەخرێنە ناو دۆزەخەوەو رزگاربوونتان نابێ و لێی دەرناچن، تازە داوای ئەوەشتان لێ ناکرێ: کە تۆبەو ئیستغفار بکەن و خودا لەخۆتان رازی بکەن، چونکە قیامەت شوێنی جەزاو پاداشە، شوێنی کردەوە نیە.

﴿فَلِلَّهِ الْحَمْدُ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ حەمد و سوپاسی تەواو و دڵسۆزانە لە پاساوی نازو نیعمەتی زۆر بۆ خودایە؛ کە بەدیهێنەرو خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، خودای هەموو بونەوەرە بە حەیوان و جەماداتیەوە، بە ناوو هەواوو وزە جۆراو جۆرەکانی ناو بوونەوەرەوە. هەموویان ملکی خودان و گەردنکەچ و بێ دەسەلاتن لە ئاستیدا. ﴿وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەر بۆ خودایە شکۆمەندی و گەورەیی و دەسەلات لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر ئەو غاڵب و خاوەن هێزو توانای رەهایە. کەس نیە بتوانێ بەسەریدا

زاڵ ببێو دەسەوەسانی بکا، داناو لێزانە لە گفتارو کردەوەیدا هیچ شتێکی بێ جێ ناکا، کەریمی کارسازەو کار دروستو سوپاس بۆ کراوە. کەس رایەی ناکەوێ خۆی بەهاوشانو هاوەڵی بزانێ تاکو تەنیاو صەمەدە کیبریاء هەر شایانی خۆیەتی. کەسی تر شیاوی ئەوە نیە. لە فەرموودەی قودسیدا هاتووەو ئەحمەدو موسلیمو ئەبو داوودو ئیبنو ماجە لە ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدەوە ریوایەتیان کردووە: دەفەرموون: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا فەرموویەتی: ﴿العظمة ردائي والكبرياء ازاري فمن نازعني واحدا منها اسكنتة ناري﴾.

**بەیارمەتی خودا جزمی (٢٥)ی تەفسیری رەوان تەواو بوو**

**٢٠٠٢/١/٢٠**

**مەلا مەحمود ئەحمەد موحەممەد**

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی (الأحقاف)

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (الأحقاف) چونکە لەئایەتی ژمارە (٢١)ی دابەسی ئەحقاف دەکا، کە شوێنو نیشتمانی گەلی عاد بووە لەوڵاتی یەمەنو خودا بەرەشەباو زریانی بەردەوامو ڕیشە کێشکەر لەناوی بردن. پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەچەند ڕویەکەوەیە:

١- سەرەتای هەردو سورەتەکان وەکوو یەك وان، ئەوەتا هەر دووسورەتەکە بە ﴿حم: تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنْ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ دەست پێ دەکەن.

٢- ناوەڕۆکی هەردو سورەتەکە لێك دەچن، هەردوکیان باسی یەکتاپەرستیو پێغەمبەرایەتیو نیگاو سروشو زیندو بوونەوەیان لەخۆگرتووە.

٣- سورەتی پێشوو بەسەرزەنشتکردنی موشریکەکان کۆتایی هات، ئەم سورەتەش بەهەمان مەبەست دەست پێ دەکا، پووچیو گەندەڵی بیرو باوەڕیان دیاری دەکا، بەڵگەیان لەدژ ڕاست دەکاتەوە، داوای بەڵگەیان لێ دەکا، گەورەییو شکۆمەندی پەروەردگار ڕون دەکاتەوە، ڕەحمەتو بەهانا هاتنی بۆ ئادەمیزاد نمایش دەکا، بەپێچەوانەی ئەوخودا دۆرزنانەی: کە موشریکەکان بەندایەتییان بۆ دەکەن، نەهیچ دەبیسنو نەفریای کەس دەکەون!

باسو مەوزوعی سەرەکی ئەم سورەتە(قضییە)ی عەقیدەیە، واتە: ئیمان بەتاكو تەنهایی خوداو خاوەنیەتی رەهای بۆ بوونەوەر، ئیمان بەسروشو نیگاو پێغەمبەرایەتی، بڕوا بەوە: کە موحەممەد پێغەمبەرەو قورئانی بۆ نێردراوە، لەپێش ئەودا پێغەمبەری تر هەبوونو ئەم دواپێغەمبەرە، هەروەها ئیمان بەزیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوە.

ئەم بنەمایانە چەند بنەمایەکی سەرەکیو بنەڕەتین، ئیسلام لەسەر ئەم بنەمایانە دروست بووە، بۆیە قورئانی پیرۆز لەهەموو سوورەتێکی مەککیدا

عیلاج و چارەسەریان دەکا، لەسورەتە مەدینەییەکانیش دا ناوبەناو ئاماژەیان بۆ دەکا، چونکە سروشتی ئیسلام وەهایە، دینێ ئیمان بەتاک و تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی و ڕابوونی قیامەت و زیندوبوونەوە دەکاتە جەمسەرێکی مەرکەزی و ئاداب و شەریعەتەکانی بەدەوردا دەسوڕێنەوە، بەم جۆرە ئەم سورەتە دڵەکان دێنی و دەبا، هەموو ڕێگاو بانێکی گومڕاییان لێ دەگرێ، لەهەموو وەتەرێکیان دەدا، لەجۆرەها بواردا ئەو بنەمایانە رادەنوێنێ، بەڵگەی (کەونی و نەفسی مێژووی) یان لەسەر دەهێنێتەوە، هەر وەکوو چۆن دەیانکاتە(قضییە)ی بوونەوەر ......، هەمووی نەک تەنها هی ئادەمیزادو بەس!

## سەلماندنی هەبوونی خوداو تاک و تەنهایی زاتی پاکی و زیندوکردنەوەی ئادەمیزادو ڕابوونی قیامەت و ڕەتدانەوەی بتپەرستەکان

﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا

يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾

پەروەدگار سەرەتای سورەتەکە بەم جۆرە دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿حم﴾ دەبێ ئەم وشەیە بە پچڕپچڕی بخوێندرێتەوە واتە: بگوترێ: (حا میم) دەربارەی ماناکەشی هەمان تەفسیرو رافەی هاووێنەکانی رەچاو دەکرێ.

﴿تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنْ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ واتە: نازڵکردنی قورئان لەلایەن خودای باڵادەستو کار دروستو داناوەیە، ئەو قورئانی بۆ حەزرەتی موحەممەد ناردوە، پەیامی خودایە بۆ بوونەوەرو حەزرەتی موحەممەدﷺ هەڵگرو ڕاگەیەنەری ئەو پەیامەیە، موحەممەد بۆ خۆی دای نەناوە، وەکوو موشریکەکان دەیڵێن، کەوابێ پێویستە هەموو ئادەمیزاد بڕوا بەو پەیامە پیرۆزە بکەن، حەزرەتی موحەممەد بە پێغەمبەری هەموو ئادەمیزادو جندۆکە بزانن‌و شوێنی بکەون‌و پابەندی بانگەوازییەکەی بن، خۆیان بەئەخلاق‌و رەوشتی ئیسلامی ئارایش بدەن‌و بەختەوەریی دونیاو قیامەت بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

﴿مَا خَلَقْنَا السَّمَوَاتِ وَالآرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلاّ بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنْذِرُوا مُعْرِضُونَ﴾ دڵنیابەو دڵنیاییت زیاد بێ ئێمە ئاسمانە بەرزو بەرینەکان‌و زەوی‌و ئەوەی لەناو یان دا هەیە بەحەق‌و ڕاستی دروستمان کردون، جگە لە شێوازی حەق‌و راستی بەهیچ جۆرێکی تر بەدیمان نەهێناون، بەگوێرەی حیکمەت‌و دانایی خودا یانەی خۆمان دروستمان کردون، بەبێهودەو عەبەث‌و بێ مەبەست نەمان هێناونەدی، هێناومانەدی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو هەر کاتێ تەواو بوو، ڕۆژی قیامەت هات، کۆتاییان پێدێ، وئاسمان‌و زەوییەکی تر دێنینە کایەوە!

ئـادەمیزاد دەكەونــە ژیـانێكی تــرەوە، جـا ئەوانــەی ئینكـاری هـەبوونو تـاكو تەنهایی خودا دەكـەن، وێـڕای ئـەو هـەموو بەڵگـەو دەلیلانـە تـەمبێ خـواردو نـابن، ئەوانــە سەرپێـچیكارو بـێ ئاگـاو پـشت هـەڵكردون لـەو هەڕەشــەو ئامۆژگاریانــەی لەقورئان دا لێیان كراوە، هـیچ خـۆ ئامـادە ناكـەن بـۆ حیسابو لێكۆڵینـەوەی ڕۆژی قیامەت، لەوەبەولاوە، سەرەنجامی ئـەو بـێ گوێیو سەرپێچیكردنەی خۆیانیـان بـۆ دەردەكەوێ، ئەوكاتە پەشیمان دەبنەوە بەڵام چ سود؟!

ئـەمجار دوای سـەلماندنی هـەبوونی خـوداو ڕابـوونی قیامـەت، پـەروەردگار ڕەدی بتپەرستەكان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّـهِ أَرُونِـي مَـاذَا خَلَقُوا مِنْ الْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي الـسَّمَوَاتِ﴾ ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویـست؛ بـەو موشـریكانە بڵـێ: ئێـوەی بتپەرسـت: كـە لەتـەك خـودادا بـتو صـەنەم دەپەرسـتن (هەروەها ئەوانەیش: كە ئەمڕۆ حیزب پەرستو گۆڕ پەرستی دەكـەن) پـێم بڵێنو شارەزای حاڵو وەزعی پەرستراوەكانی خۆتانم بكەن، ئایا ئـەو پەرسـتراوانەی ئێـوە چییان لەسەر زەوی بەدیهێناوە؟ كوا توانیویانە چ شتێك لەسـەر زەویو نـاو زەویو ئاسمانـەكان لەنـەبوەوە دروسـت بكـەن؟ ئایـا ئـەوان هاوكـاری خـودا یـان كـردوە لـە بەدیهێنانی ئاسمانەكانو هاوبەشن لەبەڕێوە بردنیان دا؟

لــەواقیع دا ئــەم پەرســـتراوانەی ئــەوان هیــچیان دروســـت نــەكردوە، هــیچ هاوبەشێكیان لەسەر زەویو ئاسمانەكانو ناویان دانیە، ئەدی چۆنو بەچ بەڵگەیەك لەتـــەك خـــودا ئـــەو چـــتە پـــڕو پوچـــانە دەپەرســـتن؟ بـــەچ عـــەقڵێك ئەو شتانە دەكەنە هاوەڵێ خودایـەك كـە بەدیهێنـەرو بەڕێوەبـەرو خـاوەنی هـەموو شتێكە؟؟

﴿ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِنْ قَبْـلِ هَـذَا أَوْ أَثَـارَةٍ مِـنْ عِلْـمٍ إِنْ كُنْـتُمْ صَـادِقِينَ﴾ بەڵگەیـەكی نووسـراوی پـێش قورئـانم بـۆ بێـنن، لـەو نامـەو صوحوفانەی لـەوە پـێش بـۆ سـەر پێغەمبەران نـازڵ كـراون، وەكـوو تـەوراتو ئینجیـل، بەڵگەیـەكم نیـشان بـدەن لـەو

نامە ئاسمانییانە بیرو باوەڕو هەڵس‌و کەوتتان پەسند بکا، ئەو مەنهەج‌و ڕێبازەتان بەڕاست بزانێ، یان تارمایی‌و ڕۆشنای یەك لە زانیاری گەل‌و نەتەوە پێشنەکان‌و پێغەمبەرانی ڕابردو بخەنە ڕو: کە ئەو ڕێبازەی ئێوە بەڕاست بزانێ، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ئەو بتانە خودان‌و شیاوی پەرستنن چتێك لەو بەڵگانە بخنە ڕو دەی: کە ئێوە هیچ بەڵگەیەکی نەقلی‌و عەقڵیتان بەدەستەوە نیە، کەواتە لەخۆڕایی‌و نەفامیتانە ئەو بتپەرستییە دەکەن.

﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ﴾ کێ لەو کەسە گومڕاترو سەر لێ شێواو ترە: کە جگە لەخودا شتێك دەپەرستێ تارۆژی قیامەت بەهانایەوە نایە؟ واتە: کەس لەو کەسە گومڕاترو نەفامتر نیە: کە لەجیاتی خودا شتێك دەپەرستێ‌و هانای بۆ دەباو لێی دەپاڕێتەوە: کە ئەو چتە ناتوانێ هیچ یارمەتیەکی بدا تاقیامەت، تا هەتا هەتایە، چونکە ئەو هاواری کردۆتە شتێك نابیسێ، ئەدی چۆن بەتەمای وەڵامدانەوەیەتی؟ وەلحال ئەوبت‌و صەنەمانە: کە ئەوان پەرستشیان بۆ دەکەن بێ ئاگان لەو عیبادەتەی بۆیان دەکرێ، هیچ نابیسن‌و عەقڵیان بەهیچ ناشکێ!

بەکورتی ئەو بت‌و صەنەمانە دەسەڵاتی هیچیان نیە، بێ ئاگان، بێ گیان‌و بێ هەستن، دەی عیبادەتکردن بۆ غەیری خودا بەگشتی‌و بۆ بێگیانان بەتایبەتی گومڕاییە‌و هیچ پاساوێکی بۆ ناهێندرێتەوە، کەدەفەرموێ: ﴿إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ مەبەست ئەوە نیە: کە ڕۆژی قیامەت وەڵامیان دەدەنەوە، نەخەیر مەبەست ئەوەیە بۆ هەتا هەتایە وەڵامیان نادەنەوەو سودیان لێ نابینرێ.

﴿وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾ ئەو ڕۆژەی ئادەمیزادە بتەپەرستەکان لەساڕای مەحشەردا کۆکرانەوە، بت و صەنەمە پەرستراوەکان دەبنە دوژمنی پەرستشکەرەکان و خۆیان لێ بەری دەکەن و دەست دەکەن بەنەفرین لێ کردنیان، بەدرۆیان دەخەنەوەو دەڵێن: هەر گیزاو هەرگیز ئێوە بەندایەتی ئێمەتان نەکردوە، ئەوانەی بێ گیانن خودا گیانیان پێ دەبەخشێ و دەکەونە ناخاوتن، وێڕای فریشتەکان و عوزەیرو مەسیح و جندۆکە ئینکاری عیبادەتکردنەکەیان دەکەن، چەند بێ عەقڵییە تۆ شتێك بپەرستی و ئەو دوژمنایەتیت بکا، لە ناخۆشترین تەنگانەدا لەجیاتی بەهانا هاتنەوە دژت بوەستێ!!

نمونەی ئەم ئایەتە چەند ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزّاً ، كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدّاً﴾ مريم/٨١-٨٢.

لەئایەتێکی تریش دا پەروەردگار لەسەر زمانی حەزرەتی ئیبراهیم درووودی خودای لێ بێ دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَوْثَاناً مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضاً وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ العنكبوت/٢٥ .

## شوبهەو گومانی موشریکەکان دەربارەی نیگاو پێغەمبەرایەتی و قورئانی پیرۆز

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَىٰ بِهِۦ

شَهِيدًا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٩﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرۡتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثۡلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾

دوای سەلماندنو چەسپاندنی (قضیە)ی یەکتاپەرستیو پوچاندنەوەی فرەخودایيو هەبوونی هاوەڵ بۆ خودا، دێتە سەرباسی پێغەمبەرایەتیو ڕەتکردنەوەی شوبهەو گومانی موشریکەکان دەربارەی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەدو قورئانی پیرۆز، ئەوە ڕون دەکاتەوە کە ئەو موشریکە نەفامانە زۆر هەڵەن لەوەدا: کەقورئان بەسیحرو جادو بازی لەقەڵەم دەدەن، زۆر نەفامن لەوەدا: هەر کاتێ گوێیان لەقورئان دەبێ، دەڵێن: موحەممەدﷺبۆ خۆی هەڵی بەستووە، بابزانن: کە موحەممەد پێغەمبەرەو نیگای بۆ نێردراوەو لەخۆیەوە شت هەڵنابەستێ، خۆ ئەگەر لەفەرزی محاڵ دا پێغەمبەر شتێك هەڵبەستێ خودا بەزویی سزای توندی دەداو کەسیش ناتوانێ ئەو سزایە بگێڕێتەوە.

ئەمجار شوبهەیەکی تری ئەو موشریکانە باس دەکا: ئەویش ئەوەیە: پێشنیاری سەیرو سەمەرە ئاراستەی پێغەمبەر دەکەن، داوای لێ دەکەن هەواڵی نهێنیو غەیب: کە تایبەتە بەخودا خۆیەوە، پێیان بڵێ، فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە بەکافرەکان بڵێ: من یەکەم پێغەمبەر نیم، لەپێش منەوە پێغەمبەری تر زۆرو زەوەنـدەن، ئەدی چۆنو بەچ عەقڵێك ئەو هەواڵانەی من پێتان ڕادەگەیەنم

بەدرۆیان دەخەنەوە، چۆن یەکتاپەرستی ڕەت دەکەنەوە؟ چۆن(قضیە) ی پێغەمبەرایەتیو ڕابوونی قیامەت بەدرۆو ئەفسانە لەقەڵەم دەدەن؟ خۆ هەموو پێغەمبەرێك بۆ چەسپاندنو سەلماندنی ئەم بنەمایانە ڕەوانەکراوە، منیش یەکێکم لەو پێغەمبەرانەو ناتوانم لەخۆمەوە هیچ موعجیزەیەك بنوێنم، ناتوانم هیچ هەواڵێکی نهێنی بگەیەنم، ئەو شتانە لەتوانای ئادەمیزاد دا نینو بەدەست پەروەردگارنو ئەو دەیانزانێو دەتوانێ بەدییان بهێنێ!!

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ لەکاتێك دا ئایاتی قورئانی پیرۆز کە ئاشکراو نمایانە- بەسەر موشریکەکان دا بخوێنرێتەوە لەجیاتی ئەوەی پەند ئامێز بنو شوێنی بکەون، دەڵێن: ئەم قورئانەی موحەممەد بۆ مانی دەخوێنێتەوە سیحرو جادویەکی ئاشکراو نمایانە، ڕوکەشو لەخشتەبەرە، بەم جۆرە گاڵتەی پێ دەکەن، لەوە خراپترو سەر سوڕهێنەر تر ئەوەیە: کە بەدەست هەڵبەستو بێبناغەی لەقەڵەم دەدەن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ نەك هەر ئەو قسە نابەجێیەیانو بەس بەڵکوو دەڵێن: موحەممەد بۆ خۆی هەڵی بەستووە بەدرۆ دەڵێ: لەخوداوە بۆم هاتووە، ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەگەر من: (وەکوو ئێوە دەیڵێن) ئەم قورئانەم بەدەم خوداوە هەڵبەستبێو بەدرۆخۆم بەپێغەمبەر بزانم ئەوە خودا توندترین سزام دەداو کەسیش نیە بتوانێ ئەو سزایەم لێ دووربخاتەوە، نە ئێوەو نەغەیری ئێوە ناتوانن تۆز قالێ: بەر گریم لێ بکەن، دەی چۆن من ئەو جۆرە بوختان دەکەمو بە دەستی خۆم خۆم دەخەمە ئەو تەهلوکەوە؟ هەر گیز شتی وا نەبووەو نابێ..

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا﴾ الجن/٢٢. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ

الآقَاوِيلِ، لَآخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ، فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ الحاقة–٤٤–٤٧.

چی دەڵێن: با بڵێنو چەدەکەن بابیکەن! ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَى بِهِ شَهِيداً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ خودا لە هەموو کەس زاناترە بەو قسەو گفتو گۆیانەی دەربارەی قورئان لەناو خۆیان دا ئەنجامی دەدەن، دەزانێ چۆن قورئان بەدرۆ دەخەنەوە، دەمێ: بەسیحرو جادو بازیو دەزانن‌و چەڵێك دەڵێن بۆخۆی دایناوەو وەختی وایش هەیە دەبێژن چیرۆکە کۆنی پێشینانە!

ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: بەسە: کە خودا شایەتی نێوان من‌و ئێوەشە، ئەو خۆی شایەتمە: کە ئەم قورئانە لەخوداوە هاتووە، بۆمنی نازڵ کردوە، بۆ ئەوەی بە ئێوەی بگەیەنم، باش باش ئاگای لێیە چۆن ئێوە بەدرۆم دەخەنەوە، وێڕای هەموو ئەو تاوان‌و هەڵانەتان خودا خاوەن ڕەحم بەزەیی‌یە، بۆ ئەوانەی تۆبە دەکەن‌و ئیمان دەهێنن‌و قورئان بە کەلامی خودا دەزانن‌و شوێنی دەکەون، نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً، قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً﴾ الفرقان/ ٥–٦.

ئەمجار پەرە بە موناقەشەی ئەم مەوزوعە (مەوزوعی نیگاو سروش) دەداو لە کەلێنێکی ترەوە باسەکە دەخاتە بەر لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ وەڵامی قسە پڕو پوچەکانی موشریکەکان دەداتەوە، فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کەڕوبەڕویان بێتەوە، درێژە بە حیوار لەگەڵ کردنیان بدا دەفەرموێ:

﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعاً مِنْ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلا بِكُمْ﴾ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: من یەکەم پێغەمبەر نیم ڕەوانە کرابم بۆ سەر ئادەمیزاد، بەڵکوو پێش من زۆر پێغەمبەری تر ڕەوانە کراون، من پێغەمبەرێکی ناوازەو تازە قەڵلانیم، نمونەی من زۆر بون‌و هەموو گەل‌و نەتەوەیەك پێغەمبەری بۆ سەر

ڕەوانە کراوە، ئەدی بۆ چی پێغەمبەرایەتی منتان بەلاوە سەیرەو بە کارێکی دوور لەواقیعی لە قەڵەم دەدەن!

ئەمن پێغەمبەرێکم وەکوو ئەو پێغەمبەرانەی پێش خۆم ئادەمیزادێکم خودا هەڵی بژاردوم بۆ پێغەمبەرایەتی‌و فەرمانی پێ کردوم پەیامی خۆم بگەیەنم، پێم سەیرە ئێوە ئیمانم پێ ناهێنن؟ نموونەی من زۆرو زەبەندەن‌و لەپێش منەوە هاتوونە سەر مەسرەحی ژیان‌و هەڵبژێراون بۆ پێغەمبەرایەتی‌و ڕەوانەکراون! دەی بۆ چی ئێوە کاری من بە نەگونجاو دەزانن‌و بەلاتانەوە دوورە من پەیامم بۆ بێ و پێغەمبەریم؟! وێڕای ئەوەی پێغەمبەرم‌و لە خوداوە سروشم بۆ دێ، زانیاری غەیب نازانم، نازانم لە داهاتوو دا چی لەگەڵ ئێوەو من دەکرێ.

نازانم کەی قیامەت ڕادەبێ، نازانم ئاخۆمن لەمەککەدا دەمێنمەوە یان ناچار دەکرێم جێی بێڵم؟ نازانم بە مردنی ئاسایی لەدونیا دەردەچم، یان دەکوژرێم، زوو لە خوداوە سزاتان بۆ دێ یان سزاکەتان دوا دەخرێ؟ ئەمانە هەموویان کاروباری نهێنین‌و هەرخودا دەیانزانی‌و من هیچیان لێ نازانم!

﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلاَّ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ من شوێن ئەو نیگاو سروشە دەکەوم: کە بۆم دەنێردری، پابەندی ئەو فەرمان‌و جڵەو گیریانە دەبم: کە لە قورئان دا بۆم نازڵ دەکرێ. لەخۆمەوە هیچ هەڵنابەستم، ئەرکی سەر شانی خۆم ئەنجام دەدەم، من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام، لە عەزابی خودا دەتانترسێنم!

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە پێغەمبەرﷺ داهاتووی خۆی نەزانیوە، نەیزانیوە لە ژیانی دونیای داچی بەسەردێ. وەڵێ لە ژیانی قیامەتی‌دا دڵنیا بووە لەوە کە دەچێتە بەهەشتەوە، دڵنیابووە: کە خۆی‌و شوێنکەوتوانی لەو دونیا لە پێڕی ڕزگاربوو بە مراز گەییشتوانن. ناتواندرێ بڕیاری چوونە ناو بەهەشت بۆ هیچ کەس بدرێ مەگەر دەقێکی شەرعی لە قورئان‌و حەدیث دیاری

بکاو بەبەهەشتییان لە قەڵەم بدا. وەکوو ئەو(دە) هاوەڵە موژدە پێدراوانـە (العشرة المبشرة)و چەندان هاوەڵانی تر: کە پێغەمبەر ﷺ موژدەی بەهەشتی پێداون.

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَكَفَرْتُمْ بِهِ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ ئـەی موحەممـەد بـەو موشریکانە بڵێ: کە بڕوایان بە قورئان نیەو بە سیحرو ئەفسانەی لەقەڵەم دەدەن، پێیان بڵێ: هەواڵم بـدە نـێ ئەگەر لـە ڕاستی دا ئـەم قورئانـە لـە خـوداوە هـاتبێ‌و ئێـوەش ئینکـاری بکـەن‌و بەکـەلامی خـودای نـەزانن، لەهـەمان کـات دا یـەکێکیش لەزاناکانی جولەکەو شارەزا لە تەورات شایەتی لەسەر ئەوەبدا: کە ئەم قورئانـە لـە خوداوە بـە نیگا بـۆ تـۆ هـاتووە، ئـەو شـایەتە بـۆ خـۆی ئیمـان بـە قورئـان بهێنـێ‌و دڵنیـابێ: کـە لـە خـوداوە هـاتووەو ئێـوەش لـە ئاست ئـەو ڕاسـتی یـە دا لوتبـەرزی بنوێنن‌و ئیمانی پێ نەهێنن، دڵنیابن ستەمتان لـەخۆتان کـردوە، بەدەسـتی خۆتـان مـاڵی خۆتـان وێـران کـردوە. کـە وابـێ ئێـوە سـتەمکارو خەسـارەتمەندن، لەهیدایەتدانی خودابێ بەشن، بەدبەخت‌و چارە ڕەشن!

بـەڕای زوربـەی ڕافەکـەرانی قورئـان ئـەو شـایەتە زانایـە عەبـدوڵڵای کـوڕی سەلامە، ماڵێکی جولەکە بووەو زۆر زاناو بەویژدان بووە.

چـونکە لـە زۆر سەرچـاوەدا ڕیوایـەت کـراوەو ئامـاژەی پـێ کـراوە: کـە پێغەمبەرﷺتەشریفی گەییشتە مەدینە عەبـدوڵڵا سـەیری ڕوخـساری پێغەمبـەری کرد، زانی ئەوە دەم‌و چاوی درۆزن نیە، زۆر دیقەتی داو لێـی نـوڕی بـۆی دەرکـەوت ئـەوە ئـەو پێغەمبەرەیـە کەلەتـەورات‌و ئینجیـل دامـوژدەی هـاتنی دراوە، ئـەمجار عەرزەی پێغەمبەری کرد: وتی: مـن سێ پرسیارت لـێ دەکـەم، کەسێك پێغەمبـەر نەبێ نایانزانێ: یەکەم نیشانەی هاتنی قیامەت چیە؟

یەکـەم خواردەمـەنی بەهەشـتییان چیە؟ بۆچـی جـاری واهەیـە منـداڵ لـە باوکی دەچێ‌و وایش دەبێ دەچێتەوەسـەر دایکـی؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: یەکـەم

نیشانەی ڕابوونی قیامەت ئەوەیە ئاگرێك لەخۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا خەڵکی ڕادەدا.

یەکەم خواردەمەنی: کەبەهەشتییەکان دەیخۆن زێدەی جەرگی ماسییە، منداڵیش چوونەوە سەر باوکی یان دایکی لەوەویە: ئەگەر لە کاتی جوتبوونی باوكو دایکی دا ئاوی پیاوەکە پێش کەوت منداڵەکە سەر لەباوکی دەدا، خۆ ئەگەر ئاوی ژنەکە پێش کەوت منداڵەکە دەچێتەوە سەر دایکی.

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خودای.

ئەمجا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! جولەکە نەتەوەیەکی بوختانکەرو فیتنە جۆن، ئەگەر بە موسوڵمانبوونم بزانن پێش ئەوەی لە بارەی منەوە پرسیاریان لێ بکەی جۆرەها بوختانم بۆ هەڵدەبەستن.

جولەکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەرو لێی پرسین عەبدوڵڵا چۆن پیاوێکە؟ هەموو وتیان: چاکترین کەسو کوڕی چاکترین کەسمانە، گەورەمانەو کوڕی گەورەمانە، زاناترین مالمانە کوڕی زاناترین زانامانە!

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئێوە دەڵێن چی ئەگەر موسوڵمان بووبێ؟ وتیان: خودا لەو هەڵە بیپارێزێ، هەرگیز شتی واناکا، عەبدوڵڵا کە لە شوێنێکی نەدیو لەوان دانیشتبوو هاتە ڕوو وتی: ( أشهد أن لا اله الا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله) ئیتر هەموو جولەکەکان تێکڕا وتیان: بەهەڵە چووین خراپترین کەسمانەو کوڕی خراپترین کەسمانە، زۆر عەیبو عاریان بۆ هەڵبەست، عەبدوڵڵا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بوو: کە من لێ ی دەترسام..

هەندێ لە موفەسسرین پێیان وایە: مەبەست بە (شاهد) لەئایەتەکەدا عەبدڵڵای کوڕێ سەلام نیە، چونکە سورەتەکە مەککیەو عەبدوڵڵا لە مەدینە دووساڵ پێش لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر ئیمانی هێناوە! بۆ وەڵامی ئەم ئیشکالە دەگوترێ هەموو سورەتەکە جگە لەم ئایەتە مەککیە، وەلێ ئەم ئایەتە مەدینەیی‌یەو پێغەمبەرﷺ فەرمانی کردوە: کە بیخەنە ئەم شوێنەوە، ئاشکراشە

تەرتیبی قورئان بەسورەت و ئایەتیەوە تەوقیفییە، بەفەرمانی خودا پێغەمبەرﷺ دیاری کردوە ...

## بیانوو نقامی موشریکەکان

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةًۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾

ئەمەش شوبهەو گومانێكی تره موشریكەكان ئاڕاستەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیان دەكرد، پەیوەندی هەیە بە ئیمانهێنانی كۆمەڵێك هەژاری وەكوو عەمماری كوڕی یاسرو صوهەیبو ئیبنو مەسعوود، ئەمانە هەژار بوون و ئیمانیان هێنابوو، كافرەكان و جولەكەكانیش وتیان: ئەگەر ئەم ئایینە خێری تێدا هەبوایە، ئەم هەژارو بێ وەجو هیچ لە بارا نەبوانە پێشمان نەدەكەوتن ئەگەر بەهرەو شكۆمەندییەكی تێدا هەبوایە ئەمان دەهێشت ئەوانە پێشمان بكەون!

ئـەمجار پـەروەردگار ڕەديـان دەداتـەوەو دەفـەرموێ: تـەورات شـايەتە لەسـەر ڕاسـتى پێغەمبەرايـەتى موحەممـەدو لـەوێ دا مـوژدەى هـاتنى پێغەمبـەرێك بـەو ناونيـشانە دراوە، ئـەمجار دواى سـەلماندنو چەسـپاندنى بەڵگـە جـۆراو جۆرەكـانى يەكتاپەرسـتى ڕاسـتى پێغەمبەرايـەتىو گومـانو بيـانووى سەرپێـچيكارانو ڕەتدانـەوەى هـەموو شـوبهەو گومانێكيـان، پاداشـتى موسـوڵمانانى كـردار پەسـند ديارىى دەكاو دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا لَوْ كَانَ خَيْراً مَا سَبَقُونَا إِلَيْهِ﴾ كافرەكانى مەككە يان جولەكەكان دەربارەى ئيمانهێنانى هەندێ لەهـەژارو بۆرەپياوى وەكوو بيلالو عەممارو صوهەيبو خەبباب دەيانگوت: ئەگەر ئەم ئايينە حەق بوايەو موحەممەد پێغەمبـەر بوايـە: ئـەم گەجـەرو گوجەرانـە پـێش ئێمـە نەدەكـەوتن، بـۆ هەرچـى شكۆمەندىو شتى حەق وڕاست هەيە خۆمان پێشەنگينو زوو بۆ خۆمانى كۆنترۆڵ دەكـەين، ئێمـە لاى خـودا خـاوەن ڕێـزو شـانو شـەوكەتينو خـودا خۆشمـانى دەوێ، هەرچى لايەنى پياوەتىو شكۆمەندى بێ بۆ ئێمەى پاوان دەكا!!

بێگومان ئەوانە لەم بيرو بۆچونەياندا كەوتوونەتـە هەڵەيـەكى شـاخدارەوە، چـونكە پـەروەردگار بـۆ پێغەمبەرايـەتىو بـۆ ئـايينى خـۆى بەنـدەكانى خـۆى هەڵدەبژێرێ، كێ زياتر لە خودا بترسێو خودا پەرست بـێ ئـەوە لاى خـودا خـاوەن ڕێـزو حورمەتـە، وەكـوو لـە ئايـەتێكى تـردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْـرَمَكُمْ عِنْـدَ اللَّـهِ أَتْقَاكُمْ﴾. ئەمجار حاڵو وەزعى ئەو كافرانە باس دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ فَسَيَقُولُونَ هَذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ﴾ واتە: ئەوكاتەى كافرەكان بە قورئان هيدايەت ئـامێز نـەبوونو سەر ڕەقىو دڵڕقيان ئاشكرا بوو، ئـيتر دەڵێن: ئەمـە درۆو ئەفسانەيەكى كۆنو لـە مێژينەيە، هەر درۆ گۆرينەكەيە سەرى هەڵداوەتەوە .

ئـەمجار پـەرورەدگار بەڵگەيـەكى تـر لەسـەر ڕاسـتى قورئـان هەڵدەسـتێنێو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَى إِمَاماً وَرَحْمَةً وَهَذَا كِتَابٌ مُصَدِّقٌ لِسَاناً عَرَبِيّاً لِيُنْذِرَ

﴿الَّذِينَ ظَلَمُوا وَبُشْرَى لِلْمُحْسِنِينَ﴾ یەکێ لەو بەڵگانەی ئەوە دەسەلمێنێ: کە قورئان لەخوداوە هاتووە، ئەوەیە ئێوە بۆ خۆتان دان بەوەدا دەنێن: کە تەورات لەخوداوە هاتووە بۆ موساو بەرنامەو پێشەوا بووە بۆ شوێنکەوتوانی، ڕەحمەتو فەڕو بەرەکەت بووە بۆ ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوە.

یان دوو وشەی ﴿إِمَامـاً وَرَحْمَـةً﴾ حاڵن لەموسا واتە: پێشەواو رابەرو ڕزگارکەری نەتەوەکەی بووەو ڕەحمەتو بەرەکەت بووە بۆ ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوە، ئەم قورئانەش کە لەخودا وە نازڵ بووە، موافیقی تەوراتی نەگۆڕدراوەو لەبنەما تەشریعیو ئەخلاقیو عەقائیدو عیباداتەکان دا پشتگیری تەورات دەکا، هەروەها پشتگیری نامە ئاسمانییەکانی تریش دەکا، بەزمانی عەرەبی نازڵ بووە، بۆ ئەوەی پێغەمبەرﷺ موشریکە ستەمکارەکانی مەککەو دەوروبەری بەم قورئانە بترسێنێ، موژدەی بەهەشتو بەختەوەری بدابەخاوەن باوەڕانو کردار چاکان، دەبی نامەیەکی ئاوەها ڕەوانو پڕ ماناو بەلیغ: کە هەڕەشەو موژدەی لەخۆگرتووە، هەڕەشە لەموشریكو بێ بڕوایان دەکاو موژدەی بەهەشت بەخاوەن باوەڕان دەدا، چون دەبێ ئێوە بەچیرۆكو ئەفسانەی لەقەڵەم بدەن؟ ئەمجار دوای باسکردنی شوبهەو بیانووی سەرپێچیکاران دێتە سەر باسکردنی حاڵو وەزعی موسوڵمانانو پاداشیانو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُـونَ﴾ بێگومان ئەوانەی دەڵێن: خودامان ئەڵڵایەو بەردەوامن لەسەر بیرو باوەڕی خۆیان، ئەوانە هیچ ترسو بیمێکی داهاتوو یان نیەو پەرۆشی لەدەستدانی ڕابوردوشیان نیە، دڵنیان، لەبەمرازگەیشتنی خۆیان، بەرچاو ڕونو کەیفخۆشن ﴿أُوْلَئِـكَ أَصْـحَابُ الْجَنَّـةِ خَالِـدِينَ فِيهَـا جَـزَاءً بِمَـا كَـانُوا يَعْمَلُـونَ﴾ ئەوانە ئەهلی بەهەشتنو بۆ هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە، ئەمەش لەپاساوی ئەو کردارە باشانەی ئەنجامیان داون!

**ڕاسپاردن بەچاکەکردن لەگەڵ باوكو دایكدا**

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۖ وَلِيُوَفِّيَهُمْ

أَعْمَالَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾

لەوە پێش پاداشتی یەکتاپەرستان و پابەند بووانی شەریعەتی دیاری کرد، ئەمجار فەرمان بەئادەمیزاد دەکا، کە هەمیشە لەگەڵ باوک و دایکیدا چاکەکار بێ، بەتایبەتی باسی هەڵوێست و ڕەوشتی پەسندی ئەوانەی کرد: کە باوک و دایکیان دەگەنە تەمەنی چل ساڵی و تێپەڕ دەکەن موژدەیان پێ دەدا بەوە: کە کردەوەی باشیان لێ وەردەگرێ و لەتاوانەکانیان خۆش دەبێ، هەروەها هەڵوێستی ناجوانمێرانەی ئەوانەش باس دەکا: کە ئەزیەتی باوک و دایکیان دەدەن و بێ گوێی فەرمان و جڵەو گیرییەکانیان دەکەن، پاداش و سزای چاکەکارو خراپەکار لەگەڵ باوک و دایکیان دا دیاری دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَاناً﴾ ئادەمیزادمان ڕاسپاردووە و فەرمانمان پێ کردوە: کەلەگەڵ باوک و دایکی دا چاکەکارو ڕەوشت بەرز بێ، لەکاتی ژیانیان دا خزمەتیان بکاو فەرمانبەر داری فەرمان و جڵەو گیرییەکانیان بێ بەخێویان بکاو خۆشەویستی و ڕێزو حورمەتیان بۆ دەربڕێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاّ تَعْبُدُواْ إِلاّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً﴾ الاسراء/٢٣. یان دەفەرموێ: ﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ لقمان/١٤.

زۆر فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هەن: کە پشتگیری و شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە دەکەن و ئەم ئەخلاق و ڕەوشتە جوانانە لەدڵی موسوڵمانان دا دەچەسپێنن،

هەڵیان دەنێ، بۆ پابەند بوونو خووپێوەگرتن بەو رەوشتە بەرزو جوانانەی: کەبناغەی پێکەوە نانو پێکەوە ژیانی خێزانە وەسییەتو راسپاردەیە بۆ هەموو ئادەمیزاد بەگشتی، هەر کەسێ ئادەمیزاد بێ دەبێ پابەندی ئەو فەرمانە خودایە بێ، وەسییەتێکە تایبەتە بە ئادەمیزادەوە.

هیچ دەقێکی ئاینی نیە ئاماژە بەوە بکا: کە گیانلەبەرانی تر لەجیهانی باڵندەوو ئاژەڵو پێرۆو خشۆك.. هتد بەرپرسیار بن لەبەخێوکردنو پارمەتیدانی بەتەمەنو بەساڵا چووەکانیان ئەوەی: کە هەستی پێ دەکرێ تەنها ئەومیە گەورەکانیان بەسروشت چاودێری بچوکەکانیان دەکەن تا لەخەم دەرەخسن لەوەدوا هیچیان هیچیان ناناسن، وەلێ ئادەمیزاد: کە بەفەرمانی خودا ئاوەدانکردنەوەی زەوی لەئەستۆدایە پەیوەندی نێوان فەردەکانی بەردەوامو هەمیشەییە، تەنانەت لەدوا مردنیش ئەو پەیوەندییە ناپچڕێ.

لەقورئانو حەدیث دا زۆر جار فەرمان بەچاکە کردن لەگەڵ باوكو دایك دا دووبارە بۆتەوە، وەلێ زۆر بەکەمی لەحاڵەتی ناوازەدا فەرمانی بەباوكو دایك کراوە: کە لەگەڵ منداڵەکانیان دا باش بن، چونکە بەسروشت باوكو دایك خوبەختکەرن بۆ جگەر گۆشەکانیان، پێویست بە فەرمان پێ کردن ناکا.

باوكو دایك هێندە فیدائیو خۆنەویستن لەئاست منداڵەکانیان دا، جاری واهەیە دەگەنە لێواری مردنو بەڵکوو لەو پێناوەدا بەبێ لێ سڵەمینەوە گیانیش لەدەست دەدەن نەچاوەڕوانی پاداشتنو نەمنەتو شاباشیش دەکەن، هەموو ئاواتو ئامانجیان ئەومیە زارۆك بەرهەم بێننو شەوو رۆژ خەریکی خزمەتکردنو پەروەردەکردنیان بن، بەڵام چینی تازە پێگەیشتوو زۆر کەم ئاوڕ لەدواخۆی دەداتەوە، زۆر بەکەمی بیر لەوە دەکاتەوە خزمەتی چینی خۆ بەختکەرو بەخێوکەریان بکەن، چونکە ئەوانیش هەر بەرەو پێش دەچنو دەیانەوێ چینێك بەرهەم بێننو خۆیانی لەپێناودا بەخت بکەن.

﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾ (الروم/٣٠) بەسروشت ئادەمیزاد هەوڵ دەدا شت لەباوك و دایكی بپچڕێ بۆ كوڕو كچی خۆی، خودا سوننەتی ژیانی وادەمەزراندوەو بەو شێوە بەڕێوە دەچێ و ڕەو ڕەوەكەی واهەڵدەسوڕێ ئاینی ئیسلام: كۆمەڵگا پێكەوە دەنێ، خێزان دەكاتە یەكەم بەردی بناغەو یەكەم هێلانەی دروستبوونی تاكەكانی كۆمەڵ..

هەر لەسەرەتاوە هەوڵێ ئەوەدە دا خۆشەویستی هاریكاری و هەمئاهەنگی بخاتە نێوان فەردەكانیەوە، گیانی فیداكاری و هاریكاری یەكتری بكاتە بەر نامەو ڕێبازی سروشتی ژیانیان، گرنگی بەخێزان دەداو لەناو خێزانیش دا گرنگی تایبەتی بەدایك دەدا چونكە دایك خوێندنگایە، دایك خۆبەختكەرە، بەشیری مەمكی و كۆشی گەرمی و سوزوعاتیفەی بێ سنووری زارۆك بەخێو دەكاو پێی دەگەیەنێ، هەر منداڵێك لە دەرەوەی خێزان دا پێبگا، بە ناسروشتی پێ دەگا، لەزۆر لایەنی ژیانیەوە كەم و كوڕی دەبێ یەكەم شتێك: كە لێ ی بێ بەش دەبێ، هەستكردنە بەنەبوونی خۆشەویستی!

زانستی دەرونزانی ئەوەی چەسپاندوە: كەمنداڵ بە سروشت لەدوو ساڵێ یەكەمی تەمەنی دا پێی خۆشە باوەشی دایكی بۆ ئەو قۆرغ بێ و كەسی تر هاو بەشی نەبێ، دەی هەرگیز ئەمە لەدایەنگای صەناعیدا دەستەبەر نابێ، چونكە ئافرەتێ: یان چەند ئافرەتێك كە سەرپەرشتیاری دایەنگاكە دەكەن چەند منداڵێكیان بەر دەكەوێ و ئاواتە سەرەكییەكەی منداڵەكە نایەتە دی و ئەوكاتە لەگەڵ هاوەڵەكانی داكینەو حیقدیان لێ پەیدا دەبێ، تۆوی دووبەرەكیان لەنێوان دا دەچێندرێ، دەرەختی خۆشەویستی نێوانیان سەوز نابێ ...

لەلایەكی ترەوە منداڵ پێویستی بەدەسەڵاتێكی فەردی هەیە سەر پەرشتی بكا تاكەسایەتی بەهێزی بۆ پەیدا بكا، ئەمەش لە باوەشی خێزان دا نەبێ دەستە بەرنابێ، خوا بۆ خۆی بەدیهێنەری ئادەمیزادەو دەزانێ چی لەبەرژەوەندییەتی،

ئاینی ئیسلام چاكه كردنی له‌گه‌ڵ باوك‌و دایك دابه باشترین كرده‌وه حسێب كردوه، ئه‌زیه‌تدانیشیانی به‌تاوانی گه‌وره داناوه.

بوخـــاری فه‌رمودەیــــه‌كی له‌عه‌بـــدوڵلاّی كـــوڕی عـــه‌مری (عـــاص)ه‌وه له‌پێغه‌مبه‌ره‌وه ڕیوایه‌ت كردوه ده‌فه‌رموێ: (الكبائر الاشراك بالله، وعقوق الوالـدين، وقتـل الـنفس، والـيمين الغمـوس) ته‌نانـه‌ت دوا مـردنیش ئـاده‌میزاد ده‌تـوانێ چاكه له‌گه‌ڵ باوك‌و دایكی دا بكا.

ئـه‌بوداودو ئیبنـو ماجـه‌و ئیبنـو حـه‌ببان له‌ئـه‌بو ئوسـه‌یدی مـالیكی كوڕی ڕه‌بیعـه‌ی (الـساعدی)یـه‌وه ده‌گێڕێتـه‌وه ده‌ڵـێ: له‌وكاتـه‌دا: كـه ئێمـه لـه خزمـه‌ت پێغه‌مبه‌ردا دانیشتبووین، پیاوێكی خێڵی به‌نوسه‌له‌مه هات وتی: ئـه‌ی پێغه‌مبـه‌ری خـودا ! ئایا لـه‌دوا دنیـا ده‌رچـوونی بـاوك دایـك چاكه‌یه‌ك هه‌یـه له‌گـه‌ڵیان بكـه‌م؟ فـه‌رمووی بـه‌ڵێ: دوعایـان بـۆ بكـه، داوا بكـه خـودا لـه تاوانیـان ببـورێ، پابه‌نـدی ئامۆژگارییـــه‌كانیان بـــه، واده‌و بـــه‌ڵێنیان جـــێ بـــه‌جێ بكـــه، ســـیله‌ی ڕه‌حـــم‌و خزمایه‌تیه‌ك: كه به‌هۆی ئه‌وانه‌وه‌یه چاودێری بكه ڕێـز لـه دۆسـت‌و هاوه‌ڵه‌كانیان بگره.

ئه‌مجار قورئانی پیرۆز هـۆی ئـه‌و فـه‌رمان‌و ئامۆژگارییانـه دیـاری ده‌كـا: كـه ده‌رباره‌ی چاكه كردن له‌گه‌ڵ باوك‌و دایك دا ئاڕاسته‌ی ئاده‌میزادی كـرد، به‌تایبـه‌تی ئه‌رك‌و ئوركی دایك: كه خـۆی بـه‌خت ده‌كـا له‌پێناو پـه‌روه‌رده بـوون‌و پێگه‌یـشتنی جگه‌رگۆشـه‌كه‌ی دا، قورئـانی پـیرۆز لێـره‌دا ئـه‌و خۆبـه‌ختكردن‌و فیداكاریـه وێنـه ده‌گرێ‌و ده‌فه‌رموێ:

﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً وَوَضَعَتْهُ كُرْهاً وَحَمْلُـهُ وَفِـصَالُهُ ثَلاثُـونَ شَـهْراً﴾ دایـك ئـه‌و زاڕۆڵه‌ی له‌ناو سكی خوی دا به‌ئه‌رك‌و ماندوو بوون هه‌ڵپێچاوه، له‌و پێناوه‌دا ئـازارو ناڕه‌حه‌تی چه‌شتووه، به ئێسقان وخوێن‌و گۆشتی خۆی نۆ مانگ‌و نۆرۆژ له‌ناوسكی خۆی دا به‌خێوی ده‌كاو په‌یكه‌ری ناسك‌و تازه پێگه‌یشتوی پێ ده‌گه‌یه‌نی، بـه‌جۆرێ:

لە ئاخرو ئۆخری نۆمانگەکەدا بەتەواوی ماندوو دەبێ و برستی لێ دەبڕێ، ئەمجار ژان و ئازاری منداڵبون، کەلەڕاستی دا ئازارو ژانەکەی دەگاتە سەرترۆپکی ئازارو هەر دایکە: کە خۆ بۆ ئەو ئازارو ژانە رادەگرێ و بەڵکوو بەدڵفراوانی و حەماسەتەوە بەرەو پیریشی دەچێ و خۆبە بەختەوەر دەزانێ: کە دەکەوێتە ئەو ناڕەحەتی و ئازارەوە، چونکە چینی تازە وەبەرهەم دێنێ و چروزەیەك دەرسکێنێ.

دوای تێپەڕبوونی ئەم دووقۆناغە سەرە دێتە سەر قۆناغی شیرپێدان و بەخێوکردن و شەونخونی و چاو دێری کردنی، تا لەم قۆناغەدا دایك پاڵفتەی خوێن و گۆشت و ئیسقانی خۆی کە شیری مەمکەکانیەتی و پوختەی سۆزی دڵ و دەرون و ئەو پەڕی تواناو هێزی خۆی دەخاتە کار بۆ فەراهەم هێنانی بەختەوەری بۆ جگەرگۆشەکەی و زۆرشادمانەبەو ماندو بون و فیداکارییەو بەم ئەرك و ناڕەحەتیە ماندو نابێ و هەست بەناڕەحەتی ناکا، هەموو ئاواتی ئەوەیە: ئەم چرۆیەی بپشکوێ و گەش و نما بکاو پێ بگاو لەخۆشی دابێ، دەی دەبێ چۆن ئادەمیزاد بتوانێ پاداشتی ئەو هەموو ماندووبونە بداتەوە؟ هەڵبەتە تۆ چەندێ: هەوڵ بدەی پاساوی ئەو خۆبەختکردن و فیداکارییەی دایك بدەیەوە، ناتوانی؛ چی بۆ بکەی هێشتا کەمە لە بەرامبەر زۆرا، بۆیە ڕیوایەت کراوە کابرایەك دایکی لەکۆڵ کردبوو تەوافی کابەی دەکرد پرسیاری لەپێغەمبەریﷺکرد وتی: قوربان ئایا من پاداشتی چاکەی دایکم داوەتەوە؟

پێغەمبەرﷺفەرموی نەخێر هێشتا پاداشتی فرمێسکی ئازاری ژانێکی ئەوت نەداتەوەتەوە!!

جەرەس و موسیقای وشەکان ئاماژە بەماندو بوون و ئەرك و ناڕەحەتی لەرادەبەدەر دەکەن، ماندوبون و ناڕەحەتی بێزو کردن و تێکچونی تەوازون و تەبیات، بارگرانی سك و هالگرتنی ئەو قورئاسایە نائاساییە، ئەمجار ئازاری منداڵبون و پاشان ئەرك و ئورکی شیر پێدان و بەخێوکردن، هەموو ئەمانە

داخوازی ئەوەن کەئادەمیزاد لە ئاست دایکی‌دا خۆبەقەرزدار بزانێو هەوڵ بدا دڵی رازی بکا .

ئـەمجار دەفـەرموێ: ﴿وَحَمْلُـهُ وَفِـصَالُهُ ثَلاثُـونَ شَـهْراً﴾ لەسـك دا هەڵپێچانو برینی قوناغەکانی زارۆڵە لەناو منداڵدان داو ئەمجار هاتنە دەرەوەی‌و شیر پێدانی دەق سی مانگ دەخایەنێ، واتە دووساڵو نیوی رەبەق دایک شەونخونی‌و ئەرکو ماندو بوونو ئازاری کەم وێنە دەچێژی‌و بەبێ وەڕز بوونو بەو پەڕی دڵسۆزی‌و فیداکارییەوە ئەم ئەرکە قورسە ئەنجام دەدا.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا، کە مافی دایك لەسەر منداڵ لەهی باوك زیاترە چونکە بە ئێشو ئازارو ئەرکو ماندوبوونەوە ئەو منداڵەی لەسکی خۆی‌دا هەڵپێچاوەو بەنارەحەتی‌و ژانو ئازاری کەم وێنەوە بەوەلەدی هێناوەو بەدڵسۆزی‌و حوببو حەنانەوە شیری پێداوەو لەباوەشی گەرمی خۆی دا پەروەردەی کردوەو بەلای لایەو شەونخونی شەوی لەگەڵ دا بەرۆژ کردۆتەوە!! لەم شتانەدا باوك چ هاوبەشیەکی ئەو تۆی نیەو بەدەگمەن ڕێ دەکەوێ یارمەتیەکی پەروەردە کردنەکەی بدا، چونکە ئەویش سەرگەرمی بەدەست هێنانی بژێوی خێزانەو ماندوی کارو کاسبی‌یە...

فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ: کە موسلیمو بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ لەهەموو کەسێ پێویسترە لەگەڵیا باش بم؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: دایکت وتی: دوای ئەو، فەرمووی: دایکت، وتی: دوای ئەو؟ فەرموی دایکت، وتی: دوای ئەو: فەرموی: باوکت.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە کەمترین ماوەی مانەوەی زارۆڵە لەسکی دایکی‌دا شەش مانگە، وەکوو زانراوە ئیمامی عەلی یەکەم کەسە: کە ئەم ئایەتەی ئێرەو ئایەتی سورەتی (لقمان١٤)و ئایەتی ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ

حَوْلَيْنِ كَـامِلَيْنِ لِمَـنْ أَرَادَ أَن يُـتِمَّ الرَّضَـاعَةَ﴾ البقـرة/٢٣٣)ی بـەراورد کـردونو ئـەو حوکمەی لێ دەرهێناون، چونکە بەپێی ئایەتەکەی ئێرە ماوەی حەملو ماوەی شیر پێـدانی منـداڵ سـی مانگـە، بـەگوێرەی ئایەتەکـەی سـورەتی لوقمـانو سـورەتی (البقـرە)ش ئـەو پـەڕی مـاوەی شـیر خـواردنی منـداڵ دووسـاڵە، کـەوابێ بۆمـاوەی مانەوەی ناو سکی دایکی شەش مانگ مایەوە.

ئیبنـو ئـەبی حاتـەمو موحەممـەدی کـوڕی ئیـسحاق لـە مەعمـەری کـوڕی عەبدوڵڵای جوهەنییەوە ڕیوایەت دەکا: کە دەڵێ: پیاوێکی خزمی ئێمـە ئـافرەتێکی خێڵێ جوهەینەی مارەکردو گواستیەوە، دوای شـەش مـانگی تـەواو منـداڵێکی بـوو، مێردەکەی چوو بۆلای ئیمامی عوسمانو روداوی بۆ باسکرد، ئیمامی عوسمان ناردی بـەدوای ئافرەتەکـەدا، ئافرەتەکـە خێـرا خـۆی گـۆڕیو ویـستی بـێ بـۆلای ئیمـامی عوسمـان لەوکاتـەدا ئافرەتەکـە خـەریکی خۆگـۆڕین بـوو خوشـکەکەی دەسـتی کـرد بەگریان، وتی: بۆچی دەگری؟ ترسی ئەوەت هەیە من خیانـەتم کـرد بـێ؟ نەخـەیر مەترسە سوێندم بـەخودا جگـە لـە مێـردی خـۆم کـەس دەسـتی لـێ نـەداوم، دڵنیـام خودا ڕیسوام ناکاو تووشی ناڕەحەتی نابم ..

کــە ئافرەتەکــەیان هێنایــە لای ئیمــامی عوسمــان فــەرمانی دا بــە بـەردەبارانکردنی ئـەم هەواڵە گەیـشتە ئیمـامی عـەلیو هاتـەلای ئیمـامی عوسمـان، عەرزی کرد: ئەوە چۆن ئەو حوکمەت دەرکردوە؟ ئیمام عوسمان وتی: ئەم ئافرەتـە دوای شەش مـانگ شـوکردنی منـداڵی بـووە، ئایـا شـتیوا دەبـێ؟ ئیمـامی عـەلی وتـی: کوڕە ئەوە تۆ قورئانت نەخوێندۆتەوە؟ عوسمـان فـەرموی: بـەڵێ، عـەلی فـەرمووی: ئـەدی نەتبیـستووە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَحَمْلُـهُ وَفِـصَالُهُ ثَلاثُـونَ شَـهْراً﴾ دەربـارەی شیرخواردنیش دەفـەرموێ: ﴿حولين كـاملين﴾ دەی چـی مایـەوە بـۆ (حـەمل) جگـە لەشـەش مـانگ؟ عوسمـان فـەرموی: وەڵڵاهـی تائێـستا سـەرنجم بـۆ ئـەوە نەچووەو ئەوەم بەخەیاڵ دا نەهاتووە!

هەر ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: ئەگەر ئافرەت بە نۆمانگ منداڵی بوو دەتوانێ (٢١) مانگ شیری پێ بدا، ئەگەر بەحەوت مانگ منداڵی بوو (٢٣) مانگ شیر بدا بە منداڵەکەی بەسیەتی، خۆئەگەر بەشەش مانگ منداڵی بوو دەبێ دووساڵی تەواو شیری بداتێ، چونکە پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْراً﴾.

جا کە ئەو منداڵە پەروەردە بوو پێگەیشتو تەمەنی درێژ بوو ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً﴾ هەتا بوو بەلاوو تەمەنی گەنجی تێپەڕی بوو بەپیاوو عەقڵو هۆشی کامڵ بوو لەتەمەنی سی ساڵی تێپەڕیو گەیشتە چل ساڵیو کەماڵی هێزو توانای عەقڵیو جەستەیی پەیدا کرد، جا ئەوکاتە:

﴿قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ﴾ وتی: خودایە یارمەتیم بدە خەریکی سوپاسکردنی نیعمەتەکانت بم، ئەو نیعمەتانەی بەخشیوتن بەخۆمو باوكو دایکم، نیعمەتی هیدایەتو لەش ساغیو ڕزقو ڕۆژی، نیعمەتی عەقڵو دۆزینەوەی ڕێبازی ڕاستی ژیانو دەستەبەرکردنی بەختەوەری بۆ هەردوو دوونیا، نیعمەتی ئەوە کە لەباوەشی دایكو باوکی دڵسۆزو خوداپەرستدا گەورە بووم.

﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي﴾ خودایە یارمەتیم بدە بۆ ئەنجامدانی کردەوەی چاكو پەسەند بەجۆرێك کە کردەوەکانم جێگای ڕەزامەندی تۆ بنو لێم قبوڵ بکەی. ئەو کردەوە چاكو پەسەندانە لەناو وەچەو نەوەکانیشمدا بەردەوام بنو خوویان پێوە بگرنو لێیان ببێتە سروشت.

﴿إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنْ الْمُسْلِمِينَ﴾ ئەمن گەڕاومەوە بۆ دەرگانەی عەفوو بەزەییتو لەهەموو تاوانێکم پەشیمانم، گەردنکەچو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانتم، بەدڵسۆزیو ڕاستاڵی بەندایەتیت دەکەمو دەمەوێ سەرگەرمی پەرستش بۆ کردنت بم.

ئەبوداود لەسونەنەکەیدا لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەرﷺ هاوەڵانی فێری ئەوە دەکرد لەتەحییاتدا ئەم دووعایە بخوێنن (اللهم الف بين قلوبنا، وأصلح ذات بيننا، وأهدنا سبل السلام، ونجنا من الظلمات إلى النور، و جنبنا الفواحش ما ظهر منها وما بطن، وبارك لنا في أسماعنا وأبصارنا وقلوبنا وأزواجنا وذرياتنا، وتب علينا، إنك أنت التواب الرحيم واجعلنا شاكرين لنعمتك مثنين بها عليك، واتمها علينا).

ئەمجار پەروەردگار پاداشی ئەو بەندە ڕاستاڵانە دیاری دەکاو دەفەرموی: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَنَتَجاوَزُ عَنْ سَيِّئَاتِهِمْ فِي أَصْحَابِ الْجَنَّةِ وَعْدَ الصِّدْقِ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ﴾ ئەوانەی کە ئەوە ڕەوشتو هەڵسوکەوتیانە، بەو جۆرە ڕەفتار لەگەڵ باوکو دایکیاندا دەکەن، ئەوە ئەوانە خودا ڕێزیان لێ دەگرێو کردەوەی چاکیان لێ وەردەگرێو لەتاوانیان خۆش دەبێو سزایان نادا لەسەری، چونکە بەکردەوە باشەکانیان خراپەکانیان پەردەپۆش دەبێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ هود/١٤٤.

ئەوانە لەپێڕو تاقمی بەهەشتییانن، خودا بۆخۆی وادەی داوە بەوانەی تۆبەکارو گەڕاوەن لەتاوان، کە بیانخاتە ناو بەهەشتەوە، هەڵبەتە خودا لەهەموو کەس زیاتر بەجێهێنەری وادەی خۆیەتی، ئەو وادەو بەڵێنانەی لەسەر زمانی پێغەمبەرانیو لەکتێبە ئاسمانیەکاندا داویەتی بەجێیان دێنێو لێیان پاشگەز نابێتەوە، وادەی ڕاستو دروستنو ئەنجامیان دەدا.

ئەمجار دێتە سەر باسکردنی منداڵی خراپو بێ گوێو زیانە خرۆو ئەزیەتخواز بۆ باوکو دایك، پاداشو سزای هەردو تاقمیش ڕون دەکاتەوەو دەفەرمووی:

﴿وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا أَتَعِدَانِنِي أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتْ الْقُرُونُ مِنْ قَبْلِي﴾ هەروەها ئەو منداڵەی کە باوکو دایکی داوای ئیمانهێنانی لێ دەکەن، پێیان دەڵێ:

داد لەدەستتان، ئای کە وەڕزم لەوەی کە پێم دەڵێن: بەڕاستی ئێوەم پێ سەیرە، کە ئەوەندە تێنەگەیشتوون، ئەوە ئێوە بەچ عەقڵێك هەواڵی ئەوەم دەدەنێ: کە مردم سەر لەنوێ زیندو دەکرێمەوە؟ ڕۆژی قیامەت دەچمەوە بەر بارەگای خواو حیسابم لەگەڵ دەکا؟ بەڕاستی ئەو زیندووبوونەوەی ئێوە دەیڵێن شتێکی وێ نەچوو بێ بناغەیە، هیچ بەڵگەیەك نیە ئەوەی ئێوە بانگەوازی بۆ دەکەن بچەسپێنێ، ئەوەتا ئەو هەموو گەلو هۆزو چینو توێژە لەپێش ئێمە مردوونو هیچیان نەگەڕاونەوە، کەس هەواڵێکی لەو بارەوە بۆ نەهێناوینەوە، ئەدی ئێوە بە چ عەقڵێك داوای شتی وەها لەمن دەکەن؟

﴿وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ اللَّهَ وَيْلَكَ آمِنْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾، باوكو دایکی کە دەیبینن ئەوە هەڵوێستی کوڕەکەیانە ئەوەندەی تر ئاگری جگەریان گەرمیان دادێنێو لەخودا دەپاڕێنەوە کە کوڕەکەیان هیدایەت بداو واز لەکوفرو بێدینی بێنێو موسوڵمان ببێ، ڕوو دەکەنە ڕۆڵەو جگەرگۆشەیانو پێی دەڵێن کوڕە ماڵوێران ئەوە بۆچی بەئاگا نایەیتەوە ئیمان بێنەو بڕوات بەزیندوو بوونەوە هەبێ، دڵنیابە وادەی خودا دێتە جێو قیامەت ڕادەبێ، هەموو ئادەمیزاد زیندوو دەکرێنەوە، حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، سزاو پاداشی خۆیان وەردەگرنەوە.

﴿فَيَقُولُ مَا هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ کوڕی سەر ڕەقو بێ ویژدان بەقسەو ئامۆژگاری باوكو دایکی وەندەی تر شیلگیر دەبێو دەڵێ: ئەوەی کە ئێوە دەیڵێن ئەفسانەو چیرۆکە ڕزیوی کۆنە لەکتێبە شڕەکان دا نووسراوە، زیندوو بوونەوەی دوای مردن شتێکی بێ بناغەو وێ نەچووە، عەقڵمو وەری ناگرێو بڕوای پێ ناکەم.

ئەمجار پەروەردگار سزای ئەو سەر ڕەقە نەفامە دیاری دەکاو دەفەرمووی:

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِمْ مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ﴾ ئەوانەی ئەو جۆرە بیرو باوەڕانە دەر دەبڕنو ئەوە قسەو

ڕەفتاریانە ئەو کەسانەن شیاوی عەزابی دۆزەخن، غەزەبو ڕقی خودایان بۆ خۆیان دەستەبەر کردووە، لەو گەلو نەتەوە کافرو بێ بڕوایانەن کە لەوەو پێش هاتوونە گۆڕەپانی ژیانەوەو بەکافریو غەزەب لێ گیراوی سەریان ناوەتەوە، چ لەڕەگەزی ئادەمیزاد بن یان لەڕەگەزی جندۆکە بن، ئەوانەی پەیامی پێغەمبەرانیان ڕەتکردۆتەوە، خۆیانو ماڵو خێزانیشیان لەدەستداوە، هەموویان شیاوی ئەوە بوون تووڕ بدرێنە ناو عەزابی دۆزەخەوە، وادەی خودایان لەسەر دێتە جێ، کە فەرموویەتی: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ص/٨٥.

ئەمجار پەروەردگار پاداشو سزای هەردوو تاقم (چاکەکارو خراپەکار) دیاری دەکاو دەفەرمووی:

﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَالَهُمْ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ﴾ واتە: بۆ هەردوو پێڕو تاقم لەخودا پەرستانی ڕەفتار جوانو کردار چاكو بێ بڕواو خراپەکارو بەدبەختەکان لەئادەمیزادو جندۆکە پلەو پایەی جودا جودا، لای خودا بۆیان ئامادە کراوە هەر کەسەو بەگوێرەی کردەوەو بیرو باوەڕی خۆی پاداشو سزای خۆی وەردەگرێتەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە، ئەوانە هیچیان ستەمیان لێ ناکرێ، تۆز قاڵێك لەکردەوەی باشی کەس کەم ناکرێتەوە، هەر وەها لە سزای کەسیش زیاد ناکرێ! هەموو کەس مافی خۆی وەر دەگرێتەوە!

ئەمجار دیمەنێکی ڕۆژی قیامەت ڕادەنوێنێو حاڵو وەزعی بێبڕوایان لەو دیمەنەدا نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست؛ ئەوە بۆ گەلەکەت باس بکە: کە کاتێ کافرو بێ بڕوایان پێش ئەوەی تووڕ بدرێنە ناو دۆزەخەوەو سزاو عەزابی سەختی ئاگر لەخۆیان دەگرێ، تەماشای ئەو ئاگرە بێ ئامانە دەکەنو لە ڕوی سەر زەنشتو لۆمەوە پێیان دەگوترێ: ئێوە لەززەتو

خۆشی خۆتان لەژیانی دونیادا چەشتووە، سەرگەرمی دەستەبەرکردنی ویستی ئارەزۆکانتان بوونو لەتاوانو خراپەکاریدا نوغرۆ بوون، تاوانکردنتان بەلاوە شتێکی ئاسایی بوو، پێغەمبەرتان بەدرۆخستەوە، زیندو بوونەوەو سزاو پاداشتی ئەم ڕۆژەتان بەئەفسانەو خەیاڵێ پڕو پووچ دەزانێ..

لەژیانی دونیادا بەشی خۆتان وەرگرتووەو هیچتان بۆ نەماوەتەوە، ئەمڕۆ سزای ڕیسوا ئامێز دەدرێن، تۆڵەی بێ بڕوایی‌و سەر ڕەقیتان لێ دەسەندرێ، لەپاساوی ئەوەدا؛ کەبە ناحەق لەسەر زەوی خۆتان هەڵدەنایەوەو لوتبەرزیتان دەنواند، پشتتان لەیەکتاپەرستی‌و خودا ناسین هەڵدەکرد، هەرچی خودا پێی ناخۆش بوو ئەوەتان ئەنجام دەدا.

لەتۆڵەی ئەو ڕەفتارو کردەوانەتان دا ئەمڕۆ سزای سەختو ڕیسواکەرو بەردەوامتان بۆ ئامادەکراوە لەناو شیوو دۆڵی دۆزەخ دا بە ئاهو ناڵەو حەسرەتەوە، بەهاوارو دادو فیغانەوە بۆ هەتا هەتایە ژیان بەسەربەرن، ژیانی چی! هەر وەندەیە زیندوون، ئەگینا مردن بەئاوات دەخوازن؛ هەڵبەتە لەززەت وەرگرتن لە نیعمەتەکانی دونیا بەشێوەی حەلاڵو ڕەوا، ڕەوایەو نەی لێ نەکراوە، ئاماژە بەو ئایەتەی: کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ الاعراف/٣٢.

هەروەها ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ المائدة/٨٧. وەلێ خۆگرتنەوە لە لەززەتو خۆشی‌یەکانی ژیان دابو نەریتی پیاو چاکانە.

لەصەحیحی موسلیم دا هاتووە: دەفەرموێ؛ عومەری کوڕی خەتتاب چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ لەماڵەوە لەو سەرو بەندەدا لەخێزانەکانی زیز بوو، عومەر دەگێڕێتەوە دەڵێ: چاوم بەماڵێ پێغەمبەردا گێڕا جگە لەپێستە کۆنێك هیچی ترم نەدی. عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ئەتۆ ڕەوانە کراوی خوداو بەڕێز ترین

بەنـدەی ئـەوی، ئـەوەتا کیـسراو قەیـصەر لـەناو حـەریرو دێبـاج دا ژیـان بەسـەر دەبەن، ئەتۆ بۆ چی بەزبری ژیان بەسەر دەبەی؟

ئیتر تۆزێ: خۆی کۆکردەوەو بەجوانی دانیشتو فەرموی: (أفي شك أنت يا ابن الخطاب؟ أولئك قوم عجلت لهم طيباتهم في حياتهم الدنيا) ئەوە کوڕی خەتتاب گومانت هەیە؟ ئەوانە تاقمو کۆمەڵێکن خۆشیو لەززەتیان بۆ پێش خراوە لەژیانی دونیـا، عومـەر دەفـەرموێ: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا لەقـسەم پەشـیمانم داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، پێغەمبەرﷺفەرموی: (اللهم اغفر له).

## چیرۆکی حەزرەتی هود (علیه السلام) لەگەڵ قەومەکەیدا

﴿ ۞ وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٢١﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوۡهُ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ أَوۡدِيَتِهِمۡ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَاۚ بَلۡ هُوَ مَا ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦۖ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٤﴾

تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾

دوای بــەیانکردنی بەڵگــەی یەکتاپەرســتی‌و ڕاســتی پێغەمبەرایــەتی کــە قورەیـشییەکان بـەهۆی هەڵەوگیر بونیـان بەلـەززەت‌و خۆشی دونیـاوە پـشتیان لـێ هەڵدەکرد، پەروەردگار چیرۆکی گەلی عادی بـۆ گێڕانـەوە بـۆ ئـەوەی پەنـدی لـێ وەربگرن،و بەخۆیان دا بچنەوە، ئـەوەتا خـودا بـەهۆی کوفرو سـەرەڕەقییان لـەناوی بردن، لەکاتێك دا گەلی عاد لەقورەیشیەکان زۆرترو خاوەن دەسەڵاتتر بوون، چونکە

هێنانەوەی پەندو سەر گورزشتەی واقیعی، داخوازی تێفکرینو لـێ وردبوونەوەیـە، لەهەمان کاتدا دڵدانەوەی پێغەمبەریشی تێدایە دەفەرموێ:

﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنْذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویست؛ باسی سەر گوزەشتەی هود پێغەمبەر بکە بۆ نەتەوەکەت، هود درودی خودای لێ بێ، بەرشتەو خزمایەتی لەقـەومی عـاد بـوو، خـودا کردییـە پێغەمبـەرو ڕەوانە کرد بۆ سەر قەومی عادی یەکەم: کە لە (ئەحقاف) دەژیان لەوڵاتی حەضرەموت.

ئـەحقاف بـریتی یـە لـە چـەند تەپۆڵکـەو بـەرزایی لمبـەلان، یـان بریتییـە لە شیوو دۆڵێك بە (بەرەهوت) بەناو بانگـە، وەلحال لـە پـێش هـودو دوای هـودیش پێغەمبەری ترمان ڕەوانە کردون، هەموویان گەلو نەتەوەکانی خۆیـان ترسـاندون: کە جگـە لـە خـودا کەسـی تـر نەپەرسـتن، هاوەڵـێ بـۆ دانـەنێن، حـەزرەتی هـودیش هـەمان ڕێبـازی گرتەبـەر، بـەو جـۆرە ئامۆژگـاری گەلەکـەی کـرد، داوای لـێ کـردن یەکتاپەرستی بکەنو هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن، پـێ‌ی گوتن من دەترسـم ئێـوە توشـی عەزابی سەختو دژواربن.

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ، إِذْ جَاءَتْهُمُ الرُّسُلُ مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ﴾ فصلت/١٣-١٤.

قەومی عاد وەڵامی حەزرەتی (هـود)یـان دایـەوە ﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا ؟﴾ وتیـان: ئـەوە هاتوویـە لامـانو خـۆت بەپێغەمبـەر دانـاوە بـۆ ئـەوەی لەپەرستشکردنی خودا کانمان لامان دەی؟ دەتـەوێ واز لـەخوداکانی خۆمـان بێـنو عیبادەت بۆ ئەو خودایە بکەین: کە تۆ بانگەوازی بۆ دەکەی؟ بێ منەتبە ..

﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ ئەو عەزابە سامناكەی هەڕەشەمان پێ لێ دەكەی بۆمان بێنە، ئەگەر ڕاست دەكەی لەوەدا: كە دەڵێی ئیمانم پێ نەهێنن عەزابی سەخت یەخەتان دەگرێ، دەی وا ئێمە ئیمانت پێ ناهێنن بائەو عەزابە گەورەو سامناكە بۆ مان بێ! ئەمە بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە: كە ئەو گەلەنەفامە خۆیان پەلەیان لەهاتنی عەزابی خودا كردوە، چونكە بەلایانەوە هاتنی عەزابی لەوجۆرە دورو نەگونجاو بووە، خۆ ئەگەر ئیمانیان بەهاتنی ببوایە هەرگیز پەلەیان لەهاتنی نەدەكرد![1] حەزرەتی هود ﷺ وەڵامی دانەوە..

﴿قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِنْدَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُمْ مَا أُرْسِلْتُ بِهِ وَلَكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْماً تَجْهَلُونَ﴾

فەرموی: من نازانم كەنگێ ئەو عەزابەتان بۆ دێ، زانیاری تەواو دەربارەی هاتن و چۆنیەتی ئەو عەزابەو هەموو شتێكی تر لای خودا خۆیەتی و بەدەست خۆیەتی: ئەو تەقدیری كردوەو ئەو دەینێرێ، لەو بارەوە هیچ زانیارییەكم نەدراوەتێ، ئیشی من ئەوەیە، پەیامی خۆم بەئێوە بگەیەنم، مـوژدە دەربەبەهەشت و ترسێنەر تانم لەدۆزەخ، ئاگادار تان دەكەمـەوە لـەوە: كە ئەگـەر ئیمـان نـەهێنن خـودا بەغـەزەبی خۆی دەتـانگرێ و لـەناوتان دەبـا، نـەك مـن خـۆم عـەزابتان بـۆ بێـنم! كـەی هـاتنی عەزاب بەدەست منە؟ وەلێ من ئێوە دەبینم گەل و نەتەوەیەكی بێ عەقڵ و نەفامن لەوەدا: كە بڕوام پێ ناكەن، سورن لەسـەر كـوفرو بێـدینی خۆتـان، پێـشنیاری شـتی وایش دەكەن لەدەسەڵاتی پێغەمبەران دا نیە!!

ئـەمجار پـەروەردگار دیمـەنی سـەرەتای هـاتنی عـەزابی سـەخت و كۆكوژیـان ڕادەنوێنێ و دەفەرموی: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضاً مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا﴾ كاتێ: دیتیان هەور یان (عـەزاب) بـەرەو ئـەوان دێ و ڕوی لەناوچـەو سنوری وڵاتـی ئەوانە، بەدڵخۆشییەوە وتیان: ئەوە هەورێكەو بارانمـان بـۆ دەبـارێنێ، زەوی و زاری

---

[1] لەئایەتەكەدا وادە لەشوێنی هەڕەشە بەكارهاتووە، چونكە وشەی (تعد) مـضارعی (وعـد)یـەو لەبابی دوەمەو مجردە بۆ وادەو بەڵێن بەكاردێ .

تينومان تێر ئاو دەكا، كەش و هەواى وشك و گەرممان بۆ خۆش دەكا! زۆريان هومێد پێ بوو، خۆشى خۆشى ئێستا نا تاوێكى تر بارانيان بۆ دەبارێ و لەو حاڵە ناخۆشەى تێ يدان ڕزگاريان دەبێ.

ڕيواياتى زۆر هەن دەڵێن: ئەو گەل و هەرێمە تووشى گەرمايەكى زۆر بوون، بێ بارانى و گەرماو وشكە ساڵێ برستى لێ بڕيبوون، كەش و هەواى وايان بۆ خولقابوو، بەكەڵكى ژيان نەدەهات: جا كە خودا ئەو هەورەى ڕەوانە كردن زۆرى پێ كەيفخۆش بوون، هەموويان لەماڵ هاتنەدەر بەرەو شيوو دۆڵەكانى دەورو بەريان ڕۆيشتن بەهومێدى ئەوە بارانيان بۆ ببارێ و كەش و هەوايان بۆ بگۆڕێ، بەڵام زوبانى واقيع تێ ى گەياندن: كەئەو هەورە هەورى باران نيە.

﴿بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ، تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾ بەڵكوو ئەو عەزابەيە: كە پەلەتان لەهاتنى دەكرد، ڕەشەبايەكى غەزەبەو سزاى سەختى هەڵگرتووە بۆ ئێوە، بەفەرمانى خودا بەسەر هەر شتێك دا بڕوا وێرانى دەكاو دەيپڕوكێنێ وەكوو لەئايەتێكى تردا باسى ئەو ڕەشەباى غەزەبەدەكاو دەفەرموێ: ﴿مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ﴾ الذاريات/٤٢.

ئايەتەكە ئامازە بۆ ئەوە دەكا: كە ئەو (با) غەزەبە زيندووەو هەستى هەيەو فەرمانبەردارەو فەرمانى پێ كراوە بە وێرانكردن و لەناوبردنى ئەو گەلە سەرڕەق و نەفامە، ئەمەش حەقيقەتێكى بوونەوەرەو قورئان زۆر جار ئامازەى پێ دەكا، ئەم بوونەوەر هەمووى زيندووەو هەموو هێزو وزەيەكى هەستيارە، هەموو شتێك بەرامبەر خوداى خۆى هەستى هەيەو پابەندى فەرمان و ويستى پەروەردگارە، ئەركى سەر شانى خۆى ئەنجام دەدا..

ئادەميزاد بۆ خۆى يەكێكە لەو هێزو توانايانەى بوونەوەر كاتێك ئيمان لەدڵ و دەرونى دا جێگير دەبێ، دڵى دەكرێتەوە بۆ (معرفة الله) بۆ خودا ناسى و يەكتاپەرستى، دەتوانێ هەست بەفەرمانبەردارى بونەوەربكا، لەگەڵ دەوروبەرى

خۆی دا هاریکاربێو بگونجێ، وەکوو جۆرێك لەزیندو هەڵسو کەوت لەگەڵ بونەوەربکا، چونکە لەڕاستی دا هەموو شتێك زیندوەو بەجۆرێکی تایبەتی هەستو گیانی تێدایە، وەلێ ئێمە دەرکی ئەو ژیانو هەستەیان ناکەینو لەناست ئێمە پەردەیان بەسەردا دراوە، چاوی دڵی هوشیارو نورانی هەستیان پێ دەکاو چاوی سەرنایان بینی[1]!

بەڵێ (بای)غەزەب ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دا، هەموو شتێکی وێران کرد، خۆیانو ئاژەڵیان، خانوبەرەو کاڵاو سامانیان هەمووی خاپور بوو ﴿فَأَصْبَحُوا لا يُـرَى إِلاَّ مَـسَاكِنُهُمْ كَـذَلِكَ نَجْـزِي الْقَـوْمَ الْمُجْـرِمِينَ﴾ وایـان لـێ هـات جگـە لـە کەلاوەروخاوی خانوەکانیان هیچی تریان نەدەبینرا، وڵاتیان کە سی تێدا نـەمابوو، هەموویان خاپورو کشو مات! قوقەی کەڵەبابی تێدا نەمابوو!

ئەمجار دوای ترساندنی قورەیشییەکان پەروەردگار هێزو تواناو شانو بازوی گەلی عاد بەیان دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِنْ مَكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعاً وَأَبْصَاراً وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَـى عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلا أَبْصَارُهُمْ وَلا أَفْئِدَتُهُمْ مِنْ شَيْءٍ﴾ بێگومـان ئێمـە گـەلی عـادو هـەموو گەلەپێشینەکانمان لەسەرزەوی جێگیر کـرد بـوو وەکـو چۆن ئێوەمـان لەسـەر زەوی جێگیر کردوە،ماڵو سامانو هێزو تواناو دەستو بـازو لەشـساغیو تەمەنـدرێـژیمان پێ دابوون بەجۆرێك کـە بـەئێوەمان نـەداوە ئـەی قورەیـشیو دانیـشتوانی مەککـە؛ ئەوان لەئێوە خاوەن سامانتر بوون، لـەئێوە زیـاتر منـداڵو پیـاوی بەشـانو بازویـان هەبوو، دەسەڵاتو توانایان لەهی ئێـوە پـتر بـوو، ژیـارو شوێنەدەسـتیان لەسـەر زەوی لەهی ئێوە بەرچاو تر بوو.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بـەوە دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿كَـانُوا أَكْثَـرَ مِـنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَاراً فِي الأَرْضِ﴾ غافر/٨٢.

---

[1] سەیری (في ظلال القرآن) بکە ٧/٤٣٢ .

دەی ئەوان وێڕای ئەو دەسەڵاتو توانایەی هەیانبوو سەرباری ئەو دەست وچاوو گوێچکەو دڵو دەرونەی پێیان بەخشرابوو کاتێك پەیامی پێغەمبەرەکەیان ڕەتکردەوەو پشتیان لەهیدایەت هەڵکرد، هیچ شتێك دادی نەدان، سودیان لەکلیلی زانیاری: کە چاو وگوێچکەیە وەرنەگرت، جەستەو هەستو ئامێری بیستنو دیتنی خۆیان نەخستە کار بۆبەختەوەری خۆیان، لەوشتانەدا بەکار یان نەهێنان: کە بۆی دروست کرابوون، شوکرو سوپاسی پەروەردگاریان پێ نەکردون، بۆ هەتا هەتایە خۆیان بەد بەختو چارە ڕەش کرد، سودیان لەهەستو عەقڵو زانیاری خۆیان وەرنەگرت.

﴿إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ چونکە ئینکاری پەیامو ئایاتی خودایان کرد، ئیتر ئەو عەزابو هەڕەشەیەی گاڵتەیان پێ دەهات دەورەی دانو تێکیەوە پێچانو خستنیە ناو زبڵدانی مێژووەو عەزابی دۆزەخیان بۆ خۆیان دەستەبەر کرد.

کەواتە دانیشتوانی مەککە وێڕای ئەوەی: کە لە گەلی عاد کەم دەسەڵاتترنو لەهیچ ڕویەکی هێزو تواناوە ناگەنە ئەوان، دەبوایە پتر لە عەزابی خودا بترسانایەو هەوڵیان بدایە تووشی ئەو بەدبەختیو چارە ڕەشییە نەهاتنایە.

﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُمْ مِنَ الْقُرَى وَصَرَّفْنَا الآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بێگومان ئێمە چەند گەلو نەتەوەمان لەدەورو بەری ئێوەی قوڕەیشی لەناو بردوە، لەسەر ئەوەی پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخستونەوە، هەر لەدەورو بەری وڵاتی حیجاز چەند شارو گوندی گەلی عادو قەومی لوطو گەلی مەدیەنمان لەناو بردون،هەموویان سەرکەشو بێ بڕواو ستەمکار بوون، پێغەمبەرمان بۆ سەرناردن، موعجیزەو نیشانەی زۆرو جۆراو جۆرمان نیشان دان، بۆ ئەوەی لەکوفرو بێدینی خۆیان واز بێننو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکانمان بکەون، بەڵام لاسارو بێ گوێ بوونو ئیمانیان نەهێنا! ئێمەیش بەعەزابی سەختو کۆکوژ لەناو مان بردن.

﴿فَلَوْلا نَصَرَهُمْ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ قُرْبَاناً آلِهَةً بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ ئەدی بۆچی؛ کەعەزابی سەختی ئێمە یەخەی گرتن خودا کانیان یارمەتییان نەدان و عەزابی ئێمەیان لێ نەگێڕانەوە؟؟ خۆ ئەوان لە جیاتی خودای حەق و بەدیهێنەر، چەند شتێکیان کردبوە خودای خۆیان و دەیانپەرستن بەتەمای ئەوە بوون، شەفاعەتیان بۆ بکەن! پێیان وابوو پارێزگارییان دەکەن، بەڵام ئەوەی بەتەمای بوون نەهاتەدی، بەڵکوو لێیان هونبون و ئامادەی یارمەتیدان و ڕزگار کردنیان نەبوون، کێ فریایان بکەوێ؟ چۆن یارمەتییان بدەن؟ ئەو بت و صەنەمانە دارای ئەوەنین شەفاعەت و یارمەتیدانیان لەدەست بێ، ئەوە گومڕایی و سەر لێ شێوانە کە ئەو شتانەیان کردون بەخوداو پەرستشیان بۆ دەکەن، ئەوە بوختان و دەست هەڵبەستی خۆیان بوو، بۆیە خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بوون و بوونە پەندو عیبرەتی ڕۆژگار.

## ئیمانهێنانی جندۆکە بەقورئان

﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغْفِرْ

لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾

باسی چەند کەسێ لە جندۆکەو گوێ لێ بوونیان لە قورئان بەخوشوعو ئەدەبەوە، خۆی لەخۆی دا بنەمای عەقیدەو ئیمان دەچەسپێنێ، یەکیەتی بنەما باوەڕیەکانی نێوان قورئانو تەورات دەسەلمێنێ، باسکردنی قورئان بۆ ڕوداوی ئامادە بوونی کۆمەڵێك جندۆکە بۆ ئەوەی لەدەمی پێغەبەرەوە گوییان لە قورئان بێ، هەڵسو کەوتو ڕەفتاریان لە بەرامبەر بیستنی قورئان دا، بەڵگەیەکی بە هێزەو پێویست بەبەڵگەی ترناکا بۆ سەلماندنی هەبوونی جندۆکە هەرچەندە ئێمە بەهەستەکانمان هەستیان پێ ناکەین، هەروەها بۆ ڕاستی ئەو ڕوداوەو چۆنیەتیەکەی!

هەروەها بۆ سەلماندنی ئەوە: کە ئەو جندۆکانە توانای ئەومیان هەبوەو هەیانە: کە گوێ لەقورئان بگرنو بیبیسنو بەگوفتاری عەرەبی لەزمانی پێغەمبەرەوە لێ ی حاڵی ببن! هەروەها ئامارە بەوەش دەکا: کە جندۆکە ئامادەباشی کوفرو ئیمانیان تێدایە، گونجاون بۆ هیدایەتو گومڕایی! بەهیچ شێوەیەك پێویستیمان بەبەڵگەی ترنیە بۆ چەسپاندنی ئەم حەقیقەتو ڕاستیە، کوردی گوتەنی:، خۆر بەدەرەوەیە چ پێویستیمان بەچرایە!

چەندێکیش لە سەری بگوترێ بۆ ڕونکردنەوەی ئەو حەقیقەتە لەدیدو بۆچوونی ئادەمیزاد، بێ سود نابێ بێگومان ئەم کەونو کائیناتە، ئەم بوونەوەرە پانو پۆڕەی دەورەی داوین، پڕە لە نهێنیو هێزو وزەی بیندراوو نەبیندراو، پڕە لەمەخلوقاتی نەزانراوو نەبیندراو، ئێمەی ئادەمیزاد لە

باوەشی ئەو هەموو نهێنیو مەخلوقاتەدا ژیان بەسەر دەبەین، کەمیان لێ دەزانینو رەوشتو کاریگەری زۆریان نازانین، رۆژ دوای رۆژ هەندێ لەونهێنیانەمان بۆ دەردەکەوێ، هەست بەهەبوونی هەندێ لەو مەخلووقاتە نەزانراوانەی ئەمرۆمان دەکەینو هێشتا لەسەرەتای بەرنامەی فێربوونو تێگەیشتن لەبونەوەرداین، ئەوەی دەربارەی دەیزانین لەچاو ئەوەی نایزانین قەترە بەدەریایەو پوشکەیە کە لەکایە.

ئەوەی ئەمرۆ دەیزانین دەربارەی بوونەوەر: بەتایبەتی لەبواری زانیاری(طب)و فیزیاو کیمیاو پیشەسازیو جیولوجیو ئاسمان شوناسیدا ئەگەر بەراورد بکرێ بەو زانیاریانەی ئادەمیزاد کەپێش هەزار ساڵ یان زیاتر زانیونی، ئەو زانیاری یانەی ئەمرۆ بۆ ئەو پیشینانە زۆر لەمەوزوعی ناسینی جندوکە سەر سورهێنەرترە.

ئەگەر یەکێ: پێش هەزار ساڵ نهێنی یەکی دەربارەی گەردیلەو بوارەکانی فیزیاو پزیشکی..هتد کە ئەمرۆ دەزانرێ دەربخستایە بەشێتیان لەقەڵەم دەدا، یان زۆر لەمەوزوعی جندۆکەیان بەلاوە سەر سورهێنەرتر دەبوو.

وێدەچێ ئێمەی ئادەمیزاد لە بواری زانستو زانیاری دا بەرەو پێش بروینو رۆژ دوای رۆژ زیاتر نهێنی بونەوەرمان بۆ کەشف بێ، لەچوار چێوەی ئاوەدانکردنەوەی زەویو بەو یاسایەی؛ کە خودا بوونەوەری بۆتەسخیر کردوین نهێنی وامان بۆ دەر بکەوێ مەوزوعی (زەڕڕە)و نهێنی یەکانی ببنە گاڵتەی منداڵو چ گرنگی یەکیان نەمێنێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئێمەی ئادەمیزاد هێشتا ئەوەی دەیزانین لەبەرامبەر نەزانراو دا زۆر کەمو بێ نمودە، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ (الإسراء/٨٥) یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ﴾ (لقمان/٢٧).

جا: کە ئێمە ئەمە هێزو توانامان بێ، ئەوە ئەندازەو بواری زانیاریمان بێ هەرگیز مافی ئەوەمان نیە لەخۆمانەوە بەبێ بەڵگە هەر ئەوەندە لەسنووری عەقڵو بیرو بۆ چونمان بەدەرە، نەفیی یان ئسباتی نهێنی یەکی بوونەوەر بکەین،

ئێمە هێشتا هەموو نهێنی جەستەی خۆمان نەزانیوە، چ جای نهێنی عەقڵ و گیانمان بزانین، جا کە خودا بەلوتف و مەرحەمەتی خۆی لەرێگای کەلام و سروشی خۆیەوە نهێنییەکی لە نهێنی یەکانی بوونەوەر بۆ دەرخستین، حەق وایە یەکسەر بەبێ سێ و دوو ئیمانمان پێی هەبێ، شوکرو سوپاسی پەروەردگارمان بکەین لەسەر ئەوزانیاریە، چۆنمان پێ گەیشتووە چەندمان پێ زانراوە ئاوا وەری گرین و لێی زیادو کەم نەکەین.

هیچ سەرچاوەیەکی تریش نیە ئێمە ئەم جۆرە نهێنی و پەنامەکیيانەی لێ وەربگرین، ئێمە لەم دەقە قورئانییەی ئێرەو ئایەتەکانی سورەتی (الجن)و فەرمودە صەحیحەکانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەورووداوە ((ڕوداوی کۆبونەوەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جندۆکەو بیستنیان بۆ قورئان لەدەمی پێغەمبەرەوە)) دەتوانین بڕی حەقائیق لەجندۆکە بزانین، دەزانین: کە مەخلووقاتێکی ترهەن لە ئاگر دروست کراون.

وەکوو قورئان لەسەر زمانی ئیبلیس دەربارەی ئادەم بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ (ص/٧٦) شەیتانیش بۆ خۆی لەرەگەزی جندۆکەیە، قورئان ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾ (الكهف/٥٠) ئەم مەخلووقاتە جندۆکانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە، ئەوان ئادەمیزاد دەبینن، وەلێ ئێمەی ئادەمیزاد ئەوان نابینین.. وەکوو قورئان دەربارەی شەیتان دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ﴾ (الأعراف/٢٧).

هەروەها ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کە جندۆکەش وەکوو ئادەمیزاد کۆمەڵگایان هەیەو لە خێزان و هۆزو گوندو شارو شارۆچکە پێك دێ: چونکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ﴾ هەروەها توانای ئەوەیان هەیە لەسەر زەوی بژین بەڵام لەکوێ و چۆن؟ نازانین! قورئان هەر ئەوەندەی دەرکاندوە کە زەوی

نـشینگەی ئـادەمیزاد جندکەیـە، ئـەوەتا بـەئادەم و حـەواو ئیبلـیس دەفـەرموێ: ﴿اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ البقرة/ ٣٦.

ئەو جندوکانەی بۆ حەزرەتی سلێمان رام کرابوون بەملکەچی لەسـەر زەوی کاریـان بـۆ دەکـرد، داخـوازی ئەوەیـە: کـە توانـای لەسـەر زەوی ژیانیـان تێـدا بـوو بـێ، هـەروەها توانـای ئـەوەیان هـەبوە لـەدەرەوەی زەوی و لەسـەر هەسـارەکانی تـریش ژیـان بەسـەر بـەرن: وەکـوو لەسـەر زوبـانی جندۆکە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاء فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَساً شَدِيداً وَشُهُباً، وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَّصَداً﴾ (الجن/٨-٩).

هەروەها توانـای ئـەوەیان هەیـە کار لـەئادەمیزاد بکـەن و لەخـشتەی بـەرن، وەکـوو قورئـان لـەدان و سـانی نێـوان پـەروەردگارو ئیبلـیسدا ئامـاژەی پـێ دەکـاو دەفەرموێ: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ (ص/٨٢-٨٣) بەڵام چۆن گومرایان دەکاو چۆن وەسوەسەو ختوکەیان دەدا؟ نازانین دەتـوانن گوێیان لەدەنگی ئادەمیزاد بێ بەبەڵگەی ئـەوە: کە گوێیـان لەبیـستنی قورئـان بـوو تێ گەیشتن، توانای موسوڵمان بون و گومڕابوونیان هەیە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَداً، وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَباً﴾ (الجن/١٤-١٥).

ئەمـە بـەکورتی ئـەو زانیـاری و ئامـاژە پێکردنەیـە: کـە قورئـان دەیگەیەنێ و پێویستە ئیمانمان پێ هەبێ و بەحەقیقەت و ڕاستی بزانین و بێ سێ و دوو وەری بگرین، زۆر ڕیوایات و فەرموودەی جیا جیاهەن مانای ئایەتەکانی قورئان زیـاتر شـی دەکەنـەوەو عالـەمی جندۆکـەمان پـێ دەناسـێنن، هەنـدێکیان ڕیوایـاتی موسلیم و بوخارین و ڕاگواتستنیان بـۆ نێـرەو بـەراوردکردن و پێـك گرتنیـان پانتـای یـەکی زۆری دەوێ، هـەر کەسـێ دەیـەوێ لـەو بـوارەدا قـوڵ ببێتـەوە باسـەیری تەفسیرەکان بەتایبەتی تەفسیری (ابن کثیر) و (الطبري) و (في ظلال القرآن) بکا.

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵەئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەیە:**

لەوە پێش پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند: کە ئادەمیزاد هەیانە خودا پەرستەو هەیانە کافرە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە ڕەگەزی جندۆکە هەیانە خودا پەرستەو هەیانە بێدینو حەق نەویستە، موسوڵمانەکانیان شیاوی پاداشو کافرەکانیان شیاوی عەزابن.

حەزرەتی (محمد) درودی خودای لەسەربێ ڕەوانە کراوە بۆ سەر عالەمی ئادەمیزادو جندۆکە بەشێوەی تەکلیفو ڕەهنمایی کردن وتێکۆشان لەگەڵیان بۆ ئەوەی ڕێگای سەفرازیی دونیاو قیامەت بگرنە بەر، جندۆکەو فریشتە دوو عالەمی غەیبی فەرمباڵخو بەرفروانن، ئێمە نایان بینین، پێویستە ئیمانمان پێیان هەبێ، هەروەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ لەڕێگای فریشتەوە نیگای پێ گەیشتووە، ئەویش بەو پەڕی دڵسۆزییەوە پەیامی خۆی بەعالەمی جندۆکەو ئادەمیزاد گەیاندوە، مژدەی بەهەشتی بەخودا پەرستان داوەو کافرەکانی لە عەزابی سەختی خودا ترساندوە، دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَراً مِنْ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست؛ باسی ئەوە بۆ گەلەکەت بکە: کە ئێمە سەرنجی چەند کەسێکمان لەجندۆکە بۆلای تۆ ڕاکێشاو ناردمانن بۆلات بۆئەوەی ببنە هۆی هیدایەتدانی نەتەوەکەیان، کاتێ ئامادەی قورئان خوێندنی تۆ بونو گوێیان لێ گرت، داوایان لەیەکتر کرد: کە بێدەنگ بنو بەخوشوعو خضووعەوە گوێی لێ ڕابگرنو بیر لەماناکانی بکەنەوە، ئەم ڕوداوە لەشیوی مەشهوور بە (بطن نخلة) ڕویداوە: کە ڕۆژە ڕێیەك بەپیادە لەمەککەوە دورە لەسەر ڕێی (الطائف) لەو کاتەدا بوو: کە پێغەمبەر ﷺ بە دڵ شکاوی لەطائیف گەڕایەوە، ئەم جندۆکانە لەجندۆکەی (نصیبین)یان (نەینەوا)بوون جا گوێیان ڕاگرت تا نوێژی بەیانی یان تاقورئان خوێندنە کە تەواو بوو، ئەمجار

گه‌ڕانه‌وه بۆلای گه‌ل‌و که‌س‌و کاری خۆیان بۆ ئه‌وه‌ی بیانترسێنن له‌عه‌زابی خودا، ئامۆژگارییان کردن: که‌پابه‌ندی فه‌رمان‌و جڵه‌و گیریه‌کانی قورئان بن.

ئایه‌ته‌که به‌ڕونی ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێ: که پێغه‌مبه‌ر ڕه‌وانه کراوه بۆ سه‌ر هه‌ردو عاله‌می ئاده‌میزادو جندۆکه به‌شێوه‌ی ته‌کلیف بۆ ئه‌وه‌ی له‌گومڕایی ڕزگاریان بکاو بیانخاته سه‌ر ڕێبازی هیدایه‌ت، چه‌ند فه‌رمودیه‌کی پێغه‌مبه‌ر له‌م باره‌وه ڕیوایه‌ت کراون، ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نن: که له‌و کاته‌دا پێغه‌مبه‌رﷺ بۆ خۆی هه‌ستی به ئاماده‌بوونی ئه‌و جندۆکانه نه‌کردوه، به‌ڵکوو ئه‌وان گوێیان له قورئان خوێندنی پێغه‌مبه‌ر گرت‌و دوای گه‌ڕانه‌وه بۆ ناو گه‌ل‌و هۆزی خۆیان‌و ده‌ستیان کرد به ئامۆژگاری کردنیان، ئه‌مجار جندۆکه ده‌سته ده‌سته‌و تاقم تاقم ده‌ستیان کرد به‌هاتن بۆلای پێغه‌مبه‌رو وموسوڵمان بوون.

یه‌کێك له‌و ڕیوایه‌تانه‌ی: ئاماژه به‌وه ده‌که‌ن: که پێغه‌مبه‌رﷺ یه‌که‌مجار هه‌ستی به‌ئاماده بوونی جندۆکه کان نه‌کردوه ئه‌و حه‌دیسه‌یه: که ئیمام ئه‌حمه‌دو تیرمیزی‌و نه‌سائی له‌ئیبنوعه‌بباسه‌وه ڕیوایه‌تیان کردوه ده‌فه‌رموێ: (كان الجن يستمعون الوحي، فيسمعون الكلمة فيزيدون فيها عشرا فيكون ما سمعوا حقا، ومازادو باطلا، وكانت النجوم لا يرمى بها قبل ذلك، فلما بعث رسول الله ﷺ كان أحدهم لا يأتي مقعده الا رمي بشهاب يحرق ما أصاب، فشكوا ذلك الى ابليس، فقال ماهذا الا من أمر قد حدث، فبث جنوده، فاذا بالنبي ﷺ يصلى بين جبلي نخلة فأتوه فأخبروه فقال: هذا الحدث الذي حدث في الأرض).

ڕیوایه‌تی تریش زۆرن ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نن: که پێغه‌مبه‌ر ﷺ جندۆکه‌ی بینیون‌و له‌گه‌ڵیان کۆبۆته‌وه‌و قورئانی بۆ خوێندونه‌وه ڕه‌هنومایی کردون، هه‌ندێکیان ئیمانیان پێهێناوه‌و هه‌ندێکیان پشتیان هه‌ڵکردوه.

جا: که جندۆکه‌کان گوێیان له قورئانخوێندنی پێغه‌مبه‌ر بوو گه‌ڕانه‌وه بۆ ناو گه‌ل‌و هۆزی خۆیان و. ﴿قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَاباً أُنزِلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ وتیان: ئه‌ی گه‌ل‌و هۆزی خۆمان،

ئێمە گوێمان لەخوێندنەوەی پەڕاوێك بوو لەدوا تەورات لەلایەن خوداوە نازڵ کراوە، پشتگیری نامە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەکا، پەیامی پێغەمبەرانی پێشوو بەڕاست دەزانێ و داوای ئەوە دەکا هەموو کەس بەڕاستیان بزانێ، نامەی شارەزایی کردنی خەڵکە بۆ ڕێگای سەرفرازی، بۆ ڕێبازی میانەڕەوی لەعەقیدەو عیبادەت و کردەوەو هەڵوێست و ئاکارو گوفتاردا.

تێبینی ئەوە دەکرێ: باسی حەزرەتی عیسای نەکرد درووودی خودای لەسەر، جا یان لەبەر ئەوە بوو ئەو جندۆکانە جولەکە بوون و موسوڵمان بوون یان چونکە ئینجیل: کە نامەی عیسایە ئامۆژگاری و باسی دڵنەرمی تێدایە، بەدەگمەن نەبێ باسی تەحلیل و تەحریمی تێدانیە، بەڵکوو لەڕاستی دا ئینجیل تەواو کەری تەوراتە: کەوابێ سەرچاوەی سەرەکی بۆ جولەکەو گاور تەوراتە، ئەو سەرچاوەیە شەریعەتە بۆ هەردولایان، بۆیە بە تایبەتی ناوی تەوراتی هێنا.

﴿يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی هۆزو گەل و کۆمەڵی جندۆکە! بە پیربانگەوازی پێغەمبەری ئیسلام و دوا پێغەمبەرو سەر داری پێغەمبەرانەوە بچن، ئیمانی پێ بهێنن، شوێن پەیامی ئەو قورئانە بکەون: کە بانگەوازیتان دەکا بۆ یەکتاپەرستی و ملکەچی و گوێرایەڵی بۆ خودای بوونەوەر، ئەگەر بەگوێمان بکەن خودا لەهەندێ لەتاوانەکانتان خۆشی دەبێ، لەو تاوانانەی کە بە (حق الله) دەژمێر درێن، چونکە ئەو تاوانانەی کە مافی بەندەکانی خودای تێدا پێشێل کراوە پێویستە بەندەکان خۆیان چاوپۆشی لێ بکەن ئەمجار خودا لێیان خۆش دەبێ هەروەها ئێوە دەپارێزێ لەعەزابی سەختی دۆزەخ و دەتانخاتە بەهەشتی بەرفراوانەوە، ئەمەش ئەو پەڕی بەمراز گەیشتن و سەرفرازییە..

ئایەتەکە بەرونی ئەوە دەگەیەنێ: کە حەزرەتی موحەممەد ﷺ کراوە بە پێغەمبەری ئادەمیزادو جندۆکە، کەبۆ سەرهەردوکیان ڕەوانەکراوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان و یەکتاپەرستی، سورەتی (الرحمن)ی

بەسەردا خوێندنەوە، کە خیتابی تێدا ئاراستەکراوە بۆ هەردو ڕەگەز: ( ئادەمیزادو جندۆکە) هەردوکیان بەرپرسیارو ئەرك لەسەرشانە، مـوژدەو هەڕەشە شمولیـان دەکا، سزاو پاداش دەیانگرێتەوە .

ئەو قسەیەی هەندێ لەزانایانی ئیسلام لەوانە حەسەنی بەصری‌و ئەبو حەنیفە گوتوویانە : کە گوایە جندۆکە خواپەرستەکانیان ناچنە بەهەشتەوە، بەڵکوو پاداشیان تەنها ئەوەندەیە، کە لە سزای دۆزەخ دەپارێزرێن، قسەیەکە لەگەڵ قورئان دا ناگونجێ‌و بێ بناغەیە، بەڵکوو زۆربەی زانایان لەوانە شافیعی‌و ئیمام مالیك فەرموویانە، هەر کەسێ موسوڵمان بێ لە ئادەمیزادو جندۆکە دەچێتە بەهەشتەوەو خودا پاداشی نەبڕاوەی پێ دەبەخشێ، قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلاً﴾ الكهف/۱۰۷.

ئەمجار شاندی جندوکەکان، کە لەخزمەت پێغەمبەر گەڕانەوە ترسیان بەر گەلەکەیان ناو هەڕەشەی عەزابی سەختیان لێ کردن، وتیان:

﴿وَمَنْ لا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءُ أُوْلَئِكَ فِي ضَلالٍ مُبِينٍ﴾ کەسێك بەپیر بانگەوازی پێغەمبەری ئیسلامەوە نەچێ، یەکتاپەرستی نەکاو ملکەچی فەرمان‌و جڵەو گیریەکانی قورئان نەبێ دەبێتە دوژمنی خودا، کەسیش لەچنگ عەزابی سەختی ئەو ڕزگاری نابێ، چی بکا لەملکی خودا دەرناچێ‌و لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا دەبێ، جگە لەخودا کەس یارمەتی نادا، ئەگەر یارمەتیشی بدەن جێ ناگرێ‌و بێ سودە، بێگومان ئەوانەی بەپیر بانگەوازیی پێغەمبەرەوە ناچن، لەگومرای‌و هەڵەیەکی ئاشکرادان، ماڵوێران‌و بەد بەختو چارە ڕەشی هەر دوجیهانن!

## سەلماندنی زیندوبوونەوەو فەرمانکردن بەخۆڕاگری

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٣٣) وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ۖ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ (٣٤) فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ۚ بَلَاغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ (٣٥) ﴾

لەوەپێش لەسەرەتای سورەتەکەدا هەبوونی خودای سەلماند، بیرو بۆچونی بتپەرستەکانی ڕەتکردەوە، (قضية)ی یەکتاپەرستیو ڕاستی پێغەمبەرایەتی چەسپاند، موناقەشەی موشریکەکانی کرد دەربارەی بیرو باوەڕی بەتاڵو پوچیان، شوبهەو گومانیی پوچاندنەوە، سەرزەنشتی کردن لەسەر ئەوە: کە ئیمان ناهێنن‌و بڕوا بەتاکو تەنهایی خودا ناکەن، پەیامی قورئان ڕەت دەکەنەوە، لەکاتێك دا جنۆکە بڕوایان بەقورئان کردوە بەئەدەبو خوشوعەوە گوێیان بۆ خوێندنەوەی ڕاگرتووەو بانگەوازی گەلو نەتەوەکەی خۆیان کردوە بۆ ئیمانهێنان.

ئەمجار دێتە سەرباسی (قضیه)ی ڕابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە، پاشان دڵنەوایی پێغەمبەر دەکاو فەرمانی پێ دەدا: کە بۆ ئەنجامدانی گەیاندنی

پەيامەكـەى بـارقوڵو پـشوو درێـژبێ، وەكـوو پێغەمبـەرە ئولولعەزمـەكانو چـاو لەئـەوان بكـا، پـەيامى خـۆى بگەيـەنێ، پەلەنـەكا لـەهاتنى عـەزابى كۆكـوژ بـۆ ئوممەتەكەى، ئەمـە پەنـدو دەرس دادانـى ئێمەيـە، بۆئەوەيـە ئێمـەيش شوێن ئـەو پەيامە پیرۆزە بكەوين، دەفەرموێ:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالآرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئايا تێنافكرنو وردنابنەوە بۆ ئەوەى ئـەو كـافرە بـێ باوەڕانـەى كـە ڕابـوونى قيامـەتيان بـەلاوە پەشمـەو زيندوبوونـەوەى دوامردن بەدوور دەزانن، تێبگەنو بۆيان ئاشكرا ببێ؛ كە ئـەو خودايـەى لەنـەبوەوە بوونەوەرى بەبێ ماندو بوون بەدى هێناوە، هيچ ئەركو نارەحەتى توش نەهاتووە، هەرئەوەندە فەرمويەتى: ببەو بووە، دەتوانى مردوان زيندو بكاتەوە!

ئـەو خودايـەى : كـە ئـەوە دەسـەڵاتو توانايـەتى بەسـەر هـەموو شـتێكدا باڵادەستەو هـيچ شـتێكى لـێ يـاخى نـابێ، كەسێك بتـوانێ لەنـەبوە بونـەوەر بـەدى بـێنێ، دەتـوانێ دوامـردن مردوەكـان لـەگۆڕەكانيان دەربـێنێو ڕاپێـچى سـاراى مەحشەريان بكا بۆ حيسابو لێكۆڵينەوە، وەكوو لەئايەتێكى تردا دەفەرموێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ غافر/٥٧.

ئەمجار دێتە سەر ڕانوانـدنى بـڕى ديمـەنى وەزعو حاڵى كافرەكـانى لەڕۆژى قيامەت دا، دەفـەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَـذَا بِـالْحَقِّ قَـالُوا بَلَى وَرَبِّنَا﴾ ئەى پێغەمبەرى خۆشەويست، باسى ئەو وەزعو حاڵە بۆ گەلەكەت بكـە: كە ڕۆژى قيامەت كافرەكان گيرودەى عەزابى سەخت دەبنو ئاگر دەورەيان دەدا، جا بۆ زێدە سەرزەنشتو لۆمـەكردنو ڕيـسوابوون پێيـان دەگـوترێ ئـەرێ ئـەم عەزابـە ڕاستو حەق نيە؟ شكو گومانتان تێيدا هەيە؟ ئـەوانيش هـيچ چارێكيان نيـە دان بەواقيعەكـەدا دەنـێنو دەڵـێن: بـەڵێ، سـوێند بـەخوداى خۆمـان؛ كـە پـەروەردگارى هەموو شتێكە ئەم عەزابە حەقەو هيچ گومانى تێدا نيە!!

﴿قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ پەروەردگار بەشێوەی سوکایەتی پێکردن‌و سەرزەنشتکردنیان پێیان دەفەرموێ: دەسزای سەختی دۆزەخ بچێژن، چونکە بڕواتان پێ‌ی نەبوو بەدرۆتان دەزانی!!

ئەمجار دوای چەسپاندن‌و سەلماندنی تاک‌و تەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرایەتی‌و هاتنی قیامەت‌و ڕەتکردنەوەی بیرو بۆچونی موشریکەکان پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کەلە بەرامبەر هەڵوێستی موشریکەکان دا پشوو درێژو بار قوڵ بێ، پێی دەفەرموێ:

﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلا تَسْتَعْجِلْ لَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست پشوو درێژو بارقوڵ بە لەبەرامبەر ئەزیەتدانی نەتەوەکەت، سەرپێچی‌و ڕکەبەرییان بەهەندمەگرە، وەکوو پێغەمبەرە ئولولعەزمەکانی تر صەبر بگرەو لەسەر بانگەوازیکردنی خۆت بەردەوام بە، چاو لە پێغەمبەرە بەرێزەکانی تری وەکوو نوح‌و ئیبراهیم‌و موساو عیسا بکە، پەلەمەکە لەهاتنی عەزاب بۆ یان، ئەوەکاری تۆنیە، بەدەست خودایە، ئەو سزایە یان توشی دێ‌و لێ ی قوتار نابن، بەڵام کەی؟ خودا دەیزانێ.

﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلاّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ بَلاغٌ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلاّ الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ﴾؟ ئەو کافرانە ئەو ڕۆژەی عەزابی سەختی خودا دەبینن‌و یەخەیان دەگرێ، ژیانی دونیایان بەکورت‌و کەم دێتە بەرچاو، وادەزانن لەدونیادا جگە لەساتێك لەساتەکانی ڕۆژ پتر نەماونەوە، چونکە عەزابەکە هێندە سەخت‌و دژوارە هەموو قیاس‌و بەراوردکاری یەکیان لێ تێك دەچێ، هیچ شتێکیان وەبیرنایەتەوە..

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەمانای ئەم ئایەتە دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ؟ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلْ الْعَادِّينَ﴾ المؤمنون/ ١١٢-١١٣. یان دەفەرموێ ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا﴾ النازعات/٤٦) .

ئەم قورئانە پیرۆزە: کە پێغەمبەر بۆتانی دەخوێنێتەوەو پێتانی ڕادەگەنێ پێڕا گەیاندنێکی تەواوو بێ خەوشە، کەس بیانووی نامێنێ و هەرکەسێ بڕوای پێ نەکا سەر ڕەق و گومڕایە، سنوور شکێن و نەفامە، شیاوی ئەوەیە خودا گیرۆدەی عەزابی سەختی بکا، ئایا جگە لە پێڕی تاوانبارو سنوور شکێنان کەسی تر بەعەزابی سەختی خودا لەناو دەچن؟ نەخەیر، خودا عەدالەتکارە، کەسێك شیاوی عەزابدان نەبێ عەزابی نادا، هەر تاوانبارو ستەمکاران دەکەونە ژێر گورزی عەزابی خوداوە!!

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی (محمد)

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (محمد) چونکە باسی ئەوەی تێدا کراوە: کە قورئان بۆ (محمد) نێردراوە، شایانی باسە لەهەمو قورئان دا چوار جار ناوی پێغەمبەر بە ناوی (محمد) هاتووە، جارێکیان لەسورەتی (آل عمران)دا ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ﴾/١٤٤ لەسورەتی (الاحزاب)دا: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ﴾/٤٠ لەسورەتی (الفتح) دا ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ﴾/٢٩ لێرەش دا واتە: لە سورەتی (محمد) دا دەفەرموێ: ﴿وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾/٢ .

جگە لەم چوار شوێنە ناوی پێغەمبەر بە (رەسول)و بە (النبي) بە(المدثر) و (المزمل) و (طه) و بەچەند شتی تریش هاتووە.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بە پێشەوەی:**

پەیوەندی ئەم سورەتە بەپێشەوەی زۆر بەتین و تۆکمەیە، سەرەتای ئەم سورەتەو کۆتایی سورەتی (الاحقاف) پێکەوە گونجاوو لەبارن، تەنانەت ئەگەر (بەسمەلە)ی نێوانیان لابەری دوای ﴿فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ﴾ سەرەتای سورەتی (محمد) ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ ...الآية﴾ بخوێنینەوە هەست بە هیچ تەنافورو دژایەتیەك ناکرێ. هەر دەڵێ یەك ئایەتن و پێکەوە جۆش دراون!

سورەتەکە مەدەنی‌یەو باسی سەرەکی تێیدا باسی جیهادە، ئەحکامی دیل‌و یاسای جەنگ‌و دەستکەوتی جەنگی لەخۆگرتووە، باسی کافرو موسوڵمان دەکا سزاو پاداشیان دیاری دەکا، حاڵ‌و وەزعی دووڕووەکان‌و پاشگەز بووەکان لەئایین ڕون دەکاتەوە!!

سەرەتا سورەتەکە بەشتێکی سەرنج ڕاکێش دەست پێ دەکا، بەباسی هەڵوێست‌و ئاکاری کافرەکان دەست پێ دەکا، ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە خودا رقی لێیانەو بەقاری خۆی گیرو دەیان دەکا، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی وەصفی خودا پەرستەکان دەکاو رەزامەندی خۆی لێیان ڕادەگەیەنی، جوداوازییەکی بەر فراوان دەخاتە نیوانی کافرو موسوڵمانەوە.

ئەمجار فەرمان بەخودا پەرستان دەکا: کە بە توندی شەڕ لەگەڵ کافران دا بکەن، هەرچی وزەو توانای خۆیان هەیە بیخەنە گەڕ بۆبەرپەرچدانەوەی ئەو سەررەق‌و بەتاڵخوازانەی نایەنە ژێر چەتری ئایینی پاکی ئیسلامەوە، مزگینی دەدابە موسوڵمانان بەسەرکەوتن‌و پیرۆزی ئەگەر بەڕاستی لەپێناو ئایینی خودادا بجەنگن‌و لەبەرامبەر ئەزیەت‌و نارەحەتی دا بەصەبرو خۆڕاگر بن، ڕیسوابوون‌و ژێر کەوتنی کافرەکان ڕادەگەیەنێ‌و خودا بۆیان لەکەمین دایەو ناهێڵێ بەسەر یانەوە بچێ!

ئەمجار هەندێ پەندو مەثەل بۆ قوڕەیشییە کافرەکان لێ دەدا، بۆ ئەوەی بەخۆیان دا بچنەوە، ترسیان لێ بنیشی‌و بزانن ئەگەر سوربن لەسەر کوفرو ستەمکاری خۆیان بەدەردی ملهوڕو ستەمکارە سەر ڕەقەکانی پێش خۆیان دەچن، وێڕای ئەوەیش باسی نازو نیعمەتەکانی بەهەشت دەکا: کە دانراوە بۆ خوداپەرستان ... بۆ ئەوەی کافرەکان هەڵبنێ بۆ ئیمانهێنان‌و گەردنکەچی بۆ خودا.

دوایی دێتە سەر باسی دووڕوو پاشگەز بووەکان، هەڵوێستو ئاکارو ڕەفتاریان باس دەکا، لە دوو توێی ئەم باسانە دا ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە ئەو کافرو سەر ڕەقو ستەمکارانەی دژایەتی پەیامی پێغەمبەر دەکەن ناتوانن هیچ زیانێک بەخودا بگەیەنن، خودا هەموو پیلانو نەخشەیەکیان هەڵدەوەشێنێتەوە، کردەوەکانیان پوچ دەکاتەوە لە کۆتایی سورەتەکەدا بانگەوازیی موسوڵمانان دەکا بۆ بەدەستهێنانی شکۆمەندیو خۆپاراستن لەزەبوونیو خۆبەدەستەوەدانی دوژمنو ژێر دەستەی کافران، ئەمەش لەگەڵ باسە سەرەکییەکەی سورەتەکەدا کە جیهادو تێکۆشانە لەپێناو ئاییی خودادا گونجاوە.

## جوداوازی نێوان کافرەکانو موسوڵمانان

﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ٣ ﴾

دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەوانەی کافرو ستەمکارن، ئینکاری تاکو تەنهایی خودا دەکەن، بڕوایان بەشەریعەتو ئاییی پەسندی ئاسمانی نیە، هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، دەبنە لەمپەڕو کۆسپو تەگەرە لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئایندا، ناهێڵن کەسانی دیکە موسوڵمان ببن..

خودا کردەوەکانیان پوچ دەکاتەوە، ئەو کردەوانەی بەرواڵەت باش‌و بەتەمای پاداشن لەسەریان وەر بگرن بەفیڕۆ دەچن‌و خودا هیچ پاداشتێکیان بۆ دانانێ، چونکە کردەوەی باش بەبێ هەبوونی ئیمان کەڵکی هیچی نیەو جێی هیچ ناگرێ..

هەر کردەوەیەك لەئیمانەوە هەڵنەقوڵێ‌و ئیمان پاڵنەرو هەڵنەری نەبێ تۆزو بایەو بێ سودەو جێگای هومێد نیە، هەر کردەوەیەك پەیوەست نەبێ بەمەنهەجێکی چەسپاو لەدەروون دا، لەگەڵ یاسای بنەڕەتی بوونەوەردا جۆشی نەخواردبێ، لەخاوەنی دڵ‌و دەرونی پڕ لە ئیمانەوە سەری هەڵنەدابێ هیچەو پووچە، نرخی قانگە لاشکێکی نیە با بەرواڵەت سود بەخش بێ هەرچی پێ‌ی دەگوترێ: باشەو بەرواڵەت بەئەخلاق‌و رەوشتی جوان حسێب بکرێ.

وەکوو بەجێهێنانی صیلەی ڕەحم‌و ئازادی بەخشین بەکۆیلەو رزگار کردنی فەقیرو هەژاران لەبرسیایەتی‌و مەینەتی، دروستکردنی مزگەوت‌و پردو قوتابخانەو خۆشکردنی ڕێگەو بان‌و بەهاناچوونی لیقەوماوان ئەگەر ئیمانی لەگەڵ دانەبێ‌و لەبیرو باوەڕی ڕاست‌و حەقەوە هەڵنە قوڵابێ، بۆ قیامەت سودی پوشکەیەکی نیە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم ڕاستی یە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُوراً﴾ الفرقان/٢٣.

دوابەدوای بەیانکردنی حاڵ‌و وەزعی کافرەکان‌و سزای عادلانەی قیامەتیان حاڵ‌و وەزعی موسوڵمانان پاداشی نەبڕاوەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾ ئەوانەی ئیمانیان بەتاك‌و تەنهایی خودا هێناوە، فەرمانبەر داری فەرمان‌و جڵەو گیرییەکانی قورئانن، ملکەچی شەریعەتی خودا پەسندن‌و بە ئاشکراو بەنهێنی پابەندی دەبن، شوێن ڕەهنومایی پێغەمبەرﷺ دەکەون، کردەوەی باش ئەنجام دەدەن‌و پەیامی قورئان بەحەق

دەزانن و دڵنیان لەوەی کە کەلامی خودایەو بەسروش بۆ پێغەمبەر هاتووە، بۆ ئەوەی بەئادەمیزادی بگەیەنێ..

.. ئەوانە بەختەوەری دونیاو قیامەتن، خودا لەتاوانی ڕابوردویان خۆش دەبێ، لەدونیاو قیامەت دا کارو باریان بۆ ئاسان دەکا، لەئەنجامدانی تاوان دەیانپارێزێ، ئیمانیان بەهێز دەکا، شارەزایان دەکا ئەنجامدانی کرداری باش و بەسود، ژیانی دونیا بەخۆشی بەسەر دەبەن و لەقیامەت دا بە بەهەشتی بەرین شادیان دەکاو مرازی گەورەیان حاصڵ دەبێ.

ئەمجار پەروەردگار هۆی گومڕابوونی کافرەکان و بەختەوەری خودا پەرستان دیاری دەکاو دەفەرموێ:

﴿ذَلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِنْ رَبِّهِمْ﴾ ئەوەی باسکرا لەسزاو پاداشی کافرو موسوڵمان بەهۆی ئەوەوەیە: کە کافرەکان شوێن بەتاڵ کەوتوون و هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن و تاوان ئەنجام دەدەن، موسوڵمانەکانیش پابەندی حەق و ملکەچی فەرمانی خودان، یەکتاپەرستی دەکەن، ئیمانیان هەیەو کردەوەیان پەسندە.

﴿كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ﴾ بەو جۆرە ڕێک و پێک و ڕەوانە پەروەردگار حاڵ و وەزعی هەر دو کۆمەڵی کافرو موسوڵمان ڕون دەکاتەوە، سەرنجامی هەردولایان دیاری دەکا، چاکەو خراپەڵێک جیادەکاتەوە.

## یاساکانی جەنگ و دیل و کوژراو جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا

﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ

وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٩﴾ ﴾

دەربارەی ئایەتی چوارەم: ﴿وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ...﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم لەقەتادەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: ئەم ئایەتە ڕۆژێ غەزای ئوحود نازڵبوو، لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ لەشیوەکەدابوو، موسوڵمانان کوژراوو برینداریان زۆر بوون، لەو ڕۆژەدا موشریکەکان هاواریان دەکرد بەرزیو شکۆمەندی بۆ (هوبەلە) یەکێك بوو لەبتەگەورەکانیان موسوڵمانەکانیش هوتافیان دەکێشاو دیانگوت: (الله أعلى واجل) موشریکەکان دەیانگوت ئێمە (العزى) مان هەیە ئێوە نیتانە، (العزى) بتێکی تریان بوو.

پێغەمبەرﷺ بە موسوڵمانەکانی فەرمووو: بڵێن: ئێمە خودا یارمەتیدەرو چاودێرمانە، ئێوە پشتیوانتان نیە...

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕوەوەیە:**

لەوەپێش ئادەمیزادی کردن بەدوو پێڕ، تاقمی کافرو گومرایان: کەشوێن ڕێبازی شەیتان کەوتوونو پێڕی ئەون، کۆمەڵی موسوڵمانان، کە حەقخوازو

خوداپەرستن، واتە: ئادەمیزاد دووبەشن حیزبی شەیتان‌و حیزبی ڕەحمان، ئەمجار لێرەدا یاسای جەنگ‌و جیهاد دژی کۆمەڵی شەیتان ڕون دەکاتەوە دەفەرموێ:

﴿فَإذا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ﴾ ئەی کۆمەڵێ موسوڵمانان هەر کاتێ بەرەو ڕوی کافرەکان بوونەوەو شەڕ لەنێوان ئێوەو ئەوان دابەرپابوو دەستیان لێ مەپارێزن، بەشمشێر دروێنەیان بکەن، شمشێرەکانتان ئاراستەی گەردنیان بکەن‌و لەملیان بدەن، ئەمە کاتێك دەبێ کە جگە لەشەڕ ڕێگا چارەی تر نەمابن، هەموو بوارەکانی تر بەتاقی کرابنەوە، دوژمن واز لەدەستدرێژیکردنی خۆی نەهێنێ‌و ڕێگا بۆ بڵاوبوونەوەی ئایین ئاچوغ نەبێ، ئیتر ئەوکاتە پێویستە بەگوێرەی بارو دۆخ‌و ئیمکانات‌و تەبیعەتی جەنگەکە چەك بەکار بێنین‌و بەزمییمان بە بەدوژمن دانەیەتەوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ البقرة/١٩٣.

ئەمە حوکمی ئیسلامە لەکاتی جەنگ دا، بەڵام هەرکاتێ شەڕ کۆتایی هات‌و ئاگرەکەی دامرکایەوە، هێزو توانای دوژمن تێك شکا حوکمەکە بەم جۆرەیە دەفەرموێ:

﴿حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾ واتە لەدوژمن بدەن‌و هێزوتوانای خۆتان بخەنە گەڕ بۆ تێك شکاندنی جاکە شەڕ کۆتایی هات‌و زۆرتان لێ کوشتن‌و بەسەر دوژمن دا زاڵ بوون‌و شەق‌و شڕ کرا، لەپەل وپۆ خرا، بەدیلی کەوتنە ژێر دەستتان، ئەوکاتە دیلەکانیان بەتوندی کۆت‌و بەند بکەن‌و ڕێگای قوتاربوونیان لێ بگرن، نەهێڵن ڕزگاریان بێ، ئەمجار ئێوە موخەیەرن لەنێوان ئەوەدا بەمنەت‌و پیاوەتی بەرەڵڵایان بکەن، یان بەفیدیەو ماڵ لێ وەرگرتن یان بە گۆڕینەوەی دیل بەدیل مەرەخەسیان بکەن!

بـەم جـۆرە هـەڵسو کـەوت لەگـەڵ دوژمـن بکـەن بـۆ ئـەوەی دیـاردەی شـەڕ ئاسەواری نەمێنێو ئاشتی بەرقەرار بێ، ڕێگا لەبەردەم بانگەوازی ئیسلامی دا ڕەها ببێ، کـەس نـەتوانێ ببێتـە لەمپـەڕو کۆسپو تەگـەرە بخاتـە بـەردەم بـانگخوازانی ئیسلام، خـەڵکی بتـوانێ بـیروڕای خۆیـان بگۆڕنـەوە، بانگـەوازی ئیسلامی لـەڕێگای دانو سـانو دڵنیـا بـونو قەناعـەتکردن بـڵاو بێتـەوە، بـە ئاراستـە کردنـی بەڵگـەو بڕینی بیانوو ئامۆژگاری کردن بۆ ئەوەی تاكو کۆمەڵ ڕوو لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکەن.

پێویـستە ئامـاژە بـۆ ئـەوە بکـرێ: کـە بڵاوبوونـەوەی ئـایین بـەهۆی چـەكو تۆقاندنەوە نیـە، بـەزۆرە ملـێو زەخـتو ملهوڕی کـەس موسـوڵمان نـاکرێ، بـەڵکوو چـەكو هێـز بـۆ ڕامـاڵینی کۆسـپو تەگـەرەکانی بـەردەم بانگـەوازی یەکـە بـەکار دەهێنـرێ، دوژمنو نەیارەکانی پێ سەرکوت دەکـرێ، ئـەگینا ئـایینو بـیرو بـاوەڕ لـە دڵ دایەو دەبێ بەقەناعەتەوەوە وەربگیرێ. ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ البقرة/٢٥٦.

ئایەتەکە بەئاشکرا ئەوە بەپێویست دادەنێ کەلەکاتی جەنگان لەگـەڵ کـافرو دوژمنـانی ئـایین دا موسـوڵمانان ئەوپـەڕی هێـزو توانـای خۆیـان بـەکار بێـنن بـۆ کوشـتنی دوژمـنو تێـك شـکاندنی دارو دەسـتەیانو لەپـەلو پۆخـستنی هێـزو تواناکانیان،جـا: کـە ئـەو مەبەسـتەیان بـەدی هـاتو دوژمنیـان تێـك شـکاند ئـەو سـادەربارەی دیلـەکانی دوژمـن موخەیـەرن لـەنێوان بـەرەڵڵاکردنیان بـەپیاوەتیو منـەت کـردن بەسـەریان دا، یـان بەگۆڕینـەوەی دیـل بـەدیلو پـارەوەرگرتن لێیـان، وادیارە ئەم ئایەتە دوای غەزای بەدر نـازڵ بـووە، ئـەوەبوو پـەروەردگار سەرزەنـشتی موسوڵمانەکانی کرد لەسەر ئەوە: کە دیلیان زۆر گرد کردبوەوە بۆ ئەوەی فیدیەیان لێ بستێنن!

ئـەمجار پـەروەردگار حیکمـەتی جـەنگان لەگـەڵ کافرانـدا ڕون دەکاتـەوە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾ ئـەوە بڕیاری خودایە دەربارەی جیهاد دژی کافران، پەروەردگار بۆ خۆی دەتوانێ کۆمـەڵێ

کوفر لەناو بەرێ و تۆڵەی سەرپێچی و ستەمکارییان لێ بستێنێ، جۆرەها عەزابی کۆکوژی وەکوو تۆفان و بەردەباران و بومەلەرزەو گرانی و دەنگی گەورەی زەندەقبەر یان توش بکا، بەبێ ئەوەی ئەرك بخاتە سەر خاوەن باوەڕان...

وەلێ خودا فەرمانی بەئێوەی موسوڵمان کردوە کە دژیان بجەنگن و شەڕیان لەگەڵ بکەن، بۆئەوەی دەربکەوێ کێ فەرمانبەرداری فەرمانی خودایە، کێ ئامادەیە لەپێناو ئایینی خودا داگیان و ماڵی خۆی بەخت بکا، پاك و پیس لێك جیا بکرێتەوە، پاداش و ئەوابی باش بۆ خودا پەرستەکان و عەزابی سەخت و دژوار لەسەر دەستی موسوڵمانان بۆ سەرپێچیکاران دەستەبەر بێ، یان ترس و خۆف لەشەڕو کوشتار هەڵیان بێ بۆ ئیمان هێنان و موسوڵمان ببن پێش ئەوەی خودا بەعەزابی کۆکوژ لەناویان بەرێ، کەوابوو حیکمەت لەجیهادو جەنگان دژی کوفرو سەرپێچیکاران تاقیکردنەوەی ئادەمیزادەکانە، بۆ ئەوەیە دەربکەوێ ناچەند ئامادەن ئەزیەت و نارەحەتی بچێژن.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللّهُ الَّذِينَ جَاهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ﴾ آل عمران/١٤٢.

ئەمجار باسی پاداشتی موجاهیدو شەهیدانی رێبازی خودا پەرستی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەوانە لەپێناو ئایینی خودا دا شەهید دەکرێن پەروەردگار ئەرك و ماندو بون و خۆبەختکردنیان بەفیرۆ نادا، کردەوەکانیان پوچ و بەتاڵ ناکاتەوە، وەکوو هی کافرەکان بەتاڵ دەکاتەوە...!

ئیمام ئەحمەد لەموسنەدی خۆیدا فەرمودەیەکی دەربارەی شەهید ریوایەت کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (يعطي الشهيد ست خصال عند أول قطرة من دمه، تكفر عنه كل خطيئة، ويرى مقعده من الجنة، ويزوج من الحور العين، ويأمن من الفزع الأكبر ومن عذاب القبر، ويحلى حلة الايمان) واتە: لەگەڵ رژانی یەکەم دڵۆپە خوێنی شەهید شەش بەهرەی دەدرێتێ، چاو پۆشی

لەتاوانەکانی دەکرێ، شوێن خۆی لەبەهەشت دا دەبینێ، حۆری لێ مارە دەکرێن، توشی نارەحەتی عەزابی ناو گۆڕو ترسی ڕاچڵەکانی کاتی زیندوبوونـەوەو ناخۆشی سارای مەحشەر نابێ، خشڵی ئیمانی لەبەر دەکرێ".

لەصـەحیحی موسـلیم دا فەرمودەیـەك لەعەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەرو ئـەبو قـەتادە ڕیوایـەتکراوە دەفـەرموێ: ( یغفـر للشهید کل شـيء الا الـدین ) لـە هـەموو تاوانو کەمو کوڕیەکی شەهید چاوپۆشی دەکرێ جگە لەقـەرز، ئەگـەر قـەرزدار بـێ لەسەر قەرز دارییەکەی موحاسەبە دەکرێ.

﴿سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ، وَيُدْخِلُهُمْ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ﴾ شـەهیدان کـە لـەپێناو ئاینی خودا دا خۆیان بـەخت کـردوە، خـودا پاشگوێیان ناخـا، بـەڵکوو دوای شـەهید بوونیان خودا سەرپەرشتیان دەکا، گیانەکانیان پاڵفتە دەکا صەفاو ڕەونـەقی زیـاتر یان پێ دەبەخشێ، بۆ ئەوەی لەگەڵ صەفای عالەمی باڵادا پەیوەست تربـێ، چـونکە شـەهیدان بـە گـوێرەی دەقـی ئایەتـەکانی قورئـان نـەمرن، بەدیمـەن لەبەرچـاوی ئادەمیزادانی سەر زەوی دیار نامێنن، ئەگینا زینـدونو خـودا ژیـانی تایبـەتییان بـۆ دەستەبەردەکا، هیدایەتو صەفاو گەشەکردنی گیانییان پێ دەبەخشێ.

لەژیانی دونیایان دا هیدایەتیان دەدا بـۆ کـردەوەی چاكو پەسـند، شـارەزایان دەکا بۆ پەیڕەو کردنی ڕێبازی بەهەشت، لەدونیاو قیامەت دا کاروباریان باش دەکا، کردەوەکانیـان بـۆ پارێزگاری دەکـا، دەیانخاتـە بەهەشـتی بـەرفراوانو ڕازاوەوە، کـە پێناسـەی بـۆ کـردونو پێـی ناسـاندون، تەنانـەت بەهەشـتییەکان کـە دەچـنە نـاو بەهەشـتەو زۆر بـە ڕێـكو پێکی بـەبێ چاو ساغو دەلیـل شـارەزای خـانوو شـوێنی خۆیانو هیچیان سەریان لێ تێك ناچێ!!

لەفـــەرمودەی صـــەحیح دا: کـــە بوخـــاری ڕیوایـــەتی کـــردوە هـــاتووە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی (والذي نفسي بيده ان أحدهم بمنزله في الجنة أهدى منه بمنزله الذي كان في الدنيا) موجاهید: کە یەکێکە لەموفەسـسرینی سـەلەف لـەمانای ئەم ئایەتەدا دەفـەرموێ: ئـەهلی بەهەشت شارەزای مـاڵو شـوێنی خۆیـانو خـودا

چۆنی بۆ داناون و بۆی بەشکردون ئاوا هەرکەسە یەکسەر شارەزایەو ڕێگای لێ هەڵەنابێ، هەر دەڵێی لەوەتای دروستکراون لەوێ دانیشتەجێ بوون!!

بەندەکانی خودا لەبەهەشت دا بەگوێرەی کردەوەکانیان پلەو پایەو شوێن و مەقامیان بەرزو نزمی هەیە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُواْ﴾ الأنعام/١٣٢.

ئەمجار لەڕوانگەی ئازو نیعمەتی ئەبڕاوەی بەهەشتەوە لەئەنجامی ئەو هەموو ڕێزو نرخەی خودا بۆ شەهیدانی دەستەبەر کردوە، موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ ئەوەی خۆیان بۆ خودا ساغ بکەنەوەو لێ ببڕێن بۆ یارمەتیدانی ئایینی خوداو هەموو هێزو توانایەکیان بخەنە گەڕ بۆ بڵاوبوونەوەو سەرخستنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان بەتاک و تەنهایی خودا هێناوە، دڵنیان لەوەی موحەممەدﷺ ڕەوانە کراوی خودایەو قورئانی بەسروش بۆ هاتووە، ئەگەر ئێوە یارمەتی ئایینی خودا بدەن، هەوڵ و تەقەڵلای خۆتان بخەنە کار بۆ بڵاوبونەوەو گەیاندنی ئایینی خودا بە ئادەمیزادانی تر، ئەوە دڵنیابن خودا یارمەتیتان دەداو بەسەر دوژمنانتان دا زاڵتان دەکاو لەبەرامبەر دوژمنان دا دڵ دامەزراوو قاچ چەسپاوتان دەکا، ورەو هێزو توانا دەخاتە دڵتانەوەو ترس و لەرز لەدڵی دوژمنانتان دا دەخولقێنێ و سەرەنجام سەرکەوتوتان دەکا .

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْساً لَهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوان بەپەیامی ئیسلام، ڕیسوایی بۆیان و بەدبەخت و چارەڕەش خۆیان، خودا کردەوەکانیانی پوچ کردونەوە، هیچ پاداشیان بۆ نەنووسراوە، هیچ خێرو بێرێکیان بۆ پاشەکەوت نەکراوە.

﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەو ڕیسوایی‌و گومڕابوون‌و مایە پوچییەیان بەهۆی ئەوەومیە دژی ئەو پەیامەن خودا ناردویەتی بۆ پێغەمبەری خۆی، ئیمانیان بە قورئان نیەو ئامادەنین ئەرك‌و واجیباتی سەرشانیان جێ بەجێ بکەن‌ئیتر خودا لەتۆڵەی ئەو هەڵوێست‌و ئاکارمیان دا کردەوە باشەکانیانی پوچ کردنەوەو هیچ خێرو پاداشی بۆ نەنووسیون! چونکە کرداری چاك کاتێك کەڵکی هەیەو پاداشی لەسەر وەردەگیرێتەوە: کە لەبیرو باوەڕی ڕاستەقینەوە هەڵبستێ.

**تێبینی:-**

ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەرونی ئەوە دەگەیەنن: کەلەکاتی شەڕو بەرامبەری‌و تێکرژان لەگەڵ دوژمن دا، دەبێ بەوپەڕی هێزوتواناوە لەدوژمن بدرێ‌و دەستی لێ نەپارێزرێ، چونکە ئەوە شەڕەو سروشتی شەڕ داخوازی کوشتن‌و بڕین‌و توندو تیژییە، بۆ ئەوەی پۆزی دوژمن بشکێ‌و لەپەل‌و پۆ بکەوێ، هەرکەسێ دژی ئیسلام بوەستێ‌و هەڵوێستی شەڕانی بنوێنێ دژی پەیڕەوانی ڕێبازی خودا پەرستی، ئەوە هەڵوێستی ئیسلامە بەرامبەری!!

ئەم ئایەتەی ئێرە لەگەڵ ئایەتی سورەتی (ئەنفال) کە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ﴾ الأنفال/٦٧. هیچ دژایەتیکیان لەناودا نیە وەلێ ئایەتی سورەتی ئەنفال باسی ئەوەی نەکردوە دوای تێکشکانی دوژمن چ هەڵوێستێك بەرامبەر دیلی کافرەکان دەنوێنرێ، ئایەتەکەی ئێرە سەرەنجامی دیلەکانیانی دیاری کردوە، فەرمانڕەوای موسوڵمانانی سەرپشك کردوە لەنێوان ئەوەدا بەپیاوەتی‌و منەتکردن بەسەریان دا مەرەخەس بکرێن، یان بەپارەیان بەگۆڕینەوەی دیل بەدیل بەرەڵلا بکرێن .

کوشتنی دیل لەبەر زەرورەت‌و بەرژەوەندی شەڕەکەو لەحاڵ‌و وەزعی تایبەتی دا، هەروەها بەکۆیلە کردنیان لەفەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ ئاماژەی پێ کراوە. کەواتە: بەگوێرەی قورئان‌و حەدیسی پێغەمبەر دوای وەستانی جەنگ

فرمـانڕەوای موسـوڵمانان سەرپـشکەلەنێوان چـوار شـتدا (کوشـتن، بەکۆیلـە کـردن، منەتو پیاوەتی کردن لەگەڵیان، فیدیە لێ وەر گرتنو گۆڕینەوەی دیل بەدیل).

بوخـاری لەئـەبو هـورەیرەوە فەرموودەیـەك ڕیوایـەت دەکـا دەفـەرموێ: پێغەمبـەرﷺ مەفرەزەیـەکی نـارد بـۆ لای نەجـد کـە گەڕانـەوە پیاوێکیـان لەبـەنی حەنیفـە گرتبـوو، پێیـان دەگـوت: (ثمامـة بـن أثـال) ئـیتر بەکۆڵەکەیـەکی مزگـەوت بەستیانەوە، پێغەمبەرﷺچوو بۆ لایو پێی فەرمووو: ئـەوە چیتـە ئـەی ئـەمامـە؟ وتی: خێرو خۆشیم لایە، ئەگەر بمکوژی ئەوە خاوەن خوێ دەکوژی، ئەگـەر منـەتم بەسـەردا بکـەی ڕزگـارم بـێ ئـەو سوپاسگوزارم، ئەگـەر مـاڵو سامانیـشتم داوا لـێ دەکەی چەند دەفەرمووی بەسەرچاو ..

بۆ ڕۆژی دوای پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی سەمامە چیـەو چ دەڵێی؟ وتی: قوربـان! هـەر ئـەوەم لایـە: کـە دوێـنێ عـەرزم کـردی، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: دە(ثمامە) بەرەڵڵا بکەن .

ئەمجار سەمامە چووە پەنادار خورمایەکی نزیـك مزگـەوتو غوسـڵی لـەخۆی دەرکردو هاتەوە ناو مزگەوت ووتی: (أشـهد أن لا الـه الا الله و أشهد أن محمـد رسـول الله) سـوێندم بـەخودا لەسـەر ڕوی زەوی کەسـێکی تـر نـەبوو لـەتۆم ناخۆشـتر بـوێ، ڕوخسارت لەلام ڕەزاگرانـترین ڕوخسار بوو، بەڵام ئـەمڕۆ تـۆ خۆشەویـسترین کەسـی لەلام...

سوێنـدم بەخودا هیچ ئاینێکم بەئەندازەی ئـایینی تـۆ نـەدەدزرا، بـەڵام ئێـستا خۆشەویسترین ئایین لـەلام ئـاینی تۆیـە، بـەخودا ناخۆشـترین وڵات لـەلام وڵاتـی تـۆ بوو، ئێستا لەهەموو شوێنێکم زیاتر خۆش دەوێ، من بـە تـەمای عـومرە هـاتبووم و لەڕێگا مەفرەزەیەکت یەخسیریان کـردم، ئێـستا تەشـریفت چـی دەفـەرمووی و چـی بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێ کرد: کە بچێ عەمرەکـەی تـەواو بکـا، کـە هاتـەوە مەککە یەکێك پێی گوت ئەوە چیە تێك چوی؟ وتی: نەخەیر ئیمانم بەموحەممـەد هێناوە...

ئـەم ڕوداوە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە: کـە مەرەخەسـکردنی دیـل بـەپیاوەتی دروستە..عیمرانی کوڕی حوسەین دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەرﷺپیاوێکیـان لـەهۆزی عەقیل بەدیل گرتو دەستو قاچیان بەستن، لەهەمان کات دا هۆزی ئـەقیـف دوو هاوەڵێ پێغەمبەریان بەدیل گرتبو، پێغەمبەرﷺ ئاڵ وگۆڕی پـێ کـرد، ئـەوان دوو هاوەڵە کەیان بەرەڵلا کرد، ئەمیش کابرای مەرەخەس کرد.

دەربـارەی کوشـتنی دیـل ئـەبو بـەکری (الجـصاص) دەڵـێ: زانایـانی ئیـسلام کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە: کە دروستە دیل بکوژرێ، لـەوە داکـەس نیـە بڵـێ وانیـە، هــەواڵی (متــواتر)و صــەحیح لەپێغەمبــەرەوە ڕیوایــەت کـراون: کـە پێغەمبــەر ﷺلەهەنـدێ حاڵـەتی تایبـەتی دا فـەرمانی کـردوە بەکوشـتنی دیـل ئـەوەتا ڕۆژی غەزای بەدر فەرمانی کرد بەکوشتنی هەردو دیل عوقبـەی کـوڕی ئـەبو موعـەیطو (النضر) ی کوڕی (الحارث) . . .

ڕۆژی غـەزای ئوحـودیش فـەرمانی دا بەکوشـتنی (ئـەبو عـزە)ی شـاعیر کـە بـەدیل گیرابـوو، بـەنوقورەیزە لەسـەر بڕیـاری سـەعدی کـوڕی مـەعاز لەقـەڵاو سەنگەرەکانیان هاتنە دەرەوە کە خۆیان بەدەستەوەدا سەعد بڕیـاری کوشـتنی دانو منـداڵو زارۆکەکانیـشیان بوونـە(سـەبایا) لەهـەموو هـۆزی بـەنو قـورەیزە تـەنها بەپیاوەتیو مەنەت زوبەیری کوڕی باطای لێ بەرەڵلا کردن .

قـەڵای خەیبـەر هەنـدێکی بـەزۆرو هەنـدێکی بەصـوڵحو ڕێککـەوتن کەوتـە دەسـت پێغەمبـەرو هـاوەڵانی، پێغەمبـەرﷺ داوای لـەکوڕی ئەبولحـەقیق کـرد: کـە هیـچی لـێ نەشـارێتەوەو هەرچـی لایـە بیڵـێ، دوایـی دەرکـەوت خیانـەتی کـردەوەو ڕاستی نەگوتووە، ئیتر فەرمانی کرد بەکوشتنی، کە فەتحی مەککەشی کرد فەرمانی دا بەکوشتنی هیلالی کوڕی خـەتالو میقیەسـی کـوڕی صوباتەو عەبـدوڵلای کـوڕی سـەعدی کـوڕی ئـەبو سـەرحو کۆمـەڵێکی تـر پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی بیـانکوژن! تەنانــەت ئەگــەر خۆیــان بەپــەردەی کەعبــەوە هەڵبواســن، لەهــەمان کــات دا لەدانیشتوانی مەککە خۆش بوو، ماڵو سامانیشی نەکردنە دەستکەوتو غەنیمـەت،

بەلگەش لەسەرئەوە: کە دروستە دیل بکرێ بەکۆیلەو مامەڵەی هاو چەشن لەگەڵ دوژمن دابکرێ، ئەوەیە: کە پێغەمبەر ﷺ دیلی هەندێ لەهۆزەکانی عەرەبی وەکوو خێڵی هەوازین‌و بەنولوستەلەق‌و هەندێ خێڵی تری عەرەبی کردنە کۆیلە، ئەبو بەکرو عومەر تیرەی بەنوناجیەی قوریشیان کردنە سەبایا، هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ کەفەتحی وڵاتی فارس‌و ڕۆمیان کرد هەندێ لە دانیشتوانی ئەو وڵاتانەیان کردنە سەبایا. ئەوانەی ئایەتی ﴿حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ﴾ میان کردۆتە بەلگە لەسەر ئەوە: کە دروستە ئەسیر بکوژرێ قسەکەیان وێ چوونیە، چونکە ئایەتەکە بۆ حاڵەتی پێش بەدیل گرتنەو بۆئەو کاتەیە دوژمن بەگوڕوتینەو زەبروەشێنە، بەڵام دوای تێکشکان‌و لەپەل‌و پۆخستنی دوژمن جەنگاوەرەکانیان دەبنە دیل‌و حوکمی ئەو کاتە جودا وازە لەحوکمی حاڵەتی پێش بەدیل گرتن. ئیبنو عەبباس دەربارەی ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ﴾ دەفەرموێ: ئەو حوکمە بۆ ڕۆژی غەزای بەدر بوو، ئەو سەردەمە موسوڵمانان کەم‌و بێ هێزو توانابوون، کەپەرەیان سەندو زۆر بوون‌و هێزو دەسەڵاتیان پەیدا کرد پەروەردگار ئایەتی:

﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾ ی نازڵ کردو پێغەمبەرو موسوڵمانانی دەربارەی دیلەکان سەرپشك کرد لەوەدا کە دەتوانن بیانکوژن دەتوانن بیانکەنە کۆیلە، دەتوانن بەفیدیەو دیل گۆڕینەوە مەرەخەسیان بکەن، بەکورتی فرمانڕەوای موسوڵمانان چی بەمەسلەحەت بزانێ ئەوە پەیڕەوی دەکا.[1]

(١) هەرکەسێ دەیەوێ لەم بوارەدا قوڵ بێتەوەو ڕاڤەو بۆچوونی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەم ئایەتانە بزانێ با بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (احکام القرآن) للجصاص ج٣/٣٩٠،٣٩١ ، و نیل الأوطار ج٨/٢ .. و تفسیر القرطبي ج١٦/٢٢٨ .

## تێفکرین لە ئاسەواری گەل‌و نەتەوەکانی پێشوو بیرکردنەوە لەسەرەنجامی حاڵ‌و وەزعی خوداپەرستان‌و بێ بڕوایان

﴿ ۞ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ۖ وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا ﴿١٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿١١﴾ إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَاهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِ كَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُم ﴿١٤﴾ ﴾

لەوەپێش سەرەنجامی بێ بڕوایان‌و خوداپەرستانی ڕون کردەوە، ناڕەزامەندی خۆی لەکافرەکان‌و ڕەزامەندی لەهەڵوێست‌و ئاکاری موسوڵمانان ڕاگەیاند، ئەمجار ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ ئەوەی لەپاشماوەو ئاسەواری گەل‌و نەتەوەکانی پێشوو ورد ببنەوە، بیر لەحاڵ‌و وەزعی موسوڵمانان‌و کافران بکەنەوە، بۆ ئەوەی پەندو عیبرەتی لێ وەر بگرن، هەست بەوە بکەن: کەخودا یارمەتی موسوڵمانان دەداو کافرەکان ڕیسوا دەکا، نازو نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشت دەدابەخاوەن باوەڕان‌و

سەرفرازیان دەکا، چونکە شوێن ڕێبازی حەق کەوتون‌و حەقیان بڵاوکردۆتەوە، کافرەکان سزادەداو بەئاگر دەیانسوتێنێ چونکە شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتون‌و بتپەرستییان کردوە..

دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا ؟﴾ ئایا ئەو موشریکانە، ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن‌و پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، بەسەر زەوی دا هاتوو چۆیان نەکردوە؟ بەسەر شوێن‌و شوێنەواری گەلی عادو سەمودو قەومی لوت‌و هی تریش دا گەشت‌و گوزاریان نەکردوە؟ بۆ ئەوەی پەندو عیبرەت لەسەرەنجامی ئەو سەرپێچیکارانە وەربگرن، خۆتا ئێستاش شوێنەواری عەزابی قەلاچۆکردن‌و لەناو بردنیان ئاشکرایەو بەچاو دەبیندرێ.

بێگومان خودا خانووبەرەو گردو گێوەکانیانی بەسەردا ڕوخاندن، بەماڵ‌و منداڵ‌و کەس‌و کاریانەوە فەوتاندنی‌و خوداپەرستانی ڕزگار کردن‌و ئەو عەزاب‌و قەلا چۆکردنە نەیگرتنەوە، بۆ هەموو ئەو کافرانەو کافرەکانی تریش نموونەو وێنەی پێش خۆیان هەیە، هەرکەسێ کافرو بێ بڕواو سەر ڕەق بێ بابزانێ خودا ڕۆژێك لەڕۆژان توشی عەزابی سەختی خۆی دەکا، ئەوەتا کافرەکانی قوڕەیش بەکوشتن‌و بەدیل گرتن لەغەزای بەدر دا عیقابی سەختیان خواردو لەڕۆژی ڕزگار کردنی مەککە دا شکستی‌و سەر شۆڕییان بەسەر هات، سزای سەخت‌و دژواری دۆزەخیشیان سەربار بۆ هەتا هەتای تێیدا دەمێننەوە.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ﴾ ئەو لەناوبردن‌و وێرانکارییە توشی کافرەکان‌و وڵاتیان هات لەکۆن‌و نوێ دا هەروا ڕزگار بوونی خودا پەرستان لەو عەزابە کۆکوژییە، بەهۆی ئەوەوەیە: کە خودا یارمەتی موسوڵمانان دەدا، لەناخۆشی‌و مەینەتیدا فریایان دەکەوێ‌و هەمیشە چاودێرو

سەرپەشتیکاریانە، کافرو بێ بڕوایان بێ پشتو پەنانو کەس نیە عەزابیان لێ وەگیرێ، بۆیە عەزابی سەخت توشیان هاتو لێ ی قوتار نەبوون!

ئەمجار دوابەدوای ڕونکردنەوەی حاڵو وەزعی موسوڵمانو کافر لەدونیادا دێتە سەر باسی حاڵێ موسوڵمانان لەقیامەت داو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ بێگومان پەروەردگار لەڕۆژی قیامەت دا فەزلو بەخششی خۆی بەسەر خواپەرستان دا دەڕێژێو دەیانخاتە ناو ڕەحمەتو نیعمەتی خۆیەوە، ئیماندارانی کردار چاك دەخاتە ناو باخو باخاتی بەهەشتی بەرینەوە؛ کە بەژێر دارو درەختەکانیان دا جۆگاو جۆباری ئاو دەکشێنو ئەوەندەی تر دیمەنی باخەکان دەڕازێننەوە..!

ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: زۆر جار کە وەصفی بەهەشت دەکا، هەر باسی جۆگاوو ئاوی دەکا: چونکە ئاو هۆی ڕسکانو هەبوونی دارو درەختە، دارو درەختیش هۆی میوەهاتو بەرو بومن، ئاویش خۆی هۆی ژیانەو هەموو شتێك لەئاو پەیدابوە!! [1].

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَهُمْ﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوانو ئینکاری هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی زاتی پاکی دەکەنو پێغەمبەرەکەی بەدرۆ دەخەنەوە، ئاژەڵ ئاسا دەلەوەڕێنو هیچ غەمو هیوایەتێکیان نیە جگە لەپڕکردنی گەدەیانو دابین کردنی هەوەسو ئارەزو ئاژەڵیەکانیان، بیر لەقیامەت ناکەنەوەو بێ ئاگان لەسەرەنجامی ژیانیان، هەمیشە هەڵپەیانە بۆ ورگیانو کۆکردنەوەی ماڵو سامان لەڕێگەی ناڕەواوە، هەر لەمەعنای ئەم ئایەتەدا فەرمووده یەکی صەحیحو چەسپاو لای ئیمام ئەحمەدو هەردوو پیری فەرمودە: (موسلیمو بوخاری)و تیرمیزیو ئیبنو ماجە هەیە لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: (المؤمن يأكل في معى واحد والكافر يأكل في سبعة أمعاء)

---

(١) تفسیری رازی حسن/٥١

موسوڵمان بەقنیاتەو بەکەمێ خواردن دادەگەوێ کافر قەناعەتی نیەو هەمیشە هەڵپەیەتیو بەهیچ شتێك قەناعەت ناكا، ئەوانە: کە ئەوە رەوشتو ئاکاریانە، بیرو باوەڕیان کوفرو ئیلحادە ئاگری دۆزەخ خانوی هەتا هەتاییانەو تێیدا جێگیر دەبن:
(خودا بەرەحمەتی خۆی لەو ئاگرە بمانپارێزێ) .

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توند لەکافرەکانی مەککە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِنْ قَرْيَتِكَ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَاهُمْ فَلا نَاصِرَ لَهُمْ﴾ زۆر لەدانیشتوانی شارو شارۆچکەو گوندی گەلو نەتەوەکانی پێشومان لەناو بردون: کەزۆر لەو مەککەییانە بەهێزو تواناتر بوون کە تۆیان لەشاری مەککەو نیشتمانی خۆت دەر کردوە، قەلاَ چۆمان کردنو کەس نەبوو داکۆکییان لێ بکا، کەس نەیتوانی عەزابو سزای خودایان لێ بگێڕێتەوە..

دەبوایە ئەو قوڕەیشیانە کە زۆر بێ دەسەلاَتترین لەو گەلانەی لەناومان بردون بیریان لەسەرەنجامی خۆیان بکردایەتەوە، پەندو عیبرەتیان لەو گەلو نەتەوە پێشینانە وەربگرتایە!

چونکە لەکاتێکدا خودا ئەو هەموو گەلو نەتەوە خاوەن دەستو بازوانە بەهیلاك بەرێ لەسەر سەرپێچیو ستەمکاری، ئەوە دوورنیە هەمان دابو نەریتی خۆی لەگەڵ کافرەکانی قورەیش دا ئەنجام بدا، خۆ ئەگەر خودا عەزابی کۆکوژی لەبەرخاتری پێغەمبەر بۆ بڕیار نەداونو لەسایەی پێغەمبەرەوە بەسزای کۆکوژ لەناویان نابا، باچاك بزانن: کە عەزابی سەختی دۆزەخ لەقیامەت دا یەخەیان دەگرێو بەهیچ کلۆجێ، لێی قوتار نابن!

ئەمجار پەروەردگار هۆی جوداوازی سزاو پاداشتی هەردووتاقم (موسوڵمانانو کافر) ڕوندەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّهِ كَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ﴾ ئایا کەسێك لەسەر ئایینو ڕێبازی ڕاستو دروست بێ،

بەگوێرەی سروشت‌و فیترەتی لەسەر خۆڵکاوی خۆی یەکتا پەرست‌و دینداربێ، وەکوو کەسێ: وایە شوێن هەواو ئارەزوکەوتبێ‌و ڕێبازی شەیتان پەسەندی پەیرەو کردبێ‌و کردەوەی خراپی خۆی لاپەسند بێ؟!!

هەڵبەتە ئەو دوو تاقمە چۆن یەك نین، یەکتاپەرست‌و خوداناس ناکرێنە تای تەرازوی بتپەرست‌و گومڕاو تاوانباران، چۆن کەسێك بەدڵنیای‌و بەڵگەو دەلیلەوە ئیمانی بەتاك‌و تەنهایی خودا هەبێ، کردارو ئاکاری چاك‌و پەسند بێ وەکوو کەسێ وایە هاوەڵ بۆ خودا دابنێ‌و شوێن ڕێبازی شەیتان کەوتبێ‌و غەرقی زلکاوی گومڕای بووبێ؟! واتە ئەو دووتاقمە وەکوو یەك نین.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى﴾ الرعد/ ١٩. یان دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ الحشر/ ٢٠.

بەکورتی بەگوێرەی عەقڵ‌و واقیع لەدونیاداو بەپێی عەداڵەتکاری موتلەقی خودا لەڕۆژی قیامەت دا کۆمەڵی موسوڵمان‌و خودا پەرست وەکوو کۆمەڵی کافرو بتپەرستەکان نین‌و بەیەك چاو سەیر یان ناکرێن.

## وەصفی بەهەشت‌و باسی دۆزەخ

﴿ مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن

رَبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾

لەوەپێش جوداوازی نێوان خودا پەرستانو کافرەکانی کرد، جوداوازی نێوانیانی ڕون کردەوە، ئەمجار گونجاو بوو: کەباسی پاداشی موسوڵمانان بکا: کەبەهەشتی ڕازاوەو پانو بەرینە، سزای کافرو بتپەرستانیش ڕون بکاتەوە کە عەزابی دۆزەخو نارەزامەندی خودایە لێیان.

دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى﴾ وەصفو پەسنی ئەو بەهەشتەی خودا وادەی وا داوە بیکاتە خەڵاتی خودا پەرستان، ئەومیە بۆ تان باس دەکەین، ئەو بەهەشتە چەندە جۆگاو جۆباری ئاوی صافو ڕون ڕەوانو نەگۆڕاوی تێدایە، ئاوی شیرینو گواراو فوارە بەستو بەژێر درەختەکانی دا ڕەوان دەبێ، تابڵێی پاکو جوانو ڕونو ڕەوانە، بەڵخو خەوشو خڵتەو بۆگەنی نیە کەسێك جارێك لێی بخواتەوە هەرگیز تینوی نابێ، لەوە دوا چی ئاو بخواتەوە بۆ زێدە لەززەتو خۆشییە، نەك بۆ لابردنی تینوایەتییە .

لەناو نیعمەتەکانی بەهەشت دا یەکەمجار باسی ئاوی کرد، چونکە ئاو لەهەموو شلەمەنییەکانی تر بەسوود ترە بۆ ئادەمیزاد.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: (جۆگاکانی بەهەشت لەکێوی میسك هەڵدەقوڵێن) هەروەها لەبەهەشت دا جۆگای شیر هەیە، شیری صافو بەتام، نەبزرکاوو نەگۆڕاو، تابڵێ سپیو شیرینو چەورە، بۆیەش دووەمجار باسی شیری کرد، چونکە بۆ هەموو کەس بەسودە بژێوێکی تام خۆشیو حەزلێکراوە، هەروەها چەند جۆگەو جۆباری تێدایە لەمەی تام خۆشو گواراو

بۆنخۆش‌و ڕەنگ ئاڵ‌و واڵا، وەکوو شەرابی دونیا تاڵ‌و بۆن ناخۆش نیە، خەڵکی مەست‌و کەلەلا ناکا، سەر ئێشەو ڕشانەوەی لێ پەیدا نابێ.

وەکو لەئایەتێکی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾ الصافات/٤٧ هەروەها دەفەرموێ: ﴿بَيْضَاء لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ﴾ الصافات/٤٦ یان دەفەرموێ ﴿لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾ الواقعة/١٩.

لەپلەی سێیەمدا باسی شەرابی هێنا چونکە وەکوو ئاوو خواردن پێویستی سەرەکی نیە بۆ ژیان، بەڵکوو بۆ زێدە لەززەت‌و ڕابواردن دەیخۆنەوە!! هەروەها لە بەهەشت دا جۆگای هەنگوینی صاف‌و بێ غەل‌و غەش هەن، کەرەشان‌و مێوو خڵتەو پڵتەی تێکەڵ نەبوە، ڕەنگی جوان‌و تام وبۆنی تابڵێ ی خۆشە، بەهەشتی یەکان بەحەزو ئارەزۆوە لێ ی دەخۆنەوە، فەرەحبەخش‌و خێر ئاوەرە، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مانای ﴿مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى﴾ واتە: لەسکی مێشە هەنگ نەهاتۆتە دەرەوە.

بێگومان خواردەمەنی شیرین خۆراکێکی بەتام‌و لەززەتە لەناو شیرنیش دا هەنگوین لەهەموویان بە لەززەت ترە، لەژیانی دونیاش دا هەنگوین سوودو قازانجی زۆری هەیە بۆجەستەو شیفای دەردانە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ﴾ النحل/٦٩.

ئێستاش لە دروستکردنی زۆر لەدەرمانەکان دا ماددەی هەنگوین بەکار دێنن، کەم دەرمان هەیە لەپێکهاتەکانی دا ماددەی هەنگوینی تێدا نەبێ.

**پەروەردگار لەم ئایەتەدا چوار شتی سەرەکی باس کردن:**

١- ئاو، چونکە بێ ئاو ژیان نابێ .

٢- شیر چونکە پێویستی جەستەیە.

٣- مەی چونکە زەوق‌و خۆشی دەخاتە جەستەوە.

٤- هەنگوین چونکە دەرمانی دەردانە .

تیرمیزی لە باوکیەوە لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: (إن في الجنة بحر الماء و بحر العسل وبحر اللبن وبحر الخمر ثم تشقق الأنهار بعده )[1] . واتە: لەبەهەشتدا دەریای ئاوو دەریای هەنگوینو دەریای شیرو دەریای مەی هەیە ئەمجار لەمانەوە جۆگا هەڵبەستراون .

﴿وَلَهُمْ فِيهَا مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ هەموو جۆرە میوەو بەروبومێك بەرەنگی جوان وتامی بەلەززەتو بۆنی خۆشەوە لەبەهەشت دا بۆ ئەوان دەستەبەر کراوە، هەرچی بیانەوێو حەزیان لێ بێ ئامادەیەو بێ ماندبوون لەبەردەستیانە وەکوو لەئایەتێکی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَاكِهَةٍ آمِنِينَ﴾الدخان/٥٥، یان دەفەرموێ: ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾ الرحمن/٥٢.

ئەمجار دوای باسکردنی نازو نیعمەتی مادی، باسی نیعمەتی مەعنەوی دەکا دەفەرمووی: ﴿وَمَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ﴾ هەروەها لێخۆشبوونو ڕەزامەندی خودایان بۆ دەستەبەر بووە، خودا لەتاوانیان خۆش بووەو ڕەزامەندی خۆی لێیان پێراگەیاندوون، ئەمەش لەهەموو نازو نیعمەتێك خۆشترو بەهرە ناوەرترە، فەوزی عەزیمەو ترۆپکی خۆشیە.

ئەمجار بەراوردیەك لەنێوان ئەو وادانەی بەخوداپەرستانی داوەو ئەو هەڕەشانەی لەکافرەکانی کردووە ئەنجام دەداو دەفەرموێ: ئایا ئەوانەی ئەوە سەرەنجامو جێگاو شوێنانە لەبەهەشتداو ئەوە نازو نیعمەتیانە بەبەردەوامی، ﴿كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاءً حَمِيماً فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ وەکو کەسێك وەهایە لەدۆزەخدا بۆ هەتا هەتایە لەئاگردا دەمێنێتەوەو ئاوی کوڵاتوی دەرخوارد دەدرێو بەخواردنەوەی ریخۆڵەکانی دەبڕدرێن؟؟

---

(١) تیرمزی لەباسی بەهەشت دا (٢٥٧١)بابی (٣٧) لەژێر عینوانی (باب ماجاء في صفة أنهار الجنة) دا ریوایەتی کردووە.

بێگومان چون یەك نین، ئاشكرایە كەسێك لەبەرزترین كۆشك و تەلاری بەهەشتدابێ وەكوو كەسێك نیە لەقوڵترین چاڵی دۆزەخدابێ! كەسێك لەناو نازو نیعمەتی بەهەشتدابێ، لەناو دارو درەخت و میوەجاتدابێ، لەسەر جۆگاو جۆبارەكانی بەهەشتدا ڕابوێرێ، وەكوو كەسێك نیە لەناو عەزابی دۆزەخدا بتلێتەوەو ئاوی كوڵاتووی دەرخوارد بدرێ!!

## ڕەوشت و ئاكاری دووڕووەكان و موسوڵمانان

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ ...﴾ دوو ڕوایەت هەن:

١- ئیبنولمونزیر لەئیبنو جورەیجەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: موسوڵمانەکان و دوو ڕووەکان لای پێغەمبەر کۆ دەبوونەوەو پێغەمبەر ﷺ فەرمایشتی دەفەرموون، موسوڵمانەکان گوێیان لێ دەبوو لێی حاڵی دەبوون، دوو ڕووەکان گوێیان لێ دەبوو لێی حاڵی نەدەبوون جا کەدەهاتنە دەرەوە لەموسوڵمانەکانیان دەپرسێ ئەرێ ئەوە موحەممەد گوتی چی؟! ئیتر ئایەتی: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ﴾ نازڵ بوو.

٢- موقاتیل ڕیوایەتی کردووەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، ڕەخنەی لەکافرەکان دەگرت، جا دوڕووەکان کە لەمزگەوت دەهاتنە دەر بەگاڵتەو قەشمەرییەوە لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودیان دەپرسی: ئەوە موحەممەد چی گوت؟! ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: منیش ئەو پرسیارەم ئاڕاستە کراوە..

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە:

لەوەوپێش حاڵ و وەزع و سەرەنجامی موسوڵمانان و کافری لەدونیاو قیامەتدا ڕوون کردەوە، ئەمجار دێتە سەر بەیانکردنی وەزع و حاڵی دووڕووەکان و بەکافریان لەقەڵەم دەدا، ئەوە ڕادەگەیەنێ، کە ئەوانە نەفامن و لەقسەی پێغەمبەر حاڵی نابن، ئەوان گوێ ناگرن بۆ تێگەیشتن، بەڵکوو گوێ دەگرن بۆ گاڵتە پێکردن و سوکایەتی پێکردن، بەپێچەوانەی خوداپەرستانەوە: کە گوێچکەی خۆیان بۆ وتەکانی پێغەمبەر کلۆر دەکەن و لێی حاڵی دەبن و پەیڕەوی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی دەکەن.

ئەمجار هەڕەشە لەدووڕووەکان دەکاو فەرمانیان پێ دەکا: کە بەخۆیاندا بچنەوەو پەندو عیبرەت وەربگرن پێش ئەوەی لەناکاو قیامەت ڕاببێ و پەشیمان بوونەوە بێ سودبێ، پاشان فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا کە بەردەوام بێ لەسەر بیرو باوەڕو گەیاندنی پەیامی خۆی و داوای لێخۆشبوون و بۆ خۆی موسوڵمانان بکا.

دەفەرمووی: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّى إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِنْدِكَ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفاً﴾ هەندێك لەو کافرانەی بڕیارماندوە بۆ هەتا هەتایە

لەدۆزەخدا بمێننەوە: کە دووڕووەکانن، گوێ لەقسەو ئامۆژگاری تۆ ڕادەگرن ئەی پێغەمبەر؛ بەڵام هیچی لێ تێ ناگەن، چونکە دڵی نادەنێ، ئیمانیان بەقسەکانی تۆ نیە، بۆ گاڵتە پێکردنو سوکایەتی پێکردن گوێی لێ ڕادەگرن، جا کە لەلای تۆ دەرۆنە دەرەوە بەهاوەڵانی زاناو تێگەیشتوو دەبێژنو بەگاڵتەپێکردنەوە پێیان دەڵێن: ئەوە لەوەوپێش موحەممەد چی گوت؟ ئێمە تێی نەگەیشتینو هیچ گرنیگمان بەقسەکانی نەدا، چمان لێ حاڵی نەبوو.

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ﴾ ئەو دوو ڕووانە ئەوانەن خودا دڵی مۆر کردوون، شتی بەسوود وەرناگرن، ئیمانیان نەهێناوەو نوری ئیسلام دڵی ڕەوشەن نەکردوونەوە، ڕویان لەخێر نەکردوەو شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون، بەکورتی ئەوان پشتیان لەحەق کردوەو شوێنی نەکەوتوون، جا یان لەبەر تێنەگەیشتوویی، یان لەبەر گوێ ڕانەگرتنو هەوڵ نەدان بۆ حاڵی بوون، شوێن بەتاڵ کەوتوونو باوەشیان پێدا کردووە.

نە لەحەق حاڵی دەبنو نە هەوڵ دەدەن لێی حاڵی ببن، بێگومان دیاردەی دوو ڕوویی لەکۆمەڵگای مەدینەدا سەری هەڵدا، لەسەردەمی مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەمەککەدا ئەو دیاردە سەری هەڵ نەداوە، چونکە لەو سەردەمەدا شتێك نەبووە داخوازی دوو ڕوویی بێ .

موسوڵمانەکان کەمو بێ هێز بوونو دەچەوسێندرانەوە، کەسێکیش ئەوە حاڵی بێ پێویست ناکا کەس دوو ڕوویی لەگەڵ بکا، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەهۆی موسوڵمان بوونی خێڵی ئەوسو هۆزی خەزرەج موسوڵمانان بەهێز بوونو پێغەمبەر ﷺبناغەی دەوڵەتی ئیسلامی داناو وردە وردە ئیسلام بڵاوبووەوەو گەشەی کرد، زۆربەی زۆری عەشائیرو بنەماڵەکان ئیمانیان هێنا، ئەوانەی ڕقیان لەپێغەمبەر بوو نەیان توانی بەرامبەری بووەستن، ناچار بوون چەکی دوو ڕوویی بخەنە کار، بەرواڵەت خۆیان بەبڕوادار دەخستە ڕوو،

لەواقیعیشدا کافر بوون، هەردەم چاوەڕوانی ئەوە بوون پێغەمبەرو هاوەڵانی توشی بەڵاو کارەساتێك ببن‌و ڕزگاریان بێ .

هەبوونی جولەکە لەناو شاری مەدینەداو دەستەبەربوونی هێزی عەسکەری‌و ئابووری بۆیان هۆکارێکی هاندەر بوو بۆ سەرهەڵدانی دیاردەی دوو ڕوویی‌و بەرپاکردنی پیلان‌و دژایەتیکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی‌و نانەوەی کۆسپ‌و تەگەرە لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئاییندا.

بەڵێ هەبوونی جولەکە لەمەدینەدا بەو دارایی‌و دەسەڵاتەوە، کارامایی‌و شارەزاییان لەبەرپاکردنی کێشەو پیلان بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانی، هاندەربوو بۆ گەشەکردنی دیاردەی دوو ڕوویی، خاڵی هاوبەشیان دژایەتیکردنی ئایینی حەق بوو، هەردوولایان حیقدو کینەیان لەپێغەمبەرو هاوەڵانی هەبوو..

هەرکاتێ موسوڵمانان دەکەوتنە تەنگانەو ناخۆشیەوە سەری دوژمنکارییان بەرز دەکردەوە، بوغزو کینەکاری خۆیان دەر دەخست، کاتێکیش موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست دێناو دەکەوتنە خۆشیەوە، ئەوان بەنهێنی کۆسپ‌و لەمپەریان دروست دەکردن‌و کێشەو نیزاعیان دەخستە نێو کۆمەڵگای ئیسلامییەوە..

تەنانەت تا ناوەڕاستی ئەو ماوەی پێغەمبەرﷺ لەمەدینە لەژیاندا بوو دوو ڕووەکان خەتەرێکی گەورە بوون بۆ دەوڵەتی تازە ڕسکاوی ئیسلام لەسەر دەستی پێغەمبەرﷺ بەڵکوو لەوە دواو هەموو کاتێك دوو ڕووەکان ڕۆڵی خیانەتکارانەی خۆیان گێڕاوەو هەمیشە لەپشتەوە خەنجەری ژەهراوی خۆیان لەجەستەی کۆمەڵی موسوڵمانان وەشاندووەو تا بۆیان کراوە هەمیشە لەکەلێندابوون‌و تا بۆشیان بکرێ دەست ناپارێزن.

ئەمجار لەبەرامبەر ئەو ناپاکانەدا باسی دەستەی خوداپەرستان دەکاو دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾ ئەوانەی ڕێبازی

هیدایـــــەتیان گرتـــــووەو خـــــودا تـــــۆفیقی داون‌و دڵـــــی نـــــوورانی کردوون، ئیمانیان هێناوەو کـردەوەی چاك ئـەنجام دەدەن‌و خـودا لەسـەر هیدایـەت ڕاگیری کردون‌و هیدایەتی بۆ زیاد کردون‌و پتر لەسـەر حـەق چەسپاندونی‌و خـودا لێیان ڕازییە، ئەوەش ئەو پەڕی بەختەوەری‌و بەمراز گەیشتنە.

ئەمجار پـەروەردگار هەڕەشـەی هـاتنی قیامـەت لـەدووڕوو بـێ بڕوایـان دەکـاو دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ السَّاعَةَ أَنْ تَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً فَقَـدْ جَـاءَ أَشْـرَاطُهَا فَـأَنَّى لَهُـمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ﴾ ئایا ئەو دو دووڕووە کافرانە جگە لـەڕابوونی قیامـەت بەناگـەهان چاوەڕوانی چی تـر دەکـەن؟ قیامـەت رادەبـێ‌و ئـەوان لـێی بـێ ئاگان‌و خۆیـانی بـۆ ئامادە ناکەن، بێگومان نیشانەکانی دەرکەوتوون، یەکێك لەو نیشانانە ڕەوانـەکردنی پێغەمبـەری ئیـسلامە، لەصـەحیحی بوخـاری‌و موسـلیم دا فەرمودەیـەك هـاتووە، ئەنـەس ڕیوایـەتی کـردوە دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (بعثـت أنـا والـساعة کهاتین، وأشار الى الوسطى والسبابة) .

جا کوا ئەوان کەقیامەت ڕابوو یادکردنەوەو پەشیمان بوونەو سودی هەیـەبۆ ئەوان؟ کەی ئەو کاتە قیامەت بیرکەوتنەوە کەڵکی دەبێ.؟ وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفەرموێ، ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى﴾ الفجر/٢٣.

بـەکورتی بەڵگـە بـۆ ئیمانهێنـان بـەخوداو بەپـەیامی ئیـسلام زۆرو ئاشـکران، ئایەتی قورئان‌و فیترەت‌و عەقڵ‌و بوونەوەر هەموویان گەواهی هەبوونی خودایەکی تاك‌و تەنهاو بێ شەریك دەدەن، جا، کە ئـەوان خێـرا پەلـە نەکـەن بـۆ ئیمانهێنـان، پـێش مـردن‌و ڕابـوونی قیامـەت ئیمـان نـەهێنن، ئـیتر لـەوە دوا ئیمانهێنانیـان بـێ سـودە، چـونکە دونیـا (دار العمـل)و (دار التکلیـف)ە قیامـەت جێگـای پـاداش وەرگرتنەوەیە چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە...

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکا: کە بەردەوام بێ لەسەر پەیامی خۆی‌و داوای لێخۆشبون بۆ خۆیـو بـۆ موسـوڵمانان بکـا، دەفـەرموێ: ﴿فَـاعْلَمْ أَنَّـهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ

اللَّهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! کە تۆ حاڵو وەزعی موسوڵمانو کافرت بۆ ڕون بووەوە، زانیت کێ بەختەوەرو سەرفرازەو کێ بەدبەختو چارەڕەشە، نیشانەکانی ڕابوونی قیامەتت بۆ ڕون بووتەوە، ئیتر بەردەوام بە لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامی خۆت، سوربە لەسەر یەکتاپەرستیو بزانە جگە لەخودا هیچ خودای تر نین، قیامەت حەقەو هەر ڕادە بێو شكو گومانی تێدا نیە.

﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ داوای لێخۆشبون لەتاوانەکانت بکە ئەگەر هەتبن، یان مەبەست بەتاوانی پێغەمبەرﷺ کردنی ئەو کارانەن کە (خلاف الأولى) یان پێ دەگوترێ، هەروەها داوای لێخۆشبون بۆ پیاوانی موسوڵمانو ئافرەتانی موسوڵمان بکە، لە خودا بپاڕێرەوە خودا لەتاوانەکانیان خۆش ببێ.

﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ﴾ خودا ئاگادارە بە هەوڵدانو هەڵسوڕانو هەڵسو کەوت ئاکارو ڕەفتارتان لە ڕۆژداو دەزانێ شەو چۆنو لەکوێ پەنادەگرنو پشوو دەدەن، ئاگاداری نهێنیو ئاشکراتانە، هیچی لێ گوم نابێ، هەموو کارو کردەوەیەکتان لەسەر تۆمار دەکاو ڕۆژی قیامەت سزاو پاداشی عادڵانەتان دەداتەوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ﴾ الأنعام/ ٦٠، یان یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الآرْضِ إِلاّ عَلَى اللّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ هود/٦.

بۆ ئەنجامدانی ئەم فەرمانە ئیلاهی یە بەشێ: لە دوعاو پاڕانەوەی پێغەمبەرﷺ وەکوو لەصەحیحی بوخاریو موسلیم دا هاتووە ئەم دوعایە بووکە دەیفەرموو: (اللهم اغفرلي خطيئتي و جهلي واسرافي في أمري وما أنت أعلم به مني، اللهم اغفرلي هزلي وجدي وخطئ وعمدي وكل ذلك عندي).

هەروەها لە حەدیسی صەحیح دا هاتووە: کە پێغەمبەرﷺ دوای نوێژ دەیفەرموو: (أللهم اغفر لي ماقدمت وما أخرت وما اسررت وما أعلنت، وما انت أعلم به مني، أنت الهى لا اله الا أنت) هەروەها لە حەدیسی صەحیح دا هاتووە: فەرموویەتی: (يا أيها الناس توبوا الى ربكم فانى أستغفر الله و أتوب اليه فى اليوم اكثر من سبعين مرة) .

ئەبو یەعلا لە ئەبوبەکری صدیقەوە لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێ کردین فەرمووی: زۆر (لااله الا الله) بکەنو داوای لیخۆشبون بکەن، چونکە شەیتان وتویەتی: من ئادەمیزاد لە رێگەی تاوانەوە بە هیلاك دەبەم ئەوانیش بە (لا اله الا الله)و ئیستیغفار بەهیلاکیان بردوم، بۆیە هەمیشە هەوڵ دەدەم لە رێگەی هەواو هەوسەوە لەخشتەیان بەرم، فرسەتم لێ هێناون بەهیلاکم بردون بۆ خۆشیان وادەزان هیدایەتدراون.

هەروەها ریوایەت کراوە: کەئیبلیس بە خودای گوت: سوێندم بە شکۆمەندی وبەرزو پیرۆزیت هەمیشە لەهەوڵو تەقەلادا دەبم بۆ گومرایی کردنی ئادەمیزاد هەتا گیانیان لە جەستەدا بێ کۆڵیان لێ نادەم، پەروەردگار فەرمووی: سوێندم بەعیززەتو شکۆمەندی خۆم منیش هەتا ئەوان داوای لێ خۆشبون بکەن لێیان خۆش دەبم.

## هەڵوێست و حاڵی دووڕووەکان و موسوڵمانەکان لەکاتی نازڵبوونی ئایاتی عەمەلیدا

﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ ﴾

لەوەپێش باسی حاڵ و وەزعی کافرو دووڕوو خودا پەرستانی کرد لە کاتی بیستنی ئایەتی قورئان دەربارەی بیرو باوەڕو بنەماکانی عەقیدە، ئەمجار هەڵوێست و حاڵ و وەزعی کاتی بیستنی ئایاتی عەمەلی وەکوو فەرمان بە جیهاد کردن و زەکات دان و نوێژ کردنیان ڕون دەکاتەوە .

دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَأَوْلَى لَهُمْ﴾ خودا پەرستان ئاواتە خوازی ئەوەن ڕێگە یان پێ بدرێ جیهاد

بکەن‌و دژی کافرو بی بڕوایان بجەنگن. داوا لەخودا دەکەن‌و دەڵێن: ئەوە بۆچی سورەتێك نازڵ نابێ خودا تێیدا فەرمانمان پێ بکا بەجەنگان دژی کافرو بێ بڕوایان، بۆ ئەوەی پاداشی جیهادمان دەست بکەوێ، جاکە سورەتێك نازڵ دەبێ‌و باسی ئەوە دەکا جیهاد لەسەر موسوڵمانان پێویستە، لە خۆشیان بزەیان دێت‌و دڵیان خۆش دەبێ دوو ڕووەکانیش لەترسان چاویان پێ ئەبڵەق دەبێ‌و بەترسەوە سەیری تۆ دەکەن ئەی پێغەمبەر!

وەکوو کەسێك لەسەرە مەرگ دابێ چاو یان بەملۆق دەوەستێ‌و ڕەنگیان زەرد هەڵدە گەڕێ. نازانن بە چ بیانوو فێڵێك خۆیان بدزنەوە، مردن‌و لەناو چون بۆ ئەوانە لەو حاڵە باشترە.

ئەمەش هەڕەشەیە بەوە کە فەوتان‌و لەناو چونیان نزیکە. یان هەڵویستی شیاوو پەسند ئەوەیە: فەرمانبەردارو گوێ بیسی فەرمانی خودابن واز لە دووڕوویی بهێنن‌و مەردانە خۆیان ئامادە بکەن بۆ تەنفیزی فەرمانی پەوەردگاریان.

﴿طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَعْرُوفٌ﴾ فەرمانبەرداری بۆ فەرمانی خوداو قسەی چاك‌و خێرئاوەر زۆر باشترە لەو هەڵوێست‌و قسانەی ئەوان دەیانوێنن‌و دەیانکەن.

جا ﴿فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْراً لَهُمْ﴾ کە کارگەییشتە جدییەت‌و جیهاد پێویست بوون وەختێ ئەوە هات بە عەمەلی جیهاد دەست پێ بکەن ئەگەر ئەوان ڕاستگۆبن لەو گفتارو ئاکارانەیاندا، فەرمان بەرداری فەرمانی خودابن‌و مەبەست‌و نیازیان بۆ ئایین دڵسۆزانەبێ، ئەوە ئەو هەڵوێست‌و بیرو باوەڕە بۆ ئەوان باشەو هەرگیز لەگەڵ ئەو ڕیسوایی‌و دڵە کوتەو ڕەنگ زەردبون‌و چاو بەملۆق وەستانەدا بەراورد ناکرێ، بەڵێ فەرمانبەرداری فەرمانی خودا بەدڵنیایی‌و بڕواوە.

قسەی چاك و بەسوود: كەڕەنگدانەوەی پاكی هەست و دڵنیایی و دەروونپاكی بێ هەر ئەوە باشە بۆ ئادەمیزادو هەڵویستی ترو قسەی تر زیانبەخش و بەهیلاك بەرە.

گەردنكەچی بۆ فەرمانی پەروەردگار تۆیشوو بژیوێكە ئیمان و باوەڕ دەستەبەری دەكا، عەزیمەت و خۆ ڕاگری بە جەنگاوەران دەبەخشێ و ترس و لەرزیان لێ دوور دەخاتەوە، سەرەنجامی بەرزو پیرۆزو بەختەوەرییان بۆ دەرەخسێنێ، یان سەركەوتن و رزگاربوونە لە دوژمن یان شەهیدبون و بەهەشتە!!

تا ئێستا بەشێوەی غائیب لێیان دوا، ئەمجار ئوسلوب دەگۆڕێ و ڕاستەو خۆ بەشێوەی خیتاب پێیان دەفەرمووێ: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ﴾؟ وێ دەچێ و لەوانەیە ئێوە ئەگەر پشت لەفەرمانی پەروەردگارتان هەڵبكەن و ئامادە نەبن بۆ جیهادو خۆ بەختكردن لە پێناو ئایینی خودادا، ئەوهەڵوێست و رفتارانە بتانگێڕنەوە بۆ سەرحاڵ و وەزعی سەردەمی نەزانیتان، خوێنرێژی و فەساد لەسەرزەوی دا بەرپا بكەن..!

یان ماناكە بەم جۆرە ئاراستە دەكرێ: ئایا چاوەڕوان ناكرێ واتە: بەڵێ چاوەڕوان دەكرێ لە ئێوە ئەگەر كارو باری وڵات و گەل بەدەستەوە بگرن، بگەڕێنەوە بۆ سەر حاڵ و وەزعی سەردەمی نەفامیتان، سەر لە نوێ دەست بكەنەوە بەخوێن رشتن و ئاژاوە نانەوەو ستەمكاری و تاڵان و بڕۆ و كوشتن و بڕین، هەڵاچۆی ڕەحم و خزمایەتی خۆتان بكەن بە كوشتن و ئەزیە تدانی یەكتری و زیندە بە چاڵ كردنی كچ و ئەنجامدانی هەموو ئەو تاوانانەی كەلەوە پێش ئەنجامتان دەدان.

بەكورتی: بترسن لەوەی ئەگەر پابەندی فەرمانی خودا نەبن، ئێوە سەرەنجامتان ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی نەفامیتان؛ كە ئاژاوەچی بوون، بێ ڕەحم و بەزەیی بوون، بەناحەق یەكترتان دەكوشت و ماڵ و سامانی یەكترتان چەپاو دەكردو جگەر گۆشەی خۆتان زیندە بەچاڵ دەكردن.

قەتادە دەفەرموێ: مانای ئایەتە کە بەم جۆرمیە؛ وێدەچێو ترسی ئەوەتان لێ دەکرێ ئەگەر روو لە ئیمانهێنان وەربگێڕن بگەڕێنەوە بۆ بەرپاکردنی فەسادو ئاشوب نانەوە لەسەر زەوی‌و خوێنڕێژی!

ئەبو حەییان دەفەرموێ: تەفسیری ڕاست‌و ئاشکرا بۆ ئایەتە کە ئەوەیە بگوترێ: خیتابەکە بۆ دووڕووەکانە دەربارەی جیهادو جەنگان، واتە ئەی دووڕووەکان! ئەگەر ئێوە پشت لە جیهادو فەرمانبەرداری فەرمانی خودا هەڵبکەن، ئایا جگە لەوەی فەساد لەزەوی دا بەرپا بکەن‌و یارمەتی ئایینی خودا نەدەن چیترتان لێ چاوەڕوان دەکرێ؟ ئەگەر ئێوە یارمەتی موسوڵمانان نەدەن صیلەی ڕەحمی نێوان ئەوان‌و خۆتان دەبڕن...

بەم جۆرە پەروەردگار ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ ورد بونەوە لەسەرەنجام‌و وازهێنان لەدەمارگیری‌و کێشەو جیدال، چونکە خودا بۆ خۆی دەزانی ئەگەر ئەو مونافیقانە ببنە کاربەدەستی خەڵکی، یان ئەگەر پشت لە ئایینی خودا هەڵبکەن، جگە لە کوشتن‌و بڕین‌و تاڵان‌و بڕۆو فەسادو ئاژاوە هیچی تر نایەتەکایەوە!

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمْ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾ ئەو ستەمکارو خوێنڕێژو پشت هەڵکردوانە ئەوانەن ؛ کە خودا نەفرینی لێ کردون، لە ڕەحمەتی خۆی دووری خستوونەوە، لە ژیانی دونیادا گوێچکەی لە بیستنی حەق هاخنیون، چاوی دڵی کوێر کردون، ناتوانن نیشانەی هەبوونی خودا لەبونەوەردا بدۆزنەوە، هەست بە عەدالەتکاری پەروەردگار ناکەن لە بونەوەردا.

**حاڵو وەزعی موونافیقەکان دوای هەڵگەڕانەوەیان لە ئایینو لەکاتی گیان کێشانیانداو ئاماژەکردن بۆ حیکمەتی جیهاد**

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ

وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾

لەوەپێش حاڵو وەزعی پشت هەڵکردنی موونافیقەکانی لە گوێگرتن لە قورئان رونکردەوە، ئەمجار فەرمانی پێ کردن بە وردبوونەوە لە قورئان، نەی لێ کردن لەوەی روی لێ وەرگێڕن. بۆنەوە نەکەونە بەر هەڕەشەی خودا، ئەمجار ئاماژە بەو ناڕەحەتیو ناخۆشییە دەکا: کە لە کاتی گیانکێشان دا توشیان دێ.

دەفەرموێ: ﴿أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ﴾ ئەرێ ئەو دوو ڕوو موشریکو بێ بڕوایانە بۆچی لە قورئان وردنابنەوەو بەدڵ نایخوێننەوە؟ بۆ ئەوەی پابەندی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی بن، بەڵگەو نیشانەکانی کاریان تێ بکاو لە خراپە کاریو تاوان بگەڕێنەوە؟ تێفکرین لە قورئان دڵو گیان مەشتو ماڵ دەکا، نورو روناکی دەخاتەناو دەروونەوە، هەستەکان دەجوڵێنێ، دڵ وەئاگادێنێ، گەشو نما دەدا بەگیانو نوورانی دەبێ.

﴿أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾ بەڵکوو لەسەر دڵیان پەردە هەیە دەرگای دڵیان داخراوە لە پەیامی قورئان حاڵی نابن، لە نێوان ئەوانو قورئاندان، لە نێوان ئەوانو ڕوناکی داپەردەی قایمو پتەو هەیە، واتە ئەوانە لە دووحاڵ بەدەرنین یان لە قورئان ورد نابنەوە چونکە خودا لەڕەحمەتو خێر دووری خستونەوە، یان تێی دەفکرن بەڵام ماناکانی ناچنە ناو دڵی ئەوانەوە چونکە دڵیان قفڵ دراوە.

ئەمجار پەروەردگار هۆی پشت هەڵکردنی ئەوانە لە پەیامی قورئان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ﴾ بێگومان ئەوانەی لە ئایین دەرچوونو گەڕانەوە بۆ زلکاوی کوفر، دوای ئەوەی هیدایەتیان بۆ ئاشکرابوو، موعجیزەی پێغەمبەریان

بینین، بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆریان لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدﷺ چاوپێکەوتن، شەیتان لێیان وەخۆ کەوت، کوفرو تاوانی لە پێش چاو جوان کردن، ڕێگای خراپەی بۆ ئاسان کردن، بەپشت بەستن بە هیواو خەیاڵ هەڵی خەڵەتاندن، تارمایی مردنی لەپێش چاو دوورخستنەوە.

قەتادە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی کۆمەڵێك جولەکە نازڵ بووە، دەیانزانی حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەرەو لە تەورات دا ناوو نیشانەکانیان زانیبوون، تەنانەت خۆیان بەسەر عەرەبەکان دا هەڵدەکێشاو دەیانگوت ناو نیشانی پێغەمبەری ئاخیر زەمان لە کتێبی ئێمەدا دەست نیشان کراوە، هەر لەگەڵ رەوانە کرا ئێمە دەیناسینو خێرا بڕوای پێ دەکەین، کەچی کە پێغەمبەر ڕەوانە کرا، جولەکەکان لەبەر حەسودی خۆیان ئیمانیان پێ نەهێناو پەیامی ئیسلامیان ڕەتکردەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: دەربارەی مونافیقەکان نازڵ بووە؛ ئیمانیان هێناو دوایی پاشگەز بوونەوەو دڵیان مردو نوری ئیمانی تێدا نەما.

ئەبو حەییان دەفەرموێ: ئایەتەکە هەموو کەسێك دەگرێتەوە: کە هەڵوێستی ئاوا ناشیرینی هەبێو کرداری خراپ بکا.

ئەمجار پەروەردگار هەندێ دیاردەی گومڕاییان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ﴾ ئەو پاشگەزبوونەوەو کوفرو خراپە کارییە یان لە دوای ئیمانهێنان، بە هۆی ئەوەوەیە: کە ئەو دو ڕوو ئاژاوە چییانە بەو جولەکانەیان گوت: کە دوژمنی قورئانو پەیامی پێغەمبەر بوون، ئێمە لەهەندێ هەڵوێستو کردەوەدا گوێڕایەڵی ئێوە دەکەین، دژی پەیامی موحەممەد دەوەستینو وەکوو دوژمنایەتی دەکەینو پێچەوانەی پەیامەکەی دەجوڵێینەوە.

بێگومان جولەکەی مەدینە یەکەم گرۆو تاقم بوون پێیان ناخۆش بوو قورئان نازڵ بوەو حەزرەتی موحەممەد کراوە بە پێغەمبەر ﷺ چونکە ئەوان

بەتەمای ئەوەبوون دوا پێغەمبەرو کۆتای پێغەمبەرایەتی بەکەسێك بێ لەڕەگەزی جولەکەبێ، زۆر جار ڕوبەڕوی کافرەکانی دیکە هەڕەشەیان دەکردو دەیانگوت: نزیکە پێغەمبەرێ ڕەوانە بکرێ لەئێمە، ڕابەریمان بکاو دەسەڵاتو شکۆمەندیمان بۆ بگێڕێتەوە، ئیتر هەموومان لەدەوری کۆدەبینەوەو دونیا دەخەینە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆمان..

جا کەپەروەردگار پێغەمبەری ئاخیرزەمانی لەنەوەی حەزرەتی ئیبراهیم هەڵبژارد لەڕەگەزی جولەکە نەبوو، دژی پەیامی پێغەمبەر وەستان، کە پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە هیندەی تر ڕقیان لێ هەلگرتو دوژمنایەتی خۆیان بۆ ڕاگەیاند، چونکە دەیانزانی مەرکەزو دەسەلاتیان لەکیس دەچێو گرۆڵەیان دەکەوێتە لێژی، بۆیە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کەوتنە خۆو یەکیان گرتو دژی پێغەمبەرو موسوڵمانان کەوتنە جەنگان، جۆرەها پیلانو فرتو فێڵیان خستە کار، چاکە هیچیان بۆ نەکراو پیلانەکانیان پوچەڵ بوونەوە..

ئەمجار بەنهێنیو لەژێرەوە هەمیشە لەهەوڵو تەقەلّادا بوون بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام، زۆر لەدەروون نەخۆشو دڵ کرمێی تریش پاڵیان لێ دانو هاوکاری جولەکەکانیان کرد، ئیتر دوژمنایەتی نێوان ئەوانو پێغەمبەرو موسوڵمانان بەردەوام بوو تا لەکۆتاییدا پێغەمبەرﷺ لە نیوە دوورگەی عەرەبی وەدەری نانو وڵاتی لێ پاك کردنەوە...

هەر لەمانای ئەم ئایەتە دایە: کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَر إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَداً أَبَداً وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ الحشر/۱۱.

جا با لە ژیانی دونیایان دا بەڕواڵەت بەهۆی ئەو دووڕویو نیفاقەی خۆیان بڕێ جار مەبەستیان بێتە دی، هەندێ شتیان بۆ سەربچێ، بەلام ﴿فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ؟﴾ دەبێ

حاڵ و وەزعیان چۆن بی و چی دەکەن لەوکاتەدا: کە فریشتە دێنە سەریان بۆ گیان کێشانیان و بەرق و کینەوە گیانیان دەکێشن؟ بێ بەزەییانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکەن، لەپێشەوەو لەدواوە تێیان دەسرەوێنن، بەزەبرو زەنگەوە دێنە وێزەیان وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُواْ الْمَلآئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ﴾ الانفال/٥٠.

یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلآئِكَةُ بَاسِطُواْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُواْ أَنفُسَكُمُ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ الانعام/٩٣.

ئەمجار پەروەردگار هۆی ئەم هەموو ناڕەحەتکردن و ڕیسواکردنە لەسەرە مەرگ داو عەزابی ژیانی بەرزەخ و قیامەتیان ڕون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەو گیانکێشان و مامەڵە کردنی فریشتە لەگەڵ ئەو جۆرە ئادەمیزادانە دا بەو شێوەیەی لەئایەتی پێشوودا باسی لێوە کرا، بەهۆی ئەوەوەیە: کە ڕێگایەکیان گرتووە خودا پێی ناخۆشە، بەهۆی کوفرو تاوانی خۆیانەوەیە، بەهۆی پیلاننانەوەیانە لەگەڵ دوژمنانی خودادا دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی، ڕقبوونەوەیانە لەهەرشتێك: کە خودا پێی خۆشە، وەکوو ئیمان و یەکتاپەرستی..

ئیتر خودا لەتۆڵەی ئەو ئاکارو ڕەفتارانەیان دا کردەوە باشەکانیانی پوچەڵ کردۆتەوە، هەرچی کارێکی باشیان هەیە پێشی پاشگەزبوونەوە خودا بەتاڵی کردوتەوە هەر کارێکی پەسند ئەنجام بدەن هاوکات لەگەڵ پاشگەزبوونەوەو نیفاق دا، وەکوو یارمەتیدانی هەژارو بێ نەوایان..

.. دروستکردنی قوتابخانەو خەستەخانەو دابینکردنی پێویستی بۆ ئاتاجان، خودا هەموویان بۆ پوچ دەکاتەوەو لەقیامەت دا سودی لێ نابینن، چونکە

کردەوەکانیان ئیمان لەگەڵ نەبووە، لەبیرو باوەڕەو هەڵنەقوڵاون، هەرکارو گوفتارێکیش ئیمانو باوەڕ لەپشتیەوە نەبێ، بۆ قیامەت کەڵکی لێ وەرناگیرێ.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُوراً﴾ الفرقان/٢٣.

ئەمجار پەروەردگار سەرزەنشتی دووڕووەکان دەکا بەهەڕەشە لێ کردن لێیان دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ أَنْ لَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ﴾ ئایا ئەو دووڕو دڵ کرمێیانە، ئەو ئاژاوە چیو دڵ پڕ لەکینەو ئاکارو ڕەفتار ناپەسندانە، پێیان وایە خودا لێیان لەهەراندا، پەردە لەسەر پوخڵاواتیان لانابا؟!

ئانا باوانەزانن، خودا ئاگاداری هەموو نهێنیو ئاشکرایانە، بەڵکوو لەنهێنی نهێنی تریش دەزانێ، پەردەیان لەسەر لادەباو فەزحیان دەکا، ئابڕوویان دەبا، وەکوو چۆن لەسورەتی (براءة) دا ڕیسوایکردن، کردنی بەپەندی دەورانو لەنامەی پیرۆزو خالیدا مۆری دووڕویی پێوەنان! بێگومان مونافیقەکان پشتیان بەکاراماییو فێڵزانی خۆیان ئەستوورو بوو، وایان دەزانی: کە تاسەر بۆیان سەردەچیو کەس پێیان نازانێو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن!!

بەڵام قورئان قەڵای ئاواتی ڕوخاندنو هەڕەشەی ئەوەی لێ کردن، کەلەوانەیە خودا یەکە یەکە بەناو دیارییان بکا، دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُمْ بِسِيمَاهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەگەر بمانەوێ یەکە یەکە ناوی دووڕووەکانت پێ ڕادەگەیەنین، یەکەبە یەکە بەدەست لەسەردانراوی پێت دەناسێنین، وا دەکەین بەشێوەو ڕوخسار بەناوو نیشانە یەکە یەکە دووڕووەکان بناسیو جیایان بکەیەوە.

بەڵام خودا دەربارەی هەموو دووڕووکان ئەوە ناکا، لەڕوی تاوانپۆشیو فەزڵو گەورەیی خۆیەوە ئەو بڕیارەی نەداوە، بۆ سرپۆشی ئادەمیزادو ناو نەزڕاندنیان،

ئـەگینا وەکـو چـۆن نـاوی هەنـدێکیانمان بـە پێغەمبـەر ڕاگەیانـد، ئـاوا هـەموو دووڕووەکانمان پێ دەناساندن!

ئیمـام ئەحمـەد دەفـەرموێ: وەکیـع بـۆی گێڕاینـەوە ئـەویش لەسـەفیانەوە لەسەلەمەی کوڕی عەیاز لەباوکیەوە لە ئەبو مەسعودەوە: (عوقبـەی کـوڕی عـەمر) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتارێکی بۆ داین، لەسـەرەتاوە حەمـدو سوپاسـی خـودای کـرد، پاشان فەرمووی: لەناو ئێوەدا ئەی موسوڵمانان دووڕوو هەن، هەر کەسێ نـاوم هێنـا باهەڵسێ ببینـدرێ، پاشـان فـەرمووی: فلاَنکـەس تـۆ هەڵسە، فیـسارەکەس تـۆیش هەڵسە، فلتان تویش هەڵسە، بەم جۆرە هەتا ناوی سیو شەش پیـاوی هێنـا، ئـەمجار پێغەمبـەرﷺ فـەرموی: ئێـوە دووڕوتـان تێـدان، لـەخودا بترسـنو تۆبـە بکـەنو واز لەدووڕوویی بهێنن[١] .

﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ﴾ بێگومان ئەی پێغەمبـەر! ئـەتۆ ئـەو مونافیقانـە بەلەهجەو شێوە ئاخاوتنیـان دەناسـی، هـەر کەقـسە دەکـەن بـۆت دەردەکـەوێ ئـاخۆ مەبەستیان چیەو چیان لەدڵ دایە!!

کولـەبی دەڵـێ: دوای نـازڵبوونی ئـەم ئایەتـە هـەر کەسـێکی دووڕوو قـسەی بکردایە یەکسەر پێغەمبـەرﷺدەیناسـی. ئەنـەس دەفـەرموێ: دوای نـازڵبوونی ئـەم ئایەتە پێغەمبەر ﷺدووڕووەکانی یەکەیەکە دەناسی.

﴿وَاللَّـهُ يَعْلَـمُ أَعْمَـالَكُمْ﴾ دڵنیـابن خـودا هیـچی لـێ گـوم نـابێ، بەهـەموو کردەوەکانتان ئاگادارەو ڕۆژی قیامـەت پاساوتان دەداتـەوە، چاکە بەچاکەو خراپـە بەخراپە...

ئـەمجار پـەروەردگار بەرنامـەی ژیـانی ئـادەمیزاد لـە جیهـان دا دیـاری دەکـاو دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَـمَ الْمُجَاهِـدِينَ مِـنكُمْ وَالـصَّابِرِينَ وَنَبْلُـوَ أَخْبَـارَكُمْ﴾ بەتەئکیـد ئێمـە ئێـوە بـەتاقی دەکەینـەوە بەفـەرمان پـێ کـردنو جڵـەو گـیری

---

[١] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج١٧٢٨/٤ ط دار الفکر ملون .

تادەربکەوێ بۆتان لێتان عەیان بێ کێ پابەندەو کێ سەرپێچیکارە، هەڵبەتە خودا بۆ خۆی هەموو شتێك دەزانێو پێویستی بەتاقیکردنەوە نیە، ئەم تاقیکردنەوە بۆ ئەومیە دەری بخاو ئێمەی ئادەمیزاد بزانین، کە فەرمان بە مسوڵمانان دەکا بەجیهاد کردن، لەپێش دا دەزانێ کێ پابەند دەبێو کێ پشت هەڵ دەکا، وەلێ بەفەرمانەکە بۆ ئادەمیزادەکان خۆیان دەردەکەوێ کێ موجاهیدەو بەدڵ ئامادەیەو بەکردەوە پابەندو خۆڕاگرو پشوو درێژەو کێ وانیە ئەخبارو هەواڵی ئادەمیزاد بۆیەکتری ئاشکرا دەکا تا بۆ خۆشیان بزانن و دەربکەوێ کێ ملکەچی فەرمانی خودایەو کێ یاخی دەبێ؛

ئیمامی عەلی مانای ﴿حتى نعلم﴾ ەی بە ﴿حتى نرى﴾ مانا کردوە ئیبراهیمی کوڕی ئەشعەس دەڵێ: فوزەیلی کوڕی عەیاز کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەگریاو دەیگوت: خودایە بەتاقیمان نەکەیەوە، چونکە ئەگەر بەتاقیمان بکەیەوە ناموسمان دەچێ. بێگومان گۆڕەپانی ژیان گۆڕەپانی تاقیکردنەوەو ئەزموونگەرییە بۆئەوەی ئادەمیزادەکان بۆ یەکتری کەشف ببن و چاك و خراپ لێك جیاببنەوە، دەربکەوێ ئاخۆ کێ موجاهیدو خۆ ڕاگرەو کێ وانیە!

## حاڵ و وەزعی ئەهلی کیتاب و هەندێ لەموسوڵمانان لەدونیاو قیامەتدا

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـًٔا وَسَيُحۡبِطُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٣٢﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ

﴿...ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُواْ وَتَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾﴾

لەوەپێش لەسەرەتای سورەتەکەدا حاڵو وەزعی موشریکەکانی بەیان کرد، دوایی حاڵی مونافیقەکانی ڕونکردەوە، ئەمجار حاڵو وەزعی کۆمەڵێك لە ئەهلی کیتاب (بەنو نەضیرو بەنو قورەیظە) رادەنوێنێ، ئەوانە کافرو سەرپێچیکار بوون، کۆسپو لەمپەڕ بوون لەبەردەم بڵاوبونەوەی ئایینی ئیسلام دا، ئیتر پەروەردگار هەڕەشەی توندی لێ کردن، چونکە دوای ناسینی حەق پشتیان تێ کرد .

دوایی دێتە سەر باسکردنی هەڵوێستی کۆمەڵێك لەهاوەڵان: کە خێڵی بەنوسەعد بوون، ئیمانیان هێنابوو، نازو نوزیان بەسەر پێغەمبەردا دەکرد، پێغەمبەریان منەتبار دەکرد... پەروەردگار نەی لەوە لێ کردن.

ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە هەرگیز لەوانە خۆش نابێ: کە بەکافری مردون، لەدونیاو قیامەت دا ڕیسوایان دەکا، پێویستە خودا پەرستان هیچ کاتێ بە زەبوونیو بێ هێزی، خۆیان نەخەنەڕوو لەبەرامبەر کۆمەڵێ کوفردا ملکەچی نەنوێنن، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَشَاقُّوا الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى لَنْ يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئاً وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمْ﴾ بێگومان ئەوانەی کافرو بێ بڕوانو سوورن لەسەر کوفرو ئیلحاد، ئامادەنین یەکتاپەرستی ئەنجام بدەن، دژی پەیامی

پێغهمبهرن و خهڵکی لهئایین دهگێڕنهوه، خۆیان کردهوه بهکۆسپ و لهمپهڕ دژی ئیسلام و سهرپێچی فهرمان و ئامۆژگاری پێغهمبهر دهکهن، ئهمهش وێڕای ئهوهی دهزانن، موحهممهدﷺ پێغهمبهری خودایهو به موعجیزهو بهڵگهی ئاشکراوه نێردراوه.

بێگومان ههڵوێست و کردهوهی ئهوانهو ئیمان نههێنانیان هیچ زیانێک بهخودا ناگهیهنێ، خودا پێویستی بهئیمانهێنانی ئهوانه نیه، ئیمانهێنانیان لهخودایهتی خودا زیاد ناکاو ئیمان نههێنانیان لهخودایهتی خودا کهم ناکا، ئیمان بهێنن سودی بۆ خۆیانهو لهسهرکوفر بمێننهوه خۆیان زهرهر دهکهن، ڕۆژی قیامهت خودا کردهوهی باشیان بۆ حیساب ناکاو پوچی دهکاتهوه، چونکه کردهوه ئهگهر له ئیمانهوه نهبێ بۆ قیامهت کهڵکی نیه.

ئهمجار لهژێر تارمایی ئهو سهرهنجامه ترسناکهی کافرهکان پێی دهگهن، ڕودهکاته کۆمهڵێ موسوڵمان و فهرمانیان پێ دهکا پابهندی فهرمانی خودا بن و شوێن پهیامی پێغهمبهر بکهون بۆ ئهوهی، بهختهوهری دونیاو قیامهتیان بۆ دهستهبهربێ، جڵهو گیرییان لێ دهکا لهوهی له ئایین پاشگهز ببنهوه..

دهفهرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ﴾ ئهی ئهوانهی ئیمانتان بهتاک و تهنهایی خوداو ڕاستی پهیامی پێغهمبهر هێناوه، پابهندی فهرمانی خوداو فهرمانی پێغهمبهر بن، خۆتان له جڵهو گیرییهکانیان بپارێزن، چاکهو حهسهناتی خۆتان به پاشگهزبوونهوه له ئایین و ئهنجامدانی تاوانی گهوره پوچهڵ مهکهنهوه، بهڵگه لهسهر پوچهڵبوونهوهی کردهوهی چاک به پاشگهز بوونهوه لهئایین... دهقی ئهم ئایهتهیهو بهئاشکرا ئهوه دهچسپێنێ...

بهڵگهش لهسهرئهوه: که تاوانی گهوره کردهوهی باش پوچ دهکاتهوه، ڕیوایهتی جۆراو جۆرن .. لهوانه: ئهبولعالییه ڕیوایهت دهکا دهڵێ: هاوهڵانی

پێغەمبەرﷺ پێیان وابوو هیچ تاوانێك لەگەڵ (لا الـه الا الله)دا زیـانی نـابێ، واتـه: کەسـێك ئیمـانی هـەبێ، تـاوان کـردەوەی باشـی پـوچ ناکاتـەوە، هـەروەکوو چـۆن کردەوەی باش لەگەڵ کوفرو بێدینی دا سودی نیە، هەتا ئەم ئایەتە نازڵ بـوو، ئـیتر لەوەدوا هاوەڵان دەترسان: کە تاوانی گەورە کردەوە باشەکانیان پوچەڵ بکاتەوە.

قەتادە دەڵێ: رەحمەتی خودا لەو بەندەیەبێ: کە بەکردەوەی خراپی کـردەوە چاکەکانی پوچ ناکاتەوە، ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: بـەرِیاکردنو خۆهەڵنانـەوەو گومان، کـردەوە باشـەکانتان لـەناو مەبـەن، موحەممـەدی کورِێ نەصـری مـەروەزی لەئیبنوعومەرەوە دەگێرِێتـەوە دەڵـێ: ئێمـەی هـاوەڵانی پێغەمبـەرﷺ لامـان وابـوو هەموو کردەوەیەکی باش لای خودا مەقبووله هەتا ئایـەتی: ﴿أَطِيعُـوا اللَّـهَ وَأَطِيعُـوا الرَّسُولَ وَلا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ﴾ نازڵ بوو، ئیتر لەوەدوا ترسی ئـەوەمان لـێ نیـشت: کـە تاوانی گەورە کردەوەی باش پوچ بکاتەوە..

ئـەمجار ئـەوە رِون دەکاتـەوە: کـە هـەر کەسـێك لەسـەر کـوفر بمـرێ فـەزڵو رِەحمەتی خودا نایگرێتەوە، ئادەمیزاد تـا لـەژیان دایـە فرسـەتی لەدەسـت دایـە، بـۆ کافرو تاوانبار دەرگای تۆبە کراوەیە، تادەگاتە سەرەمەرگو گیانەڵاو، ئیتر ئەو کاتـە هەلی لەکیس دەچێو جارێکی تر ئەو هەلەی بۆ هەڵناکەوێـتەوە، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُـمْ﴾

بێگومـان ئەوانـەی نینکـاری تـاكو تـەنهایی خودایـان کـردوە، خـەڵکی تریـان لـەئیمانهێنان بەئیـسلام زێـوان کردۆتـەوە، بوونـە کۆسـپو تەگـەرە لەبـەردەم موسوڵمانو کەسانی دیکە، بەو حاڵە مردونو ژیانی دونیایـان بـەجێ هێشتو سوور بوون لەسەر کوفرو ئیلحاد ئەوە خودا لێیان خـۆش نـابێ، بـەڵکوو بـۆ هـەتا هەتایـە لەناو دۆزەخ دا دەمێننەوە.

بێگومان ئەم ئایەتە وەکوو هەرِەشەیە لەکافرو تاوانباران بـۆ ئـەوەی هەرچـی زووە واز لـەکوفرو تـاوانی خۆیـان بهێـننو موسـوڵمان بـن پـێش ئـەوەی دەرگـای

تۆبەیان لەسەر دابخرێ لەهەمان کاتدا ترساندنی موسوڵمانانە: کە ئاگادار بن بەهیچ شێوەیەك شتێك نەکەن لەو ڕێگە خەتەرناكو شومەیان نزیك بکاتەوە.

ئەمجار فەرمان بەموسوڵمانان دەکا: کە هەمیشە ورەبەرزو دڵ دامەزراو بن، هەمیشە لەهەوڵو تەقەلادابن بۆ دابینکردنی هێزو تواناو بەرپەرچدانەوەی دوژمنان، دەفەرمویٚ:

﴿فَلا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنْتُمْ الآعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَنْ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ﴾

وره ڕوخاوو خاوو خلیچك مەبن لەبەرامبەر دوژمن دا، با داوای ئاشتیو شەڕ ڕاوەستان لە ئێوەوە نەبێ، نەوەکو بکرێتە نیشانەی زەبوونیو کەم هێزی، چونکە داوای وەستانی شەڕ نیشانەی زەعیفییە، بەلام ئەگەر داوای وەستانی شەڕ لەدوژمنەوە بوو، ئەوە دەکرێ ئێوە قبوولی بکەن، بەمەرجێ ئێوە لەحاڵێ باڵادەستیتان دا بن..

وەلێ ئەگەر دوژمن باڵا دەست بوو فەرمانڕەوای موسوڵمانان ڕاوەستانی شەڕی بەلاوە پەسندبوو بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدا دەبینی، ئەوە بۆی هەیە داوای ئاشتی بکا، پێغەمبەرﷺ کاتێك قوڕەیشییەکان نەیانهێشت بچێتە ناو مەککەوەو داوای شەڕ وەستانیان لێ کرد بۆ ماوەی(دە) ساڵ، بەرژەوەندی موسوڵمانانی لەو ئاشتی یەدا بەدیکرد یەکسەر شەڕوەستانی قبووڵ کرد.

## هەڵنانی ئادەمیزاد بۆ ئەوەی کۆڵ بەدنیاوە هەڵنەگرن، هەمیشە ئامادەباشی جیهاد بن

﴿ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا

﴿فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَا أَنتُمْ هَؤُلَاءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُم ﴿٣٨﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد جیهاد بکەنو لەپێناو ئایینی خودادا تێبکۆشنو خۆیان بەزەبوونی نیشانی دوژمن نەدەن، ئەمجار لێرەدا هانیان دەدا: کە سووربن لەسەر خۆبەختکردنو ماڵبەخشین لەپێناو ئایینی خودادا، ئەمەش لەڕوانگەی دونیا بەکەمزانینو شیرینکردنی ئیمان و خوداپەرستی لەدڵیان دا بۆ ئەوەی بەختەوەریی هەردوو جیهانیان دەست بکەوێ.

لە کۆتایی سورەتەکەش دا هەڕەشە لەموسوڵمانان دەکا بەوە ئەگەر پشت لەجیهادو خوداپەرستی هەڵ بکەن، خودا ئەوان لەناو دەباو گەلو نەتەوەیەکی تر دێنێتە ئاراوەو زۆر لەمان زیاتر پابەندی فەرمانی خودا دەبن.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! سووربن لەسەر جیهادو خودا پەرستی، لەپێناو ئایینی خودا داگیانبازی بکەن، ماڵو گیانتان لەو پێناوەدا بەهەرزان بزانن، چونکە ئاکامی دونیا گاڵتەو کەفەو پوچەو بەتاڵە، بەرقەرار نیەو بەسەر دەچێ، خۆ خەریك کردن بەدونیاوە خۆ خافڵاندنەو گاڵتە بازاڕی منداڵانە، وەکوو لەئایەتێکی تردا لەم بوارەدا دەفەرموێ: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلَادِ﴾ الحديد/٢٠.

ئــەمجار رێبــازی بەختــەوەریی‌و ســەرفرازیی نیــشانی موســوڵمانان دەداو دەفــەرموێ: ﴿وَإِنْ تُؤْمِنُـوا وَتَتَّقُـوا يُـؤْتِكُمْ أُجُـورَكُمْ وَلا يَـسْأَلْكُمْ أَمْـوَالَكُمْ﴾ ئەگــەر بەڕاستی ئیمانتــان هــەبێ‌و خــودا پەرستی خۆتــان بــەرێك‌و پێكــی ئــەنجام بــدەن، پابەندی فــەرمان‌و جڵەو گیرییــەكانی پــەروەردگار بــن دڵنیــابن خــودا لەقیامــەت دا پاداشی كردەوەكانتان دەداتەوەو,ڕەنج بەخەسار نابن.

ئەوەش بزانن خودا داوای ئەوەتان لــێ ناكا هەموو مــاڵ‌و سامانتان ببەخشن، بــەڵكوو فــەرمانتان پــێ دەكابەشــێك لــەماڵ‌و ســامانتان لەرێگــەی زەكـات‌و خێـرو صەدەقەدا ببەخشن، خودا بۆ خۆی ئاتاجی مــاڵ‌و سامانی ئێوە نیـە، فـەرمانی پـێ كردون بەشێ: لەماڵ‌و دارایی خۆتان ببەخشن بەبرا هەژارو بێنـەواكانتان، هەنـدێ قورسایی ژیانیان لەسەر سوك بكەن‌و گیانی برایەتی‌و هەمە ئاهـەنگی‌و هاوكاریتـان تێدا بەهێزبێ، سەرەنجام پاداشی باش وەربگرنەوەو سەرفرازیتان دەست بكەوێ.

ئیمان‌و خودا پەرستی ژیان لەگاڵتەو گەپەوە دەگۆڕێ بۆ جیدییەت‌و دەیباتــە ئاستی(خلافەی راشیدە)و پەیوەستی دەكا بەعالەمی بـاڵاوە، هـەر كـاتێ ژیـان خـودا پەرستی‌و تەقواكاری تێدا بوو ژیانی حەقیقی‌یەو موسوڵمان چی ببەخشێ بـە فـیڕۆ ناچــێ‌و لەقیامـــەت دا پاداشــی بــاش وەردەگرێــتەوە، خــودا بۆخــۆی سروشــتی ئادەمیزادی بەدیهێناوەو جۆش داوە، دەزانی چی بەكەڵكی دێ‌و چی لـەتوانای دایـە، زیــاد لەئەنــدازەو لەتوانابــەدەریان لــێ داوا ناكــا، داوایــان لــێ ناكــا هەرچــی مــاڵ‌و سامانیان هەیە پێ ببیەخشن

﴿إِنْ يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْـغَانَكُمْ﴾ ئەگــەر پــەروەردگار داوای بەخشینی هەموو ماڵ‌و سامانتان لێ بكـاو جـەختتان لـێ بكـا، لاتـان قـورس دەبـێ‌و بــەخیلی دەنــوێنن‌و پابەنــدی فەرمانەكــەی نــابن‌و ئەوكاتــە حیقــدو كینــەتان دەردەكەوێ.

﴿هَاأَنتُمْ هَؤُلاءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئێوه ئەی موسوڵمانان فەرمانتان پێ کراوه بۆ ئەوەی لەرێگەی خودادا ماڵێ خۆتان سەرف بکەن، واتە بەشێك لەماڵ و سامانتان لەجیهادو زەکات و رێبازی تری خێرو چاکە دابەخشن.

﴿فَمِنكُمْ مَنْ يَبْخَلُ وَمَنْ يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَنْ نَفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ هی واتان هەیە دڵی نایە کەمێ: لەماڵێ خۆی لەرێگەی خودادا سەرف بکا، دەی چۆن دڵتان دێ هەموو سامانتان ببەخشن؟ کەسێ: بەخیل و چرۆك بێ و ماڵێ نەبەخشێ ئەوە خێرو چاکە لەخۆی دەتارێنێ، خراپەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، بەخیلی هۆکارە بۆ نشوستی و ژێر دەستەیی، ئەگەر چروك و دەست قوچاو بن دوژمن بەسەرتان دا زاڵ دەبێ و نەردوشانستان نامێنێ و خوتان و ماڵتان دەکەونە ژێر دەستی ناحەزانتان، خودا خاوەنی هەموو شتێکە، بونەوەر هەمووی ملکی ئەوە، لەهەموو شتێك بێ نیازە، پێویستی بەکەس نیەو هەموو کەسێ: ئاتاجی ئەوە، بۆیە فەرمووی:

﴿وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ واتە: ئێوه ئەی ئادەمیزادینە بەواقیعی موحتاجی رەحمەتی خودان، کەفەرمانتان پێ دەکا بەماڵبەخشین بۆ پێویستی خۆتانە، خودا ئاتاجی ماڵ بەخشینی ئێوه نیە .

ئەمجار داب و نەریتی خودا لەبونەوەردا رون دەکاتەوە، هەل و مەرجی لەناوبردنی گەل و نەتەوەیەك و هێنانی گەل و نەتەوەیەکی تر بۆ شوێنی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ ثُمَّ لا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ﴾ ئەمە وشەی کۆتای و یەکالا کەرەوەیە، دەفەرموێ: ئەگەر پشت لە ئیمان هەڵبکەن، واز لەتەقواو خودا پەرستی بهێنن، وەکوو پێویست شوێن شەریعەت ویاسای ئیسلام نەکەون، ئەوە دڵنیابن خودا دەسەلات لە ئێوه دەستێنێتەوەو گەل و نەتەوەیەکی تر دەخاتە شوێنی ئێوه، ئەوان لەئێوه باشتر پابەندی فەرمانی خودا دەبن و وەکوو ئێوه پشت لە پەیامی ئیسلام هەڵناکەن ..

بـەکورتی پـەروەردگار هەڕەشـە لەموسـوڵمانان دەکـاو پێیـان دەفـەرموێ: هەڵبـژاردنی ئێوە بـۆ هـەڵگرتنی ئـەو ئەمانەتـە کـە بانگەوازیکردنـە بـۆ ئیـسلامو خۆبەختکردنە لەپێناوی دا، ڕێز لێنانو شکۆمەندییە بۆ ئێوە، جا کە ئێـوە خۆتـان بەشیاوی ئەو ئەرکە نازانن، هەوڵ نادەن لەو ئاستەدا بـن‌و پێداویـستی ئـەو ئەرکـە ناخەنە ئەستۆی خۆتانو نرخی ئـەو ڕێـز لێنانـە نـازانن، ئـەوە دڵنیـابن خـودا ئـەو شکۆمەندیو پیاوەتیـەتان لـێ وەردەگرێـتەوەو گـەلو نەتـەوەی تـر هەڵدەبـژێ بـۆ هەڵگرتنی ئەو ئەرکە پیرۆزەو لە ئێوە باشتر ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەن! خیتـابی ئایەتەکـە بـۆ قوڕەیـشییەکانە، یـان بـۆ دانیـشتوانی مەدینەیـە، بـەڵکوو دەتوانین بڵێین: خیتابە کە بۆ هەموو ئـادەمیزادە چین لـە دوای چین، چ ئەوانـەی سەردەمی نازڵبوونی قورئان یان ئەوانەی دوا ئەوان.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الفتح)

ئەم سورەتە نـاونراوە سورەتی (الفـتح) چونکە بـەموژدە دان بەسـەرکەوتنی موسوڵمانان دەستی پێ کراوە، ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً ...﴾

ئیمـام ئەحمـەدو موسـلیمو بوخـاری فەرمودەیـەکیان لەعەبـدوڵلای کـوڕی موغەففەلەوە ڕیوایەت کردوە، دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ ساڵێ ڕزگـارکردنی مەککـە لەڕێگـەدا کەچـوین بـۆ فـەتحی مەککـە بەسـەر وڵاغەکـەوە سـورەتی (الفـتح) ی بەدەنگی بەرز خوێندەوە، تەرجیعی تێدا دەکردو وشەکانی دەلارانـدەوە، معاوییـەی کوڕی قوڕڕە دەڵێ: ئەگـەر ترسـی ئـەوەم نەبوایـە: کـە خـەڵك لێم کودەبنـەوە، دەق وەکوو پێغەمبەرﷺ سورەتەکەم دەخوێندەوە.

پەیوەندی سورەتی فەتح بەسورەتی ( محمد ) ئەوە لەچەند ڕویەکەوەیە :

١- ئاشکرایە سەرکەوتن لە ئاکامی جیهادەوە پەیدا دەبێو بەروبوومی جیهادو تێکۆشانە، ئەوەبوو لەسورەتی (محمد)دا باسی چۆنیەتی شەڕو جەنگانی کردو فەرمانی بەموسوڵمانان کرد: کەدەست لەدوژمن نەپارێزن، لەم سورەتەش دا باسی شکۆمەندیو بەروبوومی ئەو جیهادو بەرەنگار بوونەوەی کرد.

٢- لەهەر دوو سورەتی(محمد)و (الفتح)دا پێناسەی موسوڵمانو کافرو دووڕووەکانی کرد.

٣- لەسورەتی (محمد)دا فەرمانی بەپێغەمبەر کرد: کە داوای لێخۆشبون بۆ خۆیو موسوڵمانان بکا، ئەم سورەتەشی بە دەستە بەربوونی لێخۆشبون دەست پێ کرد.

ئەم سورەتە وەکوو سورەتی پێش خۆی مەدەنییە، واتە: دوای کۆچکردن لەنێوان مەککەو مەدینەدا لەوکاتەدا: کە پێغەمبەر ﷺ لەپەیماننامەی (الحديبيە) دەگەڕایەوە، سورەتی مەدەنی تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بەزۆری هەڵسو کەتی دووڕوەکانو یاسای جیهادو عیباداتو (معاملات) ڕوندەکەنەوە، واتە: مەبەستە سەرەکییەکانی سورەتە مەدەنییەکان لەوبوارانەدا خۆیان دەنوێنن، چونکە سەردەمی پاش کۆچ سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامییە، دامەزراندنی دەوڵەتیش پێویستی بە یاسا هەیە..

لەبارەی فەزڵو گەورەیی ئەم سورەتەوە ئیمام ئەحمەدو بوخاریو تیرمیزیو نەسائی لەعومەری کوڕی خەتتابەوە ڕیوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نزل عليَ البارحة سورة أحب اليَ من الدنيا وما فيها: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً، لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾.

لەڕیوایەتێکی تردا فەرمودەکە بەم جۆرەیە (لقد أنزلت علي الليلة آية أحب الي مما على الأرض) دەقی ڕیوایەتی موسلیم بەم جۆرەیە (أحب الي من الدنيا جميعها) .

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم سورەتەو بارودۆخی نازڵبوونەکەی ڕودەکەینە سیرەی پێغەمبەرو کورتە باسێکی لێوە ڕاگوێزی ئێرەدەکەین، دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺلەوکاتەدا لەمەدینە بوو بەخەو بینی: کە چووە ناو مەککەوەو تەواف کابەی کرد، دوای ناوەڕۆکی خەوەکەی بەهاوەڵانی ڕاگەیاندو زۆری پێ کەیف خۆش بوون ..

ئەوە بوو تەشریفی لەمانگی زیلقەعیدەی ساڵێ شەشەمی کۆچی بەمەبەستی عەمرەکردن لەمەدینەوە بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، (١٥٠٠) هەزار پێنج کەس لەمهاجیرو ئەنصارو عەرەبە موسوڵمانەکانی دیکەی لەخزمەت دابوون، ئاژەڵی دیاریی لەگەڵ خۆی بردبوو، لەزیلحولەیفە ئیحرامی بەعەمرە بەست، ئوممو سەلەمەی خێزانیشی لەتەك خۆی دابرد بوو.

پێغەمبەرو هاوەڵانی بەنیازی شەڕ نەچوبونو جگە لەچەند پارچە چەکێکی وا کە موسافیر پێویستی بێ هیچی تریان پێ نەبوو، کابرایەکی خوزاعەی نارد بۆ بەتاقیکردنەوەی ڕێگاو بارو دۆخی مەککەو هەڵوێستی قورەیشو نیازو مەبەستیان بزانێ...

..کاتێ لەعەسفان (شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەداو دوقۆناغ ڕێ لەمەککەوە دوورە ) نزیکبونەوە بیشری کوڕی سەفیانی کەعبی: کەچاو ساغی پێغەمبەر بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو عەرزی کرد: قوربان قورەیش بەهاتنی تۆیان زانیوە، دەیانەوێ نەهێڵن بینە ناو مەککە: هێز وتوانایەکی زۆریان کۆکردۆتەو لەهەموو بنەماڵەو خێڵەکان خەڵکیان کۆکردۆتەوەو لەشکرکێشی یەکی زۆریان کردوە، چەند حوشترێکی شیر دەریان بە بێچوەکانیانەوە هێناوە بەتەمان زۆر بمێننەوە، سورن لەسەر ئەوە: کە نەهێڵن بچینە ناو مەککەوە!

ئـیتر پێغەمبـەر ﷺ عوسمـانی کـوری عـەففانی نـارد بـۆلای قورەیـشیەکان بۆئەوەی نیازی پێغەمبەریان پێ ڕابگەیـەنێ‌و ئـەوان جگـه لـه ئەنجامـدانی عـومرە بەنیازی هیچی تر نین، عوسمان بەڕێ کەوت‌و پاش ماوەیێک هەواڵێ بـۆ پێغەمبـەر هـات: کـه عوسمانیـان کوشـتووە، ئـیتر پێغەمبـەرﷺ هـاوەڵانی کـۆکردەوە، داوای بەیعەتی لـێ کردن، لەژێر درەختێك دا کـه لـەدواییدا بـە(شـجرة الرضـوان) نـاونرا کۆبونەوەی پێ کـردن، هـەموو هـاوەڵان پـەیمانیان پـێدا: کـه پـشتی بگـرن‌و خۆیـان لەپێناو ئایین دا بەخت بکەن، ئـەم پەیمانـە نـاونرا بـە (بیعـة الـشجرة) یـان (بیعـة الرضوان) .

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێ: ئێمە پەیمانمان بە پێغەمبەر ﷺداو فیداکاری خۆمان بۆ جەخت کردەوە: کـه ڕێگـای هـەڵاتن نەگرینـه بـەر، یـان سـەرکەوتن یـان شەهید بـوون، ئـەم خـۆگری‌و سوربوونەی هـاوەڵان لەسـەر جیهـادو خۆبـەختکردن ترسێکی زۆری خسته دڵی قورەیشەوە، خێرا داوای صوڵح‌و ئاشتییان کرد، هـەر لـەم سـەرو بەندەشـدا هـەواڵی ئـەوە بەپێغەمبـەرﷺ گەیـشت کـه عوسمـان نـەکوژراوەو هەواڵەکە درۆ بووە.

پەروەردگار دەربارەی ئەم پەیماننامەیە ئایەتی ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ ...﴾ الفتح/۲۸. نازڵ کرد

لەڕاستیدا ئەم پەیماننامە ئاشـتی یـە سـەرکەوتن بـوو، قۆنـاغی وەرچـەرخان بـوو، ئـەوە بـوو: کـه پێغەمبـەرﷺ گەڕایـەوە بـۆ مەدینـە، خەیبـەری ڕزگـار کـردو دەستکەوتەکەی بەسەر پەیماندەرانی حودەیبیەدا دابەش کرد.

وەکوو لەسیرەدا هاتووە ژمارەی بەیعەتکارانی (بیعة الرضوان) (۱۵۰۰) هـەزارو پێنج کەس بوو سێصەد لەوانـه ئەسـپ سـوار بـوون، مەشـهور وایـه دەڵێن: هـەزارو چوارسەد کەس بوون!

وەكوو وترا قورەیشییەكان: كە هەواڵی موبایەعەو پەیمانی هاوەڵانیان پێ گەیشت، سوهەیلی كوڕی عەمریان كردە نوێنەری خۆیانو ناردیان بۆلای پێغەمبەرﷺ بۆ گری بەندی ئاشتی (عقد الصلح) كە پێغەمبەر سوهەیلی بینی لەدوورەوە بەرەورِویان دەهات، فەرمووی قورەیشییەكان بەراستیانەو ئاشتییان مەبەستە، بۆیە ئەم پیاوە یان كردۆتە نوێنەری خۆیان، ئەمجار فەرمووی: ئێمە لەنێوان خۆمانو قورەیشدا پەیماننامە دەنووسینو مۆری دەكەین، ئیتر بانگی عەلی كوڕی ئەبوتالیبی كرد بۆ نووسینی پەیماننامەكە..

هەر لەسەرەتاوە سوهەیل: كە نوێنەری قورەیش بوو لەسەر دوخاڵ ورِكی گرت: یەكەمیان رِازی نەبوو بنووسرێ: (بسم الله الرحمن الرحيم) وتی: دەبێ (باسمك اللهم) بنووسرێ، دووەمیان رِازی نەبوو ناوی پێغەمبەر ﷺ بە (محمد رسول الله) بنووسرێ، وتی: دەبێ بنووسرێ (محمد بن عبدالله) پێغەمبەرﷺ بۆ هەر دوخاڵەكە رِازی بوو، كە بەویستی سوهەیل تۆمار بكرێن، هەر دولا رِێك كەوتنو پەیمانی ئاشتییان دا بۆماوەی (دە) ساڵ شەرِ راگرنو خەڵكی بەئارامیو ئاسایش ژیان بەسەر بەرن.

هەر كەسێك بەبێ ئیزنی وەلیو سەرپەرشتیاری لەمەككەوە بێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بیگێرِنەوە، ئەگەر لەموسوڵمانان گەرِایەوە مەككەو لەئایین پاشگەز بووەوە، قورەیشیەكان نەیگێرِنەوە بۆ مەدینە.

خاڵێكی تری پەیماننامەكە ئەوە بوو هەركەسێك بیەوێ لەم پەیمانی ئاشتی‌یەدا بچێتە ناو بەڵێنو پەیمانی پێغەمبەرﷺ یان هی قورەیش سەرپشكەو هیچ لایەك رِێگە نەگرن، ئەوە بوو خێڵی خوزاعە خێرا چوونە ناو عەهدو پەیمانی پێغەمبەرەوە، خێڵی بەنو بەكریش چونە پاڵ قورەیش.

خاڵێكی تر: ئەوە بوو دەبێ موسوڵمانان ئەمساڵ بگەرِێنەوە بەبێ ئەوەی بچنە ناو مەككەوە، ساڵی داهاتوو قورەیشیەكان مەككە چۆڵ بكەنو موسوڵمانان سێ رِۆژ بەچەكی سواریو شمشێر لەناو كالاندا بچنە ناو مەككەوە..

هەندێ لەهاوەڵان ڕێك كەوتن و پەیمانەكەیان بەدڵ نەبوو، چونكە پێیان وابوو غەدریان لێ كراوەو مەرجەكان زۆر بەیان لەبەرژەوەندی قورەیشیەكان دان، وەلێ لەڕاستی دا سەركەوتنێكی گەورە بوو بۆ موسوڵمانەكان، چونكە بۆ یەكەمجار قورەیشیەكان دانیان بەوە دانا: كە موسوڵمانەكان هەن و هێزێكی سیاسی و عەسكەرین، لەهەمان كات دا ئەو هودنەو شەڕ ڕاگرتنە ماندو حەسانەوەی موسوڵمانەكانی تێدا بوو، هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخسا: كە بانگەوازی ئیسلامی بڵاوبكەنەوەو بەم لاو بەولادا پەلیان هاوێشت و خەڵكێكی زۆر موسوڵمان بوون.

كەوابوو صوڵحی حودەیبیە خۆی لەخۆیدا سەركەوتن بوو، یان كلیلی سەركەوتن بوو، ئەوەتا لەكاتی صوڵحی حودیبییەدا ژمارەی موسوڵمانەكان هەزارو چوار سەد، یان كەمتر بوون، كەچی لەفەتحی مەككە دا: كە دوساڵ دوا ئەو پەیماننامەیە، ژمارەیان گەیشتە دەهەزار، كەڵەپیاوی وەكوو خالیدی كوڕی وەلیدو عەمری كوڕی عاص كە لەكاتی صوڵحەكەدا لەڕیزی قورەیشیەكان دابوون لەفەتحی مەككە دا لەڕیزی هاوەڵانی پێغەمبەر دا بوون ﷺ .

ئیبنو مەسعودو جابیرو (البراء) دەفەرمون: ئێمە ڕزگار كردنی مەككە بەسەر كەوتنی گەورەو یەكالاكەرەوە، لەقەڵەم دەدەین بەڵام ئێمە پێمان وایە سەركەوتنی ڕاستی صوڵحی حودەیبیە یە، ئیتر پێغەمبەرو هاوەڵانی بێ ئەوەی بچنە ناو مەككەو حەج و عەمرە ئەنجام بدەن گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەگەڕانەوەدا لەنێوانی مەككەو مەدینەدا لەشەودا ئەم سورەتە واتە: سورەتی (الفتح) نازڵ بوو.

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو نەسائی و ئیبنو جەریر لەعەبدوڵلای كوڕی مەسعود ڕیوایەت دەكەن دەڵێ: كە لەحودیبییە گەڕاینەوە بەرەبەیان لەشوێنێك لاماندا و خەومان لێ كەوت، تاخۆر لێ ی نەداین بەخەبەر نەهاتین، ئێمە لەخەو هەڵساین هێشتا پێغەمبەرﷺ لەخەودابوو، هاوەڵان وتیان: خەبەری بكەنەوە، پێغەمبەرﷺ لەخەو هەڵساو فەرمووی: (افعلوا ماكنتم تفعلون، وكذلك يفعل من نام أو نسي) واتە نوێژی بەیانی بە (قضا) بكەن هەر كەسێ بەهۆی خەوەوە یان

لەبیر چوونەوە نوێژی چوو دوایی قەزای دەكاتەوە! ئەمجار سەرژمێری وشترەكانمان كـرد، حوشـتری تایبـەتی پێغەمبـەرﷺ دیـار نـەبوو، قولاغمـان كـردو دیمانـەوە، هەوسـارەكەی لـەدارێك گـیرا بـوو، حوشـترەكەم بـەرەڵلا كـردو هێنـام بۆ پێغەمبەرﷺ سواری بوو..

لـەكاتێكا ئێمـە بـەرەو مەدینـە دەهاتینـەوە، سروشـتی بـۆ نـازڵ بـوو، پێغەمبـەرﷺ كـە نیگـای بـۆ دەهـات ئـەركی دەكەوتـە سـەرو سـواری وڵاخ بوایـە وڵاخەكە چۆكی دادەدا، بۆ خۆیشی ڕەنگی سور هەڵدەگەڕاو ئارەقی دەكرد، جا كە ئەو حاڵەتەی لەسەر نەما فەرمووی: سورەتی ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً ...﴾ نـازڵ بووە سەرم .

بـەڵێ بەڕاستی پـەیمانی حودەیبییـە فـەتحی مـوبین بـوو، ڕزگـار كـردن بـوو، ڕزگار بوون بوو لەخەتەری شەڕی قوڕەیش، بۆیە پێغەمبـەرﷺدوای پەیماننامەكە خۆی یـەكلا كـردەوە بۆبنـەبڕ كردنـی خەتـەری جولەكـەكان لـەنێو نیـوە دورگـەی عەرەبی دا.

هەر كە خەتەڕی بەنو قەینوقاع‌و بەنو نەضیرو بەنو قورەیظەی بنەبڕ كرد، ڕوی كردە بنەبڕ كردنـی خەتـەرێكی تـر: كـە لەهـەموو خەتـەرەكانی تـر سامناكتر بوو، ئەویش بریتی بـوو لەقـەڵای خەیبـەر كە هەمیـشە هەڕەشـەیەكی گەورە بـوو لەسەر ڕێگای شام ڕێگای بازرگانی‌و شـادەماری ئـابوری موسـوڵمانەكان، بەپـشتیوانی پـەروەردگار قـەڵای خەیبـەر ڕزگـار كـراو مـاڵ‌و سـامانێكی زۆر بـووە دەسـكەوتی موسـوڵمانەكان. پێغەمبـەرﷺ دابەشـی كـرد بەسـەر ئـەو هاوەڵانـەدا: كـە ئامـادەی پەیمانی حودیبییە بوو بوون .

بەڵی پەیمانی حودەیبیە فەتحی موبین بوو، ئەو وەصفەی قورئان بۆی دیاری كردوە پڕ بەپێـستیەتی، بـەڵكوو دەتـوانرێ بەیـەكێك لـەڕوداوە گرنگـەكانی سیرەی پێغەمبەر لەقەڵەم بدرێ‌و خاڵێ وەرچەرخانی مێـژووی ئیـسلامە، ئـەوەتا قـوڕەیش

دانیان نابەوەی: کە پێغەمبەرو هاوەڵانی هێزی سیاسیو عەسکەر بنو پێویستە حیسابی تایبەتییان بۆ بکرێ، پەیمانیان لەگەڵدا مۆر بکرێ!

## بەهرەو بەهای پەیمانی حودەیبیە

﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ ﴾

(الحاكم)و هی تریش لەمیسوەری کوڕی مەخرەمەو مەروانی کوڕی (الحكم)ەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێن: سورەتی (الفتح) لەسەرەتاوە تاکۆتایی لەنێوان مەککەو مەدینەدا نازڵ بووە.

هەردوو پیری فەرمودەو ئەحمەدو تیرمیزیو (الحاكم) لە ئەنەسەوە ڕیوایەت دەکەن، دەڵێ: ئایەتی ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ ...﴾ لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر لە صولحی حودیبیە نازڵ بووە، ئەو دەمە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لقد أنزلت على آية أحب الى مما على الأرض) ئایەتێکم بۆ سەر نازڵ بووە لەهەموو دونیام خۆشتر دەوێ. ئەمجار ئایەتەکەی بەسەر هاوەڵانی داخوێندەوە، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەم خەڵاتەت پیرۆز بێ، بەڕاستی خودا داهاتوی بۆ دیاری کردوی، ئەی دەبێ چی بۆ ئێمە دیاری کردبێ؟ ئیتر ئایەتی: ﴿لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ تا گەیشتە ﴿فَوْزاً عَظِيماً﴾ نازڵ بوو .

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ : جولەکەکان بە نازڵبوونی ئایەتی: ﴿وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ﴾ پێخۆشحاڵی خۆیان دەربڕی بەوەی: کە پێغەمبەرو موسوڵمانان ئاگاەو سەرەنجامی خۆیان نازانن، وتیان: چۆن ئێمە

شوێن پیاوێ بکەوین کەنازانێ چی بەسەر دێ؟؟ پێغەمبەر ﷺ زۆری ئەوە پێ ناخۆش نەبوو، ئیتر پەروەردگار ئایەتی:

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً﴾ نازڵ کرد. ئێمە شکۆمەندیو سەرکەوتنێکی ئاشکراو گەورەمان پێ بەخشیوەی، ئەویش صولحی حودەیبییەیە: کەرێگا خۆشکەرەو کلیلی دەرگای سەرکەوتنو فەتحی مەککە بوو، هۆی بڵاوبوونەوەی زانیاری بەسودو بانگەوازی ئیسلامیو چەسپاندنی ئیمان بوو، یان مەبەست بەو فەتحە ئاشکراو یەکالاکەرەوەیە خودی فەتحی مەککە یە، پەروەردگار پێش وەخت مژدەی بە پێغەمبەرﷺداوە.. کەئەو سەرکەوتنە گەورەیەی دەستگیر دەبێ.

﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ بۆ ئەوەی خودا لە تاوانی رابردوو داهاتوت خۆش بێ ئەگەر هەتبێ.. واتە: بۆ ئەوەی لەگەڵ لێخۆشبون لەتاوان نیعمەتی سەرکەوتنو باڵا دەستیت بۆ دەستە بەر بێ، شارەزای رێگا راست بێو سەرکەوتنی پیرۆز بەدەست بێنێ، شکۆمەندی دونیاو قیامەتت دەست بکەوێ.

هەڵبەتە وەکوو چەند جارێکی تر لەوەپێش ئاماژەمان پێ کردوە پێغەمبەران بەتایبەتی پاش بوونیان بە پێغەمبەر (معصوم) ن، واتە: تاوانیان نیەو شتێك ناکەن تاوان بێ، کەواتە دەبێ هەموو کاتێ وەپاڵدانی تاوان بە پێغەمبەر بەئەگەرەوە پەیوەستی بکەینو بڵێین ئەگەر تاوانی هەبێ، یان مەبەست بەتاوان، ئەنجامدانی کاری (خلاف الأولى)یە، واتە: ئەنجامدانی کاریی باش لەگەڵ ئەوەدا دەکرا کاری باشتر ئەنجام بدرێ، ئەمەش دەچێتە بواری (حسنات الأبرار سيئات المقربين) وە.

واتە هەندێ جار کردەوەی باشی پیاو چاکان بۆ ئەوانەی نزیکی بارەگای ئەقدەسن بەخراپە دەژمێردرێ!! کەمترینو بچوکترین هەڵە بۆ پێغەمبەران بەتاوان دەژمێردرێو لەکاتێکدا لەوانەیە ئەو هەڵە بچوکە بۆ کەسانی دیکە بەچاکە بژمێردرێو پاداشتی لەسەر وەربگرێتەوە.

ئیمام ئەحمەدو خاوەنانی کتێبەکانی فەرمودە جگە لە ئەبوداود، لە موغەیرەی کوڕی شوعبەوە ڕیوایەتیان کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هێندەی شەو نوێژ دەکردو بەپێوە لەنوێژدا ڕادەوەستا قاچی دەهاوسان، عەرز یان کرد ئەی پێغەمباری خودا، ئەوە تۆ بونەوەندە خۆت ماندوو شەکەت دەکەی؟ چما خودا لێت خۆش نەبووە؟ ئەوە نیە خودا لەتاوانی بەرو دوات خۆش بووە، لەوەڵام دا دەیفەرموو: (أفلا أکون عبدا شکورا) بۆچی بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم؟!

﴿وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطاً مُسْتَقِيماً، وَيَنْصُرَكَ اللَّهُ نَصْراً عَزِيزاً﴾

هەروەها بۆ ئەوەی پەروەردگار نیعمەتی خۆی بەتەواوی بۆ تۆ دەستە بەر بکا، ڕێزو نرخی لەدڵی موسوڵمانان دازیاد بێ، ئایینی ئیسلام بە ناو خەڵك دا بڵاو بێتەوەو گەشە بکا، بەهەر چوار لادا پەل‌وپۆ بهاون ناوچەو هەرێم ڕزگار بکەن، وڵات بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆتانەوە، شکۆمەندیو سەربەرزی دونیاو قیامەت دەستە بەر بکەن. پەروەردگار شارەزای ڕێبازی ڕاستو پەسندت بکا، شەریعەتو یاسای گونجاوت بۆ بنێرێ، لەسەر ئیمانو خودا پەرستیو فەرمانبەرداری ڕاوەستاوت بکا، زاڵت بکابەسەر دوژمنانت داو ئیتر ژێر دەستەیو چەوساندنەوەی ناحەزانت نەبینی! باڵا دەستی یاسای ئیسلامو فەرمانڕەوای دەوڵەتی ئیسلام لەناوەو دەرەوەدا دەستەبەر ببێ، پێغەمبەرﷺوێڕای پلەو نیشانی پێغەمبەرێتی دەسەڵاتی ڕامیاریو عەسکەریشی بدرێتیو پێشەوای ئاینی وسیاسی بێ!

## کاریگەری صوڵحی حودەیبییە لەسەر موسوڵمانو دووڕوو موشریکەکان

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا

﴿٤﴾ لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوۡزًا عَظِيمٗا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَلَعَنَهُمۡ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرٗا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾

لەوەپێش ئەوەی ڕاگەیاند: کە خودا فەزڵو نیعمەتی خۆی بەسەر پێغەمبەردا ڕشتووەو یارمەتی دەداو زاڵی دەکا بەسەر ناحەزانیدا، ئەمجار هەندێ فەزڵو نیعمەتی خۆی بەسەر موسوڵمانان دا باس دەکاو بڕێ هۆکاری سەرکەوتن: کە خۆڕاگریو دڵ دامەزراوی موسوڵمانەکانە لەگۆڕەپانی جەنگدا ڕادەنوێنێ...

دوایی دابو نەریتی خودایانەی خۆی لەبوونەوەردا ڕون دەکاتەوە، بەو جۆرە کە هەندێ کەس بەسەرهەندێکی تردا زاڵ دەکا، وەرەی سەربازە خاوەن باوەڕەکان بەرزدەکاتەوە، وادەی چونەناو بەهەشتو مانەوەیان تێیدا بۆهەتا هەتایە پێ دەدا، هەڕەشە لە کافرو دووڕووەکان دەکا، عەزابی سەختی بۆ ئامادە کردون غەزەبیان لێ دەگرێو لەڕەحمەتی خۆی بێ بەرییان دەکا، دەفەرموێ:

﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَاناً مَعَ إِيمَانِهِمْ﴾

پەروەردگار خودایەکی وەهایە ڕۆژی صولّحی حودەیبیە ئارامیو ورەبەرزی خستە دڵی خودا پەرستانەوە، لەو ڕۆژەدا مەردایەتیان نواندو فەرمانبەرداری حوکمی خودا بوون، بەدڵسۆزیو لێبڕانەوە خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ ورووبەڕوو بوونەوەی دوژمن، خودا ورەبەرزی پێ بەخشین بۆ ئەوەی دڵە کوتە یان پێ نەگاو لەتەنگانە دا ئەژنۆیان نەلەرزنو چەواشەیی ڕویان تێ نەکا، هەروەها بۆ ئەوەی دڵنیایی زیاتریان پێ ببەخشێو ئیمانیان بەهێز ببێ. گیانی مەعنەوییان بەرز بێتەوە..!

ئیمامی بوخاریو ئیمامانی تر ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەوە: کە ئیمان زیادو کەم دەکا، هەندێ لەزانایان پێیان وایە: زیادبوونی ئیمان بریتیە لەئیمانهێنان بەشەریعەت دوای ئیمانهێنان بە تاكو تەنهایی خودا.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: یەکەم شت: کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی یەکتاپەرستی بوو، جا: کە ئیمانیان بەتاكو تەنهایی خودا هێنا، ئەمجار پەروەردگار حوکمو یاسای نوێژو ڕۆژوو زەکاتو جیهادی نازڵ کرد.

ئەمجار ئەوەرا دەگەیەنێ: کە پەروەردگار دەتوانێ تۆڵە لە کافرەکان بستێنێ، دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ واتە: پەروەردگار خۆی هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە بەفریشتەو ئادەمیزادو جندۆکەو شەیاتینیو هەموو هێزو وزەکەونییەکانی وەکوو بوومەلەرزەو بورکانو زریان ڕەشەباو لافاو دەریاو شتەکانی تر.

خودا بۆخۆی دەتوانێ یەك فریشتە بنێرێ ولاتێ: وێران بکا، گەلو نەتەوەیەك لەناو بەرێ، وەلێ خودا کە ئەوەی نەکردوەو ئەرکی جیهادو تێکۆشانی خستۆتە سەر موسوڵمانانو فەرمانی پێ کردون بەئەنجامدانی لەبەر بەرژەوەندییەکی گەورەو بەبەهایە. حیکمەتێکی گەورەی تێدایە، پەروەردگار

هەمیشه زانایه به بەرژەوەندی بەندەکانی‌و دانایه لـه کردەوەکانی دا چی بکا بـێ حیکمەت نیەو پڕە لەبەرژەوەندی!

﴿لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّـرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَكَـانَ ذَلِـكَ عِنْـدَ اللَّـهِ فَـوْزاً عَظِيمـاً﴾ واتـه: خـودا موسوڵمانان تـاقی دەکاتەوە، بەزۆرشت، فـەرمانیان پـێ دەکا بـەجیهادو تێکۆشـان ڕو بـەڕو بوونـەوەی دوژمن، ئەرکی جۆراو جۆریان دەخاتە سەرو توشی جـۆرە هـا خۆشـی‌و ناخۆشـییان دەکا، بۆ ئەوەی موسوڵمانان بەئافرەت‌و پیاویانەوە بخاتـە نـاو بەهەشـتەوەو کـافران بە ئاگری دۆزەخ سزابدا. یان خودا کە فەتحی پیرۆزی بۆ دەستەبەر کردی، یان: کـە ئارامی‌و سەکینەی خستە سـەر دڵـی موسـوڵمانان بـۆ ئەوەیە ئاکامەکـەی ئـەوە بـێ موسوڵمانان بخاتە ناو باغە جوانەکانی بەهەشتەوەو بەختەوەریان بکا، تاوانەکانیان پەردە پۆش بکا، لێیان خۆش بێ، ئەوە وادەو بەڵێنـە بـەبردنی موسـوڵمانان بـۆ نـاو بەهەشـت‌و لێخۆشـبوون لـەتاوانیان لـەلای خـودا بـەمراز گەیـشتنێکی گـەورەو شـکۆمەندە، ڕزگـار بوونـە لـە ناخۆشـی‌و گەیـشتنە بەخۆشـی‌و بەختـەوەری وەکـوو لەئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿فَمَن زُحْـزِحَ عَـنِ النَّـارِ وَأُدْخِـلَ الْجَنَّـةَ فَقَـدْ فَـازَ﴾ آل عمران/١٨٥.

جابیر ڕەزای خودای لـێ بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (لا یـدخل النـار احـــد بـــايع تحـــت الـــشجرة) هـــيچ یـــەكێك لەوانـــەی لـــەژێر درەختـــی (بیعة الرضوان)دا پەیمانی داوە ناچێتە ناو دۆزەخەوە.

﴿وَيُعَـذِّبَ الْمُنَـافِقِينَ وَالْمُنَافِقَـاتِ وَالْمُـشْرِكِينَ وَالْمُـشْرِكَاتِ الظَّـانِّينَ بِاللَّـهِ ظَـنَّ الـسَّوْءِ﴾ هـەروەها بـۆ ئـەوەی ئـەهلی دوڕوو - بـەپیاوو ئافرەتـەوە، بتپەرسـتەکان بەپیاوو ئافرەتیانەوە: ئەوانەی گومانی خراپیان دەربارەی خودا هەیە- سزایان بـدا، دڵتەنگ‌و خەفەتباریان بکا بەهۆی ئەوە کە دەبیـنن ئـاییني ئیـسلام بـڵاو بێتـەوەو گەشـە دەکـا، موسـوڵمانان سـەرکەوتن بەدەسـت دێـنن‌و کافرەکـان تێدەشـکێن،

دەکوژرێن، دەگیرێن، ماڵوێران دەبن، لەقیامەتیش دا عەزابی دۆزەخ بۆیان ئامادەیە، چونکە گومانی خراپیان بەخودا هەیە، ملکەچی حوکم شەریعەتی خودا نابن، پێیان وابو وپێغەمبەرو هاوەڵانی دەفەوتێن‌و نامێنن، کوفر باڵا دەست دەبێ.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ أَبَداً﴾ الفتح/١٢.

لەئایەتەکەدا دوڕوەکانی پێش موشریکەکان خست چونکە زیانی دوڕووەکان لەهی موشریکەکان گەورەترەو خەتەریان لەسەر ئیسلام زیاترە.

﴿عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيراً﴾ ئەو گومانە خراپەی بەموسوڵمانانی دەبەن لەسەر خۆیانە، ئەو بەدبەختی‌و چارە ڕەشییەی بەهیوان توشی موسوڵمانان بێ، یەخەی خۆیان دەگرێ، بەسەر خۆیان دا دەشکێتەوەو لێ ی قوتار نابن، خۆیان توشی کوشتن‌و دیلی‌و سەرگەردانی دەبن، وێڕای ئەوانەش خودا لێیان ناڕازییە، دۆزەخی بۆ ئامادە کردون، دەچنە ناوی‌و بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە. بەڕاستی شوێنێکی خراپ‌و پڕ ئازارە بۆی دەچن، سەرەنجام‌و ئاکامێکی خراپە تێی دەکەون، ئەوانە بەد بەختی دونیاو قیامەتن هیچ کاتێك خۆزگەیان پێ ناخوازرێ.

ئەمجار پەروەردگار دەسەڵات‌و توانای بێ سنوری خۆی ڕادەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزاً حَكِيماً﴾ هەموو هێزو توانایەکی ناو ئاسمانەکان‌و سەر زەوی هی خودایە، هەمو شتێکی بوونەوەر سەربازی خودان، فریشتەو ئادەمیزادو جندۆکەو شەیتانی‌و هەموو هێزەکانی تر هی خودان‌و دەتوانێ دوژمنەکانی بپروێنێ‌و لەناویان بەرێ، خودا هەمیشە خاوەن دەسەڵات‌و باڵا دەست بووە، کەس بەسەریدا زاڵ نابێ، داناو لێزانە لەپلان‌و کردەوەی دا، لەهەڵسوڕان‌و بەڕێوەبردنی بوونەوەردا!!

ڕیوایەت کراوە: کە پەیمانی حودەیبیە مۆر کرا عەبدوڵلای کوڕێ ئوبەی سەرۆکی دووڕووەکان وتی: ئایا موحەمەد وادەزانێ کە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ دانیشتوانی مەککە دامۆر کرد، یان مەککەی کۆنترۆڵ کرد ئیتر دوژمنی نامێنن، خەیاڵێ خاوە، ئەی چی لەفارس و ڕۆم دەکا؟! بۆیە پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند: کە سەربازانی خودا زۆرو بێ ئەژمارن، فارس و ڕۆم لەئاستی سەربازانی خودا دا بەهیچ دەژمێردرێن.

## ئەرکی پێغەمبەرو سودی ڕەوانەکردنیو مانای پەیمان پێدانی لەحودەیبیەدا

﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيۡهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١٠﴾ ﴾

لەوەپێش باسی پەیمانی حودەیبیەی کردو سەروەری ئەو فەتح و سەکەوتنەی ڕاگەیاند، ئەمجار باسی تایبەتمەندی پێغەمبەر دەکاو سەرنجی موسوڵمانان ڕا دەکێشێ بۆ ئەرکی سەرشانیان بەرامبەر خوداو یاساو شەریعەتی، ئەوەشیان بەگوێدا دەدا کە ئەوانەی بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ

کردوە لەڕاستی دا بەیعەتیان لەگەڵ خودا کردوە، ئەمەش ڕێزو بەهایەکی تایبەتی بەو پەیمانە مێژوویە دەبەخشێ، دەفەرموێ:

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً، لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە شایەت بێ لەسەر ئادەمیزاد لەسەر ئوممەتەکەت بەوە: کە پەیامی خۆت پێ ڕاگەیاندون مژدەی بەهەشت بە خوداپەرستان

بدەی‌و کافرو یاخی بووان لەعەزابی دۆزەخ بترسێنێ.. ئێمە تۆمان ناردوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد ئیمان بێنن بە خوداو بە پێغەمبەری ، ئیمانی خۆیان بەهێز بکەن‌و لەدڵ دا هەست بەشکۆمەندی خودا بکەن، یارمەتی ئایینی خودا بدەن‌و ڕێزی لێ بگرن، یەکتاپەرستی بکەن‌و لەهەموو عەیب‌و خەوشێك بێ پارێزن، هاوەڵ‌و منداڵێ بۆ بەرەوا نەزانن، یان بەیانی‌و ئێواران تەسبیحاتی خودا بکەن، نوێژی بەیانی‌و نیوەڕو عەصر ئەنجام بدەن.

پێغەمبەرﷺ شایەتە بەسەر ئەو ئادەمیزادانەی بۆ سەریان ڕەوانەکراوە، شایەتی دەدا لەسەر ئەوە کە پەیامی خۆی پێ ڕاگەیاندون، ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە، شایەتی دەدا: کە ئادەمیزاد چۆن بەپیر بانگەوازییەکەیەوە چوون، هەیانە ئیمانی پێ هێناوەو هەیانە پشتی لێ هەڵکردوە، هەشیانە دووڕووە بەڕواڵەت ئیمانی هەیەو بەموسوڵمان دەژمێردرێ، لە دڵیش دا کافرو بێ باوەڕە، هەیانە چاکە خوازو چاکەکارە، هەیانە ئاشوبگێڕو فیتنە جۆیە.

چۆن پەیامی خۆی گەیاندوە، ئاواش شایەتی دەدا، موژدەی خێرو خۆشی‌و بەختەوەری بەخودا پەرستان دەدا، کافرو موناڤیق‌و یاخی بووان لەسەرەنجامی بەدبەختی‌و عەزابی دژوار دەترسێنێ.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ﴾ دڵنیابە ئەی پێغەمبەر: ئەوانەی لەژێر درەختی (الرضوان)دا ڕۆژی حودەیبییە پەیمانیان پێدای لەسەر جیهادو شەڕو

خۆبەختکردن دژی قورەیش، ئەوە بەیعەتیان لەگەڵ خودادا مۆر کردوە، پەیمانیان بە ئەو داوە، ئەوان گیانو ماڵی خۆیان فرۆشتووە بەبەهەشتو سەودایەکی سودمەندییان گرێ داوە، چونکە لەڕاستی دا

فەرمانبەرداری پێغەمبەرﷺ فەرمانبەرداریی پەروەردگارە، گوێڕایەڵی بۆفەرمانی پێغەمبەر ﷺ گوێڕایەڵییە بۆفەرمانی خودا.

﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ پەروەردگار هەمیشە لەگەڵیان دایەو ئاخاوتنیان دەبیسی ئاگاداری هەڵوێست بیروباوەڕیانە، کەوابوو بەیعەتدان بە پێغەمبەر بەیعەتدانە بەخودا، یان دەتوانرێ بەگوێرە بیروباوەڕی زانایانی سەلەف بڵێین: دەستی خودا لەژوور دەستی ئەوانەوەیە کە ئامادەی پەیمانی ژێر درەختی (الرضوان) بوون، ئەو پەیمانەی دایانە پێغەمبەرﷺ لەڕاستی دا داویانەتە خودا .

﴿فَمَنْ نَكَثَ فَإِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً﴾ کەسێك پەیمان بشکێنێو لەو سەودایە پەشیمان بێتەوە، ئەوە زیانی ئەو بەیعەت شکاندنە لەسە خودی خۆیەتیو بۆ خۆی خەسارەتمەندەو کەسی تر زیانی لێ ناکا، کەسێکیش وەفا بەعەهدو پەیمانی خۆی بکاو ئەوەی لەسەر شانیەتی ئەنجامی بدا، ئەو خودا پاداشی گەورەی دەداتێو دەیخاتە ناو بەهەشتەوە، ڕەزامەندیی خۆی لێیان ڕادەگەیەنێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا فەرموی ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً﴾ الفتح/١٨.

ئەم بەیعەتو پەیمان پێدانەی: کە موسوڵمانەکان دایانە پێغەمبەرﷺ بەیعەتی ژێر درەختی (رضوان) بوو، لەحودەیبییە لەژێر درەختی (سەمورە)دا خودا پەرستان پەیمانێکی مێژوویان دایە پێغەمبەرو خۆیان ئامادە کرد بۆ خۆبەختکردنو فیداکاری، بۆیە ڕەزامەندیی خودایان بەدەست هێنا، خودا لەکەلامی بەرزو پیرۆزی خۆی دا بەو جۆرە ڕەزامەندی خۆی لێیان تۆمار کردوە.

ژمارەی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە هەزارو چوارسەد کەس بووە، هەندێ ڕیوایەتیش هەن دەڵێن هەزارو سیسەد یان هەزارو پێنج سەد کەس بوون .

## حاڵو وەزعی خۆپاشدەرەکان لەچوون بۆ حودەیبییە

﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ

يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمۡ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبۡلُۖ فَسَيَقُولُونَ بَلۡ تَحۡسُدُونَنَاۚ بَلۡ كَانُواْ لَا يَفۡقَهُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٥﴾ قُل لِّلۡمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ سَتُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ قَوۡمٍ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَۖ فَإِن تُطِيعُواْ يُؤۡتِكُمُ ٱللَّهُ أَجۡرًا حَسَنٗاۖ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ كَمَا تَوَلَّيۡتُم مِّن قَبۡلُ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٦﴾ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبۡهُ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٧﴾

لەوەپێش باسی هەڵوێستی دووڕووەکانی کرد، ئەمجار دێتە سەر باسی کۆمەڵێك خۆ دزەرەوەو خۆ پاشدەر، ئەمانەش کۆمەڵێك ئەعراب بوون خێڵی ئەسلەمو جوهینەو موزەینەو غیفارو ئەشجەعو دیبەل) لەگەڵ پێغەمبەردا هاوبەشی چونە غەزایان نەکرد، چونکە پێیان وابوو پێغەمبەرو هاوەڵانی لەم سەفەرەیان دا سەرکەوتوو نابن .

دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنْ الآعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَا﴾ ئەی پێغەمبەر! لەوە بەولاوە خۆپاشدەرو خۆدزەرەوە عەرەبەکان لەچۆن بۆ غەزاو جیهاد لەپێناو ئایین دا دێنە لاتو عوزر دێننەوە بۆ نەهاتیان بۆ جیهادو

جـەنگان دژی دوژمـن، دەڵـێن: هـۆی نـەهاتنمان لەگـەڵ تـۆدا بـۆ جـەنگ‌و ڕوبـەڕوو بوونەوەی دوژمن هەڵەو گیربوونمـان بـوو بـەماڵ‌و منداڵمانـەوە، مەشـغەڵەت‌و کـارو کاسـبی‌و پارێزگـاری کردنـی مـاڵ‌و منـداڵمان وای لـێ کـردین نـەتوانین ئامـادەی بـەرەکانی جـەنگ بـبین، نەهاتنمــان بـەهۆی سەرپێـچیکردن‌و یاخــی بــوون لەفەرمانی تـۆ نـەبوو، بۆیـە داوات لـێ دەکـەین لـەخودا بپاڕێیـەوە لێمـان خۆشـبێ‌و عوزرمان قبووڵ بێ!!

هەڵبەتـە ئەمـە یەکێکـە لـەموعجیزەکانی قورئـان، پـێش وەخـت لەڕێگـەی گەڕانـەوەی پێغەمبـەرﷺ لـە صـوڵحی حودەیبییـە پـەروەردگار هـەواڵی پێـدا: کـە دواکەوتووەکان لەجەنگ دێنـەلات‌و پاسـاو بـۆ خۆپاشـدانەکەیان دێننـەوە، دیانـەوێ تاوانەکـەیان بـەوبیانوە بـێ جێیـە دابپۆشـن، لـە ڕاسـتی دا ئەوانـە تاوانبـاربون‌و بەئەنقەست خۆیان لە چۆن بۆ ئەو سـەفەرە پاش دابـوو، پێیـان وابـوو پێغەمبـەرو هاوەڵانی تێدا دەچن‌و لـەو سـەفەرەدا سەرکەوتو نـابن، بۆیـە پـەروەردگار بـەدرۆی خستنەوەو فەرمووی:

﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ ئەوانە ئەو عـوزرو پاساویان لەدڵەوە نیە، لەبیرو باوەڕەوە هەڵناقوڵێ، قسەیەکەو بەزوبان دەیکەن، دەیانەوێ بەچاوڕاو بـەدرۆ دەلەسـەخۆیان ڕزگـار بکـەن، هـۆی ئامـادە نـەبوونیان ترسـان لەجـەنگ‌و ڕوبـەڕو بونـەوەی قـوڕەیش بـوو، پێیـان وابـوو پێغەمبـەرو هـاوەڵانی لەوجەنگـەدا تێدەشکێن توشی جورتم‌و فەوتان دەبن.

﴿قُلْ فَمَنْ يَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرّاً أَوْ أَرَادَ بِكُـمْ نَفْعاً بَـلْ كَـانَ اللَّهُ بِمَـا تَعْمَلُـونَ خَـبِيراً﴾ ئـەی پێغەمبـەر پێیـان بڵـێ: کـێ دەتـوانێ: ئـەوەی خـودا لەچارەی نووسـیبون لـەخێرو شـەڕ بیگێڕێتـەوە؟! کـێ دارای ئـەوەی هەیـە قـەزاو قەدەری خودا ڕەت بکاتەوە؟ واتە: هیچ کەس ناتوانێ ویستی خـودا بەربەسـت بکـاو نـەهێڵێ بێتـە جێ، بـەڵکوو لەڕاسـتی دا دواکەوتنەکـەتان لەترسـان بـووە، خـوداش

ئاگاداری نیازو کردەوەکانتانە، دەزانێ: نەهاتنتان بۆ جەنگ بەهۆی هەڵەو گیربوون بەماڵو منداڵەوە نەبوو، بەڵکوو لەبەر گومانی خراپو ترسان لە قورەیش‌و هاوپەیمانەکانیان بوو، بتمانەتان بەیارمەتیدانی خودا نەبوو .

﴿بَلْ ظَنَنْتُمْ أَنْ لَنْ يَنْقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ أَبَداً وَزُيِّنَ ذَلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ وَظَنَنْتُمْ ظَنَّ السَّوْءِ وَكُنْتُمْ قَوْماً بُوراً﴾ بەڵکوو گومانتان وابوو: کە پێغەمبەرو هاوەڵانی لەم سەفەرەدا هەموویان دەکوژرێن‌و لە بێخ دەردەهێنرێن‌و کەسیان لێ ناگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵو خێزانی خۆی، بەخەیاڵێ خۆتان خۆتان لەو فەلاکەت و هیلاکەتە پاراست‌و شەیتان ئەو گومانەی لەدڵتان دا شیرین کردو ئەو کارە ناشیرینەی لەپێش چاو جوان کردن، ئێوەش پەیڕەوی فەرمانی شەیتانتان کردو پێڕو تاقمێکی خوێڕیو فەوتاوو بێ خێربوون .. واتان لەخۆتان کرد بەکەڵکی هیچ کارێکی باش نەیەن‌و شیاوی عەزابی سەخت بن!خۆتان دەرخست: کەبێ بڕوان!

﴿وَمَنْ لَمْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَعِيراً﴾ هەر کەسێك بڕوای بەتاك‌و تەنهایی خوداو ڕاستی ئاینی ئیسلام نەبێ‌و شوێن پەیامی پێغەمبەری خودا نەکەوێ، فەرمانبەرداری فەرمانی خودا نەبێ‌و بەدڵسۆزی ئەرکی سەرشانی ئەنجام نەدا، نیشانەی ئەوەیە کافرو بێ بڕوایە، ئێمەیش بۆ ئەوانەی ئاوا کافرو بێ بڕوان، سزای سەختی دۆزەخمان ئامادە کردوە.

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ خودا خاوەن دەسەڵات‌و توانای ڕەهاو بێ سنوورە، هەرچی بیەوێ لەئاسمانەکان‌و زەوی دا ئەنجامی دەداو کەس نیە بتوانێ بێیتەلەمپەر لەبەردەم ویستەکانی‌دا، چۆنی بوێ ئاواکارو باری بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، بەویستی خۆی لەهەندێ تاوانبار خۆش دەبێ‌و سزایان نادا، هەندێکی تریش بەئاگری دۆزەخ سزادەدا، کەس نیە حوکم‌و بڕیارەکانی ڕا بگرێ، یان هەڵیان وەشێنێتەوە ..

هەمیشه خودا لێخۆشبوو تاوانپۆشی بەندە تۆبەکارەکانیەتی، خاوەن ڕەحمو بەزەییە بۆ هەموو خەڵك، وێڕای ئەو هەموو کوفرو بێ دینیەیان لەدونیادا مۆڵەتیان دەدا بۆ ئەوەی بەخۆیان دا بچنەوەو تۆبە بکەن، ڕەحمەتو لێخۆشبوونی خۆی تایبەت دەکا بەکەسانێك: کە بیەوێ لێیان خۆش بێ.

ئەمجار پەروەردگار پەردەلە سەر درۆو دەلەسەی خۆ پاشدەرەکان هەڵدەداتەوە، بەدرۆیان دەخاتەوە لەوەدا کە گوایە هەڵەو گیر بوونیان بەماڵو منداڵەوە بووەتە کۆسپو بۆیان نەکراوە ئامادە بن، ئەوەتا کاتێك ئێوە ئەی پێغەمبەر دەچن بۆ شەڕێ خەیبەر بەخەیاڵێ ئەوان ئێوە سەرکەوتن بەدەست دێننو دەسکەوتتان زۆر دەبێ، دەڵێن: بالەگەڵتاندا بین. دەفەرموێ:

﴿سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَى مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ﴾ لەمە بەولاوە کە دەچن بۆ دەست بەسەراگرتنی ماڵو سامانی جولەکەکانی خەیبەر ئەو خۆپاشدەرو خۆ دزەرەوە ئەعرابانە داواتان لێ دەکەنو لێیتان دەپاڕێنەوە دەڵێن: ڕێگەمان بدەن بالەگەڵتان دا بینو هاوکاریتان بکەین، چونکە ئەوان دڵنیابوون لەوەی: کە خودا وادەی بەموسوڵمانان داوە: کە خەیبەر دەخاتە بەر دەستی موسوڵمانەکانو دەسکەوتەکەی دابەش دەکرێ بەسەر ئەوانەدا: کە ئامادەی پەیمانو صوڵحی حودەیبییە بووە.

بەکورتی دەفەرموێ: ئەوانە ئەگەر ڕاستیان بکردایە: کەساماڵو ماڵو منداڵیان هەڵەو گیری کردونو نەیانتوانیوە ئامادەی حودەیبییە بن، نەدەپاڕانەوە: کە لەتەك پێغەمبەردا بچن بۆ خەیبەر!

﴿يُرِيدُونَ أَنْ يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ﴾ ئەوانە دەیانەوێ وادەو بەڵێنی خودا بگۆڕن، خودا وادەی داوە بەپێغەمبەرو موسوڵمانان کەماڵو سامانی جولەکەکانی خەیبەر دەخاتە دەسکەوتی موسوڵمانانو دابەش دەکرێ بەسەر ئەوانەدا ئامادەی حودەیبییە بوون، ئەوانە دەیانەوێ خۆیان بکەنە هاوبەشی ئەو فەتحەو دەسکەوتیان بێ..

ئەوە بوو پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد کە بچێ فەتحی خەیبەر بکاو جگە لەئامادە بووانی حوودەیبییە کەسی تر لەگەڵ خۆی نەباو دەسکەوتەکەش هەر بەسەر ئەوان دا دابەش بکا ﴿قُلْ لَنْ تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِنْ قَبْلُ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەبێ پێچ و پەنا پێیان بڵێ: ئێوە لەگەڵمان نایەن بۆ خەیبەر، نابێ بێن، ئەوە بڕیاری پەروەردگارەو پێش گەڕانەوەمان لەحودەیبییە خودا ئەمەی پێ ڕاگەیاندوین، بڕیاری پەروەردگارەو هەڵناوەشێتەوە، دەسکەوتی خەیبەر تەنها بۆ ئەوانەیە ئامادەی پەیمانی حودەیبییە بوون و کەسی تر بەشی تێدا نیە.

﴿فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا﴾ کاتێك خۆپاشدەرەکان ئەم بڕیارە دەبیستن دەڵێن: نەخەیر شتی وانیە، ئەوە حەسودی و بەرچاو تەنگییە: کە ڕێگەمان نادەن لەگەڵتاندا بێین بۆ خەیبەر، دەتانەوێ دەسکەوتەکە بۆ خۆتان پاوان بکەن و بەشی ئێمەی تێدا نەبێ، پەروەردگار ڕەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿بَلْ كَانُوا لا يَفْقَهُونَ إِلاّ قَلِيلاً﴾ نەخەیر وانیە ئەوان بەهەڵە چون، هەرگیز ئێوەی موسوڵمان و خودا پەرست حەسودو بەرچاو تەنگ نین، پێتان ناخۆش نیە ئەوانیش دەسکەوتی جەنگیان دەست بکەوێ، بەڵکوو ئەوانە کەم تێدەگەن و لەکاروباری ئایین نازانن، هیچ لەوە حاڵی نین: کە جەنگ کردن و جیهاد لەبەر ڕەزامەندی خودایەو بۆ دەستکەوت و غەنیمەت نیە.

ئەوانە لەکاروباری دونیاییدا شارەزاو کارامەن، وەلێ دەربارەی ئایین کەم فام و کەو دەنن، هەر لەڕوی نەزانی و نەفامییانە کە هەوڵ دەدەن حوکمی خودا هەڵوەشێننەوە، موسوڵمانان بەحەسودو بەرچاو تەنگ لەقەڵەم دەدەن، ئەوانە تێفکرین و لێ وردبوونەوەیان نیە، گەل و نەتەوەیەکی مادی و مادەپەرستن، لەکاروباری دونیادا شارەزان ..

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رون دەکاتەوە: کە گۆڕەپانی جیهادو جەنگان لەگەڵ دوژمن بەرفراوانو دورودرێژە، ئەگەر ئەوانە بیانەوێ دڵسۆزی خۆیانو پێغەمبەرو موسوڵمانان بچەسپێنن، دەفەرموێ:

﴿قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنْ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو ئەعرابە پاشکەوتووە خۆپاشدەرانە بڵێ: ئەگەر دەیانەوێ بەڕاستی ئیمان بهێننو بێنە ژێر سایەی ئیسلامەوەو خۆیان لە ریزی جەنگاوەرانی ئیسلام دا پۆلێن بکەن، پێیان بڵێ: لەوە بەولاوە ئێوە ڕوبەڕوی گەلو نەتەوەیەکی ئازاو نەبەردو مەرد دەبنەوە، خۆتان بۆ شەڕ لەگەڵ نەتەوەیەکی خۆڕاگرو پشوو درێژو توندو تۆڵو بەهێزو توانا ئامادە دەکەن ، جا ئەو گەلو نەتەوەیە یان ئەوەتا شەڕتان لەگەڵ دەکەن یان ئیمان دەهێنن ..!

ڕاڤەکەرانی قورئان دەربارەی دیاریکردنی ئەو گەلو نەتەوەیە زۆر ڕاوو بۆچونیان دەربڕیوە: هەندێك پێیان وایە مەبەست هۆزی هەوازینو غەتەفانە کەموسوڵمانان دوای ڕزگار کردنی مەککە ساڵی هەشتەمی کۆچی شەڕیان لەگەڵ کردن.

هەندێ: دەڵێن: مەبەست بەو گەلو نەتەوەیە هۆزی (ثقیف)ە هەندێکی تر دەڵێن: مەبەست بەو گەلە هۆزی بەنوحەنیفەیە کە بەپیلانی موسەیلیمەی درۆزن دوای لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺ هەڵگەڕانەو خۆیان تەیار کرد بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان.

هەروا هەندێ هۆزو خێڵی تریش لەئیسلام پەشیمان بوونەوەو هەڵوێستی دژ بەئاینیان نواند، حەزرەتی ئەبوبەکر شەڕی لەگەڵ کردنو بەسەریان دا زاڵ بوو، ئەوی کوژرا کوژراو ئەوانی تر موسوڵمان بوونەوە، زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئان ئەم ڕایەیان بەلاوە پەسندە چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ:

﴿تقاتلونهم أو يسلمون﴾ یان موسوڵمانبوون یان بەشمشێر لەملیان دەدرێ بەلای ئەبو حەنیفەوە تەنها عەرەبە موشریکەکانو پاشگەزبووەکان سەرانە (جزیە)یان لێ ناسەندرێ بەڵکوو یان دەبێ ئیسلام قبوڵ بکەن یان دەکوژرێن، جگە لەوان دەتواندرێ سەرانەیان لێ بسێندرێ.

شافیعی دەفەرموێ: سەرانە تەنها لە ئاگر پەرست (مجوس)و ئەهلی کیتاب (جولەکەو فەلە) وەردەگیرێ، لەموشریکی عەرەبو ناعەرەب وەرناگیرێ. هەندێکی تر پێیان وایە ئەو قەومە ئەهلی فارسو ڕۆمو وەسەنییەکانن.

بڕێکی تر دەڵێن: ئەو قەومە کوردە، سەفیان لە ئەبوخالیدەوە لەباوکییەوە لە ئەبو هورەیرەوە بۆ دیاریکردنی ئەو گەلو نەتەوەیە دەفەرموێ: (هم البارزون). هەرسەرفیان لە (الزهری)یەوە لەسە عیدی کوڕی موسەییەبەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: (لاتقوم الساعة حتى تقاتلوا قوماً صغار الأعين ذلف الأنوف كأن و جوهم المجان المطرقة) سەفیان دەڵێ: مەبەست گەلی تورکە.

ئیبنو ئەبو عومەر دەڵێ: لە شوێنێکی تردا مِن دیومە ئەبو خالید لەباو کییەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: ئەبو هوڕەیرە هاتە لامانو تەفسیری ڕستەی (لاتقاتلوا قوماً نعالهم الشعر)ی بۆ کردین فەرمووی: (هم البارزون) واتە: گەلی کورد[1] تەنانەت هەندێ کەس بۆ ئەوە چون کە عەشیرەتی بارزان بەم بۆنەوە ناوی خۆی وەرگرتبێ لە(بارزان)ەوە، واتە: لە (البارزون) وەرگیراوە .

لە ڕیوایەتی موسلیمو بوخاری دا هاتووە: ئەبوهورەیرە دەفەرموێ: صحبت رسول الله ﷺ ثلاثة سنين وفي أخرى اربع سنين والكل صحيح بحذف الشهور فى الأولى وادخالها فى الثانية، لم أكن في سنى أحرص على أن أعي الحديث مني فيهن، سمعته يقول: وقال هكذا بيده بين يدى الساعة تقاتلون قوماً نعالهم الشعر وهو هذا

(١) تەفسیری ابن كثير ج٤/١٧٣٦ .

البارز ) ئەمجار خاوەنی فتح الباری لەراڤەی حەدیثەکەدا دەفەرموێ: (الظاهر انه برزان الذي بموصل وهم الأكراد الساكنون هناك) .

عبدالرحمن بەگی بابان لەشیعرێکی دا ئاماژە بەوە دەکا: کە ئەو قەومە گەلی کوردەو دەڵێ:

لەسورەی (فەتح) دا بەم ئایەتە دڵ شادو مەسرورە

﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ﴾ ئیشارە کوردی غەیورە

﴿أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾ وەسفی قەومێ بێ لە قورئانا

بە ئازادی دەژیو دائیم لەدیلیو ئیستیلا دوورە

مێژوو شایەتی ئەوەیە: کە هیچ گەلو نەتەوەیەك وەکوو گەلی کورد بە ئاشتی موسوڵمان نەبوە، تەنانەت لە هەموو کوردستان دا شەڕێکی خوێناوی لەنێوان سوپای ئیسلامو دانیشتوانی کوردستان روی نەداوە، بەڵکوو بەنزیك بوونەوەی سوپای ئیسلام لە سنوورەکانی کوردستان، خەڵکەکە بەویستی خۆی پێشوازییان لەو سوپا رزگارکەرە پیرۆزە کردوە، ئازادیی خۆیان لە موسوڵمانبونو شوێنکەوتنی ئەو ئاینە پیرۆزەدا دۆزیوەتەوە. ئەگەر کوردێك بەدەستی موسوڵمانان کوژرابێ لە شەڕی ئەهاوەندا کوژراوە نەك لە کوردستان دا.

ئەوە بوو کەفارسەکان لە شەڕی (قادسیە)دا تێشکانو زۆربەی سوپاکەیان بەدەستی موسوڵمانان تارو مار کرا، کیسرای ئەوکاتە کە (یەزدوجورد) بوو هانای بۆ سەرەك هۆزە کوردەکان هێناو لێیان پاڕایەوە کە بەهانایەوە بچنو یارمەتی بدەن، زۆربەی سەرەك هۆزە کوردەکانی هەڵخەڵەتانو ڕۆڵەکانی خۆیان گرد کردەوەو بۆ شەڕی بەناو بانگی ئەهاوەندیان ڕەوانە کردنن ڕۆڵەکانی خۆیان کردە سوتەمەنیو بەهەزاران لاوی کوردی بەدبەختی بە زۆر نێردراو بۆ شەڕی تێدا کوژرا.

ئەگینا لەسەرتا سەری کوردستان دا بەدەگمەن نەبێ صەحابەیەك بەدەستی کورد شەهید نەکراوەو کوردێکیش بەدەستی ئەوان نەکوژراوە، ئەوەکتێبی (الاصابة فی تمیز الصحابة) ئەوە کتێبی (أسد الغابة في معرفة الصحابة) ئەوە کتێبی (الاستیعاب فی معرفة الأصحابە) ئەوە کتێبی (حیاة الصحابة)ی یوسف کاندهلوی کەئەمانە سەرچاوەی زانیارین دەربارەی ژینامەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەم سەرچاوانەدا بەدەگمەن نەبێ نابینین هاوەڵێکی پێغەمبەرﷺ لە کوردستان دا شەهید کرابێ.

دەگمەنیش ئیعیتباری بۆ ناکرێ، خۆ ئەگەر وەکوو باوەو هەندێ لەنووسەرە داخ لە دڵەکانی کوردو فارس بەرامبەر بە سوپای ئیسلام نووسیویانە، شەڕو هەرا لە نێوان دانیشتوانی کوردستانو سوپای ڕزگاریکەری ئیسلام دا بەو شێوەی ئەوان نووسیویانە ڕوی بدایە، دەبوایە بەدەیان لە هاوەڵان شەهید بکرانایەو ئەو سەرچاوانە هۆکاری شەهید بونو شوێنی شەهیدبوونیانی دیاری بکردایە!!

کەوابێ دانیشتوانی کوردستان بەویستی خۆیان موسوڵمان بوون، وەکوو زەوی بە هارێکی وشكو تینوو چاوەڕێی بارانی ڕەحمەت بێ ، ئەوانیش چاوەڕێی هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بونو کە پێیان گەیشتوە بێ چەندو چون باوەشیان بۆ گرتۆتەوەو کە سایەتی خۆیان لە ژێر سایەی ئەو پەیامە پیرۆزەدا دۆزیوەتەوە، لەو ساوەو هەتا دونیا دونیایە خودا پشتیوان بێ ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا لە گەشەو نەشەدایە، ڕێژەی موسوڵمان لەناو دانیشتوانی کوردستاندا لە پلەی بەرزی دایەو نایەتە خوار! هەروەکوو لە ڕابردوودا لە هەرەپلەی بەرزی دابووە!

ئەمجار خودا مژدەدا بەو ئەعرابە سارانشینانە ئەگەر فەرمانبەرداربن، هەڕەشەی توندیان لێ دەکا ئەگەر سەرپێچی بکەن: دەفەرموێ:

﴿فَإِنْ تُطِيعُوا يُؤْتِكُمْ اللَّهُ أَجْراً حَسَناً وَإِنْ تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُمْ مِنْ قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ ئەگەر فەرمانبەرداری فەرمانی خودابنو بەپیر بانگەوازی جیهادەوە بچنو

ئەركی سەرشانی خۆتان بەرێك وپێكی ئەنجام بدەن، خودا پاداشی باشتان دەداتـەوە سەركەوتوویی‌و دەسكەوتی جەنگ لە دونیادا، بەهەشتی ڕازاوە لە قیامەتدا.

خۆ ئەگەر پشت هەڵبكەن خۆتان لە جیهاد بشارنەوە وەكوو چون لە چون بـۆ (حدیبیە) خۆتان پاش دا ئەوە دڵنیابن خودا سـزای تونـدتان دەدا؛ لـە دونیـادا ژێـر كەوتن‌و ژێر دەستەیی‌و كوشتن، لەقیامەت دا عەزابی سـەختی دۆزەخ. چـونكە خـۆ دزینەوە لە جیهاد تاوانێكی گەورەیەو سزاكەی دەبێ كوشندەبێ.

ئـەمجار پـەروەردگار هەنـدێ خـاوەن عـوزر لـەو حوكمـە چـەرت دەكـاو دەفـەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ كـوێرو شـەل‌و نـەخۆش ج حـەرەجێكیان لەسـەرنیە ئەگـەر لـە چـون بـۆ جیهـاد دوابكـەون، هـەتا عوزریـان بـاقی بـێ بەنەچـون بـۆ جیهـاد تاوانبارنـابن، هـەركاتێ چاكبوونەوەو عوزریان نەما حوكمەكە دەیانگرێتەوە، دوا بـەدوای ئـەو چـەرتكردنە ئادەمیزادەكان هەڵدەنێ بـۆ جیهـادو فەرمانبـەرداری فـەرمانی خـوداو شـوێنكەوتنی پەیامی پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَـنْ يَتَـوَلَّ يُعَذِّبْـهُ عَذَاباً أَلِيماً﴾ دەفەرموێ: كەسێك بەندایـەتی خـودا بكـاو بەدڵسۆزی شـوێن پـەیامی پێغەمبەری خودا بكەوێ، لەتەك خاوەن بـاوەڕان دا جیهـاد بكـا، داكـۆكی لـە ئـایینی خودا بكا، ئەوە بادڵنیابێ كـە ڕۆژی قیامـەت خـودا دەیخاتـە نـاو بەهەشـتی ڕازاوەو؛ نـاو بـاخ‌و باخاتێـك كـە بـەژێر قەصـرو درەختـەكانیان دا جۆگـاو جۆبـار دەكـشێن‌و ئەوەندەی تـر جوانی‌و ڕازاوەیی دەبەخشن بە خانووبەرەو باخەكان!

كەسێكیش پشت لە فەرمانی خودا هەڵبكا، شوێن پەیامی پێغەمبەر نەكـەوێ، خۆ لە جیهادو تێكۆشان لە پێناو ئایین دا بدزێتـەوەو خـۆ پـاش بـدا، ئـەوە بـابزانێ خودا لە دونیادا سزای زەلیلی‌و ژێـر دەسـتەیی دەداو لـە قیامـەت دا توشـی عـەزابی سەختی دۆزەخی دەكا.

## دەسکەوت و پاداشتی پەیماندارانی ژێر درەختی سەروەری مەشهور بە (بیعة الرضوان)

﴿ ۞ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ ﴾

لەوەوپێش وەزع و حاڵ و سەرەنجامی ئەوانەی بەیان کرد: کە لەچون بۆ حودەیبیەو ئامادەباشی بۆ جەنگ و فیداکاری، خۆیان پاش دا بوو، ئەمجار دێتەوە سەر بەیانکردنی حاڵ و وەزعی ئەو هاوەڵانەی: کە لەژێر درەختی سەموورە (شجرة الرضوان)دا، پەیمانیان بەپێغەمبەرﷺدا، دەستیان خستە ناو دەستی پێغەمبەرەوە بۆ فیداکاری و بەرگری کردن لەئایین، پاداشتی دونیاو قیامەتیان دیاری دەکا دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنْ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾ بێگومان خودا ڕەزامەندیی خۆی لەو موسوڵمانانە ڕاگەیاند: کەلەژێر درەختی (سمرە)دا بەڵێنیان بەتۆدا ئەی پێغەمبەر لەسەر ئەوە: کەدژی قوڕەیشیەکان بجەنگن و بەگیان و ماڵ بەرگری لەپەیامی ئیسلام بکەن و گۆڕەپانی ڕووبەڕووبوونەوە چۆڵ نەکەن، ڕیوایەت کراوە: ئەو هاوەڵانەی بەڵێنی فیداکارییان بەپێغەمبەر دا ،ژمارەیان هەزارو چوار سەد کەس بوون.

ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە: کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ڕۆیشتم بۆ حەج، لە ڕێگەدا بەلای کۆمەڵێک دا تێپەڕیم

نوێـژیان دەکـرد وتم: ئـەم مزگەوتـە چـیە؟ وتیـان: ئەمـە ژێـر ئەودارەیـە کـە پێغەمبەرﷺ بەیعەتی ڕیضوانی تێدا ئەنجام دا، ئەمجار هاتم بۆلای سەعیدی کوڕی (المسیب)و ئەم هەواڵەم بۆگێڕایـەوە: سـەعید فـەرمووی: بـاوکم کەیـەکێك بـووە لـە بەڵێندەرانی حودەیبیەو لەژێر درەختەکەدا دەستی لەدەستی پێغەمبەرﷺ ناوە.

جا عەبدوڕەحمان دەفـەرموێ: کـە لەسـاڵی دوایـیدا سـەفەری حـەجمان کـرد، زۆر هەوڵماندا ئەو شوێنە بدۆزینەوە نەمان دۆزییەوە، سەعید فەرمووی: هـاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ئەو شوێنەیان لەیاد کردوەو ئێوە پێتان زانیوە، کەواتە ئێوە لەئـەوان شارەزاترن، ئیبنو ئەبی شـەیبە لـە موصـەنەفەکەیدا لـە (نـافع)ەوە ڕیوایـەت دەکا، دەڵـێ: هـەواڵیان بەعومـەردا: کـە کەسـانێك هـەن دەچـنە زیـارەتی ئـەو درەختـەی لەژێریا بەیعەت کراوە. ئیتر عومەر فەرمانیدا درەختەکەیان بڕی!!!

﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً﴾ پـەروەردگار ئاگـاداری ناودڵیـان بـوو، دەیزانـی بیروبـاوەڕو ڕاسـتیو دڵـسۆزیو ئەمـەكو فەرمانبـەرداریيان تێدایـە، ئـارامیو تەسـکینی زیـاتر خـستە نـاو دەروونیانـەوە، سـەرکەوتنی خەیبـەری بەنـسیب کـردن، دوابـەدوای سـەروەری غـەزای خەیبـەر، ڕزگارکردنی مەککەشی بۆ دەستەبەرکردن، ئەمجار سەرکەوتنو باڵادەستی فرەی پێ بەخشینو وڵاتی تریان کۆنترۆڵ کـردن سـەروەری یـەك لەدوایـەکی بـاقی کیـشوەرو وڵاتانی تریان بۆ دەستەبەرکرا .

﴿وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزاً حَكِيماً﴾ هـەروەها پاداشتی تریـشی دانــەوە: بـەوەی: کــە دەســکەوتی زۆرو زەبەنــدەی جولەکــەکانی خەیبــەری بــۆ دەسـتەبەرکردن، بەتایبـەتی ئـەو سـەروەت وسـامانە بەسـەرئەوان دا دابـەش کـراو بەشی کەسی تری لێ نەدرا!

پەروەردگار باڵادەستە بەسـەر هـەموو شـتێك داو بەحیکمـەتو دانـایی خـۆی بونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، هەر لەروانگەی ئـەو باڵادەسـتیو حیکمەتـەوە سـەرکەوتنو

سەروەریی دونیاو قیامەتی بۆ پەیمانـدەرانی (بیعة الرضوان) دەستەبەر کرد،پاداشتی مادیو مەعنەوەی دانەوە، پاداشە مەعنەوییەکە بریتییە لە رەزامەندی خودا لێیانو نازلکردنی سەکینەو ئارامی بۆ سەر دڵیان.. پاداشتی (مادی)یش لەفەتحی خەیبەرو فەتحی مەککەو دەسکەوتنی ماڵو سامانێکی زۆری جولەکەکانی خەیبەردا رەنگی دایەوە.

## دەستکەوتو سەروەریی زۆرو زەبەندەی تر کە بۆ موسوڵمانەکان دەستەبەر بوو

﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ

عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾

**دەربارەی ئەسباب نزولی ئەم ئایەتانە چەند ریوایەتێك هاتوون:**

١-دەربارەی ئایەتی ﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ...الآيـة﴾ موسلیمو تیرمیزیو نەسائی لەئەنەسەوە ریوایەت دەکەن: دەفەرموێ ڕۆژی (حدیبیە) هەشتا کەس لەکێوی (التنعیم)ەوە دزەیان کردو هاتنە خوارەوەو ویستبویان لەناکاو دەست لەپێغەمبەر بوەشێنن، پێیان زانراو گیران. پێغەمبەرﷺ عەفوی کردن، ئیتر ئایەتی ﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم﴾ی نازڵ کرد.

ئیمامی ئەحمەد لەعەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (المزنی)یەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا لەژێر درەختی ناوبراو لەقورئان دا بووین، هەندێ لەگەڵاو لقەکانی درەختەکە کەوتبوونە سەر پشتی پێغەمبەرﷺ عەلی کوڕی ئەبو تالیبو سوهەیلی کوڕی عەمر لەبەردەمیدا دانیشتبوون. پێغەمبەرﷺ بەعەلی فەرموو بنووسە (بسم الله الرحمن الرحيم) سوهەیل دەستی گرتو وتی: ئێمە (الرحمن الرحيم) نازانین، ئەوەی لەلای ئێمە پەسەندە ئەو بنووسە: بنووسە (بسمك اللهم) بەویستی ئەو تۆمارکرا..

ئەمجار عەلی نووسی (هذا ما صالح عليه محمد رسول الله في اهل مكة) سوهەیل دوبارە رەخنەی لێ گرتو وتی: نەخەیر نابێ ئەوە بنووسی! ئەگەر ئێمە دان بەوەدا بنێین: کەتۆ پێغەمبەری خودای ئەدی بۆچی ئیمانت پێ ناهێنین؟ ئێمە پێمان وایە پێغەمبەر نیت. بۆیە دەبێ بنووسرێ: (هذا ما صالح عليه محمد بن عبدالله) ..

جا کەئێمە لەم کەینو بەینەدا بووین سێ گەنجی چەکدار هەڵمەتیان بۆ هێنایو غافڵ گیریان کردین، پێغەمبەرﷺ دوعای لێ کردنو خودا چاوی کوێر

کـردن و پـەلامارمان دان و قۆڵبەسـتمان کـردن، پێغەمبـەرﷺ پێـی فـەرموون: ئێـوە پەیمانی کەستان هەیە؟ کەسێك ئەمانی پێداون؟ وتیـان: نەخـەیر، ئـیتر چاوپۆشـی لـێ کردن و بەرەڵای کردن! ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَـنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ ی نازڵ کرد .

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە :**

کـە لـەوەوپێش پـەروەردگار وادەی بەپەیمانـدەرانی (حودەیبیـە)دا بـەوەی کـەماڵ و سـامانی خەیبـەر دەکاتـە دەسـکەوتیان ئـەمجار بەشـوێن ئـەوەدا چـەند نیعمەتێکی تر باس دەکا: کە خودا بە موسوڵمانەکانی بەخشین..

دەفەرموێ: ﴿وَعَدَكُمْ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُـمْ هَـذِهِ وَكَـفَّ أَيْـدِيَ النَّاسِ عَنْكُمْ وَلِتَكُونَ آيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِـرَاطاً مُـسْتَقِيماً﴾ ئـەی خـاوەن بـاوەڕان، پـەروەردگار وادەی دەسـکەوت و غەنیمـەتێکی زۆر و زەبەنـدەی پـێداون، بەدرێـژایی ڕۆژگار زۆر سەرکەوتن و سەروەریتان بۆ دەستەبەر دەکا، وەڵێ دەسکەوتی خەیبـەری بـۆپێش خـستن، ڕۆژی (حودەیبیـە)ش ئێـوەی لەشـەڕی قـورەیش و هاوپـەیمانانیان پاراست، زیانی ئەوانی لـێ دورخستنەوە.

.. صولح و ئاشتی بۆ دەستەبەر کـردن، هـەروەها لەشـەڕو زیـانی جولەکـەکانی خەیبـەرو هاوپـەیمانانیان ڕزگـاری کـردن؛ بـەوە کەترسـی خـستە نـاو دڵیانـەوە، نەیهێـشت ئـەو پـیلان و قـین و دوژمنایەتیـەی لـەدڵیان دا حەشـاریان دابـوو بۆیـان دەسـتەبەرببێ، ئاواتـەکانیان نەهاتنـەدی. هـەموو فـرت و فێـڵ و دوژمنایەتیـەکیان بەسەرخۆیاندا شکایەوە.

پەروەردگار هەموو ئەمانەی بـۆ ئێـوەی خـاوەن بـاوەڕ هێنانـە دی بـۆ ئـەوەی سوپاسی بکەن، هـەروەها بـۆ ئـەوەی دەسـتەبەر بـوونی ئـەو شـتانە ببێتـە نیـشانە و موعجیزە لەسـەر ڕاسـتی پـەیامی ئیـسلام و ڕاسـتگۆیی پێغەمبـەرﷺ لەهـەموو ئـەو

بەڵێنانەی پێتان دەدا، هەتا زیاتر پابەندی فەرمانی خودا بن‌و بەدڵسۆزی شوێن پێغەمبەر بکەون.

﴿وَأُخْرَى لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيراً﴾ پەروەردگار جگە لە صولحی (حودیبیە)و فەتحی مەککە وادەی سەروەریی‌و دەسکەوتی تری پێداون، لە وەزع‌و بارو دۆخی ئێستاتان دا دەسەڵاتتان بەسەریان دا ناشکێ، خودا دەزانێ: کەبۆ ئێوە دەبێ، لەمەودا بۆخۆتانی دەستەبەر دەکەن خۆتانی بۆ ئامادە بکەن‌و چاوەڕوان بن، ئەو وڵاتانە کۆنترۆڵ دەکەن‌و ماڵ‌و سامانی دانیشتوانیان دەبێتە دەسکەوتی جەنگ‌و دەکەوێتە ژێر دەستتان وەکوو ماڵ‌و سامانی هەوازین کە لەغەزای حونەین دا کەوتە ژێر دەستی موسوڵمانەکان، هەروەها کۆنترۆڵ کردنی وڵاتی فارس‌و ڕۆم‌و دەست بەسەراگرتنی ماڵ‌و سامانی ئەوانەی بەشەڕو جەنگ موسوڵمان بوون یان کوژران.

هەڵبەتە خودا هەموو کاتێك‌و هەمیشە خاوەن دەسەڵات‌و باڵادەستە بەسەر هەموو شتێك دا هەرچی بیەوێ بێتە دی چۆنی ئەوێ ئاوا دێتە دی‌و هیچ شتێکی لێ عاصی نابێ.

﴿وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيّاً وَلَا نَصِيراً﴾ خۆئەگەر کافرەکانی قورەیش دەست پێشکەرییان بکردایە لە (حودەیبیە)دا شەڕیان لەگەڵ بکردانایە، ئەوە بێگومان پەروەردگار پێغەمبەرو موسوڵمانەکانی سەردەخست‌و لەشکری قوڕەیشیەکان دەشکاو ڕێگای هەڵاتنیان دەگرتەبەرو دەیانقاچاند، پاشان کەسیان دەست نەدەکەوت یارمەتییان بداو بیانپارێزێ:

﴿سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلُ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾ سەرخستنی خاوەن باوەڕان بەسەر کۆمەڵی کوفرو بێدینان‌دا، داب‌و نەریتێکی هەمیشەیی پەروەردگارە لەبوونەوەردا، هەمووکاتێ حەق سەردەخاو بەتاڵ تڕۆ دەکا، ئەوە عادەت‌و سوننەتی خودایەو ناگۆڕێ.

﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيراً﴾ پەروەردگار بوو نەیهێشت قورەیشیەکان دەست لەموسوڵمانەکان بوەشێنن، هەلو مەرجی ئەوەشی نەڕەخساند: کەموسوڵمانەکان شەڕ لەگەڵ کافرەکان بکەن!

ئەوەبوو کافرەکانی قورەیش پێشیان بە پێغەمبەرو موسوڵمانەکان گرت، ڕێگای چونە ناو مەککەیان لێ گرتن، لەلایەکی ترەوە نزیکەی هەشتا پیاوی چەکداری مەککەیی دزەیان کردو ویستیان لەناکاو پێغەمبەر تیرۆر بکەن، بەڵام موسوڵمانەکان لێیان وەدەست هاتنو گرتیانن، پاشان پێغەمبەرﷺ چاوپۆشی لێ کردنو مەرەخەسی کرن ئەمە فەزڵو منەتی پەروەردگارە بەسەر بەندە خاوەن باوەڕەکانیدا، بەوە کەدەستی کافرەکانی لێ گرتنو نەیهێشت زەفەریان لێ بێنن.

پەروەردگار هەمیشە بەئاگاو بینایە بەکردەوەو هەڵوێستی بەندەکانی بە موسوڵمانانو کافرەوە، هیچی لێ گوم نابێ لەکۆنو نوێدا، لەرابردوو داهاتوودا ئاگاداری هەموو شتێکەو بەهەموو ئاشکراو نهێنییەك دەزانێ.

## ناپیاوی موشریکەکانو حیکمەتی ئاشتیانەی حودەیبیە

﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبْنَا

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾

دەربارەی سەبەب نـزولی ئایەتی ژمـارە (٢٥) ﴿وَلَوْلا رِجَالٌ...﴾ ریوایـەتێك هەیە طەبەرانیو ئەبو یەعلا لەئەبو حەفصە (جنید بن سبع) ریوایـەتی کـردووە جونەید دەڵێ: بەیانی دژی پێغەمبەر جەنگامو ئێوارە بەموسوڵمانی لەگەڵیدا دژی کوفر شەڕم کرد تاقمەکەمان سێ پیاوو چوار ئافرەت بوو، ئایـەتی ﴿وَلَوْلا رِجَالٌ مُؤْمِنُونَ وَنِسَاءٌ مُؤْمِنَاتٌ﴾ دەربارەی ئێمە نازڵ بووە، لەریوایـەتی ئیبنو ئـەبو حاتـەم دا دەڵێ: سێ پیاوو نۆ ئافرەت بوون:

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بە هی پێشەوە ئەوەیە:**

لەوەوپێش پەروەردگار فەزڵو منەتی خۆی بەسەر موسوڵمانان دا رانواند بەوە: کە نەیهێشت دەستی کافرەکانی قورەیشییان بگاتێ، دەستی موسوڵمانەکانیشی لەقورەیشیەکان پاراست ئاشتیو ئارامی خستنە نێوانەوەو صوڵحی حودەیبیـەی هێنایە ئاراوە، بۆئەوەی دەرگای بڵاوبوونـەوەی ئـایینی ئیسلام ئاواڵا بێ بـواری بانگەوازی لەباربێو وردە وردە بتوانرێ دیاردە ناشرینەکانی کۆمـەڵگای سـەردەمی نەفامی قەڵاچۆ بکرێن، کەللە رەقیو تەبیات درشتیو تایەفەگەری نـەمێنێ، رەگـی

نەزانى بنەبڕ بكرێ، پەروەردگار سوكنايىو ئارامى خستە ناو دڵى پێغەمبەرو موسوڵمانانەوەو واى لێكردن وەفا بەوادەى خۆيان بكەن.

دەفەرموێ: ﴿هُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَالْهَدْيَ مَعْكُوفاً أَنْ يَبْلُغَ مَحِلَّهُ﴾ واتە: كافرەكانى قورەيشىو هاوپەيمانانيان كەبەراستى بێ بڕوانو يەكتاپەرستى ناكەنو ئێوەيان لەديدەنى كابەو ئەنجامدانى مەراسيمى حەجو عومرە مەنع كرد. نەيانهێشت قوربانىو ئاژەڵە دياريیەكان بگەنە شوێنى خۆيانو سەرببڕدرێن.

ئەو ئاژەڵانەى پێغەمبەرو هاوەڵانى كردبويانن بەديارى كابەو نيشانيان كردبوون حەفتا حوشتر بوون، دەبوايە ببرێنە (مينا) يان بەستى مەككەو لەوێ سەرببڕدرێن، بەڵام قوڕەيشيیەكان بەريان بەپێغەمبەرو هاوەڵانى گرتو نەيانهێشت بگەنە مەبەستى خۆيان:

﴿وَلَوْلا رِجَالٌ مُؤْمِنُونَ وَنِسَاءٌ مُؤْمِنَاتٌ لَمْ تَعْلَمُوهُمْ أَنْ تَطَئُوهُمْ فَتُصِيبَكُمْ مِنْهُمْ مَعَرَّةٌ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ ئەگەر لەبەرئەوە نەبوايە: كەلەمەككەدا ژمارەيەك پياوى موسوڵمانو كۆمەڵێك ئافرەتى خاوەن باوەڕ هەبوون، بەنهێنى خودا پەرستيان دەكردو نەيان دەوێرا موسوڵمانبوونى خۆيان ئاشكرا بكەن، ڕێگەمان دەدان ئێوە فەتحى مەككە بكەن، دەستى ئێوەمان لەقوڕەيشيەكان نەدەپاراست، ئێوەمان بەسەر ئەوان دا زاڵ دەكردو لەبێختان دەردێنان!

بەڵام كۆمەڵێك پياوو ئافرەتى موسوڵمان لەوانەى لەمەككەدا مابوونەوەو بەنهێنى خوداپەرستى خۆيان دەكرد، دەكەوتنە ژێر دەستو پێو تێدا دەچون، ئەوكاتە ئێوە خەفەتتان بۆيان دەخواردو تاوانى كوشتنى هەڵەو كەفارەتى كوشتنى هەڵەتان توش دەبوو. ئيتر موشريكەكان دەيانگوت: ئەوەتا موسوڵمانەكان هاوبيرەكانى خۆشيان دەكوژن.

وەلێ پەروەردگار دەستی ئێوەی لەوان پاراست‌و ئاشتینامەی حودەیبیەی هێنایە کایەوە ﴿لِيُدْخِلَ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ﴾ بۆئەوەی موسوڵمانان توشی دیلی‌و نارەحەتی نەبن، هەروەها بۆئەوەی ماوەبدرێ بەکافرەکان بەخۆیان دا بچنەوەو موسوڵمان ببن.

﴿لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ ئەگەر موسوڵمانەکان جیابکرانایەوە لەکافرەکان‌و لەناو مەککەدا نەمانایە، ئەوە بێگومان کافرەکانمان بەسزای خۆیان دەگەیاند، کوشت‌و برمان دەکردن، بەم رەنگە ئێوەمان بەسەردا زاڵ دەکردن‌و تێیان دەکەوتن تا قارەتان لێ دەبرین وازتان لێ نەدەهێنان.

﴿إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ﴾ لەوکاتەدا سزامان دەدان: کە ئەو بێ باوەڕو بتپەرستانە کەللە رەقی‌و نەفامی خۆیان خستەکارو گوێیان بەبەڵگەو نیشانەو حیوارو مەنتیقی عەقڵ نەدا، تێکڕا وتیان سوێندمان بە (لات‌و عوزا) ناهێڵین موسوڵمانەکان بێنە ناو مەککەوە، هەروەها نەیانهێشت لەسەرەتای ئاشتینامەی (حودەیبیە)دا رستەی (بسم الله الرحمن الرحیم)و (محمد رسول الله) بنوسرێ ..

ئیتر ﴿فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى وَكَانُوا أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾ پەروەردگار ئارامی‌و پشوو درێژی خستە ناو دڵی پێغەمبەرو هاوەڵانیەوە، دەمارگیری نەیگرتن‌و بەمەرج‌و پێشنیاری کافرەکان رازی بوون‌و ئاشتینامەی حودەیبیەی لێ کەوتەوە: کەدەروازەی رزگارکردنی مەککە بوو، لەهەمان کاتدا خودا رشتەی شایەتومان‌و بیروباوەڕی یەکتاپەرستنی لەدڵی موسوڵمانەکان دا بەهێزترکردو وای لێ کردن رێزی حەرەم بگرن‌و شەڕی تێدا نەکەن، بەهەڵوێستی ناپیاوانەی قوڕەیشیەکان تەنگەتیزە نەبوون‌و هەڵنەچوون، بەهێدی‌و ئارامی لەسەر یەکتاپەرستی خۆیان مانەوەو دڵسۆز بوون بۆ ئایینەکەیان، بێگومان موسوڵمانەکان شیاوی ئەوە بوون‌و

ئـەهلی ئـەومن کـە لەسـەر تەوحیـدو دڵـسۆزی بـۆ ئـایین بـەردەوام بـن، هەرچـی پێغەمبەرﷺ پێی رازی بێ ئـەوانیش بەدڵـسۆزییەوە پابەنـدی بـن، چونکە ئـەوان ئەهلی خێرو صـەلاحو بیروبـاوەڕی پـاكو بێگـەردن. هەمیـشە پـەروەردگار ئاگـادارو بینایە دەزانێ کێ شیاوی خێرو فەڕو بەرەکەتە.

## هاتنەدی خەوی پێغەمبەرﷺ

﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾﴾

فـەریابیو عەبـدورەحمانی کـوڕی حەمیـد، هـەروەها بەیهـەقی لـەکتێبی (الدلائل)دا لەموجاهیدەوە دەڵێ: هێشتا پێغەمبـەرﷺ لەحودەیبیـە بـوو لەخـەودا نیشانیدرا: کە دەچووە نـاو مەککـەوە لەگـەڵ هـاوەڵانیدا بەهێـدیو لەسـەرەخۆییو سەرچاککراویو مـوو کـورتکراومیی، جـا کـە لەگـەڵ قوڕەیـشیەکان دا ئاشـتینامەی حودەیبیـەی مـۆر کـرد، هـەدیو قوربانییـەکانی لەحودەیبییـە سـەربڕی، هـاوەڵانی

وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەی مەعنای خەونەکەت؟ چی لێ بەسەر هات؟ ئیتر ئایەتی: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ﴾ نازڵ بوو.

قەتادە دەڵێ: پێغەمبەری خودا لەخەودا پێی نیشان درا کە بەو شێوەی باس کرا دەچێتە ناو مەککەوە: کە لەحودەیبییە لەگەڵ قورەیشییەکان دا صوڵحی کرد دووڕوومەکان کەوتنە بڵاوکردنەوەی پڕو پاگەندەو گومانیان دەخستە ناودڵی موسوڵمانانەوە.. تەنانەت پێغەمبەرﷺ تەئکیدی کردەوە کە دەچێتە ناو مەککەوەو ئایەتی: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ﴾ نازڵ بوو. ئیتر پێغەمبەرﷺ بەهاوەڵانی ڕاگەیاند کەدڵنیابن لەداهاتوودا خەونەکەی دێتەجێ!

ناوەڕۆکی ئەو خەونە بەم جۆرەبوو، پێغەمبەرﷺ هێشتا لەمەدینە بوو لەخەودا فریشتە هاتەلای و ﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ..﴾ تادەگاتە ﴿لا تَخَافُونَ﴾ی پێ ڕاگەیاند. پێغەمبەریش ئەمەی بۆ هاوەڵانی باس کردو دڵیان خۆش بوو دڵنیا بوون، کەمانای خەونەکە لەوساڵەدا دێتە دی و دەچنە ناو مەککەوە، جا کە لەحودەیبییە قورەیش پێشیان بەموسوڵمانەکان گرت و لەکۆتاییدا پەیماننامەی حودەیبییە هاتەکایەوە برێ لەدووڕووو باوەڕ لاوازەکان بەتەوسەوە وتیان: بەخودا نەسەرمان تاشی و نەموی سەرمان کورت کردەوەو نەچووینە ناو مەککەوە!!

هەروا دەیانگوت ئەرێ کوڕینە موحەممەد نەبوو وادەی چوونە ناو مەککەو تەوافی کابەی پێ دەدایـن؟ هەنـدێ هاوەڵانی زیرەك و بیروباوەڕ دامەزراو وتیان: خۆ پێغەمبەرﷺ نەیفەرموو: هەر ئەمساڵ دەچینە ناو مەککەوە وتیان: نەخێر تەحدیدی ساڵەکەی نەکردووە، پێیان گوتن دەسا دڵنیابن لەداهاتوودا دەچنە ناو مەککەوەو تەوافی کابەش دەکەن! ئیتر پەروەردگار بۆ پشتگیری ئەوە ئایەتی: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ...﴾ نازڵ کرد.

لەکتێبەکانی سیرەدا هاتووە: کەعومەری کوڕی خەتاب دەفەرموێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەرو عەرزم کرد، ئەرێ تۆ بەراستی پێغەمبەری خوانیت؟

فەرمووی: بەڵێ: وتم دەی باشە ئەدی بۆ چی تەنازول بکەین و ئایینی خۆمان سوك بکەین؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەتەئکید من پێغەمبەری خودام، سەرپێچی فەرمانەکانی ناکەم، هەمیشە پشتیوان و یارمەتیدەرمە، عومەر دەفەرموێ: ئەی ئەوە نەبوو دەتفەرموو: ئێمە دەچینە ناو کابەوەو تەواف ئەنجام دەدەین!

عومەر دەڵێ: ئەمجار هاتمە لای ئەبو بەکر وتم: ئەی ئەبوبەکر: ئەرێ ئەو زاتە بەراستی پێغەمبەری خودا نیە؟ دەڵێ: بەڵێ پێغەمبەری خودایە، وتم: دەی باشە ئێمە لەسەر حەق و راستی نین و دوژمنمان لەسەر بەتاڵ نیە؟ وتی: بەڵێ: وتم دەی بۆچی کەمایەتی لەئایین دا قبوڵ بکەین؟

ئەبوبەکر وتی: کوڕە ماڵوێران ئەو زاتە پێغەمبەری خودایە، هەرگیز لەخودای خۆی یاخی نابێ، شوێن پەیامی ئەو بکەوە بەموو لێی لامەدەن. سوێندم بەخودا ئەو لەسەر حەقە، وتم: دەی ئەوەنەبوو وادەی دەدایێ کەدەچینە ناو مەککەوەو تەوافی بەیت دەکەین! وتی بەڵێ: بەڵام خۆ ئەو نەیگوت: ئەمساڵ، دڵنیابە لەداهاتوودا دەچینە ناو مەککەوەو تەوافی کابە دەکەین!

﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لا تَخَافُونَ﴾ واتە: سوێندبێ، خودا خەونی پێغەمبەرەکەی بۆ بەڕاست گێڕا، ئەو خەونەی پێغەمبەر بینی بەهەق بۆی هاتە کایەوە ، ئەوەی بۆ هێنانەدی کە ئێوە لەساڵی داهاتوودا بەویستی خودا بەدڵنیاییەوە دەچنە ناو مەککەو تەوافی بەیت دەکەن، لەکەس ناترسن هەندێکتان سەرتان چاك دەکەن و هەندێکی ترتان سەرتان کورت دەکەنەوە، بەدڵنیاییەوە بەێ ترس و لەرز، کارەکانی عەمرەکردنی خۆتان ئەنجام دەدەن، لەچوونە ناو مەککەو لەمانەوەتان لەوێدا دڵنیاو بێ ترس دەبن!

ئەوەبوو پێغەمبەرﷺ لەمانگی ذیلقەعیدەدا لەحودەیبیەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، مانگی ذیلحیججەو مانگی موحەڕڕەم لەوێ مایەوە، لەمانگی سەفەردا چوو بۆ خەیبەرو فەتحی کرد، سەروەتو سامانی جولەکەکانی خەیبەر کەوتە بەردەست موسوڵمانەکان ..

لەساڵی داهاتوودا لەمانگی ذیلقەعیدەدا خۆیو ئەوانەی ساڵی پێشوو لەگەڵیدا بوون لەحودەیبیەوە بۆ قەزاکردنەوەی عەمرەکەیان بەرەو مەککە کشان، هەدیو قوربانی پێویستیان لەگەڵ خۆیان برد لە ذیلحولەیفە ئیحرامیان بەست و بە(لبيك اللهم لبيك...)و شمشێر لەکالآن دا چوونە ناو مەککە .

﴿فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا﴾ خودا شتێکی زانی ئێوە نەتانەدەزانی پەروەردگار زانا بوو بەوەی حیکمەتو بەرژەوەندی لەوەدایە ئەو سەرکەوتنە مەزنانەتان بۆ بخاتە ساڵی دوایی .

﴿فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيباً﴾ پێش ئەوەش فەتحی خەیبەرتان بۆ دەستەبەر بکاو باری ئابووری خۆتانی پێ بەهێز بکەن.

ئەو کاتەی پێغەمبەرو هاوەڵانی چوونە ناو مەککەوە سەرانی قورەیشو داخ لەدڵانی چاویان بەرایی نەدا لەمەککەدا بمێننەوە شاریان چۆڵ کرد، باقی دانیشتوانەکانی تر هەموو هاتنە سەرا سوێی بانان، لەئەمبەرو ئەوبەری ڕێگاکەدا وەستانو سەیریان دەکرد، پێغەمبەرﷺ سورای وشترەکەی خۆی بوو بوو، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ڕێشمەکەی گرتبوو، ئەو وشترە ئەوەبوو کە لەڕۆژی حودەیبیەدا سواری بوو بوو.

بەمجۆرە خەونی پێغەمبەر هاتەدیو وادەی خودا چەسپاو بەم جۆرە لەساڵی داهاتوودا فەتحی مەککە کراو ئایینی خودا لەمەککەو دەوروبەری بڵاوبویەوە ..

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً﴾ پەروەردگار خۆی پێغەمبەری خۆی ڕەوانەکردوە زانیاری بەسوودو

کـردەوەی چـاکی فێرکـردوە، بـۆ ئـەوەی ئـەویش بەخـەڵکی ڕابگەیـەنێ ئـادەمیزاد شارەزا بکا بۆ ڕێبازی ڕاستو ئایینی ئیسلام پـەیڕەو بکـەن، بـۆ ئـەوەی ئـەو ئایینـە گشتیو پیرۆزە بەسـەر هـەموو ئایینـەکانی تـردا باڵادەسـت بـێ، یـەکانگیریی خـۆی دەستەبەر بکا، هەموو ئایینەکانی تر بسڕێتەوە، پەردە لەسەر بیروباوەڕی فەسـادو پڕو پوچ هەڵبداتەوە .

هەڵبەتە کیفایەتە خودا بۆخۆی شایەت بێت بەسەر وادەو بەڵێنی خۆیدا، بۆ خۆی شـایەت بـێ لەسـەر ئـەو وادەو بەڵێنـەی کەداویـەتی بـەوە کـە ئـایینی ئیـسلام بەسـەر هـەموو ئایینـەکانی تـردا باڵادەسـت بکـا، بـە ئـەو جـۆرە ئـایینی ئیـسلام بڵاوبووەوەو گەشەی سەند نەك لەنیوەدورگەی عـەرەب دا بـەڵکوو لـەماوەی کـەمتر لەنیو سەدەدا ئایینی ئیسلام لەزۆربەی چواریەکی زەوی ئاوەدانکراوەدا بڵاوبـووەوە، هـەموو وڵاتـی کـۆنترۆڵکراوی کیسرای داگیرکـرد، زۆربـەی وڵاتـانی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمــی کــۆنترۆڵ کــرد، گەیــشتە وڵاتــی چـینو هیندســتانو بــەناو دورگــەکانی ئەندونیسیادا بڵاوبوەوە.

ئەم وڵاتو هەرێمانەش تا سەدەی شەشەمی کۆچیو نیـوەی سـەدەی حەوتـەم زۆربەی ئاوەدانی سەرزەوی بوون، تەنانـەت ئێـستاش لەگـەڵ ئـەو هـەموو لـەقاقوزە پێچانەی ئایینی ئیسلام لەلایـەن دوژمنانـەوە، ئـەو ئایینـە پیرۆزە بـڵاو دەبێتـەوەو لەمپـەرەکان ڕادەمـاڵێ، بـەبێ بـەکارهێنانی شمـشێرو هێـزی سـەربازی کۆسـپو تەگەرەکان ڕادەداو لەدڵەکاندا جێگەی خۆی دەکاتەوە.

بـەڵێ بـەردەوام ئـایینی ئیسلام بەسـەر هـەموو ئایینـەکانی تـردا باڵادەسـتەو لەبرەودایە، شوێنکەوتوانی زۆرنو هەر زۆردەبن، هێـزو توانـای لـەخودی خۆیـدایـە وبەسروشـت بـەهێزەو بـەبێ شمـشێرو تـۆپو ڕەشـاش بـەرەو پـێش دەچـێ، چونکە لەگەڵ سروشتی ئـادەمیزاددا گونجاوەو دەگونجێ، لەگـەڵ یاسـای بونـەوەردا تەبایـە پێداویـستی عـەقڵو گیـانو جەسـتە بەتـەوازون دابـین دەکـا، لەگـەڵ ئـاوەدانیو پێشکەوتن دایە، بەختەوەریی دونیاو قیامەت دەستەبەردەکا، لەگەڵ حەزو ئارەزوی

کوخ نشین‌و دەوار نشین‌و قەصرو باڵەخانەی دەیان قات‌و بیناسازیی‌و پێشکەوتوو نشین دا دەگونجیٚ‌و پێداویستیەکانیان دابین دەکات .

هەرکەسێ - موسوڵمانیش نەبێ - ئەگەر بەویژدانەوە سەیری ئیسلام بکا، بەبێ چەندو چۆن ڕێك‌و پێکی ئەم ئاینەی لەلا بەرجەستە دەبێ‌و دان بەڕاستی‌و گونجاوی ئەو ئاینەدا دەنێت بۆ ئەوەی ببێتە یاسای هەموو کۆمەڵگای ئادەمیزاد بەهەموو جوداوازیەکی کە لەنێوانیان دا هەیە!

هەر ئادەمیزادێك بەویژدانەوە لەئیسلام ورد بێتەوە دەگاتە ئەو قەناعەتە کە هیچ ئایینێك وەکو ئیسلام بەکەڵکی ئەوە نایەت ببێتە بەرنامەی ئادەمیزاد بەگشتی .

بەڵێ وادەی پەروەردگار پێش تێپەڕبوونی نیو سەدە بەسەر هاتنی ئیسلام دا لەبواری ڕامیاریدا هاتەجێ‌و دەوڵەتی ئیسلام بووە زلهێزێکی بێ وێنەو هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارس‌و ڕۆمی تێك شکاندن‌و خاك‌و وڵاتی کۆنتڕۆڵ کردن‌و لەوەدوا ئێستاشی لەگەڵدا بێت وادەی خودا بۆ باڵادەستی ئیسلام لەشێوە مەوزوعیەکەی خۆیدا بەرجەستە بووەو دەبێ.

بەشایەتی هەموو کەسێکی خاوەن ویژدان ئیسلام تاکە بەرنامەیەکە : کە هەموو کاتێك‌و لەهەموو شوێنێکدا بەکەڵکی ئەوەدێ بکرێتە بەرنامەی ژیان‌و پەیڕەوو پرۆگرامی کۆمەڵ بێت، وێدەچێ زۆربەی زۆری موسوڵمانان ئەم ڕاستیە نەزانن، بەڵام بەتەئکید دوژمنانی ئیسلام ئەم حەقیقەتە دەزانن‌و حیسابی بۆ دەکەن‌و هەمیشە لەهەوڵ‌و تێکۆشاندان بۆ بەگژاچوونەوەو بەرەنگاری کردنی بڵاوبوونەوەی، بۆ تێکدانی ڕیزی موسوڵمانان‌و چەواشەکردنیان‌و دورخستنەوەیان لەو ئایینە پاکە.

## ئەوصافی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ﴿٢٩﴾﴾

لەوەپێش ئەوەی بەیانکرد کە پێغەمبەر بە هیدایەت و ئایینی هەقەوە رەوانەکراوە، حاڵ و وەزعی موسوڵمانانی بەیانکردو خۆی کردە شایەت بەسەر ئەو راستیانەدا، ئەمجار جەخت لەسەر ئەو ڕاستیانە دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ﴾ موحەممەد رەوانەکراوی خوایەو، خودا هەڵیبژاردوەو رەوانەی کردووە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لەتاریکی کوفرو بێدینی رزگاربکا.

﴿وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ﴾ ئەوانەی لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدان و شوێنی کەوتوون، جوانمەردن خاوەنی هەڵوێستی مەردانەن: لەگەڵ کافرو دوژمنانیان توندو تیژو رەق و سەرسەختن، تۆزقاڵێك موساوەمەو سازشیان نیە، هەرکەسێك

هاوەڵ بۆ خودا دابنێو کافر بێو زیان بەئایینو موسوڵمانان بگەیەنێ ئەوان دژی دەجەنگێنو بەدەستی پۆڵایین زەبری گورچکبڕی لێ دەدەن.

﴿رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾ لەناو خۆشیان رەحمیان بەیەکتر هەیەو بەنەرمو نیانی مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن، رێز بۆ یەکتری دادەنێنو هەماهەنگو هاریکاری یەکترنو وەکوو چینی دیوار یەکیان گرتووەو یەکیان پتەو کردووە، وەکوو ئەندامی جەستەیەك وان بەپەرۆشن بۆ یەکتری وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ – المائدة/٥٤﴾.

لەحەدیثی صەحیح دا هاتووە ئیمام ئەحمەدو موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە؛ دەفەرموێ: (مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم كمثل الجسد الواحد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمى) .

لەفەرموودەیەکی تردا : کە موسلیمو بوخاریو تیرمذیو نەسائی لەئەبو موسای ئەشعەریەوە ریوایەتیان کردوو: دەفەرموێ: (المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضهُ بعضاً) موسوڵمان بۆ موسوڵمان وەکوو چینی دیوار وایە هەندێکی هەندێکی پتەو دەکات.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: موسوڵمانان ئەوەندە دژی کافرەکان بوون تەنانەت نەیاندەهێشت پۆشاکیشیان لەیەك بکەوێ، چ جایێ پێستیان، ئەوەندەش یەکتریان خۆشدەویست هەر موسوڵمانێك توشی موسوڵمانێکی تر بوایە تۆقەو چاكو چونییان لەگەڵ یەکتردا دەکرد.

شایانی باسە تۆقەکردن(مصافحە) بەکۆڕای زانایان دروستەو کارێکی جوانەو هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کردویانە، وەلێ شان لێکدانو دەست ماچ کردنو دەمو چاو ماچ کردنی یەکتری بەلای ئەبوحەنیفەوە مەکروهەو پێغەمبەرﷺ نەهی لێ کردووە، لەوەپێش بەدوورو درێژی لەم تەفسیرەدا ئەم باسەمان روون کرۆتەوە.

﴿تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً﴾ دەیانبینی ئەوانە زۆر نوێژدەکەنو دڵسۆزن بۆ ئایین زۆربەی کاتیان لەرکوعو سوجدەدان، هەوڵو تەقەللای پاداشو رەزامەندیی خودایانە، بەتەما ئەومن خودا لێیان رازی بێو بەهەشتیان بداتێ .

﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾ لەئاکامی زۆر سوژدە بردنیان نیشانەو دروشمیان بەدەمو چاوەوە دیارە، رەنگی نورانیو هەیبەتو ویقارو رێزو حورمەتیان لێ دەتکێ، جوانمەردنو پیاوەتیان تێدا بەرجەستە بووە.

ئیمامی (السدی) دەفەرموێ: ( کەسێك بەشەو نوێژ زۆر بکا بەرۆژ دەمو چاوی جوان دەبن ).

برێ لەزانایان فەرمویانە: چاکەو عیبادەت نوور لەدڵدا پەیدا دەکا، دەمو چاو دەگەشێنێتەوە رزقو رۆزیی زیاد دەکا، لەدڵی خەڵکیدا خۆشەویستی بۆ خاوەنەکەی دەستەبەر دەکا.

ئیمامی عوسمان خودای لێ رازی بێ فەرمویەتی: (هەرکەسێك رەوشتێکی جوانی تێدا بێت دیاردەو نیشانەی ئەو رەوشتە لەسەر روپەڕی دەمو چاوو شێوەی قسەکردنی دا دەرکەوێ) مەبەست ئەومیە ئەثەری عیبادەتو خوداپەرستیو دڵسۆزیی لەگەڵ خودادا لەسەر دەموچاو دەردەکەوێو هەستی پێ دەکرێ .

ئیمام ئەحمەد لە ئەبوسەعیدی خودریەوە ریوایەت دەکا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لو أن أحدكم يعمل في صخرة صماء ليس لها باب ولا كوة لخرج عمله للناس كائنا ما كان) ئەگەر لەفەرزێکدا یەکێ لەئێوە لەناو بەردێکی بێ کونو کەلێن دا کاربکا ئاثاری کردەوەکانی بۆ خەڵکی دەردەکەون هەرچۆنێك بێ .

هەر ئیمام ئەحمەد لەگەڵ ئەبوداوددا لەئیبنو عەبباسەوە لە پێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا کە دەفەرموێ: (هیدایەتی صاڵحانەو هەڵوێستو رەوشتی صاڵحانە میانەڕەوی لەکردەوەدا بەشێکە لەبیستو پێنج بەشی پێغەمبەریەتی).

﴿ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمْ الْكُفَّارَ﴾ ئەو وەصفو ئەناو پەسنىيەی هاوەڵان: کەباسکرا هەمان وەصفو پەسنیە کە لەتەوراتو ئینجیل دا راگەیەندراوە..

ئەو هاوەڵانە لەسەرەتادا کەمو بێ هێزبوونو وردە وردە زیادیان کردو بەهێزبوونو پەلو پۆیان هاوێشت، وەکوو کشتوکاڵێك، لەسەرەتادا زەبوونو بێ وەچ بەڵام ووردە ووردە رەگ دادەکوتیو گەشو نما دەکاتو خۆهەڵدەپێچێ، وای لێ دێ کشتیارەکە پێی سەرسام دەبێو سەرنجی کێش دەکا، هاوەڵانیش لەسەرتادا کەمو بێهێز بوون گەشونمایان کردو هێزو توانایان زیادبوو بۆ ئەوەی کافرەکان دڵتەنگ بنو خەفەتی پێ بخۆن!

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ پەروەردگار وادەی بەو ئادەمیزادانە داوە کەئیمانیان بەخوداو بەپێغەمبەری هێناوە، وێڕای ئەوەش کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، وادەی پێداون کە لێیان خۆش ببێو تاوانیان سرپۆش بکا، پاداشتی چاکەیان زۆربکاو بیانخاتە ناو بەهەشتەوە، ئاشکراشە وادەی پەروەردگار هەقو راستەو دێتە جێو پاشگەزبوونەوەی تێدانیە ئەم وادە پێدانە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەرو هەموو ئەو ئادەمیزادانەیە کە شوێن پەیامی پێغەمبەر کەوتوونو ڕێبازی هاوەڵانیان گرتووەتەبەر.

ئیمامی موسلیم لەصەحیحی خۆیدا فەرموودەیەکی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت کردووە دەفەرموێ: (پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: لاتسبوا أصحابي، فوالذي نفسي بيده لو أن أحدكم أنفق مثل أحد ذهباً ما أدرك مدّ احدهم ولا نصيفه).

زۆر فەرموودە دەربارەی قەدرو ڕێزی هاوەڵان ریوایەت کراون، هەروەکوو چۆن زۆر هەرەشە لەوانە کراون کە دژی هاوەڵان دەدوێن، هاوەڵان هەموویان عادڵو خۆشەویستی خودان، چینێکن لە ئادەمیزادە هەڵبژاردەکانو دوای

پێغەمبەران لەهەموو کەس رێزدارتن، خودا لێیان رازیی بووەو ئەوانیش بەپەیامی خودا رازیی و بەهرەمەندن.

هەرکەسێ دژیان بدوێو بوختانیان پێ بکاو جنێویان پێ بدا، ئەگەر پێی کافر نەبێ بەتەئکید پێی فاسق دەبێ، دەربارەی ئەو کێشەو نیزاعەی کەوتە نێوان هاوەڵانەوە بەتایبەتی دوای شەهیدبوونی ئیمامی عوسمان، پێویستە نەچینە تەفاصیلەوەو تابۆمان بکری خۆمانی لێ لادەین، بۆیە حەسەنی بەصری لەوبارەیەوە فەرمویەتی: ئەوە خوێنێك بوو رژا، خودا دەستی ئێمەی لێ پاراست، کەوابێ بازمانمانی لێ بپارێزین!

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی (الحجرات)

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (الحجرات) چونکە پەروەردگار تەئدیبی عەرەبە لادێییەکانی کرد، کەئادابو رەوشتی کۆمەڵایەتیان نەدەزانی، کەئیشیان بە پێغەمبەر هەبوایە لەجیاتی ئەوەی لەدرگا بدەن لەوەختو ناوەختدا، دەچوونە دواژووری خێزانەکانی پێغەمبەرەوەو بانگیان لێ دەکرد.

ئەم سورەتە ناوێکی تریشی هەیە پێی دەوترێ سورەتی (الأخلاق و الآداب) چونکە کۆمەڵێك ئادابو رەوشتی کۆمەڵگای ئیسلامی لەخۆگرتووە، بانگەوازیی بۆپابەندبوون بە دابو نەریتی جوانو پەسەند دەکا، ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ فەرمان بەرداریی بۆخوداو شوێنکەوتنی پێغەمبەرو رێزگرتن لە پێغەمبەرو لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەهەموو هەواڵو باسێك کە دەبیسترێن، هەروەها یاساغ کردنی گاڵتە کردن بەخەڵکانی ترو خۆپاراستن لەجاسوسیو غەیبەت کردنو گومانی خراپ لەکەسانی دیکە.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەچەند رویەکەوەیە:**

١- لەسورەی پێشودا یاسای جەنگ کردن دژی کافرانی بەیانکرد، لێرەشدا حوکمی شەڕکردن دژی یاخی بوانو سەرپێچیکارانی روون کردەوە .

٢- سورەتی پێشووی بەرستەی ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ کۆتایی پێ هێنا ئەم سورەتەشی بەرستەی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ دەست پێ کرد، بەمەش ئەوەی دووپات کردەوە: کە ئیمانداران لای خودا خاوەن رێزی تایبەتینو بەلوتفو رەحمەتی خۆی کۆمەڵگای پاكو خاوێنیان بۆ پێکەوە دەنێ، رێبازی ژیانی بەختەوەریی‌و کامەرانیان پیشان دەدا، پرۆگرامو پەیڕەوی جوانو نایاب دادەنێ بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی.. کۆمەڵگایەك رێك دەخا شیاوی ئەوەبن بەندەی خودا بن، شیاوی ئەوەبن نیسبەت بدرێن بۆ لای خودا، کۆمەڵگایەکی دڵپاكو هەست ناسكو زمان خاوێنو رەوشت جوان، خاوەنی ئەدەبو ئەخلاقی پەسەند بنو نموونەی مرۆڤایەتی بنو ناوی خۆیان بەخۆیانەوە بێ، لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خوداو لەگەڵ خۆیانو غەیری خۆیان دا خاوەنی ئەدەب بنو دیاردەی ئەو ئەدەبە لەهەڵسو کەوتیان دا رەنگ بداتەوە، لایەنی ماددیو مەعنەویان، شەریعەتو یاساو هەستو شعوریان، هەڵسو کەوتو هاتوچۆو جمو جوڵیان، بەشێوەیەکی تەوازونو تەنسیق ئامێز لەکاردابن و لەنگەریان رابگیرێ، هەرکەسە لەئاست خۆیەوە هەست بەئەرکی سەرشانی خۆی بکا بەرامبەر بەخوداو موسوڵمانانو کەسو کارو نیشتمان ! فێریان دەکا ئەخلاقو رەوشتیان لەگەڵ خوداو پێغەمبەردا چۆن بێو چۆن ئاخاوتن لەگەڵ رابەریاندا بکەن!

٣- لەهەردوو سورەتەکەدا ئاماژە بەرێزداریی پێغەمبەر دەکا، بەتایبەتی لەسەرەتای هەردوو سورەتەکەدا، رێزداریی پێغەمبەریش لای خودا داخوازی ئەوەیە، موسوڵمانان رێزی لێ بگرنو رازی بن بەوەی پێی رازیە، کەیەکێك لەوشتانە (صوڵحی حودیبیە)یە، کەوابوو پێویستە موسوڵمانان بەدڵ بەو صوڵحە رازی بنو هیچ تەگەرەیەك نەخەنە بەری!

سورەتەکە سورەتێکی مەدەنی‌یەو پڕە لەئەحکام ویاسا بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگا لەسەر بناغەیەکی پتەوو تۆکمەی پەروەردەکردن‌و ڕاهێنان، تەنانەت ناونراوە سورەتی (ئەخلاق) !

موسوڵمانان فێری ئەخلاق‌و یاسای جوان دەکاو فەرمانیان پێ دەکا بەپابەندبوون بەئەخلاقی بەرزو ڕەوشتی جوانەوە، چۆنیەتی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەتایبەتی‌و لەگەڵ خۆیان‌و غەیردا بەگشتی، پێیان دەفەرموێ چۆن بەرەو ڕووی ڕوداو ببنەوە، وچۆن هەواڵ‌و بیستراو هەڵسەنگێنن‌و توێژینەوەیان تێدا بکەن، هەڵوێستیان بەرامبەر یاخی بوان‌و سەرپێچیکاران چۆن بی‌و چی بکەن!

دەیانترسێنێ لەئاکامی ڕەوشتی ناشیرین‌و هەڵوێستی ناجوامێرانە، داوایان لێ دەکاموسوڵمانان لەناو خۆیاندا گاڵتە بەیەکتری نەکەن‌و ناوو ناتۆرە لەیەکرت نەدۆزنەوەو گومانی خراپ لەیەکتر نەکەن! پاشملە بەخراپە باسی یەکتر نەکەن‌و نەبنە جاسوس بەسەر یەکتریەوە، یەکسانی لەنێوان بەرەی ئادەمیزاددا ڕادەگەیەنێ‌و یاسای چینایەتی‌و ڕەگەزایەتی‌و دەمارگیری ڕەتدەکاتەوە، هیچ کەس‌و لایەن‌و هۆزو بنەماڵەیەك لەکەسی تر باشتر نیە مەگەر بەتەقواو ئەخلاقی جوان نەبێ، خوداپەرستی‌و پابەندبوون بەڕەوشتی بەرزەوە سەنگی مەحەکی ڕێزداری‌و جیاکەرەوەی چاك‌و خراپە، کێ تەقوای زیاتربی‌و پتر پابەندی ئایینی خوابێ، ئەوە زیاتر ڕێزدارترەو لای خودا لەکەسانی دیکە باشترە!

## گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو نواندنی ئەدەب لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ

أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ ۚ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی یەکەمی ئەم سورەتە بوخاریو تیرمیزیو هی تریش لەکوڕی ئەبو مولەیکەوە ریوایەتیان کردووە ؛ کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بۆی گێڕاوەتەوە دەڵێ: شاندێکی هۆزی تەمیم هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەرﷺ لەسەر دیاریکردنی ئەمیرێك بۆیان حەزرەتی ئەبوبەکرو حەزرەتی عومەر دەنگیان لێك بەرزبویەوەو ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ دەربارەی ئەو قرەقرەی ئەبوبەکرو عومەر نازڵ بوو.

ئیبنولموزیر لەحەسەنی بەصرییەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: رۆژی جەژنی قوربان چەند کەسێك پێش پێغەمبەرﷺ قوربانی خۆیان سەربڕی دوایی پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردن کە قوربانی‌یەکەیان تازەبکەنەوە، ئیتر ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ...﴾ نازڵ بوو.

ریوایـەتێکی تـر هەیـە طـەبـەرانی لـەخاتوو عائیـشەوە ریوایـەتی کـردووە دەفەرموێ: کەسانێك هەبوون پـێش پێغەمبـەرﷺ بـەڕۆژوو دەبـوون ئـیتر ئایـەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ نازڵ بوو.

دەربـارەی ئایـەتی ﴿لا تَرْفَعُـوا أَصْـوَاتَكُمْ ...﴾ ئیبنـو جـەریر لەقـەتادەوە ریوایــەت دەکـا دەڵــێ: هەنـدێ لـەهاوەڵان بـەدەنگی بـەرز لەگـەڵ پێغەمبــەردا ئاخاوتنیان دەکرد، ئیتر ئایەتی ﴿لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ ...﴾ نازڵ بوو.

دەربـارەی ئایـەتی ﴿إِنَّ الَّـذِينَ يَغُـضُّونَ أَصْـوَاتَهُمْ .......﴾ ئیبنـو جـەریر لەموحەممەدی کوڕی ثابتی کوڕی شەمماس ریوایەت دەکا دەڵێ: ئایەتی ﴿لا تَرْفَعُـوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ...﴾ نازڵ بوو ثابتی کوڕی قەیس هێزی ڕۆیشتنی نـەماو دانیـشتو دەسـتی کـرد بـەگریان، عاصیمی کـوڕی عـەدی کـوڕی عـەجلان بـەلای دا تێپەڕیو وتی: ئەوە بۆچی دەگری؟ وتی: دەترسم ئەو ئایەتـە دەرهـەق بـەمن نـازڵ بوو بێ. من دەنگم بەرزەو بەدەنگی بەرز ئاخافتن دەکەم ...

.. ئـەم هەواڵە بەپێغەمبـەرﷺ گەیـشتەوە، ئـەویش بـانگی کـرد، فـەرمووی: ئەتۆ رازی نابی ئەگەر بەژیانی بەختەوەریی بژیو بەشـەهیدی بمـریو بـچیتە نـاو بەهەشــتەوە؟ وتــی: قوربــان رازیــمو هــەرگیزاو هــەرگیز دەنگیــشم لەخزمــەت پێغەمبەردا بەرز ناکەمەوە، ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ...﴾ نازڵ بوو.

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: کەئایـەتی ﴿لا تَرْفَعُـوا أَصْـوَاتَكُمْ فَـوْقَ صَـوْتِ النَّبِيِّ...﴾ نازڵ بوو حەزرەتی ئەبوبـەکر سوێندی خـوارد کـەئیتر بەسـرتەوە نـەبێ قسە لەگەڵ پێغەمبەر نەکا، ئیتر ئایـەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَغُـضُّونَ أَصْـوَاتَهُمْ عِنْـدَ رَسُـولِ اللَّهِ﴾ نازڵ بوو.

دەربارەی ئایـەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِـنْ وَرَاءِ الْحُجُـرَاتِ...﴾ طەبـەرانیو ئـەبو ئـەعلا لەزەیـدی کـوڕی ئەرقەمـەوە ریوایـەت دەکـا: دەڵـێ هەنـدێ عـەرەبی دەشـتەکی هاتنـە لای ژووری پێغەمبـەرﷺو بـە (ئـەی موحەممـەد! موحەممـەد!)

بانگیان لێ کردو هەراو هوریایەکیان نایەوە ئیتر ئایەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ...﴾ نازڵ بوو.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی هەندێ لەکەللە وشکەکانی هۆزی تەمیم نازڵ بوو، ئەوەبوو لەبەردەرگای ژووری حەرەمیەوە جارێك نا دووجارو زیاتر بانگیان لە پێغەمبەر دەکردو دەیانگوت (ئەی موحەممەد!) وەرە بۆلامان، مەدحکردنمان جوانەو زەمکردنمان بەئێشە، پێغەمبەرﷺ بەو هەراو هوریایەی ئەوان تەنگەتاو بوو، ئێش بەدڵی گەیی، ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ...﴾ دەربارەی ئەوان نازڵ بوو.

ریوایەتی تریش هەن ئەم بێ ئەدەبیە دەخەنە سەرشانی خەڵکانی تر، بەهەر حاڵ کەسێك بیەوێ لەم بارەیەوە شارەزای هەمو ریواتەکان بێ بابگەرێتەوە بۆ سەرچاوە تایبەتەکان.

**ئێستایش دێینە سەرشیکردنەوەی ئایەتەکان:**

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کەئیمانداری راستەقینەن‌و لەناخەوە بڕواتان بەپەیامی پێغەمبەران هێناوە، دەست پێشخەری مەکەن‌و پێش حوکمی خوداو پێغەمبەری خودا هیچ بڕیارێك مەدەن، لەخۆتانەوە بێ بەڵگەو دەلیل حوکم دەرمەکەن‌و بڕیار مەدەن، چونکە وێدەچێ حوکم‌و بڕیارەکەتان هەڵەبێ‌و زیانی لێ بکەوێتەوە!

لەهەموو کارو کردەوەیەکتان دا لایەنی خوداتان لەبیر بێ ولەخودا بترسن، شتێك مەکەن خوداو پێغەمبەری خودا بڕیاریان لەسەر نەدابێ بۆ خۆتان یاسا بۆ خۆتان دامەنێن بێگومان خودا شنەوایە بۆ هەموو قسەو گوفتارێکتان ئاگاداری هەموو کارو کردەوەیەکتانەو هیچی لێ گوم نابێ‌و هیچی لێ تێك ناچێ.

بانگیان لێ کردو هەراو هوریایەکیان نایەوە ئیتر ئایەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ...﴾ نازڵ بوو.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی هەندێ لەکەللە وشکەکانی هۆزی تەمیم نازڵ بوو، ئەوەبوو لەبەردەرگای ژووری حەرمیەوە جارێك نا دووجارو زیاتر بانگیان لە پێغەمبەر دەکردو دەیانگوت (ئەی موحەممەد!) وەرە بۆلامان، مەدحکردنمان جوانەو زەمکردنمان بەئێشە، پێغەمبەرﷺ بەو هەراو هوریایەی ئەوان تەنگەتاو بوو، ئێش بەدڵی گەیی، ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ...﴾ دەربارەی ئەوان نازڵ بوو.

ریوایەتی تریش هەن ئەم بێ ئەدەبیە دەخەنە سەرشانی خەڵکانی تر، بەهەر حاڵ کەسێك بیەوێ لەم بارەیەوە شارەزای هەمو ریواتەکان بێ بابگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە تایبەتەکان.

**ئێستایش دێینە سەرشیکردنەوەی ئایەتەکان:**

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کەئیمانداری راستەقینەن‌و لەناخەوە بڕواتان بەپەیامی پێغەمبەران هێناوە، دەست پێشخەری مەکەن‌و پێش حوکمی خوداو پێغەمبەری خودا هیچ بڕیارێك مەدەن، لەخۆتانەوە بێ بەڵگەو دەلیل حوکم دەرمەکەن‌و بڕیار مەدەن، چونکە وێدەچێ حوکم‌و بڕیارەکەتان هەڵەبێ‌و زیانی لێ بکەوێتەوە!

لەهەموو کارو کردەوەیەکتان دا لایەنی خوداتان لەبیر بێ ولەخودا بترسن، شتێك مەکەن خوداو پێغەمبەری خودا بڕیاریان لەسەر نەدابێ بۆ خۆتان یاسا بۆ خۆتان دامەنێن بێگومان خودا شنەوایە بۆ هەموو قسەو گوفتارێکتان ئاگاداری هەموو کارو کردەوەیەکتانەو هیچی لێ گوم نابێ‌و هیچی لێ تێك ناچێ.

ئــەم ئایەتــە بەئاشــکراو بــێ پــێچ و پــەنا نــەهی لــەوەدەکا ئادەمیزادەکــان پێچەوانەی فــەرمانی خــوداو پێغەمبــەری خــودا رەفتــار بکــەن، ئیبنــو عــەبباس لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمویەتی: (شتێك مەڵێن پێچەوانەی قورئان و حــەدیثی پێغەمبەرﷺ بێ) .

ئیمامی (الضحاك) دەڵێ: واتــە حــوکم و بڕیارێـك دەرمەکەن دژی فــەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بێ.

واتــە: ئیجتهـادو دۆزینــەوەی حــوکم کــاتێ دروســتە لــەقورئان و فــەرمودەی پێغەمبــەردا دەق وەگیر نەکــەوێ، دەبــێ حــوکم لــەقورئان وەربگــیرێ ئەگــەر نــەبوو لەفــەرمودەی پێغەمبــەرﷺ ئەگــەر نــەبوو ئــەو کاتــە دەبــێ ئیجتهــاد بکــەین بــۆ دۆزینەوەی حوکم .

ئیمــامی ئەحمــەدو ئــەبوداودو تیرمیــزی و ئیبنــو ماجــە لەمــەعاذی کــوڕی جەبەلەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: کاتێك پێغەمبەرﷺ کردمی بەفــەرمانڕەوای وڵاتــی یەمــەن ویــستم بــڕۆم دەســت بــەکاربم، فــەرمووی: لــەوێ چــۆن کاروبــار بەرێوەدەبــەی و حــوکم دەردەکــەی؟ وتم : بــەگوێرەی قورئــان، وتــی: ئەگــەر ئــەو حوکمــــەت لەقورئانـــــدا نەدۆزیـــــەوە؟ وتم: دەگەڕێمــــەوە لای فــــەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر لەوێشدا هیچت چنگ نەکەوت؟ وتم: ئەوکاتــە رەئــی خۆم دەخەمە گەڕو ئیجتهاد دەکەم و بڕیارو حوکم دەردەکەم، دەڵێ: ئیتر پێغەمبەر ﷺ لەســینگی داو فــەرمووی: ســوپاس بــۆ ئــەو خودایــەی تــەوفیقی فروســتادەی پێغەمبەری خودای داوە بۆ ئەنجامدانی کار بەگوێرەی ویستی پێغەمبــەری خــودا ...

ئەوەتا مەعاذ رەزای خودای لێ بێ راو ئیجتهادی خۆی خستە دوای قورئــان و حەدیث، خۆ ئەگەر ئیجتهادی خۆی پێش بخستایە دەبــوە دەســت پێشخەری لەســەر قورئان و حەدیث و بێ جایی دەبوو.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕوای ساغتان هەیە بەتاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدا! هەرکاتێ ویستتان ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەردا بکەن بەئەدەبو حشمەتەوە قسەی لەگەڵ دا بکەن، مەنەڕێنن‌و دەنگتان بەسەر دەنگی ئەودا بەرز مەکەنەوە، چونکە نەڕاندن‌و دەنگ بەرزکردنەوە لەقسەکردندا نیشانەی کەم ئەدەبی‌و بێ ڕێزییە، لەسەرە خۆیی‌و دەنگ نزمکردنەوە لەئاخاوتن دا نیشانەی ویقارو ئەدەبە، هەڵبەتە ئەمە ئەدەبو هەڵسوکەوتێکە بۆ هەموو کەس لەگەڵ هەموو کەس دا پەسەندەو دەبێ پەیڕەوی بکرێ.

﴿وَلا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ﴾ ئەگەر قسەتان لەگەڵ پێغەمبەردا کرد بەئەدەبەوە بانگی لێ بکەن‌و نازناوی بۆ بەکاربێنن، بەهێدی‌و لەسەرەخۆیی بە(یا رسول الله)و (یا نبي الله) بانگی لێ بکەن، وای بانگ مەکەن کە خۆتان لەناو خۆتاندا بانگ لەیەکتری دەکەن، بەدەنگی بەرزو بەناوی خۆی بانگی قسە لەگەڵ کراوتان دەکەن پێویستە ئاخاوتنتان لەگەڵ پێغەمبەردا جیاوازبێ لەو شێوە ئاخاوتنانەی لەناو خۆتان دا لەگەڵ یەکتری ئەنجامی دەدەن.

﴿أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لا تَشْعُرُونَ﴾ پەروەردگار نەی لێ کردون لەوەی لەڕووی پێغەمبەردا دەنگ بەرز بکەنەوە، نەوەکو ئەو دەنگ بەرزکردنەوە پاداشتی کردەوەکانتان پوچ بکاتەوە، یا نەوەکوو بێ ڕێزی نواندن لەڕوی پێغەمبەردا سەربکێشێ بۆ کوفرو بێدینی‌و ئێوەش بەخۆتان نەزانن، فەرمودەیەکی صەحیح‌و راست هەیە: ئیمامی مالیكو ئەحمەدو تیرمیزی‌و نەسائی‌و هی تریش لەبیلالی کوڕی (الحارث)ەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: (ان الرجل ليتكلم بالكلمة من رضوان الله تعالى لا يلقى بالاً، يكتب له بها الجنة ، و ان الرجل ليتكلم بالكلمة من سخط الله تعالى لايلقى بالاً، يهوى بها في النار أبعد ما بين السماء و الأرض).

جاری واهەیە ئادەمیزاد قسەیەکی خێردەکات خودا پێی خۆشە بەندەکە بۆ خۆی چ گرنگیەکی پێ نادا، وەڵێ قسەکە کاریگەر دەبێ و خودا لەپاداشتی دا بەهەشتی بۆ دەنوسێ، وایش دەبێ کابرا قسەیەکی تاوان ئامێز دەکا، خودا پێی ناخۆشە بەندەکە خۆی چ گرنگیەکی پێ نادا وەڵێ خودا لەسزای ئەو قسەیەدا دەیخاتە ناو قوڵایی دۆزەخەوە.

ئەمجار موسوڵمان هەڵدەنێ بۆ ئەوەی بەدەنگی نزم ئاخاوتن ئەنجام بدەن و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ بێگومان ئەوانەی لەلای پێغەمبەرﷺ دەنگی خۆیان نزم دەکەنەوە و بەهێواشی قسەی لەگەڵ دەکەن رێزو حورمەتی پێویستی لێ دەگرن، ئەوانە خودا دڵی پاڵفتە کردون و لەبۆتەی داون بۆ تەقواو خوداپەرستی..

دڵی ئەوانەی کردوە بەشوێن و کانی عیبادەت و لەخودا ترسی، دڵ و دەروونی مشت وماڵ کردوون، چڵك و خڵتەی تاوانی تێدا نەهێشتوە، ئەوانە بەر بارانی رەحمەت و لێخۆشبوونی خودا کەوتون و پاداشتی بەهەشتیان دەدرێتێ، ئەمەش ئەوپەری بەختەوەرییە، خودا لەتاوانیان خۆش دەبێ، دڵیان مشت و ماڵ دەکا بۆ خوداپەرستی، لەدۆزەخ رزگاریان دەبێ و بەبەهەشتی بەرین و رازاوە شاد دەبن. چونکە لەخزمەت پێغەمبەردا دەنگی خۆیان نزم کردۆتەوە، بەئەدەبەوە ئاخاوتنیان لەگەڵ دا کردووە، رێزیان لێ ناوە، لەخزمەتیدا بەوپەری دڵسۆزی جیهادیان کردووە .

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ – الفتح/٩﴾.

ئیمام ئەحمەد لەموجاهیدەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ : نامەیەك بۆ ئیمامی عومەر نێردرا تیایا نوسرابوو، ئایا مەبەست لەئایەتەکە کەسێکە حەزی

لەتاوان نیە، تاوانیش ناکا، یان حەزی لێ یەو نایکا؟ لەوەڵام دا حەرزەتی عومەر فەرمووی ئەوانەی حەزیان لەتاوانەو لەترسی خودا نایکەن.

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەمجار پەروەردگار رەخنە لەوانە دەگرێ کەدەهاتن لە دوورەوەو لەدەرەوەی ماڵەکانی پێغەمبەرەوە بەدەنگی بەرز بانگیان لێ دەکردو دەیانگوت : ئەی موحەممەد! وەرە دەرەوە نیشمان پێتە، رەهنومایان دەکا بۆ شێوە هەڵس و کەوتێکی ترو چاوەڕوانکردنی پێغەمبەر تاخۆی تەشریفی لەماڵ دەردەچێ.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی لەدوورەوە لەدەرەوەی ماڵەکانی خێزانەکانت بانگت لێ دەکەن زۆربەیان، واتە: هەموویان نەزانن و ناداب و وصولٚ نازانن، نەفام وتەبیات وشك و گەڵحۆن رێزو تەقدیر نازانن و ئەدەب و رەوشتی بەرزیان تێدا نیە، هەست بەئەرکی سەرشانی خۆیان ناکەن بەرامبەر بە تۆ، نازانن کە پێویستە بەرێزو تەقدیرەوە بانگت بکەن و چاوەڕوانی بکەن تاخۆت لەماڵ دێیتە دەرەوە.

وەکوو گوتراوە مەبەست بە(حجرات) ئەو هۆدەو خانوانەن، کە خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ تێیدا نیشتەجێ بوون، پێغەمبەرﷺ نۆ خێزانی هەبووە هەریەکەیان خانووی جیای هەبووە، کە بریتی بووە لەهۆدەیەکی سادە کەهەلاشەکەی بە لقی دارخورما گیرابوو، بەسەر درگاکەیەوە پەردەیەکی رەشی لەموو چنراوو تەندراو هەبوو، هەلاشی هۆدەکان وابوون بەئاسایی دەستیان دەگەیشتێ، لەنزیك مزگەوتی مەدینەوە بوون .

لەسەردەمی وەلیدی کوڕی (عبدالملك) دا خرانە ناو حەرەمی مزگەوتەوە، خەڵك پێیان ناخۆش بوو گریان و نارەزاییان دەربڕی، سەعیدی کوڕی (المسیب) لەو رۆژەدا فەرمووی : من پێم خۆش بوو ئەم هۆدەو حەرەمخانانەی خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ لەسەر شێوەی خۆیان بهێڵدرانایەوە بۆ ئەوەی خەڵکی مەدینە بەو

شێوە زوهدو دونیا نەویستیە پەروەردە بونایەو کەسانی دیکەش کە زیارەتی مەدینە دەکەن بیانبینیایە کە پێغەمبەرﷺ چەند دونیا نەویست بووە لەچ هۆدەو خانویەکدا ژیانی بەسەر بردووە!

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْراً لَهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەگەر ئەوانە دانیان بەخۆدا بگرتایەو ئارامیان هەبوایە تا تۆ بەشێوەی ئاسایی دەهاتیە دەرەوە بۆ ناویان ئەوسا قسەو باسی خۆیانیان لەگەڵدا بکردیتایە، ئەگەر صەبریان بگرتایە تا تۆ بەشێوەی عادەتی دەهاتیە ناویان بەو شێوە نەفامیە جارِسیان نەکردیتایە خێرو خۆشی دەبوو بۆیانو بەرژەوەندیی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر دەبوو، چونکە ئەو کاتە موراعاتی ئەدەبو رێزلێنان لە پێغەمبەریان بەرچاو دەگرتو ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدا، پەروەردگار لێبوردەو تاوانپۆشە خاوەنی رەحم و بەزەییە بۆ بەندەکانی ئەگەر تۆبە بکەنو جارێکی تر ئەو هەڵسوکەوتە دووبارەنەکەنەوە لێیان خۆش دەبێ.

قازی ئەبوبەکر ناسراو بە (ابن العربي) دەفەرموێ: رێزگرتن لە پێغەمبەر پاش مردنی وەکوو رێزگرتنی کاتی ژیانی وایە، ئەگەر چویە زیارەتی گۆڕی پیرۆزی دەبێ بەو پەڕی رێزو حورمەتەوە دیدەنیەکەت ئەنجام بدەی .

لەکاتێکدا فەرموودەکانی دەبیستی دەبێ بەو پەڕی ئەدەبەوە گوێچکەی بۆ کلۆر بکەی بەهیچ شێوەیەك ئیهمالی نەکەیو پشتی تێنەکەی وەکوو چۆن لەحاڵی ژیانیدا ئەوە پێویست بوو، چونکە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرﷺ وەکوو قورئان وایەو ئەو رێزەی دەدریتێ، پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ – الأعراف/٢٠٤﴾.

وەلێ ئەو دەنگ بەرزکردنەوە نەی لێ کراوە، دەنگ بەرزکردنەوەیێکە: کەشیاوی گەورەپیاوان نەبێو لەعادەت دەربچێ، دەنگ بەرزکردنەوە لەخزمەت پێغەمبەرداﷺ بەمەبەستی ئیهانەو سوکایەتی پێکردن ئەوە کوفرە وپێویستە

لەکاتی بیستنی قورئانو حەدیثی پێغەمبەرداﷺ خۆمان توشی ئەو تاوانە گەورەیە نەکەین.

واتە: هەرکاتێ قورئان یان فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ خوێندرانەوە، بەوپەڕی ئەدەبەوە گوێیان لێ بگرین، دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی موجادەلەو دەمەدەمێ لەگەڵ دوژمن دا، هەروا نەڕاندن لەکاتی شەڕو جەنگدا بۆ ورە بەرزکردنەوەی جەنگاوەرانو ترساندنی دوژمن، ئەوە نەی لێ نەکراوە بەڵکوو پێویستە..! ئەوەتا پێغەمبەرﷺ لەغەزای حونەین دا بەعەبباسی فەرموو: (اصرخ بالناس) هاوار بکەرە موسوڵمانانو دەنگ هەڵبڕە باوەڕی موجاهیدەکانمان بەرزبێتەوەو دوژمن بترسێ، چونکە عەبباس زۆر دەنگ بەرزبوو.

ریوایەتکراوە بەیانیەك موسوڵمانان هێرشیان دەکرێتە سەر عەبباس بەدەنگی بەرز هاوار دەکا(یا صاحباه) سەبارەت بەوە ئافرەت منداڵی لەبارچووە!!

## لێکۆڵینەوەو دڵنیابوون لەهەر هەواڵێك کە دەبیستێ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ

ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾

فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةًۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٦) زۆر لەموفەسیرین گوتویانە ئەم ئایەتە دەرحەق بە(الولید) ی کوڕی عوقبە نازڵ بووە .

ئیبنوجەریرو ئەحمەدو طەبەرانیو ئیبنو ئەبی دونیاو هیتریش لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردووە فەرموویەتی : ئەم ئایەتە دەربارەی وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیەط نازڵ بووە، ئەوەبوو پێغەمبەرﷺ ناردی بۆلای هۆزی (بني المصطلق) بۆ کۆکردنەوەی زەکات لەنێوان وەلیدو ئەو هۆزەشدا رقو کینەیەك هەبوو، کە بیستیان وەلید دەچێ بۆ لایان هاتنە پێشوازیو و بەرەو پیری هاتن وەلیدیش بەوەی زانی ترساو بەرێی خۆیدا گەڕایەوە.

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! زەکاتەکەیان نەدامیو ویستیان بمکوژن، پێغەمبەرﷺ ویستی غەزایان بکا لەوکاتەدا کە خەریکی ئامادەباشیو کۆکردنەوەی جەنگاوەران بوو شاندی (بني المصطلق) گەیشتە خزمەت پێغەمبەرو تیان : ئەی پێغەمبەری خودا کە بیستمان نوێنەری خۆت ناردووە بۆلامان هەموومان کۆبووینەوەو هاتینە پێشوازییو رێزی لێ بگرینو زەکاتەکەمانی بدەینێ.

پێغەمبەرﷺ گومانی لێ کردنو قسەکەیانی نەچووە دڵەوە. فەرمووی: بەسە چی تر درێژە بەمجۆرە قسانە مەدەن، بەبێ دواخستن زەکاتەکەتان بدەن، یان پیاوێك دەنێرمە سەرتان لەگەڵ بکاو ژنو منداڵەکانتان بکاتە سەباياو ماڵو سامانتان بکاتە دەسکەوتی جەنگ، ئەمجار دەستی موبارەکی خستە سەرشانی ئیمامی عەلیو ئاماژەی بەوەکرد: کە ئەو دەنێرمە سەریان ئەوانیش وتیان: پەنا بەخوا لە رق هەڵسانی عەلیو پێغەمبەری خودا !!

ریوایـەتی تـر هەیـە ئامـاژە بـەوە دەکـا : کـە پێغەمبـەرﷺ هێزێکـی بەفەرمانڕەوایی خالیدی کوڕی وەلید ناردنـە سـەر، بۆ ئـەوەی شـەڕیان لەگـەڵ بکا کەخالید چووە سەریان دیتی وا بانگ دەدەن و خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ نوێـژو کۆمەڵگایەکی موسوڵمانن، ئیتر زەکاتەکەیان تەسلیم بەخالید کردو ئەو یش هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ .

موفەسـسیرین کـۆکن لەسـەر ئـەوە کـە ئـەو کەسـە خەبەرەکـەی دایـە پێغەمبەرﷺ وەلیدی کوڕی عوقبە بوو، ئایەتەکە دەربـارەی ئـەو نـازڵ بـووە، وەلـێ وەکوو ئوصوڵی دەفەرموون: (عیبرەت بەعمومی لەفظە نەك بەخصوصی سەبەب) .

بەگشتی ئایەتەکە داوا دەکا موسوڵمانان ووردبین و بەراوردکارو خـاوەن توێژینـەوە بن، کە هەواڵێکیان بیست بیخەنە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەو سەرنج دان و خێرا پێـی باوەڕنەکەن، هیچ کاتێکیش پشت بەقسەی فاسق نەبەسـتن و بڕیـاری لەسـەر گەلاڵـە نەکەن.

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەیە :**

کە لەئایەتەکانی پێشودا فەرمانی بەموسوڵمانان کرد، کـە ملکەچی فـەرمانی خـــوداو پێغەمبـــەری خـــودا بـــن، لەخزمـــەت پێغەمبـــەردا بەئـەدەب و حیـشمەت بـن و دەنـگ بەرزنەکەنـەوە، دوای ئاڕاسـتەکردنی ئـەم دوو فەرمانـە فـەرمانی پێکـردن کەپـشت بەقـسەی ئـادەمیزادی فاسـیق نەبەسـتن و هـەر هـەواڵێك دەبیـسن بیخەنـە بـەر لێکۆڵینـەوەو تـاوتوێ کـردن، بەهـەموو قـسەیەك باوەڕنەکەن، سافیلکەو خۆشباوەڕ نەبن نەبادا سـافیلکەییان سەربکێـشێ بـۆ فیتنـەو ئاژاوە لەنێوانیادا.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی ئیمانتـان هێنـاوە بـەخوداو پـەیامی پێغەمبەرﷺ ئەگەر فاسیق و بێ ویـژدانێك هاتـە لاتـان و هـەواڵێکی پـێ ڕاگەیانـدن، یەکسەر پێـی بـڕوا مەکەن، لـەناوەڕۆکی هەواڵەکە بکۆڵنـەوەو ئـەم دیـوو ئـەودیوی

بکەن، هەوڵ بدەن بگەنە حەقیقەت‌و واقیع‌و راستیتان بۆ دەربکەوێ، دەم‌و دەس لەسەر بڕیاری فاسیق‌و درۆزن بڕیار دەرمەکەن، تا حەقیقەت‌و راستیتان بۆ دەرنەکەوێ هەڵوێست وەرمەگرن .

نەوەکوو لەهەڵوێست وەرگرتنی بەپەلەو بڕیاردانی خێرایی‌و بێ لێ وردبوونەوە زیان بەکەسانی دیکە بگەیەنن و بەناڕەوا خەڵکی بێ تاوان توشی چوورتم‌و گێرەو کێشە بکەن، ئێوە ئاگاداری وەزع‌و حاڵی ئەوان نین‌و بەبیستنی هەواڵی بێ بناغە حوکم دەربکەن‌و بێ تاوان توشی زیان ببێ ئەو کاتە ئێوە لەکردەوەی خۆتان پەشیمان دەبنەوە : خۆزگە دەخوازن‌و دەڵێن: سەد بریا ئەوەمان نەکردایە.

کە لەئایەتەکەدا بەتایبەتی ناوی (فاسق)ی هێنا هۆیەکەی ئەوەیە (فاسق) جێگای گومانە بایەخ بەهەواڵی نادرێ، هەروەها بۆ ئەوەشە شك وگومان نەکەوێتە ناو کۆمەڵی موسوڵمانانەوە، هەرچی دەیڵێن وەرنەگیرێ بێ ثیقەیی‌و بێ متمانەیی لەناویاندا بڵاوبێتەوە .

ئەصڵ‌و حەقیقەت لەنێو ئەفرادەکانی کۆمەڵگای موسوڵمانان دا ئەوەیە ئەفرادەکانی جێگای متمانە بن‌و هەواڵیان بڕوا پێکراوو راستگۆبن، فاسق جێگای گومانەو بەبێ لێ ووردبوونەوە هەواڵی لێ وەرناگیرێ‌و بڕوا بەقسەی ناکرێ، بۆیە پێویستە کاربەدەستانی موسوڵمانان بەتایبەتی‌و موسوڵمانان بەگشتی هەواڵی بیستراو لەفاسیق بخەنە بەر توێژینەوەو سەرنجدان‌و خێرا بڕیاری لەسەر دەرنەکەن! نەوەکوو توشی هەڵەو تاوان ببن و بەنەزانی زیان بەکەسانی تر بگەیەنن و دوایی پەشیمان ببنەوە!!

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەخەبەری تاك (خبر الواحد) ئەگەر عادڵ بێ بەڵگەیەو متمانەی پێدەکرێ. شایەتی فاسق وەرناگیرێ .

بەشێوەیەکی گشتی ئایەتەکە داوای لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە لەهەواڵی فاسیق دەکا؛ وەڵێ هەواڵی ئادەمیزادی خوداناسی عادڵ وەردەگیری‌و بڕوای پێ

دەکرێ ئەمەیە ئەصڵو بنەمای قاعیدەی کۆمەڵگای ئیسلامیی، بڕواکردن بەقسەی پیاوچاكو عادڵ بەشێکە لەمەنهەجو پرۆگرامی (تثبت)و دڵنیابوون، چونکە قسەی عادڵ یەکێکە لەسەرچاوەی ئەو مەنهەجە ئیسلامییە!

وەکوو لەوەپێش رونمان کردەوە ئایەتەکە دەربارەی وەلیدی کوڕی عوقبە نازڵ بووە. ئەوە بوو پێغەمبەرﷺ ناوبراوی نارد بۆ ئەوەی زەکات لە (بني المصطلق) وەربگرێ، بەڵام کارەکەی ئەنجام نەداو زوو گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەرو وتی: زەکاتیان نەدامێ نەك هەرنەوەندە بەڵکوو وتی: ئەوان لەئایین پاشگەزبوونەوە، خۆیان ئامادەکردووە بۆ هێرش کردنو شەڕکردن، پێغەمبەرﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی ناردە سەریانو فەرمانی پێکرد کە بەباشی لەحاڵو وەزعیان وردبێتەوە وەبزانێ ئاخۆ هەڵوێستیان چۆنەو چییە؟ ئەمجار هەڵوێست وەربگرێ.

خالید بەخۆیو لەشکرەکەیەوە بەشەو لێیانە نزیك بوونەوەو چاودێرو جاسوسی نارد بۆ ناویان، هاتنەوە هەواڵیان پێدا: کە ئەو هۆزە موسوڵمانن‌و بانگ دەدەن‌و نوێژ دەکەن، کە رۆژ بوومەوە خالید هاتەناویان‌و بۆی دەرکەوت هەڵس‌و کەوتیان پێچەوانەی ناوەرۆکی هەواڵەکەی وەلیدی کوڕی عوقبەیە، جا خالید گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەرﷺو واقیعی حاڵی گێڕایەوە ئیتر ئەم ئایەت هاتە خوارێ، جا لەوەودوا پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: (التثبت من الله و العجلة من الشيطان) لێکۆڵینەوەو هەوڵدان بۆ ڕاستی لەخوداوەیەو پەلەکردن لەشەیتانەوەیە.

واپێدەچێ هەندێ لەموسوڵمانان بەبیستنی هەواڵی یەکەمجار لەوەلیدی کوڕی عوقبەوە خوێنیان گەرم بووەو ویستویانە بەزوویی هێرش بکرێتە سەر هۆزی (بني المصطلق)و تۆڵەیان لێ بستێندرێ، زۆر تەنگەتاوبوون بەنەدانی زەکاتو رقیان لەو هۆزە هەڵساوە، ئیتر ئەو ئایەتەی دوایی هاتۆتە خوارێ بۆ ئەوەی راستیەکی گەورەو مەزنیان بیر بخاتەوە، نیعمەتێکی گەورەی پەروەردگاریان بۆ روون بکاتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ﴾ بزانن: ئێوە پێغەمبەری خوداتان لەناودایە، ڕێزی لێ بگرن پابەندی فەرمان و جڵەوگیریەکانی بن، بێگومان ئەو باش دەزانێ بەرژەوەندی ئێوە لەچیدایە، قسەی پڕوپوچ مەکەن و بەبێ لێکۆڵینەوەو توێژینەوە دەم و دەست بڕیار بەسەر کەسدا مەدەن، چاوەڕوان بن ئاخۆ پێغەمبەر چیتان پێ دەڵێ و چ ڕێ و شوێنێکتان بۆ دادەنێ ..

بێگومان پێغەمبەر ئەگەر بێتو بەگوێی ئێوەبکا لەزۆر لەو شتانەی خەبەری دەدەنێ و ئەو ڕایانەی بۆی دەردەبڕن لەئاکامدا تووشی ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە دەبن، دەکەونە ناو تاوان و هیلاکەتەوە، وەلێ ئەو زاتە پێغەمبەری خودایەو لەخۆیەوە قسە ناکاو هەڵوێست وەرناگرێ، هەرچی دەیکا بەگوێرەی نیگاو سروشە .

بۆیە پێش دەرکەوتنی حەقیقەت بەگوێی ئێوە ناکاو پەلەناکات لەوەرگرتنی هەڵوێست و بێ لێ وردبوونەوە لەهەواڵی پێگەیشتو بڕیار نادا. کەوابێ چاك وایە بۆ ئێوەی موسوڵمان و خوداپەرست گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بن، ملکەچی قەزاو قەدەری خودا بن! پێشنیارو ئیقتراحاتی بۆ نەکەن!

ئەمجار سەرنجی موسوڵمانان رادەکێشێ بۆ لای نیعمەتی ئیمان و دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُولَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ﴾ واتە: بەڵام خودا ئیمانی لەدڵی بڕێکتان دا خۆشەویست کردووەو جوانی کردوە، بۆیە بەبیستنی هەواڵەکە وەلیدی کوڕی عوقبەو هەواڵی تر پەلەناکەن لەبڕیاردان و هەڵوێستی نامەسئولانە وەرناگرن و تۆمەتی خراپ پاڵ کەسانی دیکە نادەن، چونکە خودا ئیمان و باوەڕی لەهەموو شتێك لەلا خۆشەویست تر کردوون و لەدڵتاندا جێگیری کردوەو ڕیشەی داکوتاوە، کوفرو فیسق و بێدینی لەلا دزێوکردون و بەهیچ جۆرێك سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا ناکەن و سنوور شکێنی ئەنجام نادەن. ئەمەش هەمووی:

﴿فَضْلاً مِنْ اللَّهِ وَنِعْمَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ فهضل و نیعمهتی خودایه بۆ ئێوه بهمهحضی بهزمیی‌و رهحمهتی خۆی ئیمانی لهلا خۆشهویست کردون‌و بێدینی لهلا دزێو کردون. خودا زاناو ئاگاداره بهسهر ههموو روداوێکی رابووردوو داهاتوودا هیچی لێ گوم نابێ، زاناو دانایه لهبهڕێوهبردنی کارهکانیدا، ههرچی دهیڵێ‌و دهیکا له دانایی خۆیهوه سهرههڵدهداو حیکمهتی تێدایه، تهشریع‌و تهقدیری پڕه لهحیکمهت !!

## ههوڵدان بۆ نههێشتنی ئاژاوهی ناوخۆو حوکمی یاخی بوان

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾

ئهم دوو ئایهته قاعیدهیهکی گشتی‌و کۆمهڵایهتییان لهخۆگرتووه بۆ پاراستنی کۆمهڵگای ئیسلامیی لهپچڕان‌و پهرتهوازهبوون‌و بهرپابوونی ئاژاوه لهنێوان تاکهکانیدا، ئاوێنهیهکی باڵانومایه، بۆ چهسپاندنی حهق‌و عهداڵهت‌و رێکخستنی کۆمهڵگاو لهئاکامدا گهڕانهوه بۆ تهقواکاری‌و لهخوداترسان‌و چاوهڕوانی رهحمهت‌و بهرهکهتی!!

دەربارى سەبەب نزولى ئايەتى نۆيەم پێنج هۆكارى جيا جيا ريوايەت كراون، هەر ريوايەتە روداوێك بۆ سەبەب نزولەكە ديارى دەكا، وێدەچێ روداوەكان رويان دابێو ئايەتەكە دەربارەى هەموويان نازڵ بوو بێ، وێشدەچێ روداوێكيان سەبەب نزولى ئايەتەكە بێو ئەوانى تر وەگەڵ خرابن تێكرارو موتەشابيه بن، يەكێك لەو روداوانەى كراوەتە سەبەب نزولى ئايەتى نۆيەم ئەو ريوايەتەيە كە ئەحمەدو بوخاریو موسليمو ئيبنو جەريرو هى تريش لەئەنەسى كورى مالیكەوە ريوايەتيان كردووە:

دەفەرموێ: عەرزى پێغەمبەرﷺ كرا ئەى پێغەمبەرى خودا! خۆزگە سەردانى (عەبدوڵلاى كوڕى ئوبەى)يت بكردايە، پێغەمبەرﷺ بەسوارى گوێدرێژێك كەوتە رێ بۆلاىو موسوڵمانان شوێنى كەوتن..

دەوروبەرى ماڵى عەبدوڵلا زەويەكى بەردەلانو پيسو پۆخەڵ بوو، گوێدرێژەكەى ميزى كرد، عەبدوڵلا وتى: لێم دوور بكەونەوە سوێندم وابێ بۆگەنى ميزەكەى تەواو تێكى دام، عەبدوڵلاى كوڕى رەواحە وتى: سوێندم بەخوا ميزى گوێدرێژەكەى پێغەمبەرﷺ بۆنى لەبۆنى تۆ خۆشترە، پياوێكى خزمى (عەبدوڵلاى كوڕى ئوبەى) تورەبوو پشتگيرى (عەبدوڵلاى كوڕى ئوبەى) كرد، كەسانى ديكەش لايەنى (عەبدوڵلاى كوڕى رەواحە) يان گرتو پێك هەڵپرژانو بەلقە دارخورماو كوڵەمستەو نەعل بەربوونە يەكترى، ئيتر ئايەتى ﴿وان طائفتان من المؤمنين اقتلوا .....﴾ نازڵ بوو.

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە:**

لەوە پێش پەروەردگار موسوڵمانانى ترساند لەوەى هەواڵى بيستراو لەفاسيق وەربگرن. بێ لێكۆڵينەوە (تثبت) پێى هەڵ بخەڵەتێن. ئەمجار لێرەدا ئاكامى بڕواكردن بەقسەى بێدينو فاسيق رون دەكاتەوە كەزۆر جار بڕواكردن بەهەواڵى فاسيق سەردەكێشێ بۆ بەرپابوونى كێشەو شەڕو ناكۆكى ئا لەم كاتانەدا كەشەڕو دووبەرەكى پەيدا دەبێ.

پـەروەردگار داوا لەکاربەدەسـتو دەسـت ڕۆیـشتوی موسـوڵمانان دەکـا: کـە نەصـیحەتو ئامۆژگـاری هـەردوو لایـەن بکـەنو هـەوڵ بـدەن بەئاشـتی ئاژاوەکـە بکوژێننـەوە، نـەهێڵن تەشـەنە بکا، خۆ ئەگـەر لایـەنێکیان ملـی نـەداو سـوور بـوو لەسەر شـەڕو نیـزاع ئـەوە بـەیاخیو ستەمکار دەژمێـردرێو پێویـستە موسـوڵمانان دژی بوەسـتنو شـەڕی لەگەڵـدا بکـەنو ڕیـشەی شـەڕخوازان لـەبێخ دەربێـنن ... دەفەرموێ:

﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ هـەرکاتێ دوو لایـەنی موسـوڵمان بەشـەڕهاتنو دژ بەیـەك وەسـتان پێویـستە لەسـەر کاربەدەسـتو پیـاو مـاقوڵو بەرپرسـی موسـوڵمانان خێـرا بـچن بـەپیر کێـشەکەوەو هـەوڵ بـدەن بەنەصـیحەتو ئامۆژگـاری شـەڕو نیزاعەکـە دابمرکێننـەوە، هۆکـاری بـەرپابوونی دژایەتیەکە قەڵاچۆ بکەنو شكو گومان لەدڵی هەردوولا دەربهاوێن ..!

کۆمەڵێکی زۆر لەزانایانی ئیسلام ئەم ئایەتەیان کردۆتـە بەڵگە لەسـەر ئـەوە کە کردنی تاوانی گەورە نابێتـە هـۆی کـافربوونو موسـوڵمان تـاوانی گەورەشـی لـێ ڕوویـدا هـەر لـەجوغزی موسـوڵمانێتیدا دەمێنێتـەوەو ناچـێتە کـەمپی کـوفرەوە موعتەزیلەو خەواریج دەبێژن کەسێك تاوانی گەورە بکا کـافر دەبـێو لەقیامـەت دا بۆ هەتا هەتایە دۆزەخیە!!

لەصـەحیحی بوخـاریدا هـاتووە ئەبوبـەکرە ریوایـەتی دەکـا یـەژێ: ڕۆژێ پێغەمبـەرﷺ لەسـەر دوانگـە وتـاری دەداو حەسـەنی کچەزایـشی لەپەنایـەوە بـوو، لـەکاتی وتاردانەکـەدا کـەمێك ڕووی دەکـردە حەسـەنو چـەلێك ڕووی دەکـردە خەڵکەکـەو دەیفـەرموو: (ئـەم کوڕەیـەم ئـاغرو ڕێـزدارە هومێـدم پێیـەتی ناوبـژی دووتاقمی موسـوڵمان بکـاو ئـاژاوەی نێوانیـان بکوژێنێتـەوە) ئـەوەبو دوا ئـەو شـەڕە خوێناوییەی چەندین ساڵەی نێوان موسوڵمانان: کە لەئاکامدا ئیمامی حسینی تێدا شەهید بوو ئیمامی حەسـەن تـوانی ئـەو ئـاگرە بکوژێنێتـەوەو کۆتـایی بـە کوشـتو کوشتار بهێندرێ .

ئایەتەکـە بەئاشـکرا وەصـفی ئیمـان بـۆ هـەردوو لایەنەکـە دەهێڵێتـەوە، هەرچەندە ئیحتیمالی ئەوەهەیە لایەکیان یان هەردوو لایان تەجاوزکارو سنوور شکێن بن‌و تاوانی گەرورە ئەنجام بدەن !

﴿فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ﴾

ئەگەر لایەکیان وازی نەهێناو هەر سوور بوو لەسەر یاخی بوون‌و تەجاوزکاری خۆی‌و دەستدرێژی دەکردە سەر هێزو لایەنەکەی تر، ئەوە بەهەموو هێزو تواناتانەوە دژی لایەنی یاخی بوو، دەستدرێژی کار بوەستن‌و شەڕی لەگەڵ بکەن تا مل دەداو پابەندی یاسای خودا دەبێ‌و ئاشتی قەبوڵ دەکا، موسوڵمانان هەقە لەم جۆرە کاتانەدا هەڵوێستیان هەبێ‌و نەهێڵن ئاگری شەڕو فیتنە هەڵ بهایسێ بەڵکوو دەبێ هەوڵ بدەن دیاردەی شەڕو هەرا نەهێڵن‌و ڕیشەی فیتنە لەبێخ دەربێنن، جا ئەگەر بەبێ بەکارهێنانی چەك مەبەستەکە هاتەدی، ئەوە باشە ئەگینا چەك‌و هەموو هێزو توانایەکی دەستەبەر بوو وەکاردەخەن .

جا ﴿فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾

ئەگەر لایەنی یاخی بوو وازی لەشەڕەنگێزی هێناو ملی دا بۆ ئاشتی‌و رازی بوو بەشەریعەتی خودا، ئەوەی ئێوە موسوڵمان صوڵحی نێوانیان بکەن‌و بەعەدالەت ڕێکیان بخەنەوە، بێگومان خودا هەمیشە عەدالەتکاری خۆش دەوێ‌و ڕێزی عەدالەتکاران لای خودا زۆرو بێ شمارە.

ئیبنو ئەبی حاتەم‌و نەسائی لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ان المقسطين في الدنيا على منابر من لؤلؤ بين يدي الرحمن عزّ و جل بما أقسطوا في الدنيا) عەدالەتکاران لە دونیادا پاداشتی گەورەیان دەدرێتی دەخرێنە سەر مینبەری لولوئو لەژێر ڕەحمەتی خودادا دەگوزەرێنن لەپاداشتی ئەو عەدالەتکاریەی لەدونیادا ئەنجامیان داوە.

موسلیم‌و نەسائی لەعەبدوللای کوڕی عەمرەوە بەم دەقە ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردووە، دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (المقسطون عند الله تعالى يوم القيامة على منابر من نور على يمين العرش الذين يعدلون في حكمهم و أهاليهم و ماوَلوا) .

ئەمجار بەشوێن ئەو فەرمان‌و تەوجیهاتەی پێشوودا حەقیقەت‌و راستیەك دەخاتە روو، سەرنجی موسوڵمانان بۆ پەیوەندی‌و برایەتی‌و خۆشەویستی نێوان موسوڵمان رادەکێشێ‌و دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾

موسوڵمانان برای ئایینی یەکترن، پەیوەندی ئایین بەیەکیەوە بەستوون‌و کۆی کردوونەتەوە، کەواتە صوڵحی نێوان براکانتان بکەن‌و رێکیان بخەنەوە، لەهەموو هەڵسوکەوتێکیشتان دا تەقوای خودا بکەن‌و لایەنی رەزامەندیی خوداتان لەیاد بێ، پابەندی هەق‌و عەداڵەت بن ناوبژی کردن ونێوان کردنتان عەداڵەتکارانە بێ، مافی هیچ لایەنێك بۆ لایەنەکەی تر پێشێل مەکەن، پابەندی فەرمان‌و جڵەو گیریەکانی خودا بن بۆ ئەوەی رەحمتان پێ بکرێ.

فەرموودەی زۆر لە پێغەمبەرەوە ریوایەت کراون جەخت لەسەر برایەتی ئایینی دەکەنەوەو ئەو پەیوەندییە بەرزو پیرۆز دەنرخێنن وپەیوەندییەکە توندو تۆڵتر دەکەن، لەفەرموودەی صەحیح دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (المسلم أخو المسلم لايظلمه و لا يسلمه) موسوڵمان برای موسوڵمانە زوڵمی لێ ناکاو پشتگیری دەکاو ناهێڵێ دوژمن زیانی پێبگەیەنێ.

یان دەفەرموێ: (والله في عون العبد ما دام العبدُ في عون أخيه) پەروەردگار پشتگیری بەندەی خۆی دەکا بەمەرجێ ئەو بەندەیە یارمەتی برای موسوڵمانی خۆی بدا.

هەروەها لەحەدیثی صەحیح دا هاتووە دەفەرموێ: (مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم كمثل الجسد الواحد اذا شتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمى) نموونەی موسوڵمان لەیەکتر خۆشویستنداو لەبەزەیی هاتنەوەیان دا بەیەکتری لەپەیوەندیو هەماهەنگیو بەهانا هاتنی یەکتریەوە وەکوو جەستەیەك وان هەرکاتێك ئەندامێکی ئەو جەستەیە تووشی ئازارێك بوو هەموو جەستەکە ئێشی پێ دەگاو خەوی لێ ناکەوێو هەماهەنگی ئەو ئەندامە بەئەو ئازارە دەکەن!

یان دەفەرموێ: (المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا) موسوڵمان بۆ موسوڵمان وەکو چینی دیوار وەهایە هەندێکی هەندێکی تری پتەو دەکا.

## داب و نەریتی موسوڵمان لەگەڵ موسوڵمانو لەگەڵ خەڵکی تردا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ (١١) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن

يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾

دەربارەی ژمارە ئایەتی یانزە (الضحاك) دەڵێ سەبارەت بە شاندی بەنی تەمیم نازڵ بووە، ئەوانەی لەباسی سەبەب نزولی ئایەتی یەکەمی سورەتەکەدا باسیان هاتووە، ئەوەبوو ئەو شاندە گاڵتەیان بەصەحابە هەژارەکانی وەکوو عەممارو خەبباب‌و ئیبنو فوهەیرەو بیلال‌و صوهەیب‌و سەلمانی فارسی‌و سالم ئازادکراوی ئەبو حوزەیفە... هتد دەکرد کە بینیان روت‌و رەجاڵ‌و شڕو شۆڵ‌و چلکنن گاڵتەیان پێ هاتن!

هەندێکی تر دەڵێن: سەبەب نزولی ئەم ئایەتە ئەوەیە عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل ئیمانی هێناو هاتە ناوشاری مەدینە، کە موسوڵمانەکان عیکریمەیان بینی وتیان ئەوە کوڕی فیرعەونی ئەم ئومەتەیە، ئەویش لای پێغەمبەرﷺ شکوای حاڵی خۆی کردو ئەم ئایەتە نازڵ بوو،

هەندێ لەموفەسسیرین هۆکاری تر بۆ سەبەب نزولەکە دەستنیشان دەکەن! بەهەر حاڵ پێ دەچێ هۆکاری نازڵ بوونی ئایەتەکە زیاتر لەهۆکارێك بێ یان چەند هۆکارێك بێ. هەرچۆنێك بێ عیبرەت بەگشتگیری لەفظەکەیە نەك تایبەتمەندی نازڵ بوونەکەی .

دەربارەی ئایەتی ﴿وَلَا نِسَاءٌ مِّن نِّسَاءٍ﴾ ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (صەفیە)ی کچی حویەی کوڕی ئەخطەب هاتەخزمەت پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری

خـودا! ئافرەتـەکان قەشمـەریم پێدەکـەن، دەڵـێن: ئـەی جولەکـەی کـچی جولەکـە! پێغەمبەرﷺ فەرموی: بۆ پێیانت نەوت: باوکم هارونەو مامم موسایەو مێردەکەم (محمد)ە ئیتر ئەو ئایەتە نازڵ بوو.

دەربارەی ئایـەتی: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَـابِ﴾ ئـەبو جوبـەیری کـوڕی (الـضحاك) یەژێ پیـاوی واهـەبوو دوو نـاو سـێ نـاوی هـەبوو، کەبەهەنـدێ نـاو بانگیـان دەکـرد دڵگران دەبوو ئیتر ئەم ئایەتە لەو بارەوە نازڵ بوو.

حـاکمو هـی تـریش لـەبارەی حـەدیثی ئـەبو جوبـەیرەوە دەڵـێ: لەسـەردەمی نەزانـیدا بانگ لـێ کردن بەلەقەبو نازناو باو بوون پێغەمبەرﷺ بەشێوەی نازنـاو بانگی لەپیاوێ کرد، عەرزی پێغەمبـەرﷺ کـرا : کەئـەو پیـاوە لەوانـەیە بـانگ لـێ کردنی بەو نازناوە لەلا ناخۆش بێ ئیتر ئایەتی: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾ نازڵ بوو.

دەربارەی ئایـەتی ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضاً﴾ ئیبنولـونزیر لەئیبنوجـەریرەوە نەقڵ دەکا دەڵێ: واپێدەچیو وادەگوترێ کە ئـەو ئایەتـە دەربـارەی سـەلمانی فارسـی نازڵ بووە، نانی خواردو راکشا ویـستی بنـوێ پیـاوێ لاسایی خـواردنو راکـشانەکەی کردەوە ئیتر ئەو ئایەتە نازڵ بوو.

دەربـارەی ئایـەتی: ﴿يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ إِنَّـا خَلَقْنَـاكُمْ مِـنْ ذَكَـرٍ وَأُنثَـى﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم لە کوڕی ئەبو مولەیکەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: کەشـاری مەککـە رزگار کرا بیلال چووە سەربانی کەعبەو بانگی دا، هەندێ کەس وتیـان: ئـەو کۆیلـە رەشە پیسە چووەتە سـەربانی کەعبـەو بـانگ دەڵـێ؟! هەنـدێکی تـر وتیـان: ئەگـەر خودا رقی لێی هەڵسێ دەیکاتـە شـتێکی تـر یـان وتیـان : ئەگـەر خـودا شـتێکی بـوێ دەیگۆڕێ ئیتر ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى﴾ نازڵ بوو.

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم رووەیە :**

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی روونکردەوە کە پێویستە موسوڵمان چ هەڵسو کەوتێکی هەبێ بەرامبەر بە خوداو بە پێغەمبەرﷺهەروەها بەرامبەر ئەوانەی دوژمن‌و بەرهەڵستکارانی خوداو پێغەمبەری خودان!

ئەمجار لەم کۆمەڵە ئایەتەدا ئەوە روون دەکاتەوە کە موسوڵمان پێویستە چۆن بێ لەگەڵ موسوڵمانان بەتایبەتی‌و غەیری موسوڵمانان بەگشتی جڵەوگیری لەموسوڵمانان دەکا کە قەشمەری‌و سوکایەتی بەیەکتری نەکەن،و تانەو تەشەر لەیەکتری نەدەن‌و ناوناتۆرەی ناشیرین لە یەکتری نەنێن، جاسوسی بەسەر یەکترەوە نەکەن، واز لەفیتنەیی‌و غەیبەت بێنن، بەنژادو بنەماڵەو بنەچە نەنازن تەرازوی بەرزو نزمی، سەنگی مەحەکی چاکی‌و خراپی تەقوایە، کێ زیاتر خوداپەرست بێ‌و لەخودا بترسێ ئەوە رێزدارە، گەورەیی رێزداریی بەلەخودا ترسان دەستەبەر دەبێ دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْراً مِنْهُمْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەتاك وتەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرێتی موحەممەد هێناوەو خۆتان بەشوێنکەوتووی پەیامی دەزانن، باهیچ گەل‌و نەتەوەیەك هیچ دەستەو تاقمێك گاڵتە بەدەستەو تاقمی تر نەکا، چونکە لەوانەیە گاڵتەپێکراو لەگاڵتەکار چاکتر بێ‌و لای خودا رێزی زیاتر بێ، وێدەچێ ئەو کەسەی گاڵتەی پێدەکرێ لای خودا خۆشەویستتر بێ لەو کەسەی گاڵتەکە دەکا .

پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەیەکدا ئەبوهورەیرە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: (ربّ أشعث أغبر ذي طمرين تنبوا عنه أعين النّاس، لو أقسم على الله لأبرّه) رواه الحاكم ، واتە: زۆر کەس هەیە تەپ‌و تۆزاوی‌و چڵکن‌و شڕو شۆڵ خەڵکی بێزی لێ دەکاتەوە، بەڵام لای خودا هێندە خۆشەویستە ئەگەر هەر شتێك داوا لەخودا بکات بۆی جێ بەجێ دەکات.

ئیمامی موسلیم ئەم فەرمووده‌یەی بەم جۆرە ریوایەت کردووە (ربّ أشعث أغبر مدفوع بالأبواب لو أقسم على الله لأبرّه) زۆر تەپو تۆزاویو چڵکن لەبەردەرگایان پاڵیان پێوە دەنێن، خەڵکی بەهیچیان نازان وەڵێ لای خودا رێزدارن وەهەرچی داوا لەخودا بکەن بۆیان دەستەبەر دەکا.

ئەمجار چۆن جڵەوگیریی لەپیاوان کرد لەوەی گاڵتە بەیەکتری بکەن، بەهەمان ئوسلوبو شێوە دوابەدوای جڵەوگیریی لەوان جڵەوگیریی لەئافرەتان کردو فەرمووی:

﴿وَلا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْراً مِنْهُنَّ﴾ باهیچ ئافرەتێك گاڵتە بەهیچ ئافرەتێکی تر نەکا، چونکە لەوانەیە گاڵتەپێکراو لەگاڵتەکەر چاکتر بێ، زۆر جار ئەو ئافرەتانەی گاڵتە بەئافرەتانی تر دەکەنو پێیان پێ دەکەنو خۆیان بەچاكو بێ عەیب دەزانن ئەوان خۆیان عەیبدارو لەککەدارنو گاڵتەپێکراوەکان لەوان باشترن.

هەڵبەتە ئەگەر ئافرەتیش گاڵتە بەپیاوان بکەن یان پیاو گاڵتە بەئافرەت بکەن هەر حەرامەو هەمان حوکمی ئایەتەکە دەیانگرێتەوە. پێویستە ئادەمیزاد زۆر ئاگاداری ئەوەبێ بەگاڵتەکردن بەکەسانی تر کۆڕو مەجلیس نەرازێنێتەوە، خۆی لەم تاوانە بپارێزێو پابەندی ئەو

تەوجیهاتە قورئانییە بێ، کەبنەمایەکی سەرەکیەو فاکتەرێکی گرنگە بۆ قەڵاچۆکردنی حیقدو کینە.

﴿وَلا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ﴾ تانەو تەشەر لەکەسی دیکە مەدەن، عەیبو عار لەیەکتری مەگرن، چونکە ئادەمیزاد هەموو برای یەکترن لەباوكو دایکێك کەوتونەوە، کەسێك تانەو تەشەر لەبرای موسوڵمانی بدا وەکوو ئەوە وایە تانە لەخودی خۆی بدا، خەڵکی عەیبدار بکا خۆی عەیبدار دەکا، موسوڵمانان وەکوو ئەندامی جەستەیەك وان هەر ئەندامێك ئازاری هەبوو ئەوانی تر هاوبەشی

ئازارەکە دەکەن و لەگەڵیدا شەو بەخەبەرن، بۆیە قورئان تانەدانی لەکەسانی دیکە بەتانەدان لەخودی کابرای تانەدەر حسێب کردووە .

﴿وَلا تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ﴾ ئەی موسوڵمانان! نەکەن نازناوی سووك و ناشیرین لەیەکتری بنێن، هەر نازناوو لەقەبێك کابرا پێی ناخۆش بێ نابێ بەوە بانگی لێ بکەی، ئەمەش تاوانێکی گەورەیەو بڵاوبوونەوی لەناو کۆمەڵدا دەبێتە هۆکاری دوژمنایەتی و رق و کینە لەیەکتری بون و لێك هەڵوەشاندنی برایەتی و نەمانی خۆشەویستی .

وەلێ ئەگەر کابرا بەو لەقەبە ناشیرینە مەشهور بوو پێشی ناخۆش نەبوو بەوە بانگی لێ بکری و بەلایەوە ئاسایی بوو ئەوە قەیناکا، بۆ نموونە موفەسسیرێکی قورئان کورد بووە ناوی (یوسف الأصم)ە یوسفە کەڕە. ئەو لەقەبەی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو بەوە بانگی لێ کراوەو بەلایەوە ئاسایی بووە، نازناوو لەقەبی جوان و مەدح ئامێز نەهی ئایەتەکە نایگرێتەوە، بانگ کردن بەو جۆرە نازناوە پەسەندەو لەناو موسوڵمانان دا لەکۆن و نوێ دا باو بووەو باوە.

﴿بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ﴾ بەڕاستی دوای ئیمانهێنان و موسوڵمان بوون ناشیرینە ئێوە بەنازناوی ناشیرین بانگی یەکتر بکەن و لەقەبی ناخۆش لەیەکتری بنێن، ئەوە فیسق و تاوانە خۆتانی لێ بپارێزن .

﴿وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ﴾ کەسێك واز لەو تاوانانە نەهێنی و تۆبە نەکا ئەوە پێڕی ستەمکارانەو عەزابی دۆزەخی بۆ خۆی دەستەبەرکردووە. چونکە بەردەوام بوون لەسەر تاوان دەبێتە هۆی کافر بوون !

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنْ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان بەتاك و تەنهایی خودا هێناوەو شوێن پەیامی ئیسلام کەوتوون و محمد ﷺ بەپێغەمبەر دەزانن، خۆتان لەزۆر شك و گومان بپارێزن، لەخۆتانەوە بەبێ بەڵگەی بەهێز گومانی خراپ بەموسوڵمانان مەبەن، وەلێ گومانی خراپ بردن بەکەسانی

خراپو رەوشت ناشیرین دروستە بۆ ئەوەی خۆی لـێ بپارێزێ، بـەڵام نـابێ لەسـەر ئەو گومانە قسەی ناڕاست هەڵچنێو غەیبەتو بوختان ئەنجام بدا، چونکە هەنـدێ لـەگومان تاوانــەو لەککــەدار کردنــی موســوڵمانەو دەبێتــە هــۆی لــێ ڕەنجــانی پەروەردگار .

ئیبنـو ماجـە لەعەبـدوڵلای کـوڕی عومــەرەوە ریوایــەت دەکـا دەفــەرموێ: پێغەمبەرم بینی تـەوافی مـاڵی خودای دەکـردوە دەیفـەرموو: (مـا أطیبـك و أطیـب ریحك، وما أعظمك و أعظم حرمتك و الذي نفس محمد بیـدہ لحرمـة المؤمن أعظـم عند الله تعالی حرمة منك ، مالهُ و دمه ، وان یظن بهِ الأ خیراً).

ئیمامی مالیكو بوخاریو موسلیمو ئـەبوداود لـە ئـەبو هـورەیرەوە ریوایـەت دەکـەن دەفـەرموێ: پـەروەردگارﷺ فـەرمووی: (ایـاکم و الظـن فـإن الظـن أکـذب الحدیث، ولاتجسسوا ، ولاتحسسوا، ولاتنافسوا ، ولاتحاسدوا، ولاتباغضوا، وکونـوا عبـاد الله اخوانا) خۆتـان بپـارێزن لـەگومان، بێگومـان گومـان بردنـی خـراپ بەموسـوڵمان درۆترین درۆیە تاوانێکی گەورەیە.

﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾ جاسووسـی بەسـەر یـەکترەوە مەکـەنو لەعـەیبو عـاری یەکتری مەکۆڵنەوە، هەوڵ مەدەن نهێنیو کەمو کوڕی براکانتان بخەنـەڕوو، گوێتـان هەڵمەخەن بۆگفتوگۆی کەسانی دیکە کە پێیان ناخۆشە گوێیان لێ بگرن، هەروەها لەکونو کە لەبەرەوە مەڕواننە ناو ماڵی خەڵك .

ئـەبو داودو هـی تـریش لەئـەبو بـەرزەی ئەسـلەمییەوە ریوایـەتیان کـردووە دەڵێ: پێغەمبـەرﷺ وتـاری بـۆ خوێنـدینو فەرمووی: ئـەی ئـەو کەسـانەی بەقسە موسوڵمانن‌و ئیمانو تەقوا بەتەواوەتی نەچۆتە ناو دڵتانەوە، لێکۆڵینەوە لەعەیبو کەمو کورتی خەڵکی مەکەن، چونکە هەرکەسێ لەعەیبو عاری خـەڵکی بکۆڵێتـەوە خودا لەناو ماڵی خۆیدا ریسوای دەکا.

طەبەرانی لەحاریثەی کوڕی (النعمان) ریوایەت دەکا کە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سێ شت ئەزمەو نوشوستین بۆ ئوممەتەکەم: رەشبینیو حەسودیو گومانی خراپ، یەکێك لەهاوەڵان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چ شتێك قەلاچۆی ئەو رەوشتە ناشیرینانە دەکا؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر حەسودیت برد تەوبەو ئیستیغفار بکە، ئەگەر گومانی خراپت برد شوێنی مەکەوەو مەچۆرە بنجو بناوانی بەڵکوو پاشگوێی بخە، ئەگەر لەکردنی شتێکدا رەش بین بووی گوێی پێ مەدە بەڵکوو بوێرانە ئەنجامی بدە.

ئەبو قیلابە دەڵێ: بەعومەریان گوت کە ئەبو میحجەنی ئەقەفی لەماڵی خۆیدا هاوەڵانی کۆدەکاتەوەو مەی دەخۆنەوە، حەزرەتی عومەر بەرەو ماڵیان کەوتەڕێو چووە ژوورەوەو هیچی نەبینی ئەبو میحجەن وتی: ئەی عومەر ئەمە نابێو بۆت رەوا نیە هەروا هەڵکوتیتە سەر ماڵی خەڵك، چونکە پەروەردگار ئەی لەجاسوسی کردن کردووە ئیتر حەزرەتی عومەر بێ سیو دوو ماڵی ئەبو میحجەنی بەجێهێشت .

﴿وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ ؟﴾

با هیچ کەس لەئێوە باسی خراپەی کەسانی تر لەئێوە نەکا، جا باسکردنەکە بەڕاستەوخۆ بێ یان ناڕاستەو خۆ بێ، باسی خودی خۆی یا باسی منداڵو خێزانی بێ، یان هەر شتێك پەیوەندی بەوەوە هەبێ چونکە باسکردنی کەسانی دیکە بەخراپە دەبێتە هۆی دڵڕەنجانی باسکراوەکەو حیقدو کینە لەدڵیاندا بەدی دێنێ.

پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەیەکیدا کە ئەبوداودو تیرمیزیو ئیبن جەریر لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە، لەپێناسەی غەیبەت کردندا فەرمووی: غەیبەت ئەوەیە باسی برای موسوڵمانت بکەی بەجۆرێك پێی ناخۆش بێ، هاوەڵێك عەرزی کرد : قوربان! ئەی ئەگەر ئەو کەسە رەوشتە ناشیرینەکەی تێدا بوو؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەو کەسە رەوشتە دزێوەکەی تێدابوو ئەوە غەیبەتە، خۆ ئەگەر تێیدا نەبوو ئەوە بوختانە .

ئـه‌بوداود ده‌گێڕێتـه‌وه ده‌ڵـێ: خـاتوو عائیـشه به‌پێغه‌مبـه‌ری گـوت: ئـه‌تۆ (صه‌فیه)ت به‌سه كورته بالأیه‌كی واو وا !! پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی: (لقد قلت كلمة لو مزجت بماء البحر لمزجته) قسه‌یه‌كت كرد ئه‌گه‌ر تێكه‌ڵاوی ده‌ریای بكه‌ی لێڵی ده‌كا..

ئـه‌مجار پـه‌روه‌ردگار غه‌یبـه‌ت كردنـی شـوبهاندوه بـه‌خواردنی گۆشـتی بـرای مردووی بۆ ئه‌وه‌ی موسوڵمانان راچڵه‌كێنیێو قێزیان له‌غه‌یبه‌تكردن بێته‌وه، چونكه خـواردنی گۆشـتی ئـاده‌میزاد ته‌بیعـه‌تی سـه‌لیم قێـزی لـێ ده‌كاتـه‌وه چ جـایی به‌مردوییش‌و جگه له‌وه‌ی كه له‌شه‌رعیشدا حه‌رامه !!

ئایه‌ته‌كه به‌ڵگه‌یه‌كی زۆر به‌هێزو ئاشكرایه له‌سه‌ر ئه‌وه: كه غه‌یبـه‌ت كـردن حه‌رامه‌و شتێكی قێزه‌ونه، جا ئه‌گه‌ر كه‌سێك تووشی ئـه‌و تاوانـه بـوو بـازوو تۆبـه بكاو گه‌ردنی به‌غه‌یبه‌تكراوه‌كه ئازاد بكا.

وه‌ڵێ ئه‌گـه‌ر غه‌یبه‌تكردنه‌كـه به‌رژه‌وه‌ندییـه‌كی تێـدا بـوو ئـه‌وه غه‌یبـه‌ت كردنه‌كه دروسته، بۆنمونـه: ئه‌گـه‌ر كابرایـه‌ك بیـه‌وێ كـچی، خوشـكی، خزمـی بـدا به‌شوو به‌كه‌سێك، ئه‌و كه‌سه عه‌یبی تێدا بوون تۆ پێت ده‌زانین‌و راوێژیان پێكردی ده‌بێ چی راسته بیڵێ‌و عه‌یبی كابرای خوازبێنی كه‌ر ده‌ربخه‌ی .

غه‌یبـه‌ت په‌یوه‌نـده بـه‌پارێزگاریی رێـزی ئـاده‌میزاد به‌غه‌یبـه‌ت ئـه‌و رێـزه ده‌شكێ‌و ئه‌و سنووره ده‌به‌زێندرێ ناموسوو كه‌سایه‌تی هه‌تك ده‌كرێ.

پێغه‌مبه‌رﷺ له‌حه‌جی ماڵئاواییدا وتارێكی خوێندوه له‌وتاره‌كه‌دا خیطـابی ئاڕاسته‌ی موسـوڵمانان كـردو فـه‌رمووی: (ان دماءكم و أموالكم و أعراضكم عليكم حـرام كحرمـة يـومكم هـذا، في شـهركم هـذا ، في بلـدكم هـذا) خوێنتـان ماڵتـان ناموستان له‌یه‌كتر یاساغه، نـابێ ده‌سـتدرێژیان بكرێتـه سـه‌ر ده‌بـێ پارێزگارییـان بكـرێ، وه‌كـوو چـۆن ئـه‌م رۆژه كـه‌رۆژی عه‌ره‌فه‌یـه‌و ئـه‌م مانگـه كـه مـانگی ذیلحیجه‌یه‌و یه‌كێكه له (أشهر الحرام)و ئـه‌م وڵاتـو خاكـه كـه مه‌ككه‌یـه رێـزدارن‌و پێویسته رێزیان بگیرێ‌و پارێزگارییان بكرێ .

لەفەرموودەیەکی تردا ئەبوداودو تیرمیزی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (کلّ المسلم على المسلم حرام؛ ماله ودمه و عرضه، حسب امرئ من الشرّ أن يحقر أخاه المسلم) هەموو موسوڵمانێك لەسەری حەرامە دەستدرێژی بکاتە سەر ماڵو ناموسو خوێنی موسوڵمانانی تر، بەسە بۆ خراپی ئادەمیزاد کە سوکایەتی بە برای موسوڵمانی بکا. بەچاوی سوك سەیری بکا پاشملە غەیبەتی بکاو رێزی بشکێنێ.

لەفەرموودەیەکی تردا ئەبو داود لەئەبو بوردەی بەلەوییەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی ئەو کەسانەی بەڕواڵەت ئیمانتان هێناوە بەڵام ئیمان نەچوەتە ناو دڵتانەوە، وریابن غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن شوێن کەمو کوڕیو نهێنییەکانیان مەکەون، چونکە بێگومان هەرکەسێ بەدوی عەورەتو نهێنی موسوڵمان دا بکەوێ بیەوێ ئاشکرایان بکا، خوداش شوێن نهێنیو عەیبو عاری ئەو دەکەوێ، کە سێکیش خودا شوێن نهێنیو عەیبو عاری بکەوێ لەماڵی خۆی دا ریسوای دەکا !!

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾ تەقوای خوداتان هەبێو بترسن لەبێگوێی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی، خۆتان لەسزاو تۆڵە بپارێزن ڤێزتان لەغەیبەت بێو توخنی نەکەون، بێگومان خودا تۆبە وەردەگریو بەزەیی دێتەوە بەوانەی لەتاوان دەگەڕێنەوەو پشت بەخوا دەبەستن .

دوای ئەو هەموو بانگ لێکردنە یەك بەدوای یەکانە بە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ و سەرنج راکێشانیان بۆ ئەو ئاسۆ بەرزەو دنەدانیان بۆ ئەوەی بگەنە ئەو ئاستە بەرزو پیرۆزە پڕ فەڕو بەرەکەتە، بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ئادابە نەفسیو کۆمەڵایەتیانە .

پاش دروست کردنی ئەو هەموو شوراو سیاجانەی دروستی کردن بۆ پارێزگاریی ئازادیو کەرامەتو ماڵو ناموسی موسوڵمان و زامنکردنی ئەو هەموو

شتانە بەتـەقوای خـوداو لـەخودا ترسـان، دوای بەرزبوونـەوە بەسـەر ئـەو هـەموو پلیکانانەدا بۆ گەیشتن بەو ئاسۆ بەرزو پیرۆزە، خیطاب ئاڕاستەی هەموو ئادەمیزاد دەکا وێڕای جوداوازی رەچەڵەكو رەنـگو زوبـان ولاتو هـۆزو بنەماڵە، بـۆ ئـەوەی سەرنجیان رابکێشێ بۆ حەقیقەتو راستـیەکی حاشا هەڵنەگر بـۆ تەرازویـەکی بـێ وێنەو سەنگی مەحەکی کۆمەڵگای ئادەمیزادی نموونەیـیو دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَـاكُمْ شُـعُوباً وَقَبَائِـلَ لِتَعَـارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ ئەی ئادەمیزاد بەگشی بەهـەموو چـینو توێژو رەچەڵەكو نژادو رەنگو زوبانتانەوە کەدابەش بوون بەسەر چەندەها هۆزو گـەلو تـاقمو کۆمەڵـەوە، هـەر گەلـەی بـەزمانێك دەدوێو لەشـوێنێکی سـەر زەوی نیشتەجێیە، هەیە رەش پێـستەو هەیـە سوورەو هەیـە سـپیو هەیـە گـەنم رەنـگ، هـەمووتان لەبنەڕەتـدا لـەدایكو باوکێـك بـەدی هـاتوونو وەچـەو نـەوەی ئـادەمو حەوان، ئادەمیش لەگڵ دروستکراوە.

کەواتە پەرتەوازە مەبنو کێشەو دووبـەرەکی مەخەنـە نێوانتانـەوە ئێومـان کـرد بـەو هـەموو هـۆزو گـەلو نەتـەوە جیاجیایانـە بـۆ ئـەوەی یـەکتری بناسـنو بەیەکتر ئاشنابن، نەك بۆ ئەوەی کێشەتان تێبکەوێو دژ بەیەکتر بوەستن، وشـانازی بە بنەماڵەو هۆزو عەشیرەتەوە بکەن، خۆتان بەسەر یەکتردا هەڵبنێنەوە؛ بەکورتی هەمووتان خودا دروسـتی کـردوونو کردوونـی بەگـەلو هـۆزو خێـڵو بنەماڵـە بـۆ یەکتر ناسین نەك خۆبەزلزانینو خۆهەڵنانەوە بەنژاد!

رێزو گەورەیی نێوانتان بەتەقواو خودا پەرستـیە، کێ زیاتر لەخودا بترسێو تەقوای هەبێ ئـەوە رێزدارتـرە، واز لەخۆبـەزلزانیو خۆهەڵنانـەوە بێـنن، بێگومـان خودا زانایە بەحاڵو نهێنیو کارو بارتـان، خەبـەردارە بەئاشکراو نهێنیتـان، هیـچی لـێ گوم نابێ .

بێگومان ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کەفائەت لە بەینی ژنو مێرددا بەغەیری ئایین داریی بایەخی نیە، ئەو حەدیثانەی ریوایەتکراون کە گوایە کوڕە مسکینو کوڕە کوردو کوڕە فارسو .... هتد هاوکوفی کچە قورەیشیەك نین، کچە هاشمییەك بازۆر دینداریش نەبێ لەکوڕە کوردێکی خوێندەوارو موسوڵمان پایەبەرزترە هەروا زۆر لەم قسەو قسەڵۆکانە کە لەهەندێ کتێبان دا چەسپاون راستەوخۆ دژی ئەم ئایەتە پیرۆزەن، بۆیە دەبێ بەحەدیثیان نەزانین، وە بەبەڵگەوە رەتیان بکەینەوە .

رەحمەت لەئیمامی مالیك: کە تەنها ئایینداری دەکاتە مەرجی کەفائەتو هەر ئەو بوارە بەتەرازوی بەرزو نزمی ئادەمیزادەکان دەزانێ!!

ئایینی ئیسلام بەئاشکراو بەنهێنی دژی ئەو دەمارگیریی (عصبیە) نەزانیانە وەستاوەو ویستویەتی بەهەموو جۆرێك ریشەکێشیان بکا. بۆ ئەوەی لەژێر ئاڵای (لااله الا الله)دا یاسا ئیسلامییە جهانگیریەکەی بچەسپێنێو ئادەمیزاد بکەوێتە بەختەوەرییەوەو کامەرانی دونیاو قیامەتی بۆ دەستەبەر ببێ. تەنانەت بانگەشەی خێڵەکیو دەمارگیریی بە شتێکی بۆگەنو قێزەون داناوە، ئیمامی موسلیم لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە فەرموودەیەکی ریوایەت کردووە تێیدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ دەربارەی (عصبیة) فەرمویەتی: (دعوها فإنها منتنە) وازی لێ بێنن بانگەشەی بۆ مەکەن چونکە بۆگەنە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە ئەبوبەکری بەزار ریوایەتی دەکا، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (کلکم بنو آدم، وآدم خلق من تراب، ولینتهینّ قوم یفخرون بآبائهم ولیکون أهون علی الله تعالی من الجعلان)!

## بنەمای ئایینی راستەقینە

﴿ ۞ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَـٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا۟ ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَـٰمَكُم ۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَـٰنِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ ﴾

ئەمجار لەکۆتایی سورەتەکەدا حەقیقەتی ئیمانو نرخی ئەو هێزە مەعنەویە روون دەکاتەوە رەددی ئەوانە دەداتەوە کە بەڕواڵەت خۆیان بەموسوڵمان دەزانن و بەلام مەعنای ئیمان لەکردەوەکانیاندا رەنگی نەدەدایەوە، بەزمان ئیمانیان هێنابوو بەلام نەچوو بوە ناو دڵیانەوە، دەفەرموێ:

﴿قَالَتْ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ هەندێ لەعەرەبە سارانشینەکانی بەنی ئەسەد لەساڵانی گرانیدا هاتنە مەدینەو شایەتومانیان هێنا بەڵام لەناخەوە موسوڵمان نەبوو بوون، دەستیان کرد بەمنەت کردن بەسەر پێغەمبەردا دەیانگوت: ئەوە ئێمە دژت نەوەستاین‌و بەئارەزووی خۆمان ئیمانمان پێهێنای وەکوو فلان هۆزو فیسار خێڵمان نەکرد شەڕت لەگەڵ بکەین بەرەنگارت ببینەوە، دەسابێنە لەماڵی زەکات بەشی باشمان بدەرێ..!

ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ئەوە ئێوە ئیمان نەچوەتە ناو دڵتانەوە بەڵکوو بەرواڵەت خۆتان بەموسوڵمان نیشان دەدەن، کەواتە مەڵێن: ئیمانمان هێناوەو باوەڕی ئیسلامی لەدڵمان دا جێگیر بووە، بەڵکوو بڵێن گەردن کەچت بووین‌و خۆمان تەسلیم کردووە، ئێوە هێشتا ئیمان نەچوەتە ناو دڵ‌و دەروونتانەوە چونکە ئەگەر ئیمانی راستەقینە لەناختان دا جێگیر بوایە لەهەڵسوکەوتتاندا رەنگی دەدایەوەو ئاکارو رەفتارتان بەشێوەیەکی تر دەبوو.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە ئیمان لە ئیسلام تایبەت ترە، ئەمەش دەق رای ئەهلی سوننەو جەماعەیە! واتە: لەنێوان ئیمان‌و ئیسلام دا عام‌و خاصی رەها هەیە، ئیمان (خاص)ەو ئیسلام (عام)ە .

ئەمجار پەروەردگار موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ وەدەستهێنانی ئیمانی راستەقینەو تەواو دەفەرموێ:

﴿وَإِنْ تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لا يَلِتْكُمْ مِنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئاً إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەگەر ئێوە بەراستی تاعەتی خودا بکەن، دڵسۆزانە ئەرکی سەرشانی خۆتان ئەنجام بدەن، بڕوای راست‌و دامەزراوتان هەبێ ئەوە پڕاو پڕ پاداشتتان دەدرێتەوەو هیچ لەپاداشتتان کەم ناکرێتەوە، کەوابێ پاداشتی خۆتان پوچ مەکەنەوە دڵسۆزانە ئەرکی سەرشانتان ئەنجام بدەن !

بێگومان خودا لێخۆشبوو خاوەنی بەزەییە، هەرکەسێ تۆبەبکاو دڵسۆزانە کارو ئەرکەکانی خۆی راپەڕێنێ، لەتاوانی خۆش دەبێو دوای تۆبەکردن سزای نادا.

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ بەراستی موسوڵمانانی راستەقینە هەر ئەوانەن، کە ئیمانێکی راستو ریشەییان هێناوەو بڕوای تەواویان بەتاکو تەنهایی خوداو پێغەمبەرێتی (موحەممەد) هەیە، لەدڵیان دا ئەم باوەڕە چەسپیوە بەزوبان ئیقراری پێ دەکەنو لەکردەوەکانیان دا رەنگ دەداتەوە ..

.. ئەمجار پاش دەستەبەربوونی ئەم ئیمانە ئیتر شکو گومانو لاوازی رووی تێنەکردوونو لەسەر بیروباوەڕی خۆیان بەردەوام بوون، بەماڵو گیانی خۆیان لەپێناو ئایینی خوادا تێکۆشاون، هەوڵیان داوە خودا لەخۆیان رازیی بکەنو ئاڵای (لااله الا الله) بەرزبێتەوەو بەئازادی بشەکێتەوە، ئائەوانە موسوڵمانی ساغو خوداناسی راستەقینەن، نەك ئەو عەرەبە سارانشینانەی بەڕواڵەت ئیسلام بوبوون وەلێ ئیمان نەچووبووە ناو دڵیانەوە!

﴿قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ بِدِينِكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: بۆچی ئێوە خودا ئاگادار دەکەن بەسەر ئایینی خۆتان دا؟ وادەزانن خودا نازانێ چیتان لەدڵ دایە؟ نانا وامەزانن خودا ئاگاداری نهێنی ناو دڵتانەو دەزانێ چی تێدایە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو خودا دەزانێ ئاسمانەکانو زەوی چییان تێدایە، هەر لەزەڕڕە هەتا مەجەڕە ئاگاداری هەموانیانە وردو درشتی ئەم بوونەوەرەی ئاگا لێیە. ئەدی چۆن نازانێ ئاخۆ ئێوە موسوڵمانی راستەقینەن یان نا؟ خودا زانایە بەهەموو شتێکو هیچی لێ ناشاردرێتەوە .

﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُلْ لَا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُمْ بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: موسوڵمان بوونی

خۆتان مەکەنە منەت بەسەرمەوە، چونکە سودی ئیمانهێنانەکەتان بۆ خۆتانە، بەڵکوو خودا منەت دەکا بەسەر ئێوە دا سەبارەت بەوەی کە هیدایەتی داون بۆ ئیمانهێنان و تەوفیقی داون بۆ ئەوەی قبووڵی ئایین بکەن، ئەگەر راست بکەن ئێوە ئیمانتان هێنابێ! واتە: ئێوە درۆ دەکەن ئیمانتان نەهێناوە هەر بەرواڵەت موسوڵمان بوون!

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: کە هەرچی نهێنی ئاسمانەکان و زەوی هەیە بەسەریدا ئاگادارەو دەفەرموێ:

﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ بێگومان خودا ئاگادارە بەهەموو نهێنیو ئاشکراییەك لەناو ئاسمانەکان و زەویدا، لەوانە ئەو نهێنی و شاراوانەی ناو دڵی ئادەمیزاد، خودا ئاگادارە بەسەر هەموو هەڵسوکەوت و ئاکارو رەفتارێکتان دا، پاداشتان دەداتەوە چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە. هیچی لێ گوم نابێ، ئیمانی راستەقینەو ئیمانی فڕو فێڵ لێك جیا دەکاتەوە، نیازو مەبەستەکانی ئادەمیزاد دەزانێ، ئاگاداری هیوایەت و ترس و خەتەرەو خەیاڵاتی هەموو ئادەمیزادێکە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (ق)

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (قاف) چونکە سەرەتای سورەتەکە بەو پیتە دەست پێ دەکا، لەهەمان کاتدا یەکەم پیتە لەوشەی قورئان!

سورەتێکی هەست هەژێنەو ترس هاوەرو دڵ وەلەرزە هێنە، جەرەسی وشەکانی و تارمایی ماناکانی کاریگەریەکی تەواوی لەسەر دڵ و دەروون هەیە، ئەم لاو ئەو لا لەنەفسی ئادەمیزاد دەگرێ و لەهەموو خەتەرەو جەم و جوڵێکیدا بەشوێنیەوەیەتی بەئاشکراو بەنهێنی چاودێری دەکا بەچاودێری پەروەردگار کە تاقە چرکەیەك لێی بێ ئاگا نابێ.

ئەوە بەئادەمیزاد رادەگەیەنێ و بەگوێیدا دەدا: کە هەر لەرۆژی لەدایك بوونیەوە، وە لەوەپێشیش تا دەمرێ و لەوەدوایش هەموو هەڵسوکەوت و ئاکارو رەفتارێکی هەموو خەتەرەو خەیاڵێکی، هەموو قسەو ورتەیەکی لەلایەن خوداوە کۆنترۆڵە بەوردی موراقەبەو حسێب و لێکۆڵینەوەی لەسەرە .

هەڵبەتە سورەتەکە مەککەییەو ناوەرۆکەکەی ئەو باس و خواسانەن : کەسورەتە مەککییەکان لەخۆیان گرتوون، کەبریتین لەبنەمای عەقیدەو چەسپاندنی یەکتاپەرستی و راستی پێغەمبەرایەتی و زیندوبوونەوەی ئادەمیزاد لەرۆژی قیامەت دا، وەلێ ئەم سورەتە پێ لەسەر باسی زیندوبوونەوە رادەگرێ و رەددی ئەوانە دەداتەوە کەبڕوایان بەزیندوبوونەوە وحیساب و لێکۆڵینەوەی قیامەت نیە. بۆیە سەرەتا باسی ئینکاری کردنی موشریکەکانی عەرەب دەربارەی زیندوبوونەوە سەرسامیان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەست پێدەکا!

بۆ دەرخستنی دەسەڵاتی رەهای پەروەردگار بۆ بەدیهێنانی رۆژی قیامەت ئایەتەکان ئادەمیزاد هەڵدەنێن بۆ تێرامان و وردبوونەوە لەڕوبەری بوونەوەر وسەیرکردنی ئاسمان و وردبوونەوە لەجوانی و فراوانی ئاسمان و زۆریی ئەستێرەکانی. ووردبوونەوە لەزەوی و کێوو کەژو دەشت و بیابان و لەشیوو دەشت و چۆم و دەریاکانی لەڕوەك و دارو درەختی لەبەفرو باران و زریانی!

ئەمجار دێرۆك و بەسەرهاتی گەلە پێشینەکانی وەکوو گەلی نوح و ئەصحابی رەس و قەومی عادو ئەمودو قەومی نوح و ئەصحابولئەیکەو قەومی شوعەیب و قەومی توببەع رادەنوێنێ وسەرنجی خەڵکەکە رادەکێشێ بۆ بیرلێکردنەوەو سەرەنجامیان: کە لەراستیدا جێگای سەرنجن و هەق وایە هەموو کەس پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرێ!

ئەمجار بەرپرسیاریەتی هەموو ئادەمیزادێك رادەگەیەنێ و ئەوە روون دەکاتەوە : کە هەر یەکێك لەئێمە دوو فریشتە چاودێرنی و وردو درشتی کردەوەو

گوفتارو ئاکارو رەفتاری تۆمار دەکەن‌و بۆ چاکەو خراپە چرکەیەك لێی بێ ئاگا نین .

ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ کە فلیمی ژیانی ئادەمیزاد بەچەشتنی پیاڵەی شەرابی مردن کۆتایی دێ‌و دەکەوێتە ژیانێکی ترەوەو تووشی تەنگ‌و چەڵەمەی ژیانی بەرزەخ‌و زیندووبوونەوەی قیامەت‌و حەشرو حیساب‌و لێکۆڵینەوە دەبێ، کەوابێ پێویستە ئادەمیزادەکان پەند وەربگرن‌و خۆیان بۆ ئەو رووداوە ئامادە بکەن‌و توێشوی سەفەر بۆ ئەو سەفەرە سامناکە دەستەبەر بکەن .

کۆتایی سورەتەکەش بەسەرنج راکێشانی ئادەمیزاد دەهێنێ بۆلای دیاردەبوونەوەریەکانی وەکوو دروستکردنی ئاسمانەکان‌و زەوی ئەوەی تیایاندایەوو رووداوی زیندوبوونەوەی قیامەت‌و گۆڕ هەڵتەکاندنی ئەو هەموو مردوانەی کە هەر خودا خۆی ژمارەیان دەزانێ کەبەهەڵەداوان‌و بەخێرایی بەپیر بانگەوازی خوداوە دێن لەساڕای مەحشەردا کۆدەبنەوە بۆ لێکۆڵینەوەو سەرەنجام سزاو پاداشت بەگوێرەی کردەوە.

ئەم سورەتە جەرەس‌و وەقعێکی تایبەتی هەیە هەست هەژێنەبۆیە لە مێژوودا هەمیشە بەبۆنەی رووداوی سامناك‌و کۆبوونەوەی گشتی خوێنراوەتەوە بۆئەوەی بیسەران بەخەبەر بێنی‌و پەندو عیبرەتی لێ وەربگرن .

جابیری کوڕی سەمورە فەرموودەیەك ریوایەت دەکاو موسلیم لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی کە پێغەمبەرﷺ لەنوێژی بەیانیدا سورەتی(ق)ی دەخوێند .

موسلیم وئەبوداودو بەیهەقی‌و ئیبنوماجە لە(أم هشام)ی کچی حاریثەی (النعمان) ریوایەتیان کردووە کە دەڵێ: ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾م لەدەمی پێغەمبەرەوە بیستووە لەوتاری رۆژانی هەینیدا لەسەردوانگەی دەیخوێند.

موفەسسیرین لەنێوان سورەتی (ص)و سورەتی(ق) دا چەند شێوە لێکچوون‌و موشابەهەیان بەدی کردووە لەوانە:

هەردوو سورەتەکە بەیەك پیتی هیجا دەستیان پێکراوە، لە هەردوکیاندا دوابەدوای پیتەکە سوێند بەقورئان خوراوە، دوابەدوای ئەوە وشەی (بل)و ئوسلوبی (تعجب) بەکارهێنراوە .

لەسەرەتای سورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ﴾ لەکۆتاییشیدا دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ﴾. لەسەرەتای سورەتی(ق)دا دەفەرموێ: ﴿وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ لەکۆتاییشیدا دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ . ناوەڕۆکی هەردوو سورەتەکە بریتیە لەچەسپاندنی بنەماکانی بیروباوەڕ (تەوحید، نبوة، زیندوبوونەوە) .

## موشریکەکان بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیەو قورئان رەددیان دەداتەوە

﴿قٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ﴿١﴾ بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ ٱلْكَـٰفِرُونَ هَـٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ۖ ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ﴿٣﴾ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَـٰبٌ حَفِيظٌۢ ﴿٤﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَـٰهَا وَزَيَّنَّـٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَـٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ

عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٨﴾ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ﴿١٠﴾ رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِۖ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ﴿١١﴾

**﴿ق﴾ هێنانی ئەم جۆرە پیتانە لەسەرەتای هەندێ لەسورەتەکانی قورئانـدا چەند مانایەك دەبەخشێ وێچووتر مانا ئەوەیە: پەروەردگار تەحەددای عەرەبو غەیری عەرەبی کردووە کەبتوانن نموونەی قورئان یان دە سورەتی بەڵکوو سورەتێکیشی بخەنە ڕوو، واتە: پێان دەفەرموێ: ئەوە قورئان لەو جۆرە پیتانە پێك هاتووە! دەی ئێوە ئەگەر ئازان نموونەی قورئان بێنن، خۆتان بەتاقی بکەنەوە، خۆ قورئان بەزمانی خۆتانەو لەو پیتانە پێك هاتووە!**

**بێگومان ناتوانن بەڵکوو ئەگەر هەموو جندۆکەو ئادەمیزادیش یەك بگرن توانای خۆیان بخەنە گەڕ هەر ناتوانن نموونەی قورئان تەنانەت سورەتێکیشی بخەنە ڕوو.**

**﴿وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ سوێندم بەقورئانی پڕ خێرو بەرەکەتو بەرزو پیرۆز بێ، ئەتۆ ئەی موحەممەد پێغەمبەری‌و ڕەوانەکراوی بۆ سەر ئەو قورەیشییانەو هەموو ئادەمیزادو جندۆکە، بانگەوازییان دەکەی بۆ یەکتاپەرستی‌و لەسزاو عیقابی ڕۆژی قیامەت دەیانترسێنی، دەتەوێ لەتاریکی کوفر ڕزگاریان بکەی‌و بیانخەیتە سەر ڕێگای ڕاستو ڕۆشن‌و بەختەوەریی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەربێ.**

**﴿بَلْ عَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا شَيْءٌ عَجِيبٌ﴾ بەڵکوو کافرەکانی قورەیش سەرسام بوون لەوەی کە لەڕەگەزی خۆیان پێغەمبەرو ترسێنەر بێتە سەریان‌و بانگەوازییان بکا بۆ یەکتاپەرستی، شتەکەیان لەشكو گوماندا نەهێشتەوە بەڵکوو بەئاشکرا وتیان: ئەمە کە (محمد) پیاوێکە وەکوو خۆمان‌و**

لەڕەگەزی خۆمانەو لافی پێغەمبەرێتی لێ دەدا شتێکی سەرسوڕهێنەرەو ئیمە لەبەرامبەریدا سەرسامین! بەڵام بابزانن ئەوە هیچ جێگای سەرسوڕمان نیە، چونکە ئەو کارە بەدەست خودایەو خوداش بۆ خۆی فروستادەی خۆی لەفریشتەو ئادەمیزاد هەڵدەبژێرێ‌و ئەرکی تایبەتیان دەخاتە ئەستۆ!

نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو بەلایانەوە سەیرە کە دوای مردن زیندووببنەوە، ئەوەتا بەئاشکرا دەڵێن:

﴿أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَاباً ذَلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ﴾ ئایا کە ئێمە مردین وبوینەوە بەخاك‌و خۆڵ جارێکی دی زیندودەکرێینەوە؟ بەراستی ئەو زیندوبوونەوەمان‌و رابوونی قیامەتەمان شتێکی دوورەو عەقڵ وەری ناگرێ‌و مومکین نیە شتی وا ڕوو بدا!!

ئەمجار پەروەردگار رەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ﴾ بێگومان ئیمە بەزانیاریەکی تەواو زانیومانەو دەزانین خاك چۆن جەستەی خواردون‌و چۆن رزیون‌و چیان بەسەر هاتووە، هەموو حاڵ‌و وەزع‌و رووداوو بەسەر هاتیان پێش مردن‌و دوامردنیان لای ئێمە لەلەوحولمەحفوظدا و نوسراوەو ئاشکراو عەیانەو هیچمان لێ گوم نەبووە، هەرکاتێ بمانەوێ زیندویان بکەینەوەزۆر بەئاسانی جەستەیان رێك دەخەینەوەو زیندویان دەکەینەوەو کێشیان دەکەین بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوە، هەرکەسە بەگوێرەی خۆی سزاو پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار هۆی کوفرو سەرەڕەقی قورەیشییەکان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ فَهُمْ فِي أَمْرٍ مَرِيجٍ﴾ کافرەکانی مەککە لەراستیدا قورئان بەدرۆ دەخەنەوەو بڕوا بەپێغەمبەریەتی موحەممەدﷺ ناکەن‌و بەبێ بەڵگەو لێ وردبوونەوە پشت لەبانگەوازیی ئیسلامیی هەڵدەکەن‌و ئەو پەیامە پیرۆزە رەتدەکەنەوە..

ئەوان دەربارەی ئیسلام لەحالەتی سەرلێشێواویو ڕاڕایی دان، دەمێك دەڵێن: قورئـــان ســـیحرەو محمـــد ســـاحیرە، چـــەلێك یـــەژن: قورئـــان شـــیعرەو محمد شاعیرە، وەختێکیش دەبێژن: قورئان فاڵو فروفیشاڵەو محمدیش جادوبازو کۆڵـە وەنـانـیـیـە، نـازانن چـۆن بەربـەرەکانی ئـەو پەیامـە بکـەن، هەمیـشە لەدڵەراوکێدانو سەرگەردانو سەراسیمەن!!

نەدەبوو ئەو هەڵوێستەیان هەبێ ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ﴾ ئایا ئـەو کافرانـە بۆچـی سـەیری ئاسمـان ناکـەن لـەژوور سەریانەوە چۆنمان دروست کردووەو بەبێ کۆڵەکە ڕامان گرتووە، چۆن ئەو ئاسمانە بەرفراوانـە: کـە هـەر خـودا دەزانـێ چـەندەوە چـۆنە بـەبێ درزو کونو کەلەبـەرە، دەسەیری بکەنو بیر لەدەسەڵاتی خودا بکەنەوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِن فُطُورٍ، ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَـصَرُ خَاسِئًا وَهُـوَ حَسِيرٌ – الملـك/٣-٤﴾: ئەوانـە ئەگـەر کـەودەنو نـەفام نەبوونایە بەسەیرکردنی ئاسمانو تێفکرین لێی خودایان دەناسی وە ئیمانیـان پێـی دەهێنا،و یەکتاپەرستییان ئەنجام دەدا !!

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ هـەروەها بۆچـی ئەوانـە سـەیری زەوی ناکـەنو لێـی وردنابنـەوە بـزانن ئێمـە چـۆن ڕامـان خستوەو بەرفراوانمان کردوە، کێومان لەسەر داکوتاون بۆ ئەوەی جمو جوڵو لەرزە بەدانیـشتوانی سـەری نـەکا، نەیانهـەژێنێو ڕایـان نەتلـەقێنێ گیانلەبـەران لەسـەری هەست بەئارامی بکەن.

ئەمجار بۆ ناڕوانن ئێمە لەسـەر زەوی چـۆن ئـەو هـەموو دارو درەخـتو گیـاو گـــوڵو گوڵزارەمـــان ڕوانـــدووەو دیمـــەنی زەویمـــان پـــێ ڕازاندۆتـــەوە،

لەهەموو جۆرێك نێرو مێمان تێدا خولقاندون، وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ – الذاريات/٤٩﴾.

ئێمە كە بەو جۆرە ئاسمانو زەویمان دروستكردون ﴿تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيبٍ﴾ بۆ رێنمایی ئادەمیزاد بۆ ئەوەی بەندە گەڕاوەو تۆبەكارەكان، تێیان رامێنن‌و بیریان لێ بكەنەوە،و زیاتر ئیمانیان بەهێز بێ‌و پتر خودا پەرستی بكەن. ئەمجار ئاماژە بەچۆنیەتی روانی گیاو درەخت دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا مِنْ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكاً فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ﴾ با ئەو خەڵكە لەدەسەڵاتو توانایی ئێمە وردببنەوە، بڕوانن چۆن ئێمە لەبەرزاییەوە ئاوێكی پڕ فەڕو بەرەكەتمان باراندووە، بەوە دارو درەختو روەكمان رواندووە، باغو نزارمان پێك هێناوە، دانەوێڵەو بەروبومی جیاجیامان پێ هێناوەتە دی، دانەوێڵە ئێوە دەیچێنن بەباران پێدەگاو دوایی دەیدورونەوەو دەیكەنە بژێو .

﴿وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ﴾ هەروەها بەئاو دارخورمامان رواندوە كەدەیبینن چەند بەرزو جوانە، میوەكەی زۆرو چین چین لەسەر یەك دەكەوێ.

ئاوا بەو جۆرە بارانمان باراندوە درەختو گژو گیامان پێڕواندوە، بەروبومو دانەوێڵەی لێ دەستەبەر دەكەن، ﴿رِزْقاً لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كَذَلِكَ الْخُرُوجُ﴾ بۆ ئەوە ببێتە رزق‌و رۆزی بۆ بەندەكانم، سوپاسی پەروەردگاریان بكەن لەسەر ئەو نازونیعمەتانە، ئێمە بەو بارانە وڵاتی مردوو روتو سوتەمەڕۆ زیندوودەكەینەوە، گیاوگژو دارو درەختی تێدا دەڕوێنین، هەر بەو جۆرەش ئێوەی ئادەمیزاد دوای مردن زیندودەكەینەوە .

واتە وێنەی زیندوبوونەی رۆژی قیامەت دەق وەكوو شین بوونەوەو روانەوەی دارو درەختو گژو گیایەهەردوو حاڵەتەكە بۆ دەسەڵاتی خودا چون یەكن، چۆن بەبەرچاوتانەوە ئێمە بەهۆی باراندنی بارانەوە زەوی

وشـك و سـوتەمەڕۆ زیندوودەکەینــەوە بەهــەمان شـێوە بــە بــێ مانــدوبوون ڕۆژی قیامەت مردووەکان زیندوودەکەینەوە

## ئینکاری کردنی زیندوبوونەوە دیاردەیەکی کۆنی ئادەمیزادە

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ ۚ كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ ۚ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾﴾

لـەوەپێش ئـەوەی روونکـردەوە کـە قـوڕەیـشییەکان بڕوایـان بەزیندوبوونـەوە نــەبووە، هــاتنی رۆژی قیامــەتیان بــەرووداوێکی دوورو نامــەعقول زانیــوە، لێــرەدا پــەروەردگار هەڕەشــەیان لــێ دەکا بــەوە کــە گەلــە پێـشینەکان هــاتنی قیامــەتیان بەناڕاست لەقەڵەم داوەو خودا تۆڵەی لـێ ستاندونو لەناوی بردوون قوڕەیشییەکان ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئـەو هەڵوێـستە ناشیرینو سـەرڕەقییەیان، ئـەوە هـەمان تۆڵەیان لـێ دەسەندرێ دەفەرموێ:

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَابُ الرَّسِّ وَثَمُودُ، وَعَادٌ وَفِرْعَـوْنُ وَإِخْـوَانُ لُـوطٍ، وَأَصْحَابُ الآيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُـلَ فَحَـقَّ وَعِيـدِ﴾ لـەپێش قورەیـشییەکاندا زۆر گەلو نەتەوەی تر هاتنی قیامەتیان بەدرۆخستەوە خودا تۆڵەی لـێ ستاندونو لەناوی بردوون، قەومی نوح (نوح)یان بەدرۆخستەوە، خودا بەتۆفان لەناوی بـردن، قەومی فیرعەون پەیامی موسایان ڕەتکردەوە لەدەریادا خنکاندمانن.

﴿أَصْحَابُ الرَّسِّ﴾ ئەو خێڵەیە کەلەسەر بیرێکی هەڵنەچنراو لەوڵاتی یەمامە نیشتەجێ بوون ئاژەڵداریان دەکرد، بتیان دەپەرست .

هەندێکیش پێیان وایە ئەو گەلە (أصحاب الأخدود)ن پەروەردگار ئەم خێڵەو قەومی ثەمودو ئەهلی مەدیەنو ﴿وَأَصْحَابُ الْأَيْكَةِ﴾: کە قەومی شوعەیب بوون لەسەر ئیمان نەهێنانیان، بەناڵەو گرمە لەناوی بردن، هەروەها قەومی عاد کە گەلی هود بوون بەرەشەبای بەشیدەت، گەلی (لوط) بەرەشەبای بەهێزو بەردەباران‌و ڕۆچوونی زەوی لەناوبران.

قارون‌و دارودەستەکەی بەزەویدا ڕۆچوون‌و فەوتێنران، هەموو ئەو گەل‌و نەتەوە پێشینانە سەرپێچیان کردو پەیامی پێغەمبەرەکانیان ڕەتکردەوە، خودا هەڕەشەی خۆی هێنایەدی‌و لەناوی بردن، دەی باقورەیشییەکان‌و هەموو ئەوانەی: کە ئەم قورئانەیان ئاراستە کراوە بترسن لەوەی کە ئەو عەزابانەی یەخەی ئەو گەلانەی گرتووە تووشی ئەمانیش بێ، چونکە سوننەتی خودا ناگۆڕێ‌و هەرچی بیشیەوێ بیکا دەیکا.

ئەمجار پەروەردگار بەڵگەیەکی تر لە خودی ئادەمیزادەکان لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەت دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ ئایا ئێمە کەلەسەرەتادا ئادەمیزادمان دروست کرد، یان ئێمە: کە لەسەرەتادا بوونەوەرمان هێنایە وجوود، پێوەی ماندوو بوین؟! نەخێر هیچ ماندوبوونێکمان بەخۆمانەوە نەدی زۆر بەسانایی دروستکردنی یەکەمجارمان ئەنجام دا، ئەدی چۆن ئێمە ناتوانین دوای مردنی ئادەمیزاد جارێکی تر زیندویان بکەینەوە؟!

لەڕاستیدا هێنانی ڕۆژی قیامەت و دروستکردنەوەی زیندوان زۆر لەدروستکردنی سەرەتایان ئاسانترە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوەدەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ – الروم/٢٧﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ یس/٧٨-٧٩. بەڵکوو ئەوان لەشك و گومان و ڕاڕایی دان دەربارەی زیندوبوونەوەو هاتنی قیامەت، سەیرە ئەوان دان بەوەدا دەنێن کەلەسەرەتادا خودا دروستی کردوون و بەدیهێنەری بوونەوەر پەروەردگارە، ئەدی چۆن ئەوان ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن!

## خودا بەدیهێنەری نادەمیزادەو زانایە بەهەموو حاڵ و وەزعێکی

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ ﴾

لەوەپێش بەڵگەی جۆراوجۆرو بەهێزی هێناوەوە لەسەر رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوەی ئادەمیزاد، ئەمجار دەست دەکات بەچەسپاندنی ئەو ڕاستیە: کە هەر خودا لەسەرەتادا ئادەمیزادی دروست کردووەو زانیاری تەواوی دەربارەی حاڵو وەزعو هەڵسوکەوتی هەیە، دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ واتە: سوێندم وابێ ئێمە ئادەمیزادمان بەدیهێناوەو هەموو کاروبارێکی دەزانین چۆنەو چۆن نیە، تەنانەت ئەو خەتەرەو خەیاڵانەی بەدڵیدا دێن لەئێمە شاراوە نینو زۆر بەباشی ئاگامان لێیەتی، ئێمە لەڕەگی لاملی خۆی لێی نزیکترین، چۆن ئاگاداری نهێنیو خەتەرەی ناو دڵی نین؟

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مانای ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ ئەوەیە فریشتەی خودا لەڕەگی لاملی ئادەمیزادە کە خۆی لێی نزیکترن، هەموو چاکەو خراپەیەکی دەنووسنو هیچیان لێ فەرامۆش نابێ .

بەکورتی خودا بۆ خۆی ئادەمیزادی دروستکردوە، هەموو کاروبارێکی دەزانێو هیچی لێ گوم نابێ، تەنانەت خەتەرەو خەیاڵی ناو دڵو دەروونیشی ئاگا لێیە، وەڵێ پەروەردگار ئادەمیزاد لەسەر خەتەرەو قسەی نەفس سزانادا، هەتا بەکردەوە ئەنجامی نەدا.

لەحەدیثی صەحیح داهاتووە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (ان الله تعالى تجاوز لأمتي عمّا حدثت به انفسها مالم تتكلم به أو تعمل به) بوخاریو موسلیمو ئەبوداودو نەسائیو تیرمیزی لە ئەبو هورەیرەوە ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردووە، ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادگەیەنێ کە وێڕای ئاگاداریو زانیاری خۆی بەهەموو کاروبارێکی ئادەمیزاد

فریشتەی تایبەت هەموو چاکەو خراپەیەکی تۆماردەکەنو دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ واتە: ئێمە لەئادەمیزاد لەڕەگی لاملی

نـزیکترین لـەو کاتـەدا دوو فریـشتەی چـاودێر بەسـەریەوە لەراسـتو چـەپیەوە گوفتـاری دەبیـستنو کـردەوەی دەبیـنـنو تۆمـاری دەکـەن، فریـشتەی لای راسـتی چـاکەکانی تۆمـار دەکـاو فریـشتەی لای چـەپی خراپـەکانی دەنووسـێ، لەفەرموودەیەکدا هـاتووە ئەبوئومامـە دەیگێڕێتـەوە: دەفـەرموێ: ئـەو فریـشتەی چاکە دەنووسێ لای راستی ئادەمیزادەکەیە، خراپەنووسیش لەلای چەپیەوەیەتی نووسەری چاکە سەرداره بەسەر نووسەری خراپەدا .

جا ئەگەر چاکەیەکی کرد ئەوە فریشتەی لای راست یەك بەدە بۆی تۆمار دەکا ئەگەر خراپەی کرد فریشتەی لای راست بەهی لای چەپ دەڵێ: حەوت سەعات وازی لـێ بێنـە بـەڵکوو تۆبـە بکـاو پەشـیمان بێتـەوە، ئـادەمیزاد هەمیـشە لـەژێر چاودێری دایەو ئەو دوو فریشتە موراقەبەی دەکەن..

﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ هیچ وتەیـەکی لـەدەم دەرناچـێ ئـیللا فریـشتە وائامادەباشـە بەلایـەوەو دەینووسـێ، فریـشتەی لای راسـتی چـاکەکانی دەنوسێو فریشتەی لای چەپی خراپەکانی تۆمار دەکا، هـەموو وتـەو سـرتەو جمو جوڵێکی کۆنترۆڵەو تۆمار دەکرێ.

زاهـیری مانـای ئایەتەکـە ئـەوە دەگەیـەنێ کـە فریـشتەکان هـەموو شـتێك دەنووسن، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئـەو شـتانە تۆمـار دەکـەن کەسزاو پاداشـتیان هەیە.

فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە تیرمیزیو نەسائیو ئـیبن ماجە ریوایـەتیان کردووە ، پشتگیری قسەکەی ئیبنـو عـەبباس دەکاو دەفـەرموێ: (ان الرجل لیتكلم بالكلمة من رضوان الله تعالی مایظن أن تبلغ ما بلغت، یكتب الله عزّو جلّ بها رضوانه الی یوم یلقاه، و ان الرجل لیتكلم بالكلمـة مـن سخط الله تعـالی مـایظن أن تبلـغ مـا بلغت، یكتب الله تعالی علیه بها سخطه الی یوم القیامة) پیـاو جاری واهەیـە لـەپێناو رەزامەندی خودادا قـسەیەکی وادەکا خـۆی زۆر بایـەخی پـێنـاداو کەچی لای خـودا زۆر گەورەیـەو رەزامەنـدی خـۆی پـێ دەبەخـشێو رۆژی قیامـەت پاداشـتی لەسـەر

وەردەگرێ، هی وایش هەیە قسەیەکی خراپ دەکاو خۆی بەهەندی ناگرێ، کەچی لای خودا زۆر تاوانەو هەتا رۆژی قیامەت نارەزامەندی خۆی لەسەر دەنووسێ.

ئەمجار دوابەدوای روونکردنەوەی هەڵوێستی کافرەکان کە بریتیە لەبڕوانەبوونیان بەڕابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە، ئەمجار رەتدانەوەیان بەوە، کە ئەو کارە بۆ خودا ئاسانەو هیچ ئەرکێکی تێدا نیە. دێتە سەر راگەیاندنی راستییەکی حاشا هەڵنەگر ئەو یش ڕوبەڕوبوونەوەی مردنە، ئەوکاتەی مردن لێیان نزیک دەبێتەوەو بۆیان دەردەکەوێ کە ئەوان هەڵە بوون .

دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ ئێشو ئازارو تەنگو چەڵمەی مردن هاتو یەخەی گرتنو تاساندنی ئەوکاتە هەموو مرۆڤێك بۆی دەردەکەوێ کە ئەو هەواڵو وادەو بەڵێنانەی پێغەمبەرەکان رایان گەیاند بوو دەربارەی زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو حەشرو نەشرو بەهەشتو دۆزەخ هەموو حەقنو هیچ گومانێکیان تێدا نیە، ئا ئەو مردنە یان ئەو حەقو راستیە ئەوەیە: کە تۆ ئەی ئادەمیزاد خۆت لێ گێل دەکردو لێی هەڵدەهاتی، بەهەندت نەدەگرتو بایەخت پێ نەدەدا .

هەڵبەتە کاتی سەرەمەرگو گیانەڵا کاتێکی سەختو دژوارە، هیچ کەس نیە خۆی بۆ رابگرێ، لەحەدیثی صەحیحو چەسپاودا هاتووەخاتوو عائیشە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ کەوتە حاڵەتی سەرەمەرگو گیانەڵاو عەرەقی لەدەمو چاوی خۆی دەسڕی دەیفەرموو: (سبحان الله ان للموت سکرات) پاكو مونەزەهی بۆ خودایە مردن ئێشو ئازاری تاسێنەری هەیە، خودایە ئاگادارمان بەو یارمەتیمان بدە لەسەر ئێشو نارەحەتی کاتی سەرەمەرگ.

ئەمجار باسی رابوونی قیامەت دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ﴾ فوو کرا بەکەڕەنای صوردا بۆ زیندوبوونەوەی قیامەت ئەو کاتە کاتێکە

سەخت و دژوارو ترسناکە، ئەوە ئەو ڕۆژەیە: کە خودا هەڕەشەی پێ لەبەندەکانی کردووە، کافرەکانی پێ ترساندووە کە ئادەمیزاد زیندوبوونەوە لەگۆڕەکانیان هاتنە دەرێ ئەمجار راپێچی سارای مەحشەر دەکرێن.

﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾ هەر کەسێ بۆ سارای مەحشەر فریشتەیەکی لەتەکدایە کێشی دەکاو فریشتەیەکیشی لەگەڵدایە شایەتە بەسەریەوە جا ئەو کاتە بەئادەمیزادە بێ باوەڕەکان دەگوترێ: یان بەهەموو ئادەمیزادێکی چاك و خراپ دەگوترێ.

﴿لَقَدْ كُنْتَ فِي غَفْلَةٍ مِنْ هَذَا فَكَشَفْنَا عَنْكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾ بێگومان تۆ بێ ئاگابوویت لەهاتنی ئەم ڕۆژە وەکوو پێویست توێشوت بۆ نەخستووە، ئێستا واپەردەمان لەسەر لادای و حەقیقەتت بۆ دەرکەوت هەموو شتێکت بۆ ئاشکرا بوو، دەسا بڕوانە و ئاکامی کردەوەکانی خۆت ببینە، ئەمڕۆ چاوت تیژەو باش شتەکان دەبینی! راستیت بۆ دەرکەوت .

## گفت و گۆی ئادەمیزادی کافرو شەیتانی هاوەڵی لەڕۆژی قیامەتدا

﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُواْ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ

لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾

لەوەپێش وەزعو حاڵی سەرەمەرگی ئادەمیزادەکانی روونکردەوە، ئەمجار دیمەنی مشتو مڕی ئادەمیزادی بێ بڕواو شەیتان رادەنوێنێ، کە لەرۆژی قیامەت دا یەخەی یەکتر دەگرنو دەکەونە گازەندە کردن لەیەکتری.

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ قَرِينُهُ هَذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ ئەو فریشتەی کە ئەرکی راپێچ کردنی کافرەکەی لەئەستۆیە یان ئەو فریشتەی شایەتە بەسەریەوە، دەڵێ: ئەی ئادەمیزاد ئەوەتا نامەی کردەوەکانت لامەو ئامادەیە چت کردووە بەبێ زیادو کەم تۆمارکراوە.

دەگونجێ مەبەست بە(قرین) شەیتان بێ، واتە: شەیتان دەڵێ ئەم کابرایە لەژێر کۆنترۆڵی من دا بووەو گومڕام کردووە بۆ دۆزەخ .

بەکورتی دیمەنەکە بەم جۆرەیە: فریشتەیەك كێشی دەکاو فریشتەیەك شایەتە بەسەریەوە،و شەیتانیش بەتەکیەوەیەتی دەڵێ: ئەم کابرایەم گومڕا کردووەو ئامادەم کردووە بۆ چوونە ناو دۆزەخ، ئەوەی پشتگیریی ئەم بۆچوونە دەکا ئایەتی ﴿نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَاناً فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾ الزخرف/٣٦.

سەرەنجامی دیمەنەکەش ئەوەیە: کەپەروەردگار فەرمان بەهەردوو فریشتەکە ﴿سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾ دەکا دەفەرموێ: ﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾ تورِ بدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە هەموو ئەوانەی لەژیانی دونیادا کافرو سەرەق‌و دژ بەهەق بوون هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو پێغەمبەریان بەدرۆ خستۆتەوە.. ﴿مَنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ﴾ وێڕای ئەوەش چروك‌و دەست قوچاو بوون، زەکاتیان نەداوەو خێرو صەدەقەیان نەکردووە صیلەی رەحمیان بەجێنەهێناوە، نەیانهێشتوە کەسانی دیکە

ئیمان بهێنن و چاکە کاربن، دەستدرێژیکارو زمان پیس و ستەمکارو سنور بەزێن و خراپەکار بوون.

﴿الَّذِي جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ﴾ ئەو کافرەی هاوەڵی بۆ خودا دادەنا، دە لەتۆڵەی ئەو تاوانەی بیخەنە ناو کوشندەترین سزاوە.

ئەمجار پەروەردگار دیمەنێکی تری حیواری نێوان کافرو شەیتان نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَكِنْ كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ هاوەڵی بێ براوکە (شەیتانەکە) دێتە قسەو دەڵێ: خودایە من لێی بێ بەریم و گومڕام نەکردووە، ئەو خۆی ئامادەباشی گومڕایی تێدا بووە خۆی بەئیختیار خۆی بەتاڵی بەلاوە پەسەند بووە، دژی هەق بووە، بانگەوازییم کرد بۆ گومڕابوون بەپیر بانگەوازیەکەمەوە هات، ئەو خۆی لەبەندە راستاڵ و دڵسۆزەکان نەبوو، ئەگەر موخلیص و خوداپەرست بوایە من نەم دەتوانی رێبازی کوفری لەدڵدا شیرین بکەم، بەڵام ئەو خۆی ئامادەباشی کوفرو ئیلحادی تێدابوو بانگەوازییم کرد کەوتە داوی منەوە!

﴿قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُمْ بِالْوَعِيدِ﴾ پەروەردگار بەشەیتان و کابرای گومڕا دەفەرموێ: لای من دەمەدەمێ مەکەن؛ ئێستا کاتی حیساب و لێکۆڵینەوەیە، سەردەمی ژیانی دونیا بەسەرچوو، لەژیانی دونیادا هەڕەشەم لێ کردن و لەسەرەنجامی کوفرو بێدینی ترساندمن، لەسەر زمانی پێغەمبەران ئامۆژگارییم کردن، نامەو پەراوی ئاسمانیم بۆ ناردن، بەڵگەی جۆراوجۆرم لەسەر راست کردنەوە، گوێڕایەڵ نەبوون و پەندو عیبرەتتان وەرنەگرت، ئێستا عوزر هێنانەوەتان بێ سوودە.

﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾ ئەوەی بڕیارم داوە هەر ئەوەیە هەڵوەشاندنەوەی تێدا نیە، گۆڕانکاری لەحوکم و بڕیارم دانیەو نابێ، چیم بڕیار داوە هەر ئەوە دێتە جێ، بڕیارم داوە بەهۆی کافربوونتانەوە سزای دۆزەختان پێ

بچێژم .چارتان ناچارە دەبێ بیچێژنو قوتار بوونتان نابێ! هیچ کەسێکیش بە بێ تاوان عەزاب نادەم!

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر عەزابی دۆزەخ دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ ؟﴾ ئەی موحەممەد ئەوە بۆگەلەکەت باس بکەو بیانترسێنە لەعەزابی دۆزەخ، بیانترسێنە لەهەولو کارەساتی ئەو ڕۆژەی بەدۆزەخ دەڵێین: ئەرێ پڕبووی لە ئادەمیزادو جندۆکە؟ ئەو حەمکە تاقمو کۆمەڵەی تورمان دانە ناوتەوە پڕیان کردی؟

دۆزەخ دێتە وەڵامو دەڵێ: جا بۆ کەس ماوە بیخەنە ناومەوە؟ واتە: پڕبوومو کیفایەتمە، دەشگونجێ مانای ئەوەبێ:دۆزەخ بڵێ: جا بۆ کەس ماوە تێم فڕێ دەن؟ ئەگەر هەیە بابێ شوێنم هەیە بۆ ئەوە زیاتر تاوانباران جێگایان پێ تەنگ ببێو بکەونە ناخۆشییەوە، بەکورتی ئایەتەکە دوو مانا هەڵدەگرێ:

١- یەکەمیان ئەوەیە: دۆزەخ هەرچەندە بەرفراوانە بەڵام پڕ دەبێو هیچی لێ زیاد نابێ.

٢- دووەم ئەوەیە دۆزەخ هێندە فراوانە چەندێك تاوانباری تێ فڕێ بدرێن هێشتا شوێنی تری هەیەو پڕ نابێ .

## وەزعو حاڵی تەقواکاران

﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾ ﴾

ئوسلوبی قورئان وەهایە هەرکاتێ باسی شتێ بکا باسی دژەکەشی دێنێ، جا چونکە لەئایەتەکانی پێشوودا باسی گفت و گۆی نێوان بێ باوەڕەکان و شەیتانی کرد، سەرەنجامی ئەوانەی روون کردەوەو ئەمجار باسی حاڵ ووەزعی خوداپەرستەکان دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ بەهەشت نزیک دەکرێتەوە دەڕازێنرێتەوە بۆ خودا پەرستان، بەباشی چاویان لێی دەبێ و هەموو نازو نیعمەتێکی ناوی دەبینن، دەیڕواننێ هەرچی تێیدایە هەمووی ناوازەیە، لەوەپێش چاو نەیدیوەو گوێچکە نەیبیستووەو هیچ ئادەمیزادێك بەخەیاڵیش پەی پێ نەبردووە، فریشتە پێیان دەڵێن:

﴿هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ﴾ ئەم نازو نیعمەتانەی دەیبینن لەناو بەهەشتدا ئەوەیە: کە لەژیانی دونیاتان دا لەسەر زمانی پێغەمبەران وادەو پێ دراوە، ئەم نازو نیعمەتە نەدیتراوەو نەبیستراوە بۆ ئەوانەیە لەتاوان و کوفر گەڕاونەتەوە بۆ لای خودا گەڕاونەتەوە، زۆر پارێزگاریی سنوورەکانی خودایان کردووەو پابەندی وادەو بەڵێنی خۆیان بوون، کەمتەرخەم و بێ موبالات نەبوون، بەجیددی خوداپەرست و تەقواکار بوون، کێن ئەوانەی ئەوە رەوشتیانە؟

﴿مَنْ خَشِيَ الرَّحْمَنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُنِيبٍ﴾ کەسێکە بەغائیبانە لەخودا ترسابێ و بەنهێنی و ئاشکرا خودای لەبیر بووبێ، خودای نەبینیوە بڕوای پێی بووە، لێی ترساوەو بەندایەتی بۆ کردووە، لەشوێنێکا کەس چاوی لێ نەبووە لەترسی خودا تاوانی نەکردووە، هەرکە لەچۆڵی و خەڵوەت دا یادی خودای کردوە چاوی پڕبوون لەناوو فرمێسکی باراندوون، بەدڵسۆزیی بۆ لای خودا گەڕاوەتەوەو رەزامەندیی خودای لەزوور هەموو شتێکەوە داناوە. بەدڵی ساغ و بێ گەرد بەرەو رووی بوەتەوە.

جا ئەو موسوڵمانە راستاڵانە لەپاداشتی باوەڕو ئاکارو کرداری دونیایان دا پێیان دەگوترێ: ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلامٍ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ﴾ بڕۆنە ناو ئەو بەهەشتەوە بەسەلامەتی لەعەزاب و بەدڵنیایی لەنەبڕانەوەی نازو نیعمەتەکان، ترسی هیچتان نەبێ هیچ کەم و کوڕییەك نابینن، خودا سڵاوتان لێ دەکاو فریشتەش هەروا، ئەو رۆژەی ئێوەی تێدا دەچنە ناو بەهەشتەوە ئەوە رۆژی (خلود)ە، رۆژێکە ئیتر مردنی لەدوا نیەو خۆشیەکانی نەبڕاوەن و پیری و نەخۆشی و ناخۆشی تێدا نابێ.

﴿لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ هەیە بۆ ئەو تەقواکارانەی ئەوە باوەڕو کردەوەی دونیایان بووە، هەرچی بیانەوێ و داوای بکەن و هەرشتێك حەزیان لێی بێ و لەبەر چاویان جوان بێ و پەسەندی بکەن یەکسەر بۆیان ئامادەیە، هیچ پێوەی ماندو نابن ..

نیعمەتی زیادەشمان لایە پێیان دەبەخشین کە لەوە پێش نەیاندیوەو بەخەیاڵیش بەسەر دڵیاندا رانەبوردووە ئەویش بریتیە لە بینینی پەروەردگار وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ یونس/٢٦.

پێغەمبەرﷺ لە فەرمووودەیەکیدا کە ئیمامی موسلیم لەصوهەیبی کوڕی سەنانی رۆمیە وە ریوایەتی دەکا دەفەرمووێ: (انها النظر الى وجه الله الكريم) ئەوە نیعمەتی زیادەی بەهەشتەو تێڕوانینە بۆ زاتی پەروەردگاری خاوەن بەخشش .

## هەڕەشە لەکافرو مولحیدەکان و فەرمان کردن بە پێغەمبەر بەبەردەوام بوون لەسەر پەیامی خۆی

﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُواْ فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ (٣٦) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ

لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ۚ ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی توندی لە بێباوەڕان کرد بەوە کە لەقیامەت دا سزای توندیان دەدا، لێرەدا جارێکی تر هەڕەشەکە دووپات دەکاتەوە، لەنێوان هەردوو هەڕەشەکاندا وەزعو حاڵی خوداپەرستانی بەیانکرد، ئەوەشی روونکردەوە کە مردنو تێدا چوون پەندو عیبرەتە بۆ هەموو کەسێکی ژیرو داناو خاوەن عەقڵو ئاوەز.

لەلایەکی تـرەوە لـەوەپێش سـەرنجی ئـادەمیزادی بـۆ لاپـەڕەی بوونـەوەر ڕاکێشاوەو فەرمووی: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ، وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ (ق/٦-٧).

ئەمجار لێرەدا سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ حەقیقەتێکی ترو تێڕوانین لەلاپەڕەکانی بوونەوەرو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ (ق/٣٨) بێگومـان ئێمـە ئاسمانـەکانو زەویو ئـەوەی لەناویاندایە لەشـەش ڕۆژدا یـان لەشـەش قۆناغـدا دروسـتکردوەو هـیچ مانـدوبونو ئەرکێکمان پێوە نەبینین، ئەدی چۆن ناتوانین جارێکی تر ئێوە زیندوبکەینەوە.

خۆ دروستکردنەوەی ئێوەو زیندوکردنـەوەی ئێـوە لـەدوای مردنتـان لەئاسـت دروستکردنی بوونەوەردا هەر قیاس ناکرێو حیسابی بۆ نـاکرێ، کەوابوو پێویسـتە بیرێك لەداهاتووی خۆتان بکەنەوەو خۆتان تووشی عەزابی سەختی دۆزەخ نەکەن!

﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُمْ بَطْشاً فَنَقَّبُوا فِي الْبِلادِ هَلْ مِنْ مَحِيصٍ؟﴾ زۆر گەلو نەتـەوەمان لـەپێش ئـەو کافرە سـەر ڕەقانـەدا لـەناو بـردوەو ئەوان زۆر لەم قورەیشیانە زۆرترو بەهێزترو دەسەڵاتدار تربوون، شوێن دەستیان لەزەویدا کاریگەرترو زۆرتر بـوو، بازرگانیو بیناسـازیو گەشـتو گوزاریـان لـەمان زۆرترو پێشکەوتووتر بوو..

ئایـا توانیـان لەچـنگ عـەزابی سـەختی خـوا ڕزگاریـان بـێ؟ ئایـا توانیـان پێـچەوانەی قـەزاو قـەدەری خـودا بجوڵێنـەوە؟ ئایـا ئـەو مـاڵو سـامانەی کۆیـان کردبـووەوە فریایـان کـەوت؟ عـەزابی خـودای لـێ ڕەت کردنـەوە؟ نەخـەیر، دەی سـا ئێـوە ئـەی قوڕەیـشیەکان ئـەی هـەموو ئەوانـەی کـافرو بـێ بـڕوان چـاك بـزانن کـەئێوەش هـیچ شـتێك نیـە بتـوانێ بـەرگری عـەزابی

ســەختی خوداتــان لــێ بکــا، بــەهیچ شــێوەیەك لەچــنگ عــەزابی ســەختی خودا رزگاربوونتان نیە!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ بێگومان لەگێرانـەوەی سەرگوزەشـتو چیرۆکی گەلو نەتـەوە پێشینەکان دا هـەروەها لـەو هــەموو ئــاداب و ئامۆژگاریانــەی ئاراســتەتان دەکــرێ و کــراوە لــەم ســورەتەو لەسورەتەکانی پێشوودا پەندو عیبرەت هەیە بۆ کەسانێك دڵیان وشیار بێ و عەقڵ و هۆشیان هەبێ، وردببنەوەو تێ بفکرن و بیر لەئاکام و سەرەنجام بکەنـەوە، کەسـێك بـەم سەرگوزەشـتو پەنـدو ئامۆژگارییانـە وەهـۆش خـۆ نەیەتـەوە، لەناوچـوون و سەرەنجامی گەلو نەتەوە پێشینەکان وەخەبـەری نـەهێنێ ئـەوە دڵـی مـردووە یـان هەر دڵی نیە!

ئەمجار پەروەردگار بەڵگەیەکی تر ئاراستە دەکا لەسەر بەتوانایی و دەسـەڵاتی رەهـای خـۆی و هـاتنی رۆژی قیامـەت و زیندوبوونـەوە، دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾ بێگومـان ئێمـە ئاسمانــەکان و زەوی و ئــەوەی تیایاندایــەو لەناویاندایــە لــەماوەی شــەش رۆژدا یــان لەشەش قۆناغ دا دروستمان کردون و هیچ ماندوبونێکمان پێوە نەدیوە .

جا خودایەك بتوانێ بەبێ ماندوون ئەو ئاسمان و زەوی و حەشاماتە دروسـت بکـا بێگومـان دەتـوانێ مـردوان زینـدوو بکاتـەوەو قیامـەت هەڵـسێنێ و حیـساب و لێکۆڵینەوە ئەنجام بدا.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژەبەوە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ الأحقاف/٣٣.

﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویـست! خـۆڕاگر بـە لەبەرامبەر موشریکەکان دا، بەرەتکردنەوەی پەیامەکەت لەلایەن ئەوانـەوە دلگـران

سـەختی خوداتـان لـێ بکـا، بـەهیچ شـێوەیەك لەچـنگ عـەزابی سـەختی خودا رزگاربوونتان نیە!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ بێگومـان لەگێڕانـەوەی سەرگوزەشـتو چـیرۆکی گـەلو نەتـەوە پێشینەکان دا هـەروەها لـەو هـەموو ئـادابو ئامۆژگاریانـەی ئاراسـتەتان دەکـریو کـراوە لـەم سـورەتەو لەسورەتەکانی پێشوودا پەندو عیبرەت هەیە بۆ کەسانێك دڵیان وشیار بێو عەقڵو هۆشیان هەبێ، وردببنەوەو تێ بفکرنو بیر لەئاکامو سەرەنجام بکەنەوە، کەسێك بـەم سەرگوزەشـتو پەنـدو ئامۆژگارییانـە وەهـۆش خـۆ نەیەتـەوە، لەناوچـوونو سەرەنجامی گەلو نەتەوە پێشینەکان وەخەبـەری نـەهێنێ ئـەوە دڵی مـردووە یـان هەر دڵی نیە!

ئەمجار پەروەردگار بەڵگەیەکی تر ئاراستە دەکا لەسەر بەتواناییو دەسـەڵاتی رەهـای خـۆیو هـاتنی رۆژی قیامـەتو زیندوبوونـەوە، دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾ بێگومـان ئێمـە ئاسمانـەکانو زەویو ئـەوەی تیایاندایـەو لەناویاندایـە لـەماوەی شـەش رۆژدا یـان لەشەش قۆناغ دا دروستمان کردونو هیچ ماندوبونێکمان پێوە نەدیوە .

جا خودایەك بتوانێ بەبێ ماندوون ئەو ئاسمـانو زەویو حەشاماتە دروسـت بکـا بێگومـان دەتـوانێ مـردوان زینـدوو بکاتـەوەو قیامـەت هەڵسێنێو حیسـابو لێکۆڵینەوە ئەنجام بدا.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژەبەوە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ الأحقاف/٣٣.

﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویسـت! خـۆڕاگر بـە لەبەرامبەر موشریکەکان دا، بەرەتکردنەوەی پەیامەکەت لەلایەن ئەوانـەوە دلگـران

مەبە، هەروەها گرنگی مەدە بەقسەی بێ بناغەو هەڵەت و پەڵەتی جولەکەکان کە دەڵێن: خودا ئاسمانەکان و زەوی لەشەش ڕۆژدا بەدیهێناون سەرەتا ڕۆژی یەك شەممەو لەڕۆژی هەینیدا تەواوی کردون و ڕۆژێ پشووی داوەو ئیستراحەتی تەواوی کردووە. ئەمە قسەیەکی بێ سەرو بەرەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ، وَمِنْ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! بەردەوام تەنزیهی خودا بکە بەبێ خەوش و بێ عەیبی بزانە، هیچ کەم و کوڕییەکی پاڵ مەدە هەمیشە سەرگەرمی حەمدو سوپاسی بە، بڵێ: (سبحان الله و بحمده) کاتی بەیانی و دەمی عەسرو هەندێ لەشەو ئەم ویردە بخوێنە.

﴿وَاسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ الْمُنَادِ مِنْ مَكَانٍ قَرِيبٍ﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەرژ گوێ رابگرە بۆ ناڵەو گرمەی هاتنی قیامەت (نفخة)ی دووەم: کەئیسرافیل فوو دەکا بەکەڕەنای صورداو بانگ هەڵدەداو هەموو کەس دەی بیسێ، پێیان دەڵێ: رابن بۆ حیساب و لێکۆڵینەوە، ئیتر هەموو ئادەمیزاد تێکڕا لەگۆڕەکانیان رادەبن و بەرەو سارای مەحشەر دەچن و لەو دەشتە پان و فراوانەدا کۆدەکرێنەوە بۆ حەق و حیساب .

﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ﴾ ئەو ڕۆژەی کە دەنگی کەڕەنای صور دەبیستن کە ڕوداوێکی هەقەو گومان لەپەیدابوونیدا نیە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی زیندوبوونەوەیەو ڕۆژی هاتنەدەرەوەیە لەگۆڕ، ڕۆژی لێکۆڵینەوەی هەق و حیسابە، ڕۆژی لێك جیاکردنەوەی چاك و خراپەیە، ڕۆژی وەرگرتنەوەی سزاو پاداشە.

﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ﴾ ئێمە لەدونیادا ژیان دەبەخشین و لەقیامەت دا مردوو زیندودەکەینەوە، لەدونیادا زیندوان دەمرێنین کاتێك تەمەنیان تەواو دەبێ، ئەوە تەنها بەئێمە دەکرێ بۆ ئێمە کارێکی ئاسانەو کەسی تر شەریکمان نیە، کەس نیە بتوانێ هاوبەشیمان بکا یان هەر بۆ خۆی بیکا،

سەرەنجام گەڕانەوەی هەموو شتێك بۆ لای ئێمەیەو هەموو ئادەمیزاد دێنەوە بۆ لای ئێمەو ئێمە حەق و حیسابیان لەگەڵ دەکەین هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداشتی خۆی وەردەگرێتەوە چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعاً ذَلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾ سەرەنجام گەڕانەوە بۆلای ئێمەیە ئەو کاتەی زەوی شەق دەبێ و ئەوانیش بەگورجی لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوەو راپێچی سارای مەحشەر دەکرێن و بەپەلە بەرەو رووی بانگ دەر دەڕۆن، ئەو زیندووکردنەوە حەشرو نەشرە بەلای ئێمەوە ئاسانەو هیچ ئەرك و ماندوو بونێکی پێوە نابینین، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ لقمان /٢٨.

ئەمجار هەڕەشە لەموشریکەکانی مەککە دەکاو دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾ ئێمە زۆر باش دەزانین موشریکەکان چی دەڵێن، ئاگامان لێیە پەیامەکەت رەت دەکەنەوەو ئینکاری زیندوبوونەوەو تاك و تەنهایی خودا دەکەن، تۆ ئەی پێغەمبەر زۆرت بەسەر ئەوانەوە نیە، ناتوانی بەتۆپزی ئیمانیان پێ بهێنی، ئەتۆ راگەیاندنت لەسەرە، ئێمە حەق و حیسابیان لەگەڵ دەکەین.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ الرعد/٤٠ یان دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾ الغاشية/٢١-٢٢ .

﴿فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەتۆ بەم قورئانە پیرۆزە ئامۆژگاریی بکەو پەیامی خۆت رابگەیەنە، جا ئەوانەی دڵیان زیندوەو ترسی خودایان هەیە پەند ئامێز دەبن و بەپیر بانگەوازییەکەتەوە دێن، ئەوانەش کەهیچ شتێك کاریان تێ ناکا، تەنانەت ئایەتەکانی قورئانیش دڵیان راناچڵەکێنێ هەر

سوورن لەسەر کوفرو ئیلحادی خۆیان، کۆڵیان پێوە هەڵمەگرەو خەفەتیان بۆ مەخۆ ئێمە لەعۆدمیان دێین‌و حیسابیان بۆ دەکەین.

## سورەتی الذاریات

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَٱلْحَٰمِلَٰتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَٱلْجَٰرِيَٰتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْمُقَسِّمَٰتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٌ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾

ئـەم سـورەتە نـاو نـراوە (سـورة الـذاريات) چـونکە بەسـوێند خـواردن بە(الذاريات) دەستی پێ کراوە، کە بەمانای (با)یەك دێ تۆزوخۆڵ هەڵبگرێ‌و بڵاوی بکاتەوەو لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بیگوێزێتـەوە. سوێند خـواردن بـەو جۆرە

بایـه، خـۆی لـه‌خۆی دا مانایـه‌کی سـه‌رنج راکـێش‌و تـرس ئـاوەری هه‌یـه، ئامـاژه به‌مه‌ترسییه‌کی گه‌وره ده‌کا.

**په‌یوه‌ندی ئه‌م سوره‌ته به‌سوره‌تی پێشووی له‌دوو روه‌وه‌یه :**

١-سـوره‌تی(ق) کۆتـایی پـێ هێنـراوه به‌باسـی زیندوبوونـه‌وه‌و حیـساب‌و لێکۆڵینه‌وه‌و به‌هه‌شت‌و دۆزه‌خ. که ده‌فه‌رموێ: ﴿ذَلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾ (ق/٤٤) ئه‌م سوره‌ته‌ش به‌سوێند خواردن به‌(با) وبه هه‌ورو که‌شتی‌و فریشته ده‌ستی پێ کراوه‌و جه‌خت له‌سه‌ر ئه‌وه ده‌کاتـه‌وه: که‌هاتنی قیامه‌ت‌و حیساب‌و لێکۆڵینـه‌وه‌و پاداشدانه‌وه‌و سزادان گومانی تێدا نیه‌و حه‌قن‌و دێنه دی.

له‌سوره‌تی پێشوودا به‌کورتی باسی له‌ناوبردنی نه‌ته‌وه به‌درۆخه‌ره‌وه‌کانی کرد، له‌م سوره‌ته‌شدا به‌شێوه‌یه‌کی درێژ لێیان ده‌دوێ.

ئـه‌م سـوره‌ته مه‌ککییـه واتـه: له‌مه‌ککـه نـازڵ بـووه، نـاوه‌رۆك‌و باسـه‌کانی له‌چوارچێوه‌ی بنـه‌ماکانی عه‌قیده‌و ئیمانـدا ده‌سورێنه‌وه، باسی یه‌کتاپه‌رستیی‌و پێغه‌مبه‌رایه‌تی‌و هاتنی قیامـه‌ت ده‌کا، جـه‌خت له‌سـه‌ر زیندوبوونـه‌وه‌و حیـساب‌و لێکۆڵینه‌وه ده‌کاته‌وه.

سوره‌ته‌که جه‌وێکی تایبه‌تی هه‌یه، سه‌ره‌تا به‌سوێند خواردن به‌چوار هێـزی گرنگ ده‌ست پێ ده‌کا، (١-بای به‌هێزو شت جوڵێن. ٢- هـه‌وری بارانـاوی. ٣ - که‌شتی بارهـه‌ڵگری نـاو ده‌ریـاو ده‌ریالوشـه‌کان . ٤- ئـه‌و فریـشتانه‌ی رزق‌و رۆزی دابـه‌ش ده‌کـه‌ن. ) سـوێند بـه‌م مه‌خلوقاتانـه ده‌خـواو جـه‌خت له‌سـه‌ر رابـوونی قیامـه‌ت ده‌کاته‌وه‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا﴾ سوێند به‌و (با) بـه‌هێزه‌ی خـشت‌وخۆڵ‌و هه‌ر شتێك شیاوی رافراندن بێ هه‌ڵده‌گرێ‌وبـه گه‌ردونـدا بڵاوی ده‌کاتـه‌وه‌و یاسـای (جاذبیة)ی زه‌وی ده‌شکێنێ.

﴿فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا﴾ سوێند بەو هەورانەی بارانی زۆر هەڵدەگرن و باریان قورسە، ﴿فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا﴾ سوێند بەو کەشتیانەی بەئاسانی بەو بارە گرانەی لەسەریانە بەناو دەریادا دێن و دەچن.

﴿فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا﴾ سوێند بەو فریشتانەی رزق و رۆزی و باران دابەش دەکەن، فریشتە هەریەکەیان کارو فرمان و ئەرکی سەرشانی جودایە ، حەزرەتی جوبرائیل تایبەتە بەهێنانی سروش بۆ پێغەمبەران، میکائیل تایبەتە بەدابەشکردنی رزق و رۆزی بەسەر زیندەوەراندا، ئیسرافیل ئەرکی فوو کردنی بەکەرەنای صوردا لەسەر شانە. عیزرائیل گیانکێشانی زیندوانی لەئەستۆیە.

پەروەردگار سوێندی بەو دیاردە بوونەوەریانەو بەو هێزە کاریگەرانە) بەدیارو نادیاریانەوە (خوارد لەسەر ئەوە: کە ئەوەی وادە دراوە بەئادەمیزادان لەزیندوبوونەوەو حەشرو حیساب و لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش دێنەجی و نەهاتنیان مەحاڵە. فەرمووی: ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ﴾ ئەوەی وادەتان پێ دراوە لەسەر زمانی پێغەمبەران کە بریتیە لەزیندوبونەوەو حەشرو نەشر. پاداشدانەوەو تۆڵە لێ ستاندن شتێکی پەیدا بوەو هیچ گومان لەپەیدابوونیدا نیە.

پەروەردگار: کە سوێند بەمەخلوقاتی خۆی دەخوا ئاماژە بەفراوانی و رەهایی دەسەڵاتی خۆی دەکا، ئەوە دەگەیەنێ: کە کەسێك بتوانێ ئەو شتانە دروست بکاو چۆنی بوی ئاوا وەگەڕیان بخا، بەئاسانی دەتوانێ مردوان زیندو بکاتەوەو قیامەت هەڵسێنی و پاداشی چاکەکارو سزای خراپەکاران بداتەوە. لەلایەکی ترەوە عەرەبەکان پێیان وابوو پێغەمبەر بەڵگەو دەلیلی بەهێزی هەبوە، لەبەڵگە هێنانەوەدا دەستی باڵای هەبوە، پەروەردگار: کە سوێند بەو شتە رێزدارانە دەخوا بۆ ئەوەی جەخت لەسەر راستی پەیامی پێغەمبەر بکاتەوە، لەسەرێکی ترەوە عەرەبەکان پێیان وابوو سوێندی بەدرۆ وڵات وێرانکەرەو زیان بەسوێند خۆرەکە دەگەیەنێ، پەروەردگار سوێند بەو شتانە دەخوا بۆ ئەوەی بڕوا بەپێغەمبەر بکەن،

دەشیانزانی پێغەمبەر سوێند بەدرۆ ناخوا، دوای سوێند خواردنەکەشی تووشی زیان نەبوو.

هێشتا سوێند خواردن بەو چوار شتانە بەکۆتا نەهاتووەو تارماییان ماوە. سوێندێکی تر ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ.إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُخْتَلِفٍ. يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾ سوێند بەئاسمان کە خاوەن جوانیو شکۆمەندییە یان سوێند بەئاسمان کە ئەو هەموو ئەستێرەو مانگو خۆرەی پێدا دێنو دەچن، ڕێگاوبانی قایمو قۆڵی ئەستێرەکانی تێدایە، قایمو پتەوو ڕەختەیە، مەلایین ساڵە دروستکراوەو بێ کۆڵەکە راوەستاوەو شوێنێکی نەڕوخاوە. ئێوە ئەی قوڕەیشیەکان لەبیرو باوەڕێکی چەواشەدان، قسەو بڕیارتان بێ سەروبەرەو هیچی بەسەر هیچەوە نییە، بیروبۆچوونتان دەربارەی قورئانو پێغەمبەر نابەجێو خەیاڵو گومانە. جارێک دەڵێن: قورئان شیعرە دەمێک دەبێژن سیحرو جادوبازییە، چەڵێک بەچیرۆکو ئەفسانەی حسێب دەکەن، دەربارەی پێغەمبەریش رۆژێک دەڵێن: شاعیرە، دەمێک دەڵێن کولەوەنانییە، فالگرەوەو جادوبازە، کاتێکیش دەبێژن شێتە، هیچ کاتێک لەسەر قسەیەک یەکدیگیر نابن ، بێگومان کەسێک روو لەم قورئانە وەردەگێڕێ: کە خۆی لەخۆی دا گومڕا بێ، نەزانو گێل بێو شوێن هەواو هەوەسی سەرکەشی خۆی کەوتبێ، عەقڵو هۆشی خۆی بەکار نەهێنێ، چونکە ئەوان دەڵێن: پێغەمبەر شێتە، وەختی وایش هەیە دەڵێن شاعیرە ، ساحیرە، کاهینە، دەی خۆ شاعیریو ساحیریو کاهینی. بەبێ عەقڵ ئەنجام نادرێن کەسێک عەقڵی نەبێ ناتوانێ سیحرو جادو بکا، شیعرو قسەی هەست هەژێنی بۆ دانانرێن، بێعەقڵ کەی دەتوانێ کاهینی بکا!؟

کەوابێ ئەی کافرەکانی قورەیش ئێوە وان لەناو گوفتارو وتوێژی جیاجیا، قسەکانتان بێسەروبەرن هیچیان بەسەر هیچەوە نیە.

دەتوانن راناو لەوشەی (عنه)دا بۆ (قول مختلف) بەرینەوە، ئەو کاتە ماناکە بەم جۆرە دەبێ ﴿يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾ لەو قسە پروپوچانە لا دەدرێ کەسێك کەخودا تەوفیقی بدا لێیان لابدرێو نەیانلێ. ﴿قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ.الَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ﴾ بەدرۆخەرەوەکان بەهیلاك چون، فەوتان، بەدبەختو چارەڕەش بوون، ئەوانەی لەبێهۆشیو نەزانیدان، دەربارەی قیامەت هەرچی دەیلێن : بەگومانو تەخمینە، لەزەلکاوی کوفردا دەتلێنەوە، بێئاگان لەراستیو بەلگەی یەقین، شكو گومانیان هەیە لەو رۆژی قیامەتەی بەرەوڕوی دەچن. بەگاڵتەو قەشمەری کردنەوە ﴿يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ﴾ پرسیار لەپێغەمبەر دەکەن دەڵێن: ئەوە قیامەت کەی دێ؟ واتە: بەدرۆی دەزانن‌و پێیان وایە زیندوبوونەوە هەر نیە.

ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ﴿يَوْمَ هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ﴾ قیامەت ئەو رۆژەیە کە ئەوان بەئاگری دۆزەخ سزا دەدرێن، لەسەر لێواری دۆزەخ رادەگیرێن‌و دوایی تورِ دەدرێنە ناوی‌و دەسوتێندرێن. ئەمجار پێیان دەگوترێ ﴿ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ﴾ سزای خۆتان بچێژن، دەبخۆن‌و ئەوە دەردتان بێ ﴿هَذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ ئەمە ئەو عەزابەیە: کە پەلەتان لەهاتنی دەکرد لەدونیادا بڕواتان پێی نەبوو بۆیە بەگاڵتەوە پەلەتان لەهاتنی دەکرد.

## پاداشتی لەخودا ترسان‌و هەڵس‌وکەوت‌و ئاکارو رەفتاریان لەدونیادا

﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا

يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾﴾

لەوەپێش حاڵو وەزعی تاوانبارانو بەدبەختەکانی بەیان کرد ئەوانەی بڕوایان بەزیندوبوونەوە نەبوو، ئینکاری پێغەمبەرایەتی موحەممەدیان دەکرد، هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، ئەمجار دێتەسەر باسکردنی حاڵو وەزعی خوداپەرستانو پاداشی قیامەتیان. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ. آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ﴾ بێگومان ئەوانەی تەقوای خودایان کردوە، خۆیان، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار بوون، ئەوانە رۆژی قیامەت لەناو باغو باغاتی بەهەشتدا: کە سەرچاوەو کانیاوی جوانو رەنگینیان تێدایە دەگوزەرێنن. هەرچی پەروەردگاریان پێی بەخشیون بەرەزامەندییەوە وەری دەگرن، هەرکەسە بەبەشی خۆی رازییە. دڵخۆشن بەوەی پێیان دراوە. بەپێچەوانەی بەدبەختو چارەڕەشەکان: کە لەناو عەزابی سەختو ئەشکەنجەدا دەمێننەوە.

ئەو خوداپەرستو لەخوداترسانەی بەرەزامەندیی تەواوەوە بەخششو فەیضی پەروەردگار وەردەگرنو لەپاداشی عیبادەتی دڵسۆزانەیاندا بەختەوەرن ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ﴾ چونکە بێگومان ئەوان لەژیانی دونیایان دا خاوەن باوەڕبوون بەدڵسۆزی خوداپەرستی خۆیان ئەنجام داوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ (الحاقة:٢٤) .

ئەمجار پەروەردگار شێوەی عیبادەتو خوداپەرستی دونیایان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَانُوا قَلِيلاً مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ﴾ ئەوانە لەدونیادا بەشەو کەم دەنووستن‌و زۆربەی کاتی شەویان بەنوێژکردن‌و خوداپەرستی‌و یادی پەروەردگاریان بەسەر بردووە.

﴿وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ لەکۆتایی شەودا دوای شەونوێژو عیبادەتی جۆراوجۆر تۆبەو ئیستیغفاریان دەکرد، نزاو پاڕانەوەیان ئەوەبوو دەیانگوت: خودایە لێمان خۆشبە، رەحممان پێ بکە، ئەوەندە لەخودا ترسن زۆربەی شەو خەریکی خودا پەرستیین کەچی: کە دەگەنە بەرەبەیان دەست دەکەنە پاڕانەوەو تۆبەو ئیستیغفار، وکوو ئەوە تاوانیان کردبێ، ئەمەش دابو نەرێتی ئادەمیزادی رەوشت بەرزە، باشترین دیاریی دەهێنێ‌و کەچی بەکەمی دەزانێ، چروك‌و دڵ پیس بەپێچەوانەوەیە، کەمترین شت دەهێنێ، کەچی منەتی زۆر دەکا.

ئیمام حەسەن مانای ئایەتەکەی بەم جۆرە کردووە، دەفەرموێ: شەو تا بەیانی سەرگەرمی شەونوێژ بوون، ئەمجار لەبەرەبەیان دا دەستیان کردووە بەتۆبەو ئیستیغفار.

کۆمەڵێکی زۆر لەهاوەڵان لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەت دەکەن‌و دەفەرمون: پێغەمبەر فەرموویەتی: (ان الله ينزل الى سماء الد نيا حتى يبقى ثلث الليل الأخير، فيقول: هل من تائب ، فأتوب عليه؟ هل من مستغفر غأغفر له؟ هل من سائل فيعطى سئله؟ حتى يطلع الفجر..) زۆربەی زۆری موفەسسیرین پێیان وایە حەزرەتی (یەعقوب): کە فەرمووی: ﴿سوف أستغفر لكم ربي﴾ (يوسف:٩٨) دوعاو نزاکەی دواخست بۆ کاتی بەربەیان‌و ئەو کاتە لەخودا پاڕایەوە: کە لەتاوانی کوڕەکانی خۆش ببێ.

ئەو خوداپەرستە شەو بێ دارو عیبادەتکارانە وێڕای ئەو عیبادەتە جەستەییەیان ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ بەشێك لەماڵ‌و سامانیان

دەبەخشن بەهەژارو بێنەوایان. (سائل) واتە: سوالکەر، (محروم) ئەو کەسەیە هەژارەو روی نایە سواڵ بکاو خەڵکیش نازانن: کە هەژارە تایارمەتی بدەن.

موسلیم‌و بوخاری فەرمودەیەکی پێغەمبەریان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (ليس المسكين بالطواف الذى ترده اللقمة واللقمتان. والتمرة والتمرتان،ولكن المسكين الذى لا يجد غنا يغنيه، ولا يفطن له فيتصدق عليه) مسکێن ئەو کەسە نیە دەرگاو دەرگا دەگەڕێ کەرتە نانێك دوو کەرتە نان، دەنکە خورمایەك دوو دەنکە خورما دەیگێڕێتەوەو قنیاتی پێ دەکا. بەڵکو مسکێن ئەو کەسەیەو موحتاجەو کەسیش پێی نازانێ تا یارمەتی بدا. چەند حەدیسی تریش بەم مانایە ریوایەت کراون. هەموو ئەوە رون دەکەنەوە : کە فەقیرو مسکێن دوو زاراوەی جودان (مسکین )و (محروم) یەك مانایان هەیە، ئیمام ئەحمەدو ئەبو داود لەحوسەینی کوڕی عەلییەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (للسائل حق وان جاء على فرس) سوالکەر حەقی هەیە بیدرێتێ با بەسواری (ئەسپ)یش بێ بۆ سوالکردن. ماوەتەوە بزانین مەبەست بە(حەق) لەئایەتەکەدا چیە؟ زۆربەی زۆری موفەسسیرین پێیان وایە مەبەست زەکاتە، ئاماژە بەئایەتێکی تر: کە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ. لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ (المعارج:٢٤-٢٥) دیارە (حق معلوم) زەکاتە، زەکات چەندییەت‌و چۆنیەتی رونکراوەتەوە، کەی دەدرێ‌و بەکێ دەدرێ، کێ دەیداو چۆنی دەدا، هەموو ئەمانەی دیاری کراون، بەڵام خێرو خێراتی تر ئەم شتانەی دیاریی نەکراوە. فەرمودەیەکی تر هەیە پشتگیری ئەم مانایە دەکا، ئەبوهورەیرە ریوایەتی کردوە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (اذا أديت زكاة مالك فقد قضيت ما عليك) ئەبوسەعیدی خودری دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووێ: (اذا اديت زكاة مالك فقد قضيت الحق الذى يجب عليك) ئەم حەدیثانە پشتگیریی ئەوانە دەکەن کە مانای(حق معلوم) یان بەزەکاتی فەرز لێك داوەتەوە، وەڵێ هەرچەندە حەدیثەکان صەحیحن‌و زوربەی رای (موفەسسیرین)یش هەروایە.

لێرەدا ئیشکالێك سەر هەڵدەدا ئەویش ئەوەیە: سورەتەكە وەكوو وتمان: مەككیە، زەكات لەمەدینە فەرز كراوە. جا ئەگەر تەفسیری (حق معلوم) بەزەكات بكەین، ئەو كاتە نابێتە صیفەتی مەدح بۆ تەقواكاران چونكە هەموو موسوڵمانێك زەكاتی ماڵی خۆی دەدا.

پیاوێك پرسیاری لەئیبنو عومەر كرد دەربارەی مانای (حق معلوم)ی ئەم ئایەتە لەوەڵامدا فەرمووی مەبەست زەكاتە. جگە لەزەكاتیش حەقی تر لەماڵی ئادەمیزاددا هەن.

جا ئەوانەی كە دەڵێن: جگە لەزەكات حەقی تریش لەماڵو ساماندا هەیە ئەو حەدیثە دەكەنە بەڵگە كە (الشعبی) لەفاتیمەی كچی قەیسەوە ریوایەتی كردوە دەڵێ پرسیارم لەپێغەمبەر كرد ئایا لەماڵو ساماندا جگە لەزەكات حەقی تر هەیە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) لەوەڵامدا ئایەتی ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ...﴾ (البقرة: ١٧٧) ی خوێندەوە : كە دوای ئایەتی ﴿وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ..﴾ جارێكی تر ﴿آتى الزكاة..﴾ یشی هێناوە. دەی خۆ ناكرێ مانای هەردوو رستەكە(وآتى المال..) وەكوو لەئایەتێكی تردا ﴿وآتى الزكاة..﴾ یەك بن، كەوابێ ئەوەتا ﴿وآتى المال على حبه﴾ یەكێكە لەو حەقانەی جیا لەزەكات لەماڵو ساماندا هەن.

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر رابوونی قیامەت دەكاتەوە: بەهێنانەوەی بەڵگەی جۆراوجۆر لەزەویو دەفەرموێ: ﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ﴾ لەدیاردەكانی زەوی دا نیشانەی جۆراوجۆر هەن بۆ كەسانێك باوەڕیان بەتاكو تەنهایی خودا هەبێ، ئەم ئەستێرەی ئێمە لەسەری دەژین نمایشگایەكی گەورەو سەیرو سەمەرەیە بۆ نیشانەكانی هەبونی خوداو دەستڕەنگینیو كارسازیی پەروەردگار، نمایشگایەكە تا ئێستا كەمی لێ نیشان دراوە، رۆژانەو ساڵانە شتی تازەقەڵای دەردەكەوێ، تا زانیاری پێش بكەوێو زانایان تێبفكرن بەڵگەی

جۆراوجۆر ده‌خه‌نه‌ڕو. هه‌تا سه‌یری کێوو که‌ژو ده‌شت‌و ساراو شیوو دۆڵی زه‌وی بکه‌ی له‌دارو دره‌خت‌و که‌ش‌و هه‌واو کانی‌و کانیاوو جۆگه‌و چه‌م‌و روباره‌کانی ورد ببنه‌وه، پتر نیشانه‌کانی ده‌سه‌ڵاتی خودا ده‌رده‌که‌ون. تا سه‌یری زینده‌وه‌ران‌و ئاده‌میزادان بکه‌ین له‌زمان‌و زاراوه‌و ره‌نگ‌و روخساریان ورد ببینه‌وه، بیر له‌عه‌قڵ‌و تێگه‌یشتن‌و ده‌نگ‌و صه‌داو ته‌بیعه‌ت‌و حه‌زو ئاره‌زویان بکه‌ینه‌وه به‌ڵگه‌ی ئاشکراو به‌هێزمان بۆ ده‌رده‌که‌ون له‌سه‌ر تاك‌وته‌نهایی خوداو ده‌سه‌ڵاتی ره‌هاو زانیاری بێسنوورو بێ ئه‌ندازه‌ی.

وێڕای نمایشگای زه‌وی، نمایشگایه‌کی تری سه‌یرو سه‌مه‌ره‌تر له‌خودی ئاده‌میزاددا هه‌یه ده‌فه‌رموێ: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُونَ﴾ له‌خودی خۆتاندا ئایه‌تی جۆراوجۆر هه‌ن له‌سه‌ر تاك‌وته‌نهایی خوداو راستیی پێغه‌مبه‌ریه‌تی‌و حه‌قیقه‌تی ئه‌و په‌یامه‌ی هێناویانه . ئه‌وه بۆچی به‌چاوێکی وردبینانه سه‌یری بوونه‌وه‌ر ناکه‌ن؟ بۆچی له‌خۆتان ورد نابنه‌وه؟ هه‌تا ئه‌و دیاردانه بکه‌نه به‌ڵگه له‌سه‌ر تاك‌و ته‌نهایی په‌روه‌ردگار، دڵنیابن ئه‌م بونه‌وه‌ره به‌صودفه نه‌هاتۆته دی. سروشت ئێوه‌ی نه‌هێناوه‌ته دی، به‌ڵکو به‌دیهێنه‌ری هه‌موو شتێك خودای زاناو دانایه. مێشکی ئاده‌میزاد: که مه‌لایین خانه‌ی تێدایه‌و مه‌ڵبه‌ندی بیرو هۆش‌و زانست‌و زانیارییه، هه‌ستی بیستن‌و دیتن‌و تامکردن‌و له‌مس‌و بۆنکردن، هه‌موو جم‌وجۆڵێکی جه‌سته، هه‌موو بیرکردنه‌وه‌و زانین‌و زانیاریه‌ك به‌هۆی مێشکه‌وه ئه‌نجام ده‌درێ‌و له‌وه‌وه ئیعاز وه‌رده‌گرن. ئامێری دیتن، ئامێری بیستن، هه‌ڵسوڕانی خوێن به‌ناو ره‌گه‌کانی جه‌سته‌دا، کۆئه‌ندامی هه‌زم‌و زاوزێ. . . هتد به‌ڵگه‌ی به‌هێزو ئاشکران له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی بێ سنووری په‌روه‌ردگار .

﴿وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ﴾ له‌ئاسمانه‌وه مه‌زنده‌ی چۆنیه‌تی‌و چه‌ندێتی رزق‌وڕۆزی ئێوه ده‌کرێ. هه‌ر له‌ئاسمانه‌وه واده‌ی خێرو هه‌ڕه‌شه‌ی سزاتان لێ ده‌کرێ، له‌وێوه، دیاری ده‌کرێ کێ به‌هه‌شتیه‌و کێ دۆزه‌خیه، کێ شیاوی پاداشتی باشه‌و کێ شیاوی سزای دۆزه‌خه، له‌ئاسمانه‌وه باران ده‌بارێ‌و رزق‌و رۆزی ئێوه پێك

دێنێ، هەروەها هۆکارەکانی رزق‌ورۆزی ئێوە: کە مانگ‌و خۆرو ئەستێرەو گەلێ شتی ترە : کە بەهۆی ئەوانەوە وەرزەکان دەگۆڕێن‌و هاوین‌و پایزو زستان‌و بەهار یەك بەدوای یەکدا دێنەدی، لەئاسمانەوە دەستەبەر دەبن، گۆڕانکاری شەوو رۆژو کورتی‌و درێژییان، گۆڕانی وەرزەکان‌و هەورو هەڵاو باو گونجانی کەش‌و هەوا بۆ رسکان‌و پەروەردە بوونی گژوگیاو بەروبوم‌و دانەوێڵە، ئەمانە هەمویان لەئاسمانەوە مەزندە دەکرێن‌و دابین دەکرێن، هەمویان خودا بەدی هێناون‌و هەڵیان دەسورێنێ‌و نەخشەیان بۆ دەکێشێ‌و تەنفیزیان دەکا.

ئەمجار پەروەردگار سوێند بەزاتی پاکی خۆی دەخواو جەخت لەسەر بەرعودەبونی رزق‌و رۆژی‌و هاتنی قیامەت‌و زیندوبونەوەی دوای مردن دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنْطِقُونَ﴾ سوێند بەخودای ئاسمان‌و زەوی ئەوەی لەو ئایەتانەدا پێتان راگەیەنرا هەقەو هیچ گومانێکی تێدا نیە، ئەوەی کە وادەتان پێ دراوە دەربارەی قیامەت‌و زیندوبونەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوە لەقیامەتداو دابین کردنی رزق‌ورۆزی لەدونیادا حەقەو هیچ گومانێکی تێدا نیە. قیامەت دێتە دی‌و هیچ شك‌و گومانتان تێیدا نەبێ. وەکو چۆن شك‌و گومانتان نیە لەئاخاوتن‌و قسەی خۆتان کە دەیکەن. چۆن ئێوە لەقسەکردنی خۆتاندا گومانتان نیە لەو هەواڵانەی پێتان راگەیەنرا گومانتان نەبێ.

ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم‌و ئیبنو ئەبی عودەی لەحەسەنی بەصرییەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (قاتل الله اقواما اقسم لهم ربهم ثم لم يصدقوا) ئەو گەل‌و نەتەوانە داوەشێن‌و خودا بیانکوژێ پەروەردگاریان سوێندی بۆ خواردن کەچی بڕوایان پێ نەکرد.

## چیرۆکی میوانەکانی حەزرەتی ئیبراهیم و ئەرکی سەرشانیان بۆ لەناوبردنی قەومی لوط

﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا ۖ قَالَ سَلَـٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَـٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾ ۞ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾﴾

لەوە پێش هەڵوێستی موشریکەکانی دەربارەی رابونی قیامەتو زیندوبونەوە راگەیاند، بەڵگەی بۆ هێنانەوەو هەڕەشەی لێکردن، ئەمجار لێرەدا دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجام دەدا، ئەوەی پێ رادەگەیەنێ: کە پێغەمبەرانی تریش بەرەوڕوی هەمان هەڵوێستی گەلەکانیان بوونەتەوە سەر ڕەفەکانیان بوونەوە، ئەزیەت دراون، بەدرۆ خراونەوە، پشت لەپەیامەکەیان هەڵکراوە، سەرەتا چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم (باوکی پێغەمبەران)مان بۆ دەگێڕێتەوە. بۆ ئەوەی موشریکەکانی مەککە پەندئامێز ببن‌و بەخۆیاندا بچنەوە، بترسن لەوەی کەبەسەر گەلی لوط هات بەسەر ئەوانیش بێ. دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ. إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلاماً قَالَ سَلامٌ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ﴾ ئایا سەرگورشتەی میوانەکانی (ئیبراهیم)ت پێ گەییوە؟ چیرۆکی ئەو فریشتانەی نێردرابون بۆ لەناوبردنی قەومی لوطو لەرێگایاندا لایان دایە مالی ئیبراهیم، هیچی لێ دەزانی؟ کاتێك ئەو فریشتانە بەگوێرەی ئوصولو عادەت لەسەر شێوەی ئادەمیزاد چوونە مالی ئیبراهیم‌و سلاویان لێ کرد، ئیبراهیم وەلامی دانەوەو وتی: سلاو لەسەر ئێوە بێ، ئیوە کەسانێکن لەوەپێش ناسیاویمان نەبووەو نازانم کێن‌و چ کەسێکن، خۆتانم پێ بناسێنن.

وا پێ دەچێ ئەم رستەیەی کە دەفەرموێ: ﴿قوم منكرون﴾ حەزرەتی ئیبراهیم ئاراستەی میوانەکانی نەکردبێ، بەلکوو لەدلی خۆی دا گوتبێتی، یان بەمالو مندالو خزمەتچی‌و کەسانی دیکەی وتبێ کەلە مەجلیسەکەدا لەگەلی بووون. چونکە درکاندنی ئەم جۆرە گوفتارانە بەرەو روی میوان جۆرە قورساییەکی تێدایە.

﴿فَرَاغَ إِلَى أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ. فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلا تَأْكُلُونَ﴾ خێراخۆی لەمیوانەکانی دزیەوەو چوو بۆلای مالو خێزانی فەرمانی دا بەئامادەکردنی خواردنی باش بۆ میوانەکان. هێندەی پێ نەچوو گۆلکەلەیەکی قەلەویان سەربڕی‌و

گۆشتەکەی برژێنـدراو ئامادەکرا، حەزرەتی ئیبراهیم هێنایە بەردەم میوانەکان بەڕێزەوە فەرموی کردن و خواردنی لێ نزیك کردنەوە: کە میوانەکان دەستیان بۆ خواردنەکە نەبرد، حەزرەتی ئیبراهیم وەدەنگ هات و وتی: ئەوە بۆ ناخۆن؟ خواردن بۆ ئێوە ئامادەکراوە کەچی ئێوە دەستی بۆ نابەن!! ﴿فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾ کە رویان لەخواردن نەکرد و دەستیان بۆ نەبرد لەدڵی خۆی دا ترسێکی لێ پەیدا بوو، چونکە نان نەخواردن و خۆگرتنەوەی میوان لەخواردن لەماڵی خانە خوێدا ئاماژەی خێری تێدا نیەو چاوەڕوانی ئاشتی لێ ناکرێ.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾ (هود/٧٠) ئالەم کاتەدا: کە گۆشتی برژاو لەبەردەم میوانـدا دانـراوەو دەستی بـۆ نابرێ، حەزرەتی ئیبراهیم دڵەراوکەیەتی و ترسی لێ نیشتووە ﴿قَالُوا لا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلامٍ عَلِيمٍ﴾ فریشتەکان بە(ئیبراهیم)یان گوت مەترسە، ئێمە فریشتەین نێردراوین بۆ لەناوبردنی گەلی لوط. لە هەمان کاتدا مزگێنیان پێ دابەوە کە کوڕێکی زاناو ئاغری دەدرێتێ. ئەویش حەزرەتی ئیسحاقە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ﴾ (هود/٧١) هەواڵێکی سەرنج ڕاکێش بوو لەگوێچکەی خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم دا زرنگایەوە، ﴿فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾ خێزانی ئیبراهیم، (ساراخاتون) کە لەسوچێکی ماڵەکەدا بوو گوێی لەم موژدە خۆشە بوو، بەرەو روی میوانەکان هات و بەدەستی لەرومەتی خۆی دەداو هاواری دەکرد، ئەیەڕۆ من و منداڵ!! پیرەژنێکی نەزۆك و بەساڵاچووی وەکوو من منداڵی دەبێ؟؟

من بەگەنجی منداڵم نەبووە، ئێستا بەم پیرییە منداڵم ببێ؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخاً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ﴾ (هود:٧٢) ئەم هەواڵە نەخافڵە سەرسامی

کرد، ئەوەی لەبیر چووەوە کە ئەو موژدەیە فریشتە هێناویانەو بڕیاری خودایە، بۆیە فریشتەکان خێرا رەدیان دایەوەو ﴿قَالُوا كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ إِنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ﴾[1] وتیان وەکوو چۆن پێمان گوتی خودا ئاوای فەرموو: ئەوە بڕیاری پەروەردگارەو دێتە جێو هیچ شكو گومانت تێیدا نەبێ، بەلاتەوە کارێکی گرنگ نەبێ. ئێمە فروستادەی خوداینو ئەو هەواڵەت پێ رادەگەیەنین، ئەو موژدەیەت دەدەینێ، بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێکدا خاوەن دەسەلاتو بەتوانایە، زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا، هیچی لێ گوم نابێ، دەزانێ کێ شیاوی چیە.

هەڵبەتە ئەم گوفتو گۆیە لەگەڵ ساراخاتونو حەزرەتی ئیبراهیمیش بووە وەکوو لەسورەتی (الحجر/٥٣ - ٥٤)دا هاتووە: لەوێ هەر حەزرەتی ئیبراهیمی دەست نیشان کرد، لێرە ساراخاتون. لەوێ ناوی سارای نەهێنا چونکە لێرە ناوی هێناوە، لێرەش ناوی حەزرەتی ئیبراهیمی نەبرد چونکە لەوێ دەست نیشانی کرد. ئەمجار دوای ئەم موژدە پێدانە بەحەزرەتی ئیبراهیمو ساراخاتون، حەزرەتی ئیبراهیم روی کردە میوانەکانو ﴿قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ﴾ ئەوە بۆ چ کارێکی گرنگ هاتوونو پەروەردگار چ ئیشێکی پێ سپاردون!؟ ﴿قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُجْرِمِينَ. لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ. مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ﴾ وتیان: ئێمە نێردراوین بۆ سەر گەلی (لوط) ئەو گەلەی کافرو ستەمکارو تاوانبارن، ئەخلاقو رەوشتیان تێدا نەماوە نێردراوین بۆ ئەوەی بەسواڵەت بەردەبارانیان بکەین، بەردەکان نیشانە کراون بۆ ئەو تاوانبارە ستەمکارانە، ئەوانەی رۆچون لەگومڕاییو بەدڕەوشتی دا.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەم عەزابە تەڕو وشکی پێکەوە نەسوتاندوە، بەڵکوو تایبەت بووە بۆ تاوانباران، دەفەرموێ: ﴿فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ. فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ کاتێ ویستمان قەومی لوط لەناو بەرین، هەرچی موسوڵمانی ناو ئەو قەومە هەبوو هەموومان هێنانە دەرێ، بۆ ئەوەی عەزابەکە نەیانگرێتەوە. لەسەرانسەری ئەو گوندو شارانەی گەلی

---

[1] کۆتایی جزمی بیستو شەش.

(لوط)ی تێدا نیشتەجێ بوون تەنها یەك خێزانیان هەبوو موسوڵمان بێ ئەویش خانەوادەی حەزرەتی لوط بووجگە لەژنەکەی. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ژمارەیان سیانزە کەس بووە. لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطاً قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَنْ فِيهَا لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ﴾ (العنكبوت:٣٢) ژنەکەی حەزرەتی لوط لەگەڵ گەلە ستەمکارەکەی لەناومان بردنو عەزابی سەختو دژوار تێکیەوە پێچان.

﴿وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ﴾ لەو شارو گوندە وێرانکراوانەدا شوێنەوارو دیاردەو نیشانەمان هێشتبونەوە بۆ هەموو ئەوانەی لەعەزابی خودا دەترسن: کە موسوڵمانن. ئەو کافرو ستەمکارانەمان کردنە پەندو عیبرەت بۆ ئەوەی کەسانی دیکە پێیان پەندئامێز ببن، خۆ لەسزای خودا بپارێزن، خۆیانمان بەعەزابی سەخت لەناو بردو خاكو وڵاتمان ژێروژوور کردن، نیشتمانەکەیانمان کردە دەریاچەیەکی بۆگەن: کە دەریاچەی تەبەرییەیە.

لەناوبردنی گەلی لوط عیبرەتو نیشانەیە بۆ هەموو کەسێك، وەلێ ئەوەی بەو شوێنەوارانە پەند ئامێز بوونو دەبن ئادەمیزادیلەخوداترسو خاوەن ئاوەزن.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ تَرَكْنَا مِنْهَا آيَةً بَيِّنَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (العنكبوت:٣٥)

## چیرۆکی هەندێ لەپێغەمبەرانی تر لەگەڵ نەتەوەکانیان

﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴿٤٠﴾ وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ

﴿مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٤٦﴾﴾

لەوەپێش کورتەیەکی لەسەرگوزشتەی حەزرەتی ئیبراهیمو حەزرەتی لوط گێڕایەوە، ئاماژەی بەپەندو عیبرەت لێ وەرگرتنیان کرد، ئەمجار لێرەدا ئاماژە بەسەرگوزشتەی هەندێ لەپێغەمبەرانی تر دەکا، کە گەلەکانیان بەعەزابی ریشەکێش لەناو بران لەتۆڵەی بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرەکانیان. دەفەرموێ: ﴿وَفِي مُوسَى إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَى فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ. فَتَوَلَّى بِرُكْنِهِ وَقَالَ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾ لەسەرگوزشتەی موسادا پەندو ئامۆژگاریی هەیە، ئەو کاتەی ناردمان بۆ سەر فیرعەونو نەتەوەکەی بەبەڵگەی بەهێزو نیشانەی ئاشکراوە.

ناردمان بۆ سەر فیرعەونی ستەمکارو بێ ویژدانو ملهوڕ بانگەوازییو کرد بۆ ئیمانهێنان، موعجیزەی جۆراوجۆری نواندن، لەعەزابی خودا ترساندی ئەگەر سەرپێچی بکا، موژدەی بەختەوەری پێدا ئەگەر ئیمان بێنێ. وەلێ فیرعەون پشتی هەڵکردو ملی بۆ حەق نەدا، پشت ئەستور بوو بەهێزو توانای خۆی، شانازی کرد بەسوپاو دارو دەستەی، بەمڵكو سەڵتەنەتی خۆی نازیی. موسای بەسوك زانیی، پەیامەکەی رەتکردەوە، وتی: ئەوە یان ساحیرو جادوبازە یان شێتە، چونکە هەرچەندە هەوڵی دا تەفسیرێك بۆ ئەو موعجیزانە بدۆزێتەوە نەیتوانی، هەر

ئەوەندەی پێکرا بڵێ: ساحیرە یان شێتە!! وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو لەسەر زوبانی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿ان هذا لساحر عظيم﴾ (الشعراء:٢٧) یان دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ﴾ (الشعراء:٢٧) سەرەڕەقیو ملهوڕیی لەرادەبەدەری بۆ سەر نەچوو ﴿فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ فیرعەونو داروودەستەکەیمان بەعەزابی سەختی خۆمان گرت، چۆن گوتنێک؟ هەر باس ناکرێ، بەتوندوتۆڵی گرتمانن، تورمان دانە ناو دەریاوە، فیرعەون هەمیشە لۆمە کراوو نەفرەت لێکراوە. چونکە کافرو سەرڕەقو خۆ بەزل زانو بێویژدانو خۆ بەخودا زان بوو ﴿وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ. مَا تَذَرُ مِنْ شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ﴾ هەروەها لەسەرگوزشتەی قەومی عاد پەندو عیبرەت هەیە، کاتێ بای سەختو ریشەکێشکەرو نەزۆکو بێ خێروبێرمان ناردنە سەر، بایەک بوو بای بەهیلاکبەرو فەوتێنەر، بەسەر هەرشتێکدا تێپەڕ بوایە دەیفەوتاندو دەیرزاند.

﴿وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّى حِينٍ. فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنْظُرُونَ﴾ هەروەها لەچیرۆکو بەسەرهاتی گەلی ثەمودا پەندو عیبرەت هەیە، کاتێ پێمان گوتن: رابوێرنو لەزەت وەربگرن تاکاتی فەوتاندنتان، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا فِي دَارِكُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾ (هود:٦٥) وەلێ ئەو قەومە سەرسەختە پەندئامێز نەبوون لەهەڵوێستی ناشیرینی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە، لوتبەرزییان نواند، گەردنکەچی فەرمانی خودا نەبوون. ئیتر بەعەزابی سوتێنەری بەهیلاکبەری (صاعیقە) گرتمانن، بەئاشکرا عەزابی فەوتێنەریان بینیو زەق زەق سەیریان دەکرد. یان چاوەڕوانی بوون بێتە سەریان ئەوەبوو ئەوان سێ رۆژ چاوەڕوانی هاتنی ئەو عەزابە بون، لەبەرەبەیانی رۆژی چوارەم دا عەزابی وادە پێدراویان بۆ هات سزایەک بوو پڕاوپڕی تاوانەکانیان بوو. ﴿فَمَا اسْتَطَاعُوا مِنْ قِيَامٍ

﴿وَمَا كَانُوا مُنْتَصِرِينَ﴾ نەیانتوانی لەجێگای خۆیان بجولێن، بۆیان نەکرا رابکەنو هەوڵی قوتاربوون بدەن، بەڵکوو دەست لەعاست هەموویان لەماڵی خۆیان دا سلار بوونەوە، کەس عەزابی خودای لێ نەگێڕانەوە، کەس نەبوو یارمەتییان بدا.

﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِنْ قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْماً فَاسِقِينَ﴾ لەپێش ئەو گەلو نەتەوە سەرسەختانەی باسمان کردن گەلی (نوح)مان بەتۆفان لەناو برد، بێگومان ئەوانیش گەلو نەتەوەیەکی فاسقو یاخی بوو بوون لەسنووری یاسای خودا دەرچووبوون. ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر قودرەتو دەسەڵاتی خودا ئەوەتا دەتوانێ شتێك کە هۆکاری بوونە بیکاتە هۆکاری نەبوون، وەکوو زانراوە عونصوری ژیانو بوون بۆ مەخلوقات چوار شتی سەرەکییە. (ئاو، هەوا، ئاگر، گڵ) دەی ئەوەتا قەومی (لوط)ی بەگڵ لەناو برد، گەلی نوحو گەلی فیرعەونی بەئاو لەناو برد ، گەلی (عاد)ی بەهەوا ریشەکێش کردن، گەلی (ثمود)ی بەئاگر دوابڕاو کردن.

## بەڵگەی جۆراوجۆر لەسەر تاكو تەنهایی خوداو رەهایی دەسەڵاتی

﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٥١﴾﴾

دوای ئیسباتکردنی رابوونی قیامەت‌و زیندوبونەوە، ئەمجار بەلگە لەسەر تاک‌وتەنهایی خوداو رەهایی دەسەلاتی دەهێنێتەوە: کە بەشێك لەدیاردەکانی ئەو دەسەلاتە دروستکردنی ئاسمانە بەو پانی‌و بەرفراوانی‌و تۆکمەییەی. هەروەهادروستکردنی زەوییە بەو شێوەی : کە دەڵێی راخراوە بۆ ئەوەی زیندەوەران بەئادەمیزادیشەوە بتوانن لەسەری هەڵبکەن‌و ژیان بەسەربەرن، هەروەها دروستکردنی نێرو مێیە لەهەموو رەگەزێك. هەروەها لەهەموو صنفێك دو شتی دژ بەیەکی هێناونە دی: ئاسمان‌و زەوی، دەریاو وشکانی، تەڕو وشك، تاریکی‌و رەناکی، مردن‌و ژیان، زیندو مردو، شەوو رۆژ...هتد. دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ بێگومان ئاسمانمان بەدیهێناوە بەهێزو توانا، دڵنیا بن ئێمە خاوەنی هێزو دەسەلاتی رەهاین توانیومانەو دەتوانین بەئاسانی ئاسمان‌و غەیری ئاسمان بهێنینە دی، هیچ ماندوبون‌و ئەرکێك توشمان نەهاتووەو توشمان نابێ،

﴿وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ﴾ زەویمان بەدی هێناوەو رامان خستووە وەکوو مافور، وامان دروستکردوە بتوانرێ ژیانی تێدا بەسەر ببرێ، زیندەوەر لەسەری جێگیربن ، ئێمە زۆر باشمان کردوە بەبێشکەی تێدا ژیان، کەش‌و هەوای تێدا ژیانمان تێدا رەخساندوە، پڕمان کردوە لەخێرو فەڕ، لەسەر روبەری‌و لەناو دەریاو کون‌و کەلەبەری دا ئادەمیزادو زیندەوەرانی تر دەژین، لەناو سکی زەوی دا جۆرەها سامانی کانزایی تێدایە، لەسەر روبەری جۆرەها گژوگیاو گوڵ‌و گوڵزارو درەخت هەن، لەناو دەریاکانی دا هەزارەها جۆر ماسی‌و زیندەوەری تر هەن، جۆرەها لوئلوئو مەرجان هەیە. لەهەواو بۆشایی دا جۆرەها باڵندەو پەلەوەر هەیە، ﴿وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ لەهەموو صنف‌و رەگەزێك نێرو مێمان بەدیهێناوە، دوو شتی لێك جوداوازو دژ بەیەکمان هێناوەتە دی، (نێرو مێ، ساردو گەرم، تاڵ‌و شیرین، سپی‌و رەش، نەرم‌و رەق، شەوو رۆژ، ئیمان‌و کوفر،

مردنو ژیان، خێرو شەڕ، بەهەشتو دۆزەخ.... هتد. ) ئەمانە هەموو بەڵگەی ئەوەن؛ کە خودا تاكو تەنهایەو خاوەنی دەسەڵاتی رەهایە.

کەوابێ ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ هەرچی زووە پەنا بۆ خودا بەرن، ملکەچیو بەندایەتی بۆ بنوێنن، لەهەموو کارمباریکتاندا پشتی پێ ببەستن، تۆبە لەتاوانەکانتان بکەن وگوێڕایەڵی فەرمان وحەڵەو گیریەکانی بن، بێگومان من لەلایەن خوداوە ئاگادار کەرەوەو ترسێنەرم بۆتان. دەمەوێ لەتاریکی کوفر رزگارتان بێ وبکەونە سەرڕێبازی هیدایەت من بۆئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام.

﴿وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ هاوەڵ بۆ خودا دامەنێن، کەس نیە بتوانێ ببێتە شەریکی خودا، پەروەردگار خودایەکی ئەوتۆیە تاكوتەنها، بەرزو شکۆمەند، خاڵی لەهەموو عەیبو لەککەیەك، هەر ئەو شیاوی خودایەتییە. بەندایەتیو عیبادەت هەر بۆ ئەو دەکرێو بۆ ئەو شیاوە.

## هەڕەشەکردن لەموشریکەکان بەناردنی عەزاب بۆ سەریان

﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٥﴾ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو

ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَـٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾

لەوەپێش بەڵگەی لەسەر رابوونی قیامەتو تاكو تەنهایی پەروەردگارو دەسەڵاتی فراوانی هێنایەوە، سەرەنجامی گەلو نەتەوە كافرو سەرڕەقەكانی رابوردوی دیاریی كرد، ئەمجار بۆ تەسەللا دانەوەی پێغەمبەر ئەوە رون دەكاتەوە: كە هەموو پێغەمبەرێك لەلایەن گەلو نەتەوەكەیەوە بەدرۆ خراوەتەوە، هەر دەڵێی ئەو گەلو نەتەوانە بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرەكانیان لێكتر گێڕاوەتەوەو لەزاری یەكتر تفیون!

دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾ ئەی پێغەمبەر! وەكوو موشریكە قورەیشییەكان تۆ بەدرۆ دەخەنەوەو پەیامەكەت رەتدەكەنەوە، بەساحیرو شێتو وێتت دەزانن، گەلو نەتەوە پێشینەكانیش هەمان هەڵوێستو دابو نەرێتیان بووە، ئەوە پیشەی هەموو گەلو نەتەوەیەكی رابردوە. هەر تۆ نیت كە بەدرۆ خراویتەوەو پەیامەكەت رەتكراوەتەوە، ﴿أَتَوَاصَوْا بِهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾ ئایا ئەو گەلو نەتەوانە لەیەكتریان گێڕاوەتەوە؟ هەر گەلو نەتەوەیەك وەصیەتی بۆ دوا خۆی كردوە كە هەر كاتێ پێغەمبەریان بۆ سەر رەوانە كرا بەدرۆی بخەنەوە؟ نەخەیر لەواقیع دا ئامۆژگاریی یەكتریان نەكردوە، لەیەكتریان نەگێڕاوەتەوە، چونكە رۆژگارو سەردەمیان زۆر لەیەكتر دوورە، وەلێ گەلو نەتەوەیەكی ملهوڕو یاخی بوو بوون، هەموویان كافرو سەرڕەقو سنوور بەزێنو یاساشكێن بوون، هەوەڵو ئاخریان یەك دابو نەرێتیان هەبوە، بێ بەڵگە پێغەمبەرەكانیان بەدرۆ خستونەوە.

﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَا أَنْتَ بِمَلُومٍ﴾ ئەی پێغەمبەر رویان لێ وەرگێڕەو دەمەدەمێیان لەگەڵ مەکە ئەتۆ پەیامی خۆت گەیاندو ئەرکی سەرشانی خۆتت ئەنجام داوە، تۆ لەلایەن خوداوە هیچ گلەییەکت لەسەر نیە، چونکە پەیامی خودات پێڕا گەیاندون. پێغەمبەریش هەر راگەیاندنی لەسەرە.

﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەتۆ بەردەوام ئامۆژگاریی خۆتیان ئاراستە بکە، بەقورئان وەعظو نەصیحەتی ئیماندارەکان بکە چونکە بیرخستنەوە سودیان پێ دەگەیەنێ، یان ماناکە بەم جۆرەیە:نەوەکوو سود لەبیرخستنەوە دەکەن ئیللا کەسانێك دەیکەن: کە دڵیان ئامادەباشی هیدایەتە. .

واتە: روو وەرگێڕان لەکۆمەڵێك ناکاتە ئەوە رو لەهەموو کۆمەڵان وەرگێڕی.. بەڵکوو ئەتۆ کە ڕوو لەکافرە سەرسەختەکان وەردەگێڕی لەهەمان کاتدا ئامۆژگاریی موسوڵمانەکان بکە، چونکە ئەوان سودی لێ وەردەگرن.

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ ئەمن عالەمی جندۆکەو ئادەمیزادم کە دروست کردون بۆیەم دروست کردون عیبادەتم بکەن، بۆیەم بەدی هێناون بەندایەتیم بۆ ئەنجام بدەن‌و بم ناسن، ئەگینا من پەروەردگاری بوونەوەرم بێ نیازم لەهەموو عالەم، بون‌و نەبوونی عالەم بەنیسبەت منەوە چون یەکە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهاً وَاحِداً لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (التوبة: ٣١). موجاهید دەڵێ: مانای ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ بەم جۆرەیە، ئەمن جندۆکەو ئادەمیزادم: کە دروستکردون بۆیەم دروست کردون فەرمانیان پێبکەم بەعیبادەت کردن‌و بەندایەتی بۆ کردنم.

﴿مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِ. إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ خواستم نیە ئەوان رزق‌و رۆزیم بدەنێ نامەوێ خۆراکم بۆ بێنن، من ئاتاجی خواردن‌و خواردنەوە نیم، نیازی ئەوەم لێیان نیە سودم پێبگەیەنن زیانم

لــێ دوور بخەنــەوە، بێگومــان خــودا رزقو رۆزیــدەرە بەهــەموو گیانلەبــەرێ، دەوڵەمەنــدیی رەهای هەیــە موحتــاجی کــەس نیــەو هــەموو کــەس ئاتــاجی ئــەوە. خاوەن دەسەڵاتو توانای رەهایەو بێباکە لەهەموو شتێك.

بــەکورتی پــەروەردگار بەنــدەکانی دروســتکردون بــۆ ئــەوەی بەتاكوتــەنهای بناسنو بەندایەتی بۆ بکەن، جا هەر کەسێك ملکەچی فەرمانو جڵەوگیرییــەکانی پەروەردگار بێ پاداشی دەداتــەوە بەبەهەشتی رازاوە، کەسێکیش لێی یاخی بێ ، بەکوشندەترین سزا سزای دەدا! بەهەشتی دروستکردوە بۆ خوداپەرستانو دۆزەخی ئامادەکردوە بۆ کافرو یاخی بووان! بەپێغەمبەران دا پەیامی بۆ ئادەمیزاد ناردوەو رێگای چاكو خراپی بۆ رون کردونــەوە. ئیتر هــەموو کــەس لەســەرەنجامی خــۆی بەرپرسیارەو بەگوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداشیان دەداتەوە.

﴿فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذَنُوباً مِثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَابِهِمْ فَلا يَسْتَعْجِلُونِ﴾ بێگومان بۆ ئەوانــەی ســتەمکارو کــافرو بــێ ویــژدانن بەئەنقەســت رێبــازی کــوفر دەگرنەبــەرو پێغەمبەر بــەدرۆ دەخەنــەوە بەشێك لەســزای ســەخت هەیــە وەکوو ئــەو عەزابــەی بەگەلو نەتەوە پێشینەکانمان چەشت. دەی با پەلە لەهاتنی عەزاب بۆ سەر خۆیان نەکەن، دڵنیا بن بەشی خۆیان لەعەزابی خودا دەچێژنو رەتبوونەوەی نیە.

ئــەم ئایەتــە وەڵامــی کافرەکانــە: کــە دەیــانگوت: ﴿مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (الملك:٢٥) یان دەیانگوت: ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (هود:٢٢) ئەوە بڕیاری پەروەردگارە هەرکەسێ کافرو بێ بڕوا بێ دەبێ تۆڵەی لێ بسەندرێ، کەوابێ ﴿فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ يَوْمِهِمُ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ هیلاكو لەناوچوون، عــەزابی بەشــیدەت لــەرۆژی قیامەتــدا بــۆ ئــەو کەسانەیە کــافرو بــێ بڕوان.

بسم الله الرحمن الرحيم

# سورەتی الطور

ئەم سورەتە ناونراوە (الطور) چونکە وشەی (الطور) لەسەرەتای سورەتەکەدا هاتووەو خودا سوێندی پێ خواردوەو مەبەستی کێوی (طور)ە، کە کێوێکی دارستاناوییە، پەروەردگار حەزرەتی موسای بانگ کرد بۆ سەر ئەو کێوەو ئاخاوتنی لەگەڵدا ئەنجام دا، هەر لەویشەوە حەزرەتی عیسای رەوانە کرد، بەمەش زێدە رێزی بۆ دەستەبەر بووە.

**موناسەبەی سورەتی ( گور ) لەگەڵ سورەتی ( الذاريات )دا لەچەند رویەکەوەیە :**

هەردوو سوورەتەکە مەککین‌و جەخت لەسەر بنەماسەرەکییەکانی ئیسلام دەکەنەوە، باسی تەوحیدو رابوونی قیامەت‌و باس‌و خواسی رۆژی جەزاو راستیی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو پوچەڵکردنەوەی بیروباوەڕی موشریکەکانی لەخۆ گرتووە.

سەرەتاو کۆتایی سورەتەکان لەیەك دەچن، لەسەرەتای هەردو سورەتەکەدا حاڵ‌و چۆنیەتی خوداپەرستان لەرۆژی قیامەتدا نمایش دەکا. ئەوەتا لەسەرەتای سورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ لەسەرەتای سورەتی (الطور)یشدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ﴾ لەکۆتایی سورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لەکۆتایی (الطور)یشدا دەفەرموێ ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ﴾.

لە هەردو سورەتەکەدا سوێند بەمایەتی کەونیی دەخوا، لەسورەتی (الذاريات)دا سوێندی بە(با)ی سودبەخش‌و لەسورەتی (الطور)یشدا سوێند بەکێوی (الطور) دەخوا.

لە هەردوو سورەتەکەدا فەرمان بەپێغەمبەر کراوە: کە رو لەکافرەکان وەربگێرێو بەردەوام بێ لەسەر ئامۆژگاری موسوڵمانان، لە(الذاريات)دا دەربارەی کافرەکان فەرمووی: ﴿فتول عنهم﴾ دەربارەی موسوڵمانەکانیش فەرمووی: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾.

لە سورەتی(الطور)یشدا دەربارەی موسوڵمانەکان دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ﴾ دەربارەی کافرەکانیش دەفەرموێ: ﴿فَذَرْهُمْ حَتَّى يُلاقُوا يَوْمَهُمُ ...الآية﴾.

## رابوونی قیامەتو هەبوونی عەزاب لەژیانی قیامەتدا

﴿وَالطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ ﴿٢﴾ فِي رَقٍّ مَنْشُورٍ ﴿٣﴾ وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ ﴿٤﴾ وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ ﴿٥﴾ وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ ﴿٧﴾ مَا لَهُ مِنْ دَافِعٍ ﴿٨﴾ يَوْمَ تَمُورُ السَّمَاءُ مَوْرًا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ الْجِبَالُ سَيْرًا ﴿١٠﴾ فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَى نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنْتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَذَا أَمْ أَنْتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾

ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾

لـە سـەرەتای ئـەم سـورەتەدا پـەروەردگار سـوێند بـەکێوی (طـور) دەخـواو دەفـەرموێ: ﴿والطــور﴾ سـوێندەکە دەخـوا بـەکێوی طـوری سـەینا: کـە کێـوێکی دارەستاناوییەو گـەڵێ روداوی گـەورەی لەسـەر روداوە، حـەزرەتی موسا لەسـەر ئـەو کێوە خودا ئاخاوتنی لەگەڵ کردوە، لەوێ تەوراتی بۆ نازڵ کردوە، حـەزرەتی عیـسا لەوێوە کراوە بەپێغەمبەرو رەوانەکراوە بۆ سەر گەلەکەی.

﴿وَكِتَـــابٍ مَـــسْطُورٍ﴾ ســوێند بەنامــەی رێك‌وپێــك نوســراو کــە نامــە ئاسمانییەکانن(تەورات‌و زەبورو ئینجیل‌و قورئان) بەڵام لێرەدا دەتوانـدرێ بگـوترێ مەبەسـت قورئانـە. ﴿فِـي رَقٍّ مَنْـشُورٍ﴾ کـە نوسـراوەتەوە لەپێـستێکی بڵاوەبـووی خۆشکراوداو گەورەترین نامەی ئاسمانییەو کەتەلۆکی بوونەوەرەوبەرنامـەی ژیانـە. ﴿وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ﴾ سـوێند بـەو خانـەیـەی ئاوەدانـە بەنوێژکـەران‌و تـەوافکاران:کە کەعبەی پیرۆزەو یەکەم خانویەکە دروستکراوە بۆ خوداپەرستیی‌و لەهەموو کون‌و قوژبنێکی جیهانەوە بەشەوو بەرۆژ لەنوێژدا موسوڵمانان روی تێدەکەن‌و لەتەوافدا بەدەوری دا دەسوڕێنەوە. چرکەیەك نیە کۆمـەڵی موسـوڵمان رویـان تـێ نـەکردبێ‌و کۆمەڵێکیش تەوافی نەکەن. ﴿وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ﴾ سوێند بەسەقف بڵنـدکراوی زۆر بەرزو شکۆمەند کە ئاسمـانی بـەرفراوان‌و تۆکمـەو پتـەوە. وەکـوو سـەقف وایـە بـۆ زەوی. وەکوو لەئایەتێکی تـردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفاً مَحْفُوظاً وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ (الانبياء).

﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾ سوێند بەدەریا لووشی پڕو لێوان لێو لەئاو: کە بـەهێزی کێشندە ناهێڵدرێ ئاوەکەی سەررێژ بکاو وشکانی داپۆشێ.

بەراستی ئاسمان و دەریا دوو نیشانەی گەورەو مەزنن لەسەر تاك و تەنهایی خوداو رەهایی دەسەلاتی، ئاسمان بەهەزاران و بەملیۆنەها ئەستێرەو مانگ و خۆری تێدان و دێن و دەچن. هەریەکە لەو مانگ و خۆرو ئەستێرانە، رێڕەوی خۆی هەیەو شوێنهەلات و شوێن ئاوابوونی هەیە، هیچیان لێك ناخشێن و دەعم ناکەن، هەموویان پەروەردگار هەڵیان دەسوڕێنێ و بەهێزی کێشندە رایگرتوون و ناهێڵێ هەڵوەرن. مەلایین ساڵ ئەم کەونە لەهەڵسوڕان و هاتووچۆدایەو شتێکی ئەسواوەو پەکی نەکەوتوە، بەهەڵسوڕانی زەوی و مانگ و خۆرو ئەستێرەکان بەو شێوەو یاسا خوداییە. ساڵ و مانگ و شەو رۆژو وەرزەکانی ساڵ دێنە کایەوە، تاریکی و روناکی، ساردی و گەرمی، تەڕو وشکی پەیدا دەبێ.

(دەریالوشی)یش بەو هەموو پانی و قوڵییەی کە هەیەتی، بەو هەموو شەپۆلانەی دەیانهاوێ و دەیانکێشێتەوە، بەرزیان دەکاتەوەو نزمیان دەکاتەوە بەو هەموو کەشتی و پاپۆڕانەی بەباری قورسەوە پێیدا دێن و دەچن، بەملیۆنەهاو ملیارەها گیانداری ئاوی کە لەناویا هەڵدەکەن و ژیان بەسەر دەبەن، بەو هەموو لوئلوئو مەرجانەی تێیدایە، ئەمانەو دەیان و سەدان و زیاتریش لەدیاردە کەونییەکان بەئاشکراو بەنهێنی بەگوێچکەی ئادەمیزاددا دەچرپێنن و وەئاگای دەهێننەوە بۆ ئەوەی لەدیاردەکانی دەسەلاتی پەروەردگار بنوارێ و بڕوا بەتاك و تەنهایی خوداو زانایی و کار دروستیی و دەسەلاتی بێ سنووری بکا.

پەروەردگار بەو پێنج مەخلوقە رێزدارانە سوێندی خواردو فەرمووی: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ . مَا لَهُ مِنْ دَافِعٍ﴾ دڵنیا بەرۆژی قیامەت دێ و حیساب و لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش رودەدات، کەس نیە بتوانێ عەزابی خودا لەتۆ بگێڕێتەوە، دووری بخاتەوە، نەهێڵێ بێ. بێ شك و گومان عەزابی سەخت و دژوار یەخەی کافرو یاخی بوان دەگرێ و کەس نیە بەرەودوا پاڵی پێوە بنێ.

﴿يَوْمَ تَمُورُ السَّمَاءُ مَوْراً. وَتَسِيرُ الْجِبَالُ سَيْراً﴾ ئەو رۆژەی ئاسمان تێکەوە دەهاوێ، ئەو ئاسمانە بەرزو رێك‌وپێك‌و پتەوە تێك دەچێ‌و دەکەوێتە جونبوش‌و وەکوو دەریا شەپۆل دەهاوێ، کێوەکان لەجێگای خۆیان دەترازێن‌و هێزی کێشندە نامێنێ‌و شاخەکان لێك هەڵدەوەشێن. دەبن بەتەپ‌وتۆزو بەحەوادا دەچێ. ئەمەش نیشانەی ئەمیە: کە ئیتر ببڕای ببڕای جارێکی تر گەڕانەوە بۆ دونیا نەماوەو تەمەنی دونیا بەسەرچوو. چونکە ئاسمان‌و زەوی‌و مانگ‌و خۆرو ئەستێرەو کێو...هۆکاری ئاوەدانی دونیان‌و بۆ سود لێ وەرگرتنن: کە هومێدی گەڕانەوە بۆ دونیا نەمێنێ ئیتر سود لەمانەوەی ئەو شتانە نامێنێ.

﴿فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئای عەزابی سەخت‌و دژوار یان شیوی دۆزەخ لەو رۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەریان بەدرۆ خستۆتەوە، پەیامی ئیسلامیان رەت کردۆتەوە ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي خَوْضٍ يَلْعَبُونَ﴾ ئەو بەدرۆ خەرەوانەی بەقسەی پڕوپوچ گاڵتەجاڕ یاری بەقورئان دەکەن جۆرەها بوختان‌و قسەلۆك بۆ پێغەمبەر هەڵدەبەستن. ﴿يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَى نَارِ جَهَنَّمَ دَعّاً﴾ ئەو رۆژەی بەزەخت پاڵ بەبێ بڕوایانەوە دەنرێ‌و راپێچی ناو ئاگری دۆزەخ دەکرێن‌و توڕ دەدرێنە ناوی.

ئەمجار بۆ زێدە تەعزیب‌و سەرزەنشتکرد پێیان دەگوترێ: ﴿هَذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾. ئەو ئاگرەی دەی بینن ئەوەیە: کە پێغەمبەر لەدونیادا دەیترساندن لێی‌و بڕواتان پێ نەکرد. دەتانگوت ئەو قورئانەی موحەممەد هێناویەتی جادوی جادوکەرانە. یان دەیانگوت چیرۆکە کۆن‌و ئەفسانەی پێشینانە. ئەمجار بەشێوەی گاڵتە پێکردن پێیان دەگوترێ: ﴿أَفَسِحْرٌ هَذَا أَمْ أَنتُمْ لا تُبْصِرُونَ﴾ ئایا ئەوەی ئێستا دەیبینن سیحرو جادوبازییە وەکوو لەدونیادا دەرحەق بەنامە ئاسمانییەکان‌و پێغەمبەران دەتانگوت. ئایا ئەمە راستە؟ یان لێرەشدا جادوتان لێ

نـەکراوە؟ نـەء جادوتـان لێ نـەکراوە بـەڵکوو ئەمـە حـەق‌و راسـتەو جادوتـان لێ نەکراوە.

﴿اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ جـا: کـە ئێـستا بەئاشـکرا ئـەوە دەبیـنن‌و هـیچ ئینکارییـەکتان بـۆ نـاکرێ، دەچـنە نـاو دۆزەخەوەو عەزابی دژوار بچێژن، ئیتر صەبر بگرن یان صەبر نەگرن چون یەکە، هـیچ شـتێك دادتـان نـادا، چـی دەکـەن بیکـەن، بێسـوودەو رزگاربونتـان نیـە سـزای کردەوەی خۆتانە وەری دەگرنەوە.

بۆ خۆشیان هەست بەو واقیعە تاڵە دەکەن، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا ئامـاژەی پێ دەکاو لەسەر زوبانی دۆزەخییان دەفەرموێ: ﴿سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَـا مِنْ مَحِيصٍ﴾ (ابراهيم: ٢١) .

## پاداشی تەقواکاران‌و نیعمەتی خودا بەسەریانەوە لەبەهەشتدا

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَاكِهِينَ بِمَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَاهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِئِينَ عَلَى سُرُرٍ مَصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَاهُمْ بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِمَّا

يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَازَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾

له‌وه‌پێش باسی رابوونی قیامه‌ت‌و سزادانی کافره‌کانی کرد، که بێگومان تووشیان ده‌بێ‌و ناتوانن له‌خۆیانی لابده‌ن‌و ئه‌مجار باسی ته‌قواکاران ده‌کاو پاداش‌و نیعمه‌ته‌کانی په‌روه‌ردگار به‌سه‌ریانه‌وه نمایش ده‌کا. ئه‌مه‌ش ئوسلوبی قورئانه: که شته دژ به‌یه‌که‌کان ده‌هێنێ‌و به‌مه‌به‌ستی ته‌رغیب‌و ته‌رهیب رایان ده‌نوێنێ. هه‌رکاتێ باسی دونیا بکا، ئاماژه به‌قیامه‌تیش ده‌کا، حاڵ‌و وه‌زعی دۆزه‌خییان رون ده‌کاته‌وه، نازونیعمه‌تی به‌هه‌شتیه‌کانیش باس ده‌کا...هتد بۆ ئه‌وه‌ی سه‌رنجی ئاده‌میزاده‌کان راکێشێ‌و بیر له‌سه‌رئه‌نجامی خۆیان بکه‌نه‌وه، واز له‌کوفرو بێدینی بێنن، روبکه‌نه خوداپه‌رستی. ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ. فَاكِهِينَ بِمَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَاهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾ بێگومان ته‌قواکاران‌و له‌خواترسان له‌باخاتی به‌هه‌شت‌و نازونیعمه‌تی جۆراوجۆرو نه‌براوه‌دان، دڵخۆش‌و ته‌ڕ ده‌ماخن به‌و نازونیعمه‌تانه‌و له‌زه‌ت‌و چێژیان لێ وه‌رده‌گرن‌و به‌ئارەزۆی خۆیان راده‌بوێرن. خواردنی خۆش‌و پۆشاکی جوان‌و شوێنی دڵگیرو هاوسه‌رو خێزانی شۆخ‌و شه‌نگ‌و نه‌ونه‌مام، چییان بوێ‌و چۆنیان بوێ بۆیان ئاماده‌یه. له هه‌مان کاتدا خودا

لەعەزابی دۆزەخ پاراستونی. ئەمەش ئەوپەڕی بەمرازگەیشتن و خۆشنوودییە، بەختەوەری و کامەرانییان بۆ هەتاهەتایە.

فریشتەکان پێیان دەڵێن: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بخۆن و بخۆنەوە، چ شتێك ئارەزوو بکەن بۆتان بەردەستەو نۆشی گیانتان بێ، خواردن و خواردنەوەتان بێ عەیب و خەوشە، بەتام و لەززەتە. ئەمەش لەپاساوی ئەو کردار و رەفتارە باشانەتان ؛ کە لەدونیادا ئەنجامتان داوە. خودا بەفەزڵ و ئیحسانی خۆی ئێوەی خستۆتە ئەم ناز و نیعمەتانەوە.

ئەمجار پەروەردگار باسی راخەر و شوێنی حەوانەوە و کورسی و مۆبێلەو رابواردن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا دەکاو دەفەرموێ: ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى سُرُرٍ مَصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ﴾ ئەو بەهەشتیانە حاڵ و وەزعیان وایە: پاڵیان داوەتەوە لەسەر کورسی و مۆبێلەی نەرم و جوان و رازاوە و ریزکراو، حۆری چاورەش و شۆخ وشەنگمان کردونە هاوسەریان و لەگەڵیان رادەبوێرن.

وێرای ناز و نیعمەتی بەهەشتییەکان خۆیان، خۆشییەکی تریشیان هەیە ئەویش ئەوەیە ؛ کە بەم ئایەتە ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ﴾ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و بەکردەوە ئیمانداریی خۆیان چەسپاندوە، منداڵ و وەچەشیان لەبیروباوەڕدا شوێنیان کەوتوون، خودا بەفەضڵ و گەورەیی خۆی بۆ زێدە خۆشگوزەرانی و فێنکایی چاویان و منداڵەکانیان بەرز دەکاتەوە بۆ پلەوپایەی باوکەکانیان و شایستەی ئەو جێگاو ناز و نیعمەتە ئەبن، بەڵێ خودا لەبەردڵی باوکەکانیان ئەو شوێنە بەرز و خۆشانەیان دەداتێ. وەلحاڵ تۆزقاڵێك لەپلەوپایەی باوکەکانیان کەم ناکەینەوە. لەهەمان کاتدا ئەگەر پلەوپایەی منداڵەکان بەرزتر بێ، ئەوە پلەوپایەی باوکەکانیان دەگەیەنینە هی منداڵەکانیان بۆ ئەوەی زیاتر خۆشنوودی و کامەرانیی دەستەبەر بکەن. حافیظی طەبەرانی لەئیبنو عەبباسەوە

لەپێغەمبەرەوە ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (اذا دخل الرجل الجنة سأل عن ابویه و زوجته وولده، فیقال: انهم لم یبلغوا درجتك. فیقول: یارب قد عملت لی ولهم فیؤمر بالحاقهم به.): کە مرۆڤ دەچێتە بەهەشتەوە پرسیار دەکا: ئاخۆ باوك‌و دایك‌و خێزان‌و منداڵەکانی لەکوێن، پێی دەگوترێ: ئەوان نەگەیشتونە پلەی تۆ، دەڵێ: ئەی خودایە من بۆ خۆم‌و بۆ ئەوان هەوڵم داوە، ئیتر فەرمان دەکرێ: کە بیانهێننە لای‌و بەرزیان بکەنەوە بۆ پلەو پایەی ئەو. ئەمجار ئیبنو عەبباس ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ... الآية﴾ی خوێندەوە.

ئەمەش فەضل‌و ئیحسانێکی تری پەروەردگارە بەسەر بەهەشتیەکانەوە: کە بەهۆی باوك‌و دایکیانەوە پلەیان بەرز دەکرێتەوە، هەروەکوو چۆن بەهۆی منداڵ‌و وەچەکانیانەوە پلەیان بەرز دەبێتەوە.

ئیمام ئەحمەد لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ان الله لیرفع الدرجة للعبد الصالح فی الجنة، فیقول یارب أنّی لی هذه؟فیقول: باستغفار ولدك لك) لەصەحیحی موسلیمدا فەرمودەیەك پشتگیری ئەم فەرمودە دەکا: ئەبوهورەیرە لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: (اذا مات ابن آدم انقطع عمله الا من ثلاث صدقة جاریة،او علم ینتفع به، او ولد صالح یدعو له) کە ئادەمیزاد لەدونیا دەرچوو ئیتر هیچ کاریگەریەکی لەسەر جیهان نامێنێ جگە لەوەی لەژیانی خۆی دا خێرو چاکەیەکی نەبڕاوەو بەردەوامی ئەنجام دابێ، یان زانیارییەکی سودبەخشی بڵاو کردبێتەوە، یان منداڵێکی صاڵح‌و راستاڵی لەدوا بەجێ مابێ‌و دوعای بۆ بکا، خێرو خێراتی بۆ بنێرێ.

﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ هەموو ئادەمیزادێکی ژیرو باڵغ لەرۆژی قیامەتدا پابەندی کردەوەکانی خۆیەتی‌و لەملی نابێتەوە، هەروەها هیچ

کەسێکیش بەکردەوەی یەکێکی تر گیرۆدە نابێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ. إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ﴾ (المدثر:۳۸-۳۹) .

ئەمجار باسی ئەوە دەکا: کە خواردنو خواردنەوەی بەهەشتییەکان لەتامو رەنگو بۆندا هەمیشە یەك جۆر نین، بەڵکوو ناو بەناو بەپێی ئارەزۆی خۆیان دەگۆڕێن، دەفەرموێ: ﴿وَأَمْدَدْنَاهُمْ بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ لەهەموو جۆرە میوەیەكو گۆشتی تەڕو تازە کە ئارەزۆی بکەن بەویستی خۆیان بۆیان دابین دەکەین.

﴿يَتَنَازَعُونَ فِيهَا كَأْساً لا لَغْوٌ فِيهَا وَلا تَأْثِيمٌ﴾ بەحەماسو حەزو ئارەزۆوە پیاڵەی شەراب لەیەکتری وەردەگرن دەڵێی خەریکن جەنگی لەسەر بکەن، بۆ خۆشیو یاری کردن پیاڵە مەی لەیەکتری دەفڕێنن، یەکێکیان پیاڵە شەرابێك وەردەگرێو تۆزێکی لێ دەخواتەوەو ئەمجار دەیدا بەیەکێکی ترو دەبێتە قاقای پێکەنینو مەجلیس دەڕازێتەوە، سروشتی ئەو شەرابە وەهایە عەقڵ تێك ناداو ئەو کەسەی دەیخواتەوە قسەی پڕوپوچو قسەی تاوان ناکا، وەکوو مەیخۆرەکانی دونیا لێیان رودەدا. ئیبنوقوتەیبە لەمانای ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەو شەرابە عەقڵیان نابا تا قسەی پڕوپوچ بکەن، شتێك ناڵێن تاوانی تێدا بێ.

﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَكْنُونٌ﴾ بەمەبەستی خزمەتکردنی بەهەشتییەکان چەند غیلمانو تازەلاو بەپیاڵە مەیەوە بەسەریاندا دەگەڕێنو خزمەتیان دەکەن، ئەوەندە جوانجاكو قۆزن دەڵێی مرواری ناو سەدەفن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ.بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ﴾ (الواقعة).

پاش ئەو پیاڵە لێك وەرگرتنو یاریو پێکەنینە ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ بەهەشتییەکان رودەکەنە یەکتریو پرسیار لەسەرگورشتەی یەکتر دەکەن، ئەمیان لەو دەپرسێ ئەرێ لەژیانی دنیادا وەزعو حاڵت چۆن بووەو چۆنت

ژیان به‌سه‌ر بردوه‌؟ ئه‌ویان له‌م ده‌پرسێ ئه‌دی تۆ چیت کردوه هه‌ڵس‌وکه‌وتت چۆن بووه‌؟ ﴿قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ. فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ﴾ وڵام ده‌ده‌نه‌وه‌و ده‌ڵێن: ئێمه له‌دونیادا ته‌قواکارو له‌خوداترس بووین، ترسی عه‌زابی خودامان هه‌بوو، خۆمان له بێفه‌رمانیی خودا ده‌پاراست. ئیتر خودا به‌فه‌ضڵ‌و گه‌وره‌یی خۆی لێخۆشبون‌و ره‌حمه‌تی خۆی به‌سه‌ردا رشتوین‌و هیدایه‌تی داوین بۆ ئه‌نجامدانی کرده‌وه‌ی چاك، له‌عه‌زابی سه‌خت‌و دژواری دۆزه‌خ رزگاری کردوین‌و ئه‌م نازو نیعمه‌ته‌ی پێ به‌خشیوین.

﴿إِنَّا كُنَّا مِنْ قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ﴾ ئێمه له‌دونیادا خوداناس‌و یه‌کتاپه‌رست بووین، بۆ هه‌موو کارێك هاوارمان ده‌کرده قاپی ره‌حمه‌تی‌و هانامان بۆ ده‌بردو لێی ده‌پاڕاینه‌وه؛ که لێخۆشبون‌و ره‌حمه‌تی خۆیمان به‌سه‌ردا برێژێ. دوعای قبوڵ کردین‌و مه‌رامی به‌جێ هێناین، بێگومان خودا له‌گه‌ڵ به‌نده‌کانی دا زۆر چاکه‌کارو میهره‌بانه. ره‌حمه‌ت‌و ئیحسانی ده‌ریای بێبنه‌و به‌شی هه‌موو که‌س ده‌کا.

## فه‌رمانکردن به‌پێغه‌مبه‌ر: که به‌رده‌وام بێ له‌سه‌ر بانگه‌وازیی‌و گه‌یاندنی په‌یامی پیرۆزیی

﴿فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ ۚ أَمْ هُمْ

قَوۡمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمۡ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥۚ بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلۡيَأۡتُواْ بِحَدِيثٖ مِّثۡلِهِۦٓ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار سوێندی خوارد: کە عەزابی قیامەت دێ‌و گومانی تێدا نیە، حاڵ‌و وەزعی بێ بڕوایان‌و بڕوادارانی بەیان کرد، ئەمجار فەرمان دەکا بەپێغەمبەر(ﷺ) کە لەئامۆژگاریکردنی خۆی دوا نەکەوێ‌و ئەرکی سەرشانی خۆی پاشگوێ نەخا، گوێ نەدا بەوانەی کە پەیامەکەی رەت دەکەنەوە هەروەها ئەو قسەو بوختانانەی کافرەکان بەپێغەمبەریان دەکرد هەمووی رەتکردنەوەو فەرموی: ﴿فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ بەردەوام بەلەسەر کاری خۆت، ئامۆژگاریی خۆت بکەو پشتت سارد نەبێتەوە. ئەوەی بۆ تۆی هەڵدەبەستن پوچ‌و بێبناغەیە، ئەتۆ لەسایەی رەحمەتی خوداوە نە فاڵچی‌و نە شێتی. ئەتۆ پێغەمبەرو فروستادەی پەروەردگاری هەرچی دەیڵێی‌و هەرچی ئەنجامی دەدەی لەروانگەی سروشەوەیە. بەپێی نیگای ئاسمانی هەڵس‌وکەوت دەکەی. فاڵچی هەرچی دەیڵێ گۆترە کارییەو هیچ بنەمایەکی راستیی نیە، شێتیش هەرچی عەقڵ‌و زیریی بێ نیەتی. وەڵێ تۆ بەئیعتیرافی هەموو قورەیشیەکان زیرو تێگەیشتوی‌و ئەمین‌و دەستپاکی. راستگۆو رەوشت جوانی. لەلایەکی ترەوە شێتی‌و فاڵچییەتی زۆر لەیەکەوە دورن، چونکە فاڵچی ئەو کەسەیە لەسەرو سیماو قسەو گوفتاری ئەو کەسانەی فاڵیان بۆ دەگرنەوە زانیاری خۆی دەردەهێنێ‌و بلاوی دەکاتەوە. دەی خۆ ئەمە پێویستی بەجۆرە زیرەکی‌و لێهاتوویەك هەیە زیری‌و بیرێکی تایبەتی دەوێ. شێتیش ئەمانەی هیچ تێدا نین. کەوابێ قسەکانیان دژ بەیەکن.

ئەمجار پەروەردگار رەخنە لەوتەیەکی تری کافرەکان دەگرێ‌و رەتی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ﴾ بەڵکوو ئەوان

دەڵێن: موحەممەد شاعیرێکە وەکوو نابغەو زوهەیرو هاووێنەکانیان، چاوەڕوانی مردنی دەکەینو رۆژگار لەناوی دەبا وەکوو چۆن شاعیرەکانی پێشوو مردوون، ئیتر لەکۆڵمان دەبێتەوەو رزگارمان دەبێ لەدەستیی!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە هەڕەشەیان لێ بکا دەفەرموێ: ﴿قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُتَرَبِّصِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: چاوەڕوانی مردنی من بن، منیش لەگەڵتان دا چاوەڕوانی سەرەنجامم بزانم قەزاو قەدەری خودا چیتان لێ دەکا، لەوە بەولاوە بۆتان دەردەکەوێ سەرکەوتن بۆ کێ دەبێ. من دڵنیام خودا پشتیوانمەو یارمەتیم دەدا.

﴿أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَٰذَا﴾ ئایا ئەوان نامەیەکی ئاسمانییان بۆ سەر نازڵ بووە پشتگیریی بۆچونەکەیان بکا؟ یان عەقڵو ئاوەزیان فەرمانی ئەوەیان پێ دەکا: یان ئەو قسە پڕوپوچانە بڵاو بکەنەوە: کە هیچیان بەسەر هیچەوە نیە. دەمێك دەڵێن قورئان سیحرەو موحەممەد ساحیرە، چەلێك یەژن قورئان شیعرەو موحەممەد شاعیرە، کاتێکیش دەڵێن: موحەممەد شێتو وێتە، یان فاڵچیو کوڵەوەنانییە. دەی ئەم قسانە هیچیان بەسەر هیچەوە نیەو بێ سەروبەرن.

﴿أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾ بەڵکوو ئەوانە گەلو نەتەوەیەکی یاخی بوو سەرکێشن، دڵ رەقو نەفامن بۆیە ئەم بوختانانە بۆ پێغەمبەر هەڵدەبەستن، ئەم رەوشتە ناشیرینانەی پاڵ دەدەن.

﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ ئایا دەڵێن: فاڵچی یان شایەرە، یان دەڵێن موحەممەد بۆ خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووەو دانراوی خۆیەتی. نەخەیر وانیەو سەریان دای لەبەرد، بەڵکوو کوفرو بێدینیان، بڕوا نەبوونیان بەپەیامی ئیسلام، وای لێ کردون ئەم قسەو قسەڵۆکانە هەڵبەستن ئەو جۆرە بوختانانە بەپێغەمبەر بکەن.

﴿فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِثْلِهِ إِنْ كَانُوا صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئەوان راست دەکەن موحەممەد بۆ خۆی قورئانی هەڵبەستووە، دەی با ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە نمونەیەکی ئەم قورئانە بێنن، خۆ ئەوان شۆڕەسواری بەلاغەتو فەصاحەتن، لەبواری شیعرو پەخشاندا شارەزاو تێگەیشتون.

بەڵام با دڵنیابن ئەگەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی بەئامادەمیزادو جندۆکەوە کۆ ببنەوە ناتوانن کەلامێکی ئاوا رەوان دابنێن، بەڵکوو ناتوانن دە سورەت تەنانەت سورەتێکیش دابنێن!

## بەڵگەی جۆراوجۆر لەبونەوەرو لەنەفسی ئینسان لەسەر هەبوونی خوداو تاکو تەنهایی زاتی پاکی

﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ (٣٥) أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ (٣٦) أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ (٣٧) أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ (٣٨) أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ (٣٩) أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ (٤٠) أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ (٤١) أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ (٤٢) أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٤٣) ﴾

لەوەپێش پەروەردگار رەدی بیرو بۆچونی کافرەکانی دایەوە، ئەو بوختانو قسەلۆکانەی: کە دەیانگوت: موحەممەد (شاعیرە، ساحیرە، فاڵچی)یە، پوچەڵ کردەوە. ئەمجار لێرەدا بەڵگە لەبوونەوەرو نەفسی ئادەمیزادەکان هەڵدەستێنێ لەسەر هەبوونی خوداو تاكوتەنهایی زاتی پاكیو راستیی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ)، دەفەرموێ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾ ئایا ئەو کافرو بێ بڕوایانە: کە ئینکاری هەبوونی خودای بەدیهێنەر دەکەن، خۆیان بەبێ بەدیهێنەر هاتوونە کایەوە؟ یان خۆیان خۆیانیان دروستکردوە؟ بێگومان بەشایەتی عەقڵو واقیعی حاڵو بەگفتی خۆشیان بەدیهێنەر هەر خودایەو خودا لەنەبونەوەوە ئەوانی هێناوەتە وجود.

﴿أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَلْ لَا يُوقِنُونَ﴾ ئایا ئەوان ئەم ئاسمانەو زەوییان دروست کردووە؟ ئەوان لەواقیعدا ناتوانن لافی ئەوە لێ بدەن، هەرچەندە لەم بارەوە پرسیاریان لێ کرابێ، دانیان ناوە بەوەدا: کە خودا بەدیهێناون وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ (لقمان:٢٥). بەڵام ئەوان بڕوایان بەتاكوتەنهایی خودا نیە، کە دەڵێن: خودا بەدیهێنەریانە لەدڵەوە نایڵێن. لەناچاریە بڕوا نەبوونی راستەقینەیان بەوە: کە خودا بەدیهێناون، هەڵیناون کە پەیامی ئیسلام رەت بکەنەوە، هاوەڵ بۆ خودا دابنێن، حەزرەتی موحەممەد بەپێغەمبەر نەزانن. ئەگینا ئەگەر لەواقیعو حەقیقەتدا یەقینیان بەوە هەبوایە: کە بەدیهێنەری خۆیانو ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تێیاندایە؛ خودایە، پشتیان لەعیبادەتی هەڵنەدەکردو پێغەمبەریان بەدرۆ نەدەخستەوە. بتپەرستییان نەدەکرد

﴿أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ﴾ ئایا ئەوان خاوەنی خەزینەکانی رەحمەتی خودای تۆن، دابەشکردنی رزقو رۆزییو پێغەمبەرێتی ببەخشن بەهەرکەسێك خۆیان بیانەوێو بیگرنەوە لەوانەی نایانەوێن. رزقو رۆزی بدەن بەمو بیگرنەوە لەو؟

﴿أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ﴾ یان ئەوان بالادەستن بەسەر بونەوەرداو دەتوانن بەویستی خۆیان ئاسمانەکانو زەوی هەڵسوڕێننو تەصەروفیان تێدا بکەن؟ واتە: نەخەیر ئەمانە هیچیان بەدەس ئەوان نین، هەموو شتێك بەدەست پەروەردگارە.

ئەمجار پلەیەکی تر دەیانهێنێتە خوارێو پرسیاریان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ ئایا ئەوان پەیژەو پلیکانیان هەیە پێ یدا سەربکەون بۆ ئاسمانو گوێ بگرن لەئاخاوتنی فریشتەکانو ئەو سروشەی بۆیان دێو ئاگادارن بەسەر زانیاریی غەیبدا؟ بۆیە لەهەڵوێستی خۆیان لانادەنو سورن لەسەر کوفر. دەی کەوایە با ئەو کەسەی سەردەکەوێ بۆ ئاسمانەکانو دەنگوباسی عالەمی بالا وەردەگرێ با لەگەڵ بەڵگەی رۆشندا بیخاتەڕو قسەکانی خۆی پێ بچەسپێنێ.

بە کورتی موحەممەد: کە دەڵێ پێغەمبەرمو ئەم قورئانەم بەنیگا بۆ هاتووە، کافرەکانی قوڕەیش بەدرۆی دەخەنەوە، ئایا ئەوانە هیچ بەڵگەو زانیارییەکی تریان لا هەیە: کە زانیاری پێغەمبەر بەدرۆ بخاتەوە! ئایا ئەو زانیارییەی ئەوان گڕو تینێکی وای تێدایە سەرو دڵو دەرون داگیر بکاو ئادەمیزاد ناچار بکا بڕوایان پێ بکا، وەك ئەو تینو تەوژمەی لەقورئانی نازڵ کراو بۆ سەر موحەممەدا هەیە؟

ئەمجار رەدی ئەوانە دەداتەوە: کە دەڵێن : فریشتە کچی خودان، گاڵتە بەعقڵو هۆشیان دەکا: کە کچ بۆ خوداو کوڕ بۆ خۆیان دادەنێن دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ﴾ ئایا ئێوە کچ بۆ خودا دادەنێنو کوڕ بۆ خۆتان قۆرخ دەکەن. لەکاتێکدا کە خۆتان ناتانەوێ کچتان ببێ، کە بەیەکێکتان دەوترێ: کچت بوو رەنگی رەش دادەگیرێ، واتە هیچ شەرم ناکەن بەشە باشەکە بۆ خۆیانو بەشە خراپەکە بۆ خودا دادەنێن! ئەمە هەڕەشەیەکی توندوتیژە لەو کافرە نەفامانە. کەوابێ کەسێك ئەمە راو بۆچونی بێ لێی بەدوور ناگیرێ کە ئینکاری زیندوبونەوە بکا! لەهەمان کاتدا ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە ئەمانە ئەوە بیروباوەڕیان بێ

هەرگیز بە خاوەن عەقڵو فام دانانرێن چ جای ئەوەیان لێ بوەشێتەوە دەستیان بگاتە ئاسمانو بتوانن سروش وەربگرن.

﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْراً فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلُونَ﴾ ئایا تۆ ئەی پێغەمبەر لەپێناوی بانگەوازیکردنت بۆ موسوڵمان بونی ئەو بتپەرستانە داوای کرێیان لێ دەکەیو ئیتر ئەوان لەبەر گرانیی باری غەرامەو ئەو کرێیەی کە داوایان لێ دەکەی ناتوانن موسوڵمان ببن، نەخەیر هەرگیز شتی وا نیەو نەتۆ هیچ داوایەکیان لەو بارەوە لێ ناکەی!

﴿أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ﴾ یان ئەوان زانیاری غەیبیان لایەو هەرچی لە لەوحولمەحفوظدا نووسراوە ئەوان بەسەریا ئاگادارنو دەینوسنەوەو رای دەگەیەنن بەناو مەردومدا بڵاوی دەکەنەوە، هەرچی تۆیش بیڵێی ئەوان بەپوچی ئەزانن؟! نەخەیر ئەمە هیچی وا نییە، جگە لەخودا کەس عیلمی غەیب نازانێ! ﴿أَمْ يُرِيدُونَ كَيْداً﴾ بەڵکوو ئەو کافرانە دەیانەوێ فێڵ لەپێغەمبەر بکەنو پیلانی کوشتنو لەناوبردنی بۆ دارێژن، وەکوو ئەوە: کە لە(دار الندوة)دا هەموو سەرانی قورەیش کۆ بونەوە بریاریان دا پێغەمبەر بکوژن ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ﴾ ئەوانی کافرو بێبڕوان هەر ئەوان فێڵ لێ کراونو زەرەری فێڵەکەیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە. واتە ئێوە ئەگەر ئیدیعای زانینی غەیب دەکەن، ئەوە درۆ دەکەنو جگە لەخودا کەس غەیب نازانێ، خۆ ئەگەر پێتان وایە دەتوانن بەسەر پێغەمبەردا زاڵ ببن، ئەوە بێگومان ئێوە بەهەڵە چون چونکە خودا یارمەتی دەرو پشتیوانیەتیو بەسەر ئێوەدا زاڵی دەکا. خۆ ئەگەر بەتەمابن فێڵی لێ بکەنو لەناوی بەرن ئەوە دڵنیا بن زیانی فێڵەکە خۆتان دەگرێتەوەو خۆتان لەناو دەچن.

﴿أَمْ لَهُمْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ئایا ئەو بێباوەڕانە جگە لەخودای تاکوتەنیا خودایەکی تریان هەیە لەسزای خودا بیانپارێزێ، خودا پاکو مونەززەهە لەهەموو عەیبو هاوبەشێك کە بۆی پەیدا بکەن. خودا تاکو تەنهاو

بێ هاوەڵو بێ نەظیره بێ وێنەو ئەمثالە، بەرزو پیرۆزو شکۆمەندە، بالادەستو بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەرە، پەروەردگارو خاوەنی بونەوەرە.

## روو وەرگێران لەکافرەکان، چونکە ئینکاری مەحسوسات دەکەن

﴿ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ ﴿٤٩﴾ ﴾

لەوەپێش ئەو هەموو بەڵگانەی هێنایەوە، بیروباوەڕی پوچو بێبناغەی موشریکەکانی بەپاشدا بردەوە دەربارەی هەبونی خودای تاکو تەنهاو بالادەستییو زانیاریی بەرفراوانی خودا دوا، بەڵگەی جۆراوجۆری ئاراستە کردن، راستیی پێغەمبەرایەتیو رابوونی قیامەتی بەبەڵگە سەلماند. ئیتر ئەگەر لەروی لاساریو سەهندەییەوە نەبێ حەق وایە بێ سێو دوو ئیمان بێننو لەهەڵوێستی نالەباری خۆیان پەشیمان ببنەوە.

بەڵام ئەوان سورن لەسەر سەرڕەقی خۆیانو بەهیچ کلۆجێ ئیمان ناهێنن، ئەمجار فەرمان بەپێغەمبەرەکەی دەکا: کە رویان لێ وەرگێڕێو لەبەرامبەر تانەو

تەشەرو بوختانو درۆو دەلەسەیان خۆگر بێ، هەواڵی ئەوەشی دەداتێ کە سزای خودا دەیانگرێو لەدونیاو قیامەتدا لێی رزگار نابن، دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَرَوْا كِسْفاً مِنَ السَّمَاءِ سَاقِطاً يَقُولُوا سَحَابٌ مَرْكُومٌ﴾ ئەوانە هێندە لاسارو سەهەندەن، ئەگەر بەچاوی خۆیان ببینن پارچەیەکی گەورەی ئاگراوی لەئاسمانەوە بکەوێتە خوار بۆ سەریان بیانسوتێنێ، بڕوا ناکەنو واز لەکوفرو بێدینی خۆیان ناهێنن، بەڵکوو دەڵێن: ئەوە هەورێکی گەواڵ گەواڵو توێ توێ لەسەر یەك کەڵەکە بووەو بارانمان بۆی دەبارێنێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَاباً مِنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ . لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَسْحُورُونَ﴾ (الحجر: ١٤-١٥) ئەمجار خودا بەپێغەمبەر دەفەرموێ: (فَذَرهم) وازیان لێ بێنە، گوێیان پێ مەدە ﴿حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ﴾ هەتا توشی رۆژێکیان دەبن کە رۆژی قیامەتەو تێیدا بەهیلاك دەچن، سزای تاوانەکانیان لێ دەسەنرێت.

﴿يَوْمَ لا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئاً وَلا هُمْ يُنْصَرُونَ﴾ ئەو رۆژە رۆژێکە فرتو فێڵیان دادیان نادا، ئەو پیلانەی دایان رشتووە بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر(ﷺ) سودیان پێ ناگەیەنێ، ئەو عەزابەی دێتە سەریان ناگەڕێتەوە کەس نیە بەهانایانەوە بێو یارمەتیان بدا.

جا وەنەبێ سزای ئەوانە هەر لەقیامەتدا بێو بەس، بەڵکوو ﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَاباً دُونَ ذَلِكَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ بێگومان لەژیانی دونیادا هەیە بۆ ئەوانەی ستەمیان لەخۆیان کردوە بەوە: کە سورن لەسەر کوفرو بتپەرستیو دارشتنی پیلان دژی پێغەمبەر سزای سەختو دژوار: لەکوشتنو نەخۆشیو ترسو هەژاریو بێبارانیو لەناوچونیماڵو سامانو مردنی منداڵو کەسوکار بۆ ئەوەی لەهەڵوێستی خۆیان پەشیمان ببنەوە. وەلێ ئەوانە نازانن چ عەزابێك دێتە سەریانو چۆن لەناو دەچن، کاتێکیش عەزاب یەخەیان دەگرێو تەنگیان پێ

هەڵدەچنێ، ئەگەر خودا بەفەضلی خۆی عەزابیان لەسەر هەڵبگرێ، لەجیاتی ئەوەی سوپاسی خودا بکەنو واز لەهەڵوێستی ناشیرینی خۆیان بێنن دەست دەکەنەوە بەکوفرانی نیعمەتو خراپتر لەجاران کوفرو بێدینی ئەنجام دەدەنو سپڵەیی خۆیان دەنوێنن.

ئەمجار سورەتەکە بەفەرماندان بەپێغەمبەر کۆتایی پێدێنێ فەرمانی پێ دەکا بەوەی: کە خۆڕاگر بێ لەبەرامبەر هەڵوێستی کافرەکانو دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ ئەی پێغەمبەر لەبەرامبەر هەڵوێستی کافرەکان پشوو درێژ بە، گوێ مەدەرە هەڵوێستی ناشیرینیان، تا ئەو کاتەی عەزابی چاوەڕوانکراو یەخەیان دەگرێ، ئەتۆ لەژێر چاودێریی ئێمەدای، پارێزگاریت دەکەین، ناهێڵین کەس دەستدرێژیت بکاتە سەر. تەقدیسو تەنزیهی خودای خۆت بکە، لەهەموو عەیبو خەوشێك بەدووری بگرە، هەرشتێك شیاوی ئەو نەبێ پاڵی مەدە: هەرکاتێك هەڵسای بۆ نوێژ یان لەخەو هەڵسای یان لەکۆڕو مەجلیس هەستای یان لەشوێنیکەوە چوی بۆ جێگەیەکی تر ئەوە تەسبیحی خودای خۆت بکە. واتە: بڵێ: (سبحان الله وبحمده) یان (سبحانك اللهم و بحمدك اشهد ان لا اله الا انت، استغفرك واتوب اليك) لەم بارەوە زۆر ویرد ریوایەت کراون.

﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ بەشەو کاتێك لەخەو رادەبی تەسبیحاتی خودا بکە، عیبادەتی بۆ ئەنجام بدە لەکۆتایی شەودا کە ئەستێرەکان بەرەو ئاوابوون دەچن سەرگەرمی عیبادەتکردن بەچونکە ئەوکاتانە عیبادەتکردن ئەرکێکی قورسەو خەو خۆشەویستە. سازشو ریاکاریی تێدا نیە.

موقاتیل دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ﴾ مەبەست نوێژی شێوانو نوێژی خەوتنانە. ﴿وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ مەبەست نوێژی بەیانییە. ئیمامی رازی دەفەرموێ: واپێدەچێ مەبەست لەرستەی ﴿وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ نوێژی کاتی بەیانی بێ چونکە ئەو

کاتــە ئەســتێرەکان بــەرەو ئــاوابون دەچــنو بــەهۆی رونــاکی خــۆرەوە روناکیــان کزدەبێو نامێنێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی النجم

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (الـنجم) چونکە لەسـەرەتای سـورەتەکە خـودا سوێندی پێ خواردوە، فەرمویەتی: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى﴾ سـوێند بەئەسـتێرە کـاتێ ئاوا دەبێ.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشووەوە لەچەند رویەکەوەیە:**

١- کۆتایی سورەتی پێشوی بەرستەی ﴿وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ هینـا، سـەرەتای ئـەم سورەتەش بەوشەی (والنجم) دەست پێکرد.

٢- لە سورەتی پێشوودا ئەوەی باسکرد: کـە کافرەکـان بوختـانی ئـەوە دەکـەن موحەممـەد خـۆی قورئـانی هەڵبەسـتبێ. لەسـەرەتای ئـەم سـورەتەش بەجەختـەوە رەدی ئەوەی دایەوە.

٣- لە سورەتی پێشوودا دەربارەی باوكو دایکی موسوڵمان فـەرمووی: منـداڵو وەچـەکانیان پـێ دەگەیەنینـەوە بـۆ ئـەوەی زیـاتر خۆشـنوودیو کامـەرانیان بـۆ دەسەبەر ببێ.

لـەم سـورەتەشدا دەربـارەی کـافرو منـداڵی گـەورەیان فـەرموی: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ ئەم سورەتە وەکوو باقی سورەتە مەککییەکانی تر گرنگـی دەدا بەسـەلماندنو چەسـپاندنی بنـەماکانی عەقیـدە. لەتـەوەرەی باسـی یەکتاپەرسـتیو راسـتیی پێغەمبەرایـەتییو رابـوونی قیامــەتدا دەسـوڕێتەوە. بـاس لەچـۆنیەتی نازڵبوونی نیگا بـۆ پێغەمبـەرو وەرگرتنـی دەکـا، قسە لـەبارەی هیچو پوچی بتـو صەنەم دەکا...

سەرەتا سورەتەکە دیاردەی نیگاو سروش دەسەلمێنێ کە بەهۆی جوبرائیلەوە بۆ پێغەمبەر دێ. ئەمجار باسی میعراجی پێغەمبەرو نزیکبونەوەی لەپەروەردگار دەکا. ئاماژە بەوە دەکا: کە پێغەمبەر(ﷺ) لە شەوی میعراجدا جوبرائیلی لەسەر شێوەی خۆی بینیوە، لە مەلەکوتی ئاسمانەکان شتی عەجایب‌و سەرسوڕهێنەری دیوە، ئەمجار هێرش دەکاتە سەر بتپەرستەکان لەسەر ئەوەی: کە داروبەرد دەپەرستن، فریشتە بەکچی خودا لەقەڵەم دەدەن. دوایی دێتە سەر باسکردنی عەداڵەتکاریی پەروەردگارو ئاماژە بەوە دەکا: کە سزاو پاداش بەگوێرەی کردەوەی ئادەمیزادەکان خۆیانەو ئەوە دەسەلمێنێ: کە هەموو کەس بەرپرسیارەو هەموو کەس پرسیاری لێ دەکرێ. کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ‌و کەس لەسەر کەس سزا نادرێ.

ئەمجار باسی رەهایی تواناو زانیاری پەروەردگار دەکاو ئەوە رادەگەیەنێ: کە هەر خودا خاوەنی بونەوەرەو مردن‌و ژیان، سامانداریی‌و هەژاریی، لەشساغی‌و نەخۆشیی، .... هتد هەمووی بەدەست خودایە.

## راستیی پێغەمبەرایەتی‌و دیاردەی سروشت

﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ

أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾

دەفـەرموێ: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ سوێند بەئەستێرە كاتێ بـەرەو ئـاوابوون دەچێ. چـونكە بـەهۆی جـوڵان‌و كـشان بـەرەو ئاسـۆی ئـاوابوون، باشـورو بـاكورو رۆژهەڵات‌و خۆرئاوا دەزاندرێ. ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ﴾ هاوڕێكەتان: كـە موحەممەدە، لەرێی حەق‌و راست لای نەداوە، گومڕا نەبووە، قسەی بەتاڵ‌و بێبناغـە ناڵێ ؛ ئەو موحەممەدەی لەخۆتانەو لەمناڵییەوە لەناوتاندایەو تا ئێستا درۆتـان لـێ نەبیستووە، هەر لەمنداڵییەوە دەستپاك‌و راستگۆو عاقڵ‌و زیـر بـووە، رۆژ دوای رۆژ ئـەم رەوشـتانەی زیـاتر تێـدا بەرجەسـتە بـوون‌و لەهەڵس‌وكـەوتی دا رەنگیـان داوەتەوە. ئەدی چۆن ئێستا درۆتان لەگەڵ دەكا؟! نەخـەیر هـەرگیزاو هـەرگیز ئـەو بـیرو بۆچـونانەتان راسـت نـین، زۆر لەواقیعـەوە دوورن. پـەروەردگار ؛ كـە سـوێند بەئەسـتێرە دەخـوا، ئامـاژە بـەوە دەكا: كـە عالـەمی ئەسـتێرە عالـەمێكی گـەورەو بـەرفراوان‌و سەرسـوڕهێنەرە، چ لـەبارەی قـەبارەو زەبەللاحییانـەوە، چ لـەبارەی تیژڕەوی‌و جم‌وجوڵی خۆیان‌و تیژرەوی روناكییەكەیانەوە. وەكوو زانایانی فەلەك‌و ئاسمـان شوناسـی دەبێـژن خێرایـی نـوری ئەسـتێرە سێـسەد هـەزار كیلۆمـەترە لەچركەیەكدا . واتە : روناكی ئەستێرە لەحەوتیەكە چركەیەكدا جارێك بەدەوری زەوی دا دەسـوڕێتەوە. خـۆر ملیۆنێـك‌و سێـسەد هـەزار جـار لـەزەوی گـەورەترە. لەكاتێكدا خۆر بۆ خۆی یەكێكە لەسی هەزار ملیۆن خۆر، كۆمەڵەی خۆری‌و یـازدە

ئەستێرە گەڕۆکەکان بەشێکن لەعالەمی (مەجەرە) مەجەرەش سێ هەزار ئەستێرەی لەخۆ گرتوە، ئەستێرەی وایان تێدایە لەخۆر گەورەتر. ئەو مەجەرەی کە خۆر سەر بەئەوە قوطرەکەی سەد هەزار ساڵی تیشکییە ساڵی تیشکیش بەشەش ملیۆن میل مەزەندە دەکرێ. هەبوونو پاڵەپەستۆی هێزی کێشندەی نێوان مەجەرەکان بەرادەیەکی زۆر لەغازو مەوادی تر، بۆشاییە رەشاییەکانی ناو مەجەرەکان دەکەنە تیر ئەستێرەی ئاگراوی (شهاب مشتعلة) ئەمەش بەدەگمەنو لەماوەی ملیۆنەها ساڵدا جارێك رودەدا.

تیرە ئەستێرە دەشوبهێتە ئەستێرە، وەلێ تیشکی موگناتیسیی زۆرترە لەهی ئەستێرەی ئاسایی. دووری تیرەئەستێرە لەزەوی بەدەها هەزار ملیۆن ساڵی تیشکیی مەزندە دەکرێ.

وەکوو دەزاندرێ خۆر لەماوەی ساڵدا لەدوانزە کەلوو (برج)دا جێگۆڕکێ دەکا، لەهەموو بورجێك مانگێك دەمێنێتەوە، بەدوانزە مانگ واتە: (٣٦٥) رۆژو شەش سەعاتو (٩) دەقیقەو (دە) ثانیەدا دەورەی خۆی تەواو دەکا. بەمە دەگوترێ ساڵی خۆرییو لەرۆژی (٢١)ی ئازار دەست پێ دەکا.

مانگیش کەلو (برج)ی هەن پێیان دەگوترێ: مەنزڵ، مانگ هەر رۆژە لەمەنزڵێکدا دەبێ، لەمانگێکدا (٢٩) یان(٣٠) مەنزڵ دەبینێ، دوا مەنزڵ پێی دەگوترێ: مەحاق.

**لەدەوری تۆیە ئەی خۆرشیدی پڕتەو بەخشی شەو گەردان**
**کە نالی وا لەحالاتی مەحاقی ماهی ئەودایە**
**(نالی)**

لە ئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەو مانایـە دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿هُـوَ الَّـذِي جَعَـلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَـا خَلَـقَ اللَّـهُ ذَلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (يونس:٥) .

لەبـەر گرنگـی ئەسـتێرەکان پـەروەردگار سـوێند بەئەسـتێرە دەخـوا لەسـەر ئـەوە: کـە موحەممـەد گومڕا نیـە سـەری لـێ تێـك نەچووەو لەحـەق لای نـەداوە. چونکە موحەممەد پێغەمبەرەو لەخوداوە سروشی بـۆ دەنێـردرێ ﴿وَمَـا يَنْطِـقُ عَـنِ الْهَوَى. إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ موحەممەد بەهەواو هەوەس‌و لەخۆوە قسە ناکا، بـۆ مەبەسـتی تایبــەتی خـۆی بانگـەوازیی بـلاو ناکاتــەوە، راگەیانــدنی قورئــان بــۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی ئەنجام نادا، ئـەوەی رای دەگەیـەنێ سروشـی خودایـەو بـۆی نێـردراوەو فـەرمانی پێکـراوە ئـەنجامی بـدا، ئەرکێکـەو خراوەتـە سـەر شـانی. هەرچی دەیڵێ: حەقەو راستەو لەخوداوەیە. ئیمام ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبنو ئەبی شـەیبە لەعەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەرەوە ریوایـەت دەکـەن دەفـەرموێ: هـەر شـتێکم لەپێغەمبـەر دەبیـست خێـرا دەمنووسـی، بـۆ ئـەوەی لەبـەری بکـەم، قوڕەیـشیەکان نــەیان لــێ دەکــردم، وتیــان: ئــەتۆ هەرچــی لەپێغەمبــەری دەبیــسی دەینووســی، پێغەمبەریش ئادەمیزادێکە جاری وا هەیە بەتوڕەییەوە قسە دەکا، ئـیتر وازم لـەو کارە هێنا، پاشان ئەم رووداوەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد فەرمووی: (اکتب فـو الـذی نفسی بیده ما خرج منی الا الحق) بنوسە سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەرچــی وتومــەو دەیڵــێم حەقــە لەحــەق بــەولاوە هیــچم نــەگوتووە. ئــەمجار پـەروەردگار باسـی مامۆسـتای پێغەمبـەر(ﷺ) دەکـا: کـە جوبرائیلـەو بەرپرسـیاری هێنانی سروشە لەخوداوە بۆ ئەو. دەفەرموێ: ﴿عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى﴾ قورئانی فێـری پێغەمبەر کردوە فریشتەیەکی خاوەن هێزو توانا لـەزانیاریی‌و کارکردنـدا، ئـەویش جوبرائیلە، هەرچی خودا فەرمانی پـێ بکـا ئـەنجامی دەداو هیـچی لـێ یـاخی نابـێ. هەرچی ئەنجامیـشی دەدا بەفـەرمانی خودایـەو لەخوداوەیـە، ﴿ذُو مِـرَّةٍ فَاسْـتَوَى﴾

خـاوەنی ژیـری‌و بیروبـڕوای بـەرزە، ئـەو سروشـەی لـەخوداوە وەری دەگـرێ بەئەمانەتەوە دەیگەیەنێ بەپێغەمبەرو هیچی لـەبیر ناچێتەوە، جوبرائیـل لەسـەر شێوەی تایبەتی خۆی وێستاو پێغەمبەر بینی!

ئەوە بوو پێغەمبەر زۆر حـەزی دەکـرد کـە فریـشتەی سـروش لەسـەر شکڵ‌و وێنەی تایبەتی خـۆی ببینـێ، بـەدڵ لـەخودا دەپاڕایـەوە: کـە بـەو شـێوە تایبەتییـە جارێـک نیـشانی بـدا، خـودا داواکـەی گـیرا کـرد دوا ئـەو ماوەیـەی کـە سـروش لەپێغەمبەر بڕا جوبرائیل بەشێوەی فریشتەیی خۆیەوە هاتە خوارێ بۆ لای راست وێستاو لەئاسۆی بەرزەوە خـۆی نیشانی پێغەمبـەر(ﷺ)دا کـە ئاسـۆی خـۆرە، کـەمێ لەئاسۆکە بەرزتر بوو، هەموو ئاسۆکەی پڕکردا ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَـدَلَّى﴾ پاشـان جوبرائیـل وردە وردە دابـەزی‌و لەپێغەمبـەر نزیـک کەوتـەوە، بەسروشـەوە هاتـە خزمـەتی، کەمکەم دابەزی‌و لەپێغەمبەر(ﷺ) نزیك بووەوە تا وای لێ هـات ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى﴾ مەسافەی نێوان پێغەمبەر(ﷺ)و جوبرائیل دیاریی دەکا بەئەنـدازەی دوو کەوان یان کەمتر لەدوو کەوان بوو.

عەرەبـەکان داب‌و نـەریتیان وابـوو مەسـافەی نزیکیـان بەکـەوانێ: یـان دوو کەوان یان بـەرمێك مەزنـدە دەکـرد. وەکوو چـۆن ئێمـەی کـورد ئـەو جـۆرە شـتانە بەبست‌و بەهەنگاوو بـەگوریس مەزنـدە دەکـەین. مەبەسـت ئەوەیـە زۆری لێ نزیـك بووە.

جا: کە حەزرەتی جوبرائیل وا لەپێغەمبەر(ﷺ) نزیك کەوتەوە ﴿فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى﴾ ئیتر خودا بەهۆی ئەو فریشتەوە سروشی کرد بۆ بەندەی خۆی: کە موحەممەدە- بەو سروشەی بۆی کـرد: کـە قورئـانی پـیرۆزە، کاروبـاری ئـایینی فێـر کرد. دەشتوانین بەم جۆرە مانای بکەین بڵێین: ئیتر جوبرائیـل سروشـی بەبەنـدەی خودا کە حەزرەتی موحەممەدە راگەیاند، ئەو سروشەی بۆی هێنابوو فێری کرد.

ئەم بینینەی پێغەمبەر بۆ جوبرائیل لەسەر شێوەی فریشتەیی خۆی لەسەر زەوی بووە، جارێکی تریش لەلای درەختی (سدرة المنتهی) بەو شێوە تایبەتییە بینیویەتی.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جوبرائیلم لەسەر شێوەی خۆی بینی شەشسەد باڵی هەبوو!!

بەڵێ: ئەم بینینە بینینێکی نزیکی بوو، بینینی فێرکردنو سرووش پێراگەیاندنبوو، بینین بوو بەچاوی سەرو ناسین بوو بەچاوی دڵ، بینینێکی بێ پەردە بوو، بینینی موشاهەدەو یەقین بوو.

﴿مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى، أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى﴾ (النجم/١١-١٢) دڵی پێغەمبەر ئەوەی بەچاوی سەر لەپەردەی غەیبا بینی رەتی نەکردەوە، بەڵکوو بەراستی زانیو بڕوای پێکرد. ئەدی چۆن ئێوە دەمەدەمێ لەگەڵ دەکەنو بەدرۆی دەخەنەوە لەشتێکدا؛ کە بەچاوی خۆی لەنزیکەوە بینیویەتیو دڵیشی بەراستی زانیوە. بەئەوهاەو خەیاڵی حسێب نەکرد، نەیگوت: ئەوە شەیتانە یان جندۆکەیە!!

لەلایەکی ترەوە ئەم بینینەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جوبرائیل یەکەمجار نەبوو بەڵکوو جارێکی تریش هەر لەسەر شێوەی فریشتەیی خۆی جوبرائیلی بینیوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى﴾ بێگومان جارێکی تر پێغەمبەر(ﷺ) لەشەوی میعراجدا جوبرائیلی لەسەر شێوەی فریشتەیی خۆی بینی ﴿عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى﴾ لەلای درەختی (سدرة): کە لەئاسمانی حەوتەمدایە، یان لەئاسمانی شەشەمە.

هەرچی زانیاریو گوفتارو کرداری مەخلوقات هەیە تا ئەوێ دەڕواو سەردەکەوێ. واتە کردەوەی بەندەکان بەئادەمیزادو فریشتەوە تا ئەوێ بڕ دەکاتو

ئیتر دەوەستێ، لەوێ بەولاوە نەکەس دەیزانێ چیەو نەکەس دەیگاتێ. لەشەوی میعراجدا جوبرائیل لەگەڵ پێغەمبەردا بەرز بۆوە تا گەیشتە درەختی (سدرة المنتهی) ئیتر لەوێ وێستاو جێما، پێغەمبەر(ﷺ) بەتەنها ماوەیەکی تر رۆیی تا نزیک بووە لەبارەگای پەروەردگار ، ئەمانە هەموو غەیبن و خودا نیشانی پێغەمبەریدا، ئێمە هیچی لێ نازانین.

﴿عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى﴾ ئەو بەهەشتەی ئارامگای خوداپەرستانە لەنزیک درەختی (سدرة)وەیە. ئێمە دەبێ بڕوامان بەدرەختی (سدرة المنتهی) هەبێ بەو شێوەیەی قورئان باسی دەکا، بەبێ ئەوەی شوێنەکەی و چۆنیەتەکەی دیاریی بکەین، مەگەر فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەوە شتێکمان بۆ دیاریی بکا. ئیمام ئەحمەدو موسلیم و تیرمیذی لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: کاتێک شەوڕەوی بەپێغەمبەر(ﷺ) کرا، بەرز کرایەوە تا گەیشتە لای درەختی (سدرة المنتهی) کە لەئاسمانی حەوتەمە، هەرچی لەزەوییەوە بەرز دەبێتەوە تاوێ دەگاو لەوێ وەردەگیرێ، هەرچی لەعالەمی بالآوە دادەبەزێ دەگاتە وێ و لەوێوە وەردەگیرێ.

لە ریوایەتی صەحیحی موسلیمدا لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەتکراوە کە درەختی (سدرة) لەئاسمانی شەشەمە. لەریوایەتێکی تری موسلیمدا لەئەنەسەوە ریوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: کاتێک بەرزکرامەوە بۆلای درەختی (سدرة) کە لەئاسمانی حەتەمە میوەکەییم دی هێندەی کوپەی وڵاتی هەجەر دەبوون، گەڵاکانی وەکوو گوێچکەی فیل وەهابوو.

﴿إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى﴾ ئەوکاتەی سیدرەی داپۆشی ئەوەی داپۆشی، واتە ئەوەی سیدرەی داپۆشی لەنوری تەجەللاو داباریىنی فریشتە بەسەریا؛ کە هەر وەصف و باسی ناکرێ، هەر خودا دەزانێ چۆن و چەندە. بەکورتی زمان کۆڵەو ناتوانێ باسی گەورەیی و زۆری ئەو شتە بکا کە بەسەر سیدرەدا هات.

﴿مَـا زَاغَ الْبَـصَرُ وَمَـا طَغَـى﴾ چاوی پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەملاو ئـەولای نـەكرد، لەوەی: كە فەرمانی پێ درابوو سەیری بكا لای نەدا، لەو شـەوە پـیرۆزەداو لەودەمـە حەسساس‌و ناسك‌و دەگمەنەدا، لەو ساتەدا: كە لەمێژووی ئادەمیزاددا جارێك بووەو دوبارە نەبۆتەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) چاوی سـەرو چاوی دڵـی بڕییـە نـورو مەلـەكوتی پەروەردگارو گەلێ نیشانەی بینین: كە یەكێكیان وێنەی فریشتەیی جوبرائیـل بـوو، چاوی نەتروكاندو نەیسوڕاند. موشاهەدەی حـەقیقی‌و ئاشكرا بـوو، شك‌و گومـانی تێدا نەبوو، راستەوخۆ دڵێ پەیوەست بوو بەحەقیقەتـەوە، هـیچ پـەردەو لەمپـەڕی لەنێوان نەما.

﴿لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾ بێگومان پێغەمبەر لەو شەوەدا زۆر ئایـات‌و نیشانەی گەورە گەورەی پـەروەردگاری دی، كـە بـەزمان نایەنـە وەصـف‌و باسـكردن، بینینی رون‌و ئاشكراو بـێ پـەردەو حیجاب. پلـەو پایەیـەك بـوو درا بەپێغەمبـەرو جارێك روی داوەو دوبارە نابێتەوەو ئەوەندەی خودا حەز بكـا ئەسـراری مەلـەكوتی نیشاندرا، نهێنی بوونەوەری بینی.

## هیچ‌و پووچی بیروباوەڕی بتپەرستیی

﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلۡكَ إِذٗا قِسۡمَةٞ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنۡ هِيَ إِلَّآ أَسۡمَآءٞ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهۡوَى ٱلۡأَنفُسُۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّن

رَبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾

لەوەپێش پەروەردگار راستیی پێغەمبەرایەتیو راستی هاتنی نیگاو سروشی بۆ حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) بەبەڵگەوە چەسپاند، ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا: کە پێویستە پێش هەموو شتێك پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازیی بۆ بکا: ئەویش بریتییە لەیەکتاپەرستیو قەڵاچۆکردنی بتپەرستیو رونکردنەوەی ئەوە: کە ئەو بتو صەنەمانە هیچو پوچو بێ کەڵکنو هیچیان لەدەست نایە. ئەدی چۆن عیبادەتیان بۆ دەکەن؟ چۆن پەرستگاو شوێنی پەرستنیان بۆ دادەنێن ؟! کەعبە: کە ماڵی خودایەو ئیبراهیم بۆ خوداپەرستیی تێداکردن بنیاتی ناوە، ئەوان کردویانە بەمەڵبەندی بتپەرستی؟!

دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى. وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى﴾ ئایا ئێوە چۆن روانیوتانە بۆ (لات) کە بتی ثەقیفو (عوزا) کە بتی قورەیشیەکانو (مناة) سێیەم بتە بێ رێزەکە: کە بتی هۆزی هوزەیلو خوزاعەو ئەوسو خەزرەجە ئایا چیتان لێ دیونو چ کەڵکێکیان بەئێوە گەیاندوە؟! کە رێزیان لێ دەگرنو کۆشکیان بەسەرەوە دەکەنو پەردەیان بەسەردا دەدەنو ئاژەڵیان بۆ سەدەبڕن؟

١- (اللات) بەردێکی سپی نەخشێنراو بوو لەطائیف خانوێکیان بەسەرەوە کردبوو، پەردەیەکیان بەسەردا دابوو مجەورو زێوانیان بۆ راگرتبوو، بەدەوری خانوەکەدا حەوشەو باغێکی زۆر تەرخان کرابوو، ئەم بتە لای دانیشتوانی شاری (طائف) کە هۆزی سەقیف بوون، زۆر رێزی لێ دەگیراو عیبادەتی بۆ دەکرا. جگە لەقورەیش شانازییان بەسەر هەموو خێڵە عەرەبەکانی تردا دەکرد. بەوەی کە

خاوەنی ئەم بتە ڕێزدارەن. تەنها قوڕەیشییەکان لەخۆیان باڵاتر دەبینی چونکە خاوەنی (کابە) بوون: کە ئیبراهیم بنیاتی نابوو!

٢- (العزى) درەختێك بوو لەشیوی (النخلة) لەنێوان مەککەو طائیفدا، شوراو دیواری بەدەوردا کرابوو پەردەی بەسەردا درابوو قورەیشییەکان دەیانپەرستو شانازییان پێوە دەکرد، بۆ نمونە ڕۆژی غەزای ئوحود ئەبوسەفیان بەرامبەر موسوڵمانەکان دەیگوت: (لنا العزى ولا عزى لكم) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی وەڵامی بدەنەوە بڵێن: (الله مولانا ولا مولى لكم).

لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بیبڕێ، خالید تەوری بەدەستەوە گرتو لێی دەداو دەیگوت: (یا عز كفرانك لا سبحانك- انى رايت الله قد أهانك).

٣- (مناة) بەردێك بوو لای (قەدید) لەنێوان مەککەو مەدینە، هۆزی هوزەیلو خوزاعەو ئەوسو خەزرەج دەیانپەرست، ئاژەڵی قوربانیو هەدیان لەلا سەردەبڕیو خوێنیان دەڕشت. لەوێوە دەستیان دەکرد بەحەجکردن.

لەنیوە دورگەی عەرەبی دا زۆر لەو بتو صەنەمانە هەبوونو عەرەبەکان دەیانپەرستن وەلێ ئەم سێ بتە لەهەرە گەورەو ڕێزدارەکانیان بوون. وا پێدەچێ ئەم بتانە ڕەمزو نیشانەی فریشتە بوون، کە فریشتە بەلای بتپەرستەکانەوە کچی خودان، بۆیە پەرستشیان بۆ دەکردنو ئەم بتانەش بەمێ دانراون. پاشان ئەم بنەماو ئەصڵە لەبیر چۆتەوەو خودی نیشانەو ڕەمزەکە بووە بەپەرستراو.

ئەمجار دوای بەیانکردنی بێعەقڵی قورەیشییەکانو نەفامیان بەوە: کە داروبەرد دەپەرستن، سەرزەنشتێکی تریان دەکا لەسەر ئەوە: کە فریشتە بەکچی خودا دادەنێنو پەرستشیان بۆ دەکەن، سەیرو سەمەرەیە، بۆ خۆیان پێیان ناخۆشە کچیان هەبێ، ئەگەر یەکێکیان هەواڵی پێ بدرایە: کە کچی بووە ڕەنگی ڕەش هەڵدەگەڕاو خۆی لەخەڵکی دەشاردەوە، نەیدەزانی چۆن ئەم سوکایەتیە لەشانی خۆی داماڵێ . کەچی فریشتەیان بەکچی خودا دەزانینو هەندێکیان پەرستشیان بۆ

دەکردن. بۆ خۆشیان کوڕیان قۆرغ کردبوو. دەفەرموێ: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى﴾ ئایا بۆ ئێوە نێرو بۆ خودا مێینە بێ؟! ئایا ئێوە بەچ عەقڵێك منداڵ بۆ خودا بڕیار دەدەن، ئەمجار کچ بۆ خودا دادەنێن‌و بۆ خۆتان کوڕ هەڵدەبژێرن؟ ﴿تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى﴾ ئەگەر ئێوە لەناو خۆتاندا شت ئاوا بەش بکەن، بەشکردنێکی ستەمکارییەو لەحەق بەدەرە، چ جای لەگەڵ خودادا دابەشکردنی ئاوا بکەن. ئێوە بەشێك بۆ خودا دادەنێن: کە بۆ خۆتان ناتانەوێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا بەشێوەی ئیستیفهامی ئینکاریی دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ﴾ (الطور:٣٩) ئەمجار خودا قسەکانیان بەدواوە دەباتەوەو دەفەرموێ: ئەی هاوبەش پەیداکەرەکان ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ﴾ ئەو بتانەی ناوتان ناون خوداو عیبادەتیان بۆ دەکەن لەکاتێکا ئەو بتانە نە دەبینن نە دەبیستن، نە دەتوانن زیان بگەیەنن نە قازانجیان لێ چاوەڕوان دەکرێ، لەراستی دا ئەو بتانە هەر ئەو ناوانەن ئێوەو باوك‌و باپیرانتان لێتان ناون‌و بەخوداتان داناون‌و پەرستشیان بۆ دەکەن، ئەگینا چ حەقیقەتێکیان نیەو خودا لەو بارەوە هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی نازڵ نەکردوە تا ئێوە بیکەنە بەڵگەو بەخودایان بزانن.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ﴾ (یوسف: ٤٠) کەوابێ ئەم ناوانە (لات)و (عزی)و (مناة)و زۆری تر لەو بابەتە، هەروا ناو بردنیان بەفریشتەو بەپەرستراو، ناوبردنی فریشتە بەمێینەو دانانیان بەکچی خودا، هەمووی ئەمانە ناون‌و ئیسمی بێ (مسمی)ن.

﴿إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ﴾ ئەوانە لەهاوەڵ دانان بۆ خوداو لەبڕیاردانی ئەو بتانە بەخوداو لەهەموو بیروباوەڕێکی تریاندا تەنها شوێن گومان‌و هەوەسبازی خۆیان کەوتوون، هیچ رویان لەحەق نەکردوە ﴿وَلَقَدْ جَاءَهُمْ مِنْ رَبِّهِمُ الْهُدَى﴾ بێگومان ئەوانە لەخوداوە بەڵگەو نیشانەی ئاشکراو عەیانیان بۆ

هاتووه، كه ئەو بتانه خودا نين بەكەڵكی عیبادەت بۆکردن نایەن. ئەوەتا قورئانمان بۆ پێغەمبەر ناردوه لەوێدا رونمان کردۆتەوە: کە ئەو بتانە هیچو پوچن‌و کەڵکی هیچیان نیە، کەچی ئەو نەفامانە رویان لێ وەرگێڕاو پشتیان لێ هەڵکردو بوختانیان بۆ پێغەمبەر کردو بەساحیرو شاعیریان لەقەڵەم دا!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رون دەکاتەوە کە (قضیة)کە بەویست‌و خواستی ئادەمیزاد نیە، ئەو بتانە هیچ سودو قازانجێکیان نیە، هیچیان لەدەست نایە. دەفەرموێ: ﴿أَمْ لِلْإِنْسَانِ مَا تَمَنَّى. فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَى﴾ ئایا هەرچی ئادەمیزاد ئارەزۆی بکاو ئاواتەخوازی بێ دەبێ بۆی بێتەجێ؟!

نەخەیر هەموو شتێك بەویستی ئادەمیزاد نایەتە جێ. ئەوەی تەمەنای دەکەن: کە ئەو بتانە شەفاعەتتان بۆ بکەن‌و سودیان لێ وەرگرن هەرگیز نایەتە دی، دەسەڵاتی دونیاو قیامەت‌و هەموو کارێکی ئایینی‌و دونیایی بەدەست خودایە، هەر ئەو کاروبار هەڵدەسوڕێنێ‌و بت‌و صەنەمەکان هیچیان بەدەست نیە نە لەدونیادا نە لەقیامەتدا: وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ..﴾ (النساء:١٢٣) ئەمجار پەروەردگار بەیەکجاری موشریکەکان ناهومێد دەکا لەوەی بەتەمایني: کە بریتیە لەشەفاعەتکردنی فریشتەو بت‌و صەنەم بۆیان، دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ مِنْ مَلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً إِلَّا مِنْ بَعْدِ أَنْ يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾ زۆر لەفریشتە بەرێزەکان لەئاسمانەکاندا وێڕای عیبادەت‌و پەرستشی زۆرو زەبەندەیان بۆ پەروەردگار رێزو نرخیان لای خودا شەفاعەت بۆ هیچ کەس ناکەن، ئەگەر لەفەرزێکدا بیشیکەن بێ سودە. مەگەر خودا روخصەتیان بداو رازیی بێ: کە شەفاعەت بۆ هەندێ کەس بکەن: کە شیاوی شەفاعەت بۆکردن بن‌و خودا بیەوێ شەفاعەتیان بۆ بکرێ. ئەدی بەچ عەقڵێك ئەو موشریکانە بەتەمای شەفاعەتی ئەو بت‌و صەنەمە لەدارو بەرد تاشراوانەن؟ بەکورتی فریشتە شەفاعەت بۆ کەس ناکەن مەگەر ئیزنیان پێ بدرێ‌و خودا

بیەوێ شەفاعەتیان وەربگیرێ، شەفاعەت بۆ کراوەکانیش لەپێری یەکتاپەرستان بن، کەوابێ بەهیچ جۆرێ موشریکەکان بەشیان لەو شەفاعەتەدا نیە. جا کە ئەوە حاڵی شەفاعەتی فریشتە ڕێزدارەکانی نزیك بارەگای ئەقدەس بێ دەبێ بتێکی بێگیانی داتاشراو لەبەردو دار چ نرخێکی هەبێ؟ بەتەمای چ سودێکی ئەو بت و صەنەمە بێ گیانانە بن؟!

## سەرزەنشتکردنی موشریکەکان چونکە فریشتەیان بەکچی خودا داناون

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار موشریکەکانی سەرزەنشت کرد لەسەر بتپەرستی و ئەوەی ڕونکردەوە: کە ئەو بتانە لەدونیاو قیامەتدا هیچیان لەدەست نایە، جارێکی تر سەرزەنشتیان دەکا لەسەر ئەوە: کە بوختانی ئەوە دەکەن دەڵێن: فریشتە کچی خودان، ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە ئەم ئیدیعایەشیان بەتاڵ و بێبنج و بناوانەو درۆیەکی شاخدارە، ڕۆژی قیامەت خودا تۆڵەیان لێ دەستێنێ، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ الْمَلائِكَةَ تَسْمِيَةَ الْأُنْثَى﴾ ئەو موشریکە

بێباوەڕانـە: کـە بڕوایـان بەزیندوبوونەوەوحیـساب‌و لێکۆڵینـەوە نیـە، پێیـان وایـە هەموو فریشتە مێینەن‌و کچی خودان!!

دەك ماڵوێران بن بۆ بوختانێ دەیکەن، بێگومـان خـودا بـەرزو پـیرۆزە، دوورە لەوەی پـاڵی دەدەن، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەم مانایـە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَـادُ الـرَّحْمَنِ إِنَاثـاً أَشَـهِدُوا خَلْقَهُـمْ سَـتُكْتَبُ شَـهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾ (الزخرف:١٩) بەڕاستیی ئەوە ئەوپەڕی بـێ شـەرمی‌و کەودەنییـەە: کـە منالْ بۆ خودا دادەنێن‌و منالەکەش کچە، لەکاتێکدا ئەگەر بۆ خۆیان کـچیان هـەبێ پێیان ئەنگەو هەندێ جار بۆ سڕینەوەی ئەو ئەنگییـە کـچی خۆیـان زینـدە بەچـاڵ دەکەن.

﴿وَمَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ﴾ وەلحاڵ ئەوان لەسەر ئەم قسە ناشیرین‌و ناماقوڵانەیان هـیچ بەڵگـەو زانیارییـەکیان بەدەسـتەوە نیـە ئـەوان نـە فریـشتەیان ناسـیوە، نەدیویانـەو نـە هەواڵـدەرێکی راسـتگۆ هـەواڵی پـێداون، بـەڵکوو لـەرووی نـەزانی‌و گومڕاییپیەوەیە کە جورئەتی ئەوە دەکەن ئەو بوختانە گەورەیە بڵاو بکەنەوە ﴿إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّـا الظَّـنَّ وَإِنَّ الظَّـنَّ لا يُغْنِـي مِـنَ الْحَـقِّ شَـيْئاً﴾ بـەڵکوو ئـەوان شـوێن گومـان کەوتوون، گومانیش هیچ شتێکی پێ ناچەسپێ، ئـادەمیزاد بەشك‌و گومـان راسـتیی دەسـت ناکـەوێ، حـەق‌و راسـتی بـەزانین‌و وردبوونـەوە دەسـتەبەر دەبـێ، بۆیـە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (اياكم والظن فان الظن أكذب الحديث) خۆتـان بپـارێزن لەگومان‌و گۆترەکاریی چونکە بێگومان گومان درۆترین قسەیە.

﴿فَأَعْرِضْ عَنْ مَنْ تَوَلَّى عَنْ ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ ئەی پێغەمبەر روو وەرگێـڕە لەوانـەی پـشت لـەقورئان هەڵدەکـەن‌و گـوێ بـۆ فـەرمان‌و جڵـەوگیری پەروەردگار نـاگرن‌و بڕوایـان بەزیندوبوونـەوە نیـە، کـار بـۆ ئـەو ژیانـە جاویدانیـە ناکـەن، هـەر ژیـانی دونیایـان مەبەسـتەو هیـچی تـر.

﴿ذَلِكَ مَبْلَغُهُمْ مِنَ الْعِلْمِ﴾ ئەو دونیا پەرستییەیان ئەوپەڕی تێگەیشتنیانەو هەر هەڵپەیانە بۆ بەدەستهێنانی ئارەزووەکانی جیهان. بۆیە پێغەمبەر لەدوعاو پاڕانەوەکانی دا دەیفەرموو: (أللهم لا تجعل الدنيا أكبر همنا ولا مبلغ علمنا) خودایە وامان لێ مەکە هەرەکاری گرنگمان دونیا کۆکردنەوە بێو ئەوپەڕی زانیارییمان کاروباری دونیا بێ.

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اهْتَدَى﴾ ئەی پێغەمبەر تۆ گوێ مەدەرە ئەوان پشتیان لێ هەڵبکە، دڵنیابە خودا باش دزانێ کێ گومڕا بووەو ڕێبازی حەقی لێ گوم بووەو کێ ڕێبازی هیدایەتی گرتۆتە بەر، هەموو کەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداش وەردەگرێتەوە.

## سزاو پاداشی خراپەکاران و چاکەکاران

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى (٣١) ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ (٣٢) ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی رونکردەوە: کە خۆی زاناو ئاگادارە بەوەی لەئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، سزاو پاداشی بەندەکانی بەعەدالەت دەداتەوە، ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە: کە خۆی خاوەنی عالەمی بالاو جیهانی پایینە، بەویستی خۆی تەصەروفیان تێدا دەکا، لەروانگەی ئەو دەسەلاتە رەهایەو زانیاریە بەرفراوانو بێ سنوورە پاداشی چاکەکارانو سزای خراپەکاران دەداتەوە. دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى﴾ هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە هەمووی هی خودایەو لەژێر دەسەلاتی رەهای ئەودایە خودا بێئاتاجە لەهەموو کەسو هەموو کەس پێویستیان بەوە، بەحەقو راستیی بونەوەری وەدی هێناوەو سەرەنجامی بەندەکانی وا داناوە: کە هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداش وەربگرێتەوە، جا ئەگەر کردەوەکانیان باش بوو پاداشیان بەهەشتە ئەگەر بەدییان کردبوو سزایان دۆزەخە.

ئەمجار باسی رەوشتی چاکەکاران دەکاتو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ﴾ چاکەکاران ئەوانەن: کە خۆیان دەپارێزن لەتاوانی گەورەی وەکوو هاوەڵدانان بۆ خوداو کوشتنی ئادەمیزاد بەناحەقو خواردنی ماڵی هەتیو، هەروەها خۆی پاراستبێ لەفاحیشەو تاوانی گەورەی وەها: کە خودا هەڕەشەی دۆزەخی لەبکەرانی کردبێ. خۆیان پاراستبێ لەو تاوانانە جگە لەتاوانی بچوك، ئەمیش بەمەرجێك بەردەوام نەبێ لەسەریانو تۆبەیان لێ بکا. چونکە سوربوون لەسەر تاوانی بچوك دەیکاتە گوناهی گەورە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنْ تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُمْ مُدْخَلاً كَرِيماً﴾ (النساء: ۳۱) .

لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتووە تاوانی گەورە حەوتنو بەهیلاکبەرن، ئیمامی عەلی فەرموودەکەی ریوایەت کردوەو دەڵێ پێغەمبەر

فەرمووی: (اجتنبوا السبع الموبقات: الاشراك بالله تعالى والسحر و قتل النفس التى حرم الله ا بالحق و اكل الربا واكل مال اليتيم والتولى يوم الزحف وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات) خۆتان بپارێزن لەو حەوت تاوانەی بەهیلاکبەرن: هاوەڵدانان بۆ خودا ، جادوبازی، کوشتنی ناڕەوا، خواردنی ماڵی هەتیو، سودخواردن، هەڵاتن لەصەفی غەزا، بوختانکردن بەئافرەتی داوێنپاکی بێئاگا.

ئیمامی ذەهەبی لەکتێبی (الكبائر)دا تاوانە گەورەکانی بەحەفتا تاوان مەزندە کردوە. طەبەرانی دەڵێ پیاوێك بەئیبنو عەبباسی گوت: گوناهی گەورە حەوتن. ئیبنو عەبباس فەرمووی: بڵێ: حەوت سەد!

ئەمجار پەروەردگاردەرگای هیوا لەبەندە تاوانبارەکانی ئاوەڵا دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ﴾ بەراستی خودای تۆ زۆر لێ بوردەیە، لەتاوانی تاوانباران خۆش دەبێ، ئەگەر بەدڵ تۆبە بکەنو پەشیمان ببنەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ (الزمر:٥٣) .

بەکورتی هەموو تاوانێکی گەورەو بچوك جگە لەشیرك ئەگەر تۆبەی لێ بکرێ لەوانەیە خودا چاوپۆشی لێ بکا. ئیبنو جەریر فەرمودەیەکی لەئەبوهورەیرەوە ریوایەت کردوە دەربارەی تەفسیری ئایەتی ﴿الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ﴾ فەرموویەتی: (اللمة) ئەوەیە زینا بکا، دوایی تۆبە بکاو نەگەڕێتەوە سەری، دزی بکاو دوایی تۆبە بکاو نەگەڕێتەوە سەری، مەی بخواتەوەو تۆبە بکاو نەگەڕێتەوە سەری. .

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: من ئەم تەفسیرەم بەلاوە پەسەندەو گونجاوە لەگەڵ مانای ﴿إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ﴾ لێخۆشبوونی رەهاو بەرفراوان، گونجاوە لەگەڵ ئەوەی کابرا ئەو تاوانانە ئەنجام بداو دوایی تۆبە بکا. بەم جۆرە (استثناء)ەکە مونقەطیع نابێو موحسینین ئەو کەسانەن خۆیان لەو جۆرە تاوانە

گەورانـە دەپارێزن، هـەرگا فاچیان هەڵخلیـسکاو تۆشـی ئـەو جـۆرە تاوانانـە بـوون، خێرا دەگەڕێنەوەو تۆبە دەکەن. وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَالَّـذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّـهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (آل عمران:١٣٥) بەو جۆرە کەسانەی دەگوترێ: خۆپـارێزو تـەقواکار، خـودا مـوژدەی بەهەشـتی پـێداون. ئـەمجار کۆتـایی ئایەتەکـە بەوە دەهێنـێ: کـە سـزاو پاداشـدانەوەی بەنـدەکانی بـەدۆزەخ و بەبەهەشـت لـەوەوە سەرچـاوەدەگرێ: کـە خـودا حەقیقـەت و نـاوەرۆکی هـەموو شـتێك دەزانـێ، ئـەو قۆناغانــەی ژیــانی ئــادەمیزادی پێـدا تــێ دەپــەڕێ لای خــودا رون و ئاشــکرایە، دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِـي بُطُـونِ أُمَّهَـاتِكُمْ﴾ خودا ئاگادارە بەحاڵ و وەزعی ئێوە لەهەموو قۆناغەکانی ژیانتاندا، هەموو کـردارو رەفتارو گوفتارێکتان لای ئەو ئاشکراو نمایانـە، ئـەو کاتـەی بـاوکی ئێـوە کـە ئادەمـە لەگڵ دروسـتی کـرد، وەچـەو نـەوەکانی لەپشتی هێنایـە دەرێ، ئـەو کاتـەی لەسـکی دایکتانـا شـێوەو روخـساری ئێـوەی کێـشاو پـەروەردەی کـردن، خودایـەك ئاگـاداری زارۆك بێ لەناو منداڵدانی دایـکدا کـە تـاریکترین شوێنە، دیـارە وەزع و حـاڵی تـری بەندەکانی لێ گوم نابێ، ئاگای لەحاڵ و وەزعی ئێوە بـووە هێـشتا نەهاتوونـە وجـود، ئاگای لێتان بووە کە لەناو تاریکایی منداڵدانی دایکتانـا بـوون و روناکیـتان نـەدیوە، خودا زانایە بەهەموو شتێك پێش ئـەوەی بێتـە قۆنـاغی ظهور، زانایـە بەسروشـتی هەموو شتێك لەهەموو تەورو قۆناغەکاندا، کـەوابێ ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُـسَكُمْ هُـوَ أَعْلَـمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾ مەدح و وەصفی خۆتـان مەکـەن، پاکانـە بـۆ خۆتـان مەکـەن، بـەخۆتاندا هەڵمەڵێن، سوپاسی خودا بکەن لەسەر طاعەتکردن و بترسن لەتاوان، خودا بۆ خـۆی دەزانێ کێ تەقواکارەو خۆ لەتاوان دەپارێزێ. وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَـى الَّـذِينَ يُزَكُّـونَ أَنْفُـسَهُمْ بَـلِ اللَّـهُ يُزَكِّـي مَـنْ يَـشَاءُ وَلَا يُظْلَمُـونَ فَتِـيلًا﴾ (النسـاء:٤٩).

**سەرزەنشتکردنی موشریکە ملهوڕەکان چونکە پشتیان لەحەق کرد**

﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار دەسەڵاتی بێ سنووروو بەرفراوانی زانیاری خۆی ڕاگەیاند بەوە: کە ڕۆژی قیامەت پاداشتی چاکەکارو سزای تاوانباران دەداتەوە.

نـەزانی موشـریکەکانی رونکـردەوە ، بەنمونـە باسـی یـەکێك لـەو بتپەرسـتو نەفامانەی کرد: کە رویان لەئیمانهێنان وەرگێڕاوەو پشتیان لەبانگەوازیی پێغەمبەر کـردوەو پێـی وایـە کەسـانی تـر دەتـوانن تاوانـەکانی بـۆ هـەڵبگرنو خـۆی لێـان بەرپرسیار نەبێ.

دەفـەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْـتَ الَّـذِي تَـوَلَّى. وَأَعْطَـى قَلِـيلاً وَأَكْـدَى﴾؟ ئایـا هـەواڵت پێگەیـشتووەو کـاری ئـەو کەسـە دەزانـی کـە پـشتی لـەخێر کـردوەو روی لەحـەق وەرگێڕاوە، کەمێکی مـاڵ داو ئـیتر وازی هێنـا، واتـە کـەمێکی دا لـەو مـاڵ سـامانەی بڕیار بوو بیدا بەو کەسەی بەرعوۆدەی عەزابی دۆزەخ بوبوو بۆی ئەوی تری لێ گل دایەوەو نەیدایە. موجاهیدو ئیبنوزەید دەڵێن: ئەو ئایەتـە لەشـانی وەلیـدی کوڕی موغـەیرە نـازڵ بـووە، کـە چـووە خزمـەت پێغەمبـەرو موسـوڵمان بـوو، یـەکێك لەموشریکەکان پێی گوت: ئەوە بۆچی موسـوڵمان بـووی؟ وەلیـدیش دەڵێ لەترسـی ئـاگری دۆزەخ، کـابرا دەڵـێ: مـن بـۆت بـەرعوۆدەی ئـاگری دۆزەخ دەبم بەمـەرجێ ئەوەندەم ماڵ بدەیتێ، وەلیدیش دەڵێ باشە، پێـشەکی بڕێکـی پـارە دەداتـێ، لەپاشـا لێی پەشیمان دەبێتەوەو باقیەکەی ناداتێ. ئیتر بەم بۆنەوە ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

﴿أَعِنْدَهُ عِلْمُ الْغَيْبِ فَهُوَ يَرَى﴾ ئایا ئـەو کـافرە بـەدخووە: کـە کـوفری بەسـەر ئیماندا هەڵبژاردوە، زانیاری غەیبی لایەو دەزانێ هاوەڵەکەی بەرعوۆدەی تاوانەکانی دەبێ؟ نەخەیر با وا نەزانێ، کار بەو شێوەیە نیە: کە ئەو بـۆی چـووە. هـەر کەسـە بۆخۆی بەرپرسیارە لەکردەوەی خۆیو کـەس تـاوانی کـەس هـەڵناگرێ. غـەیب زان هە ر خودایەو جگە لەو کەس نایزانـێ، کـەوابێ بـا ئـادەمیزاد هەمیـشە لەحـەزەردا بێو تەقواو خوداپەرستی بەردەوام بێ، بەخشندەییو خێـرو خێراتـی نەوەسـتێنێ، هەمیشە ترسی عەزابو هیوای رەحمەتی خودای هـەبێ، ئـەمجار ئـەوە بـەیان دەکـا: کە لەشەریعەتی خودادا هەمیشە بەرپرسیارێتی شەخصییە، دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَى. وَإِبْـرَاهِيمَ الَّـذِي وَفَّـى﴾ ئایـا ئـەو کابرایـە: کـە وەلیـدی کـوڕی

موغەیرەیە یان هەرکەس و تاقمێکی تری لەو بابەتەیەخەبەردار نەکراوە بەو یاسایەی لەتەوراتدا هەیە، هەروا لەصوحوفی ئیبراهیمدا، ئەو ئیبراهیمەی وەفای خۆی بەرامبەر پەروەردگاری بەجێ هێنا. هەرچی فەرمانی پێ کرا ئەنجامی دا، هەرچی نەی لێ کرابوو توخنی نەکەوت، پەیامی خۆی بەوپەڕی دڵسۆزییەوە گەیاند، شیاوی ئەوە بوو بکرێتە پێشەوای ئادەمیزاد بەگشتیی، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَاماً﴾ (البقرة/١٢٤) بۆیە ناوی صوحوفی (ئیبراهیم و موسا)ی هێنا چونکە موشریکەکان لافی ئەوەیان لێ دەدا؛ کە لەسەر ئاینی ئیبراهیمن، ئەهلی کیتابیش خۆیان بەپابەند بووی تەورات دەزانن. ئەمجار یاسای ناو تەورات و صوحوفی ئیبراهیم رون دەکاتەوە؛ کە پانزە خاڵی سەرەکین دەفەرموێ:

١- ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ هیچ کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ، هەرکەسێك تاوانێك ئەنجام بدا خۆی لێی بەرپرسیارەو کەسی تر بەرعۆدەی نابێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَى حِمْلِهَا لا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى إِنَّمَا تُنْذِرُ﴾.

٢- ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ ئادەمیزاد هەرچی بۆ خۆی ئەنجامی نەدا دەستی ناکەوێ، پاداشت لەسەر شتێك وەرناگرێ کە خۆی نەیکردبێ. هەروەکو چۆن کەس بەرعۆدەی سزای کەس نابێ کەسیش بەروبومی کۆششی کەسێکی تر وەرناگرێ. ئیمامی شافیعی لەم ئایەتە ئەوەی دەرهێناوە: کە خوێندنی قورئان خێرەکەی بەمردو ناگا چونکە خوێندنی قورئان سەعی و کۆششی مردوەکە نیە.

وەڵێ رای پەسەندو قسەی بڕواپێکراو لەلای زانایانی هەر چوار مەذهەب (مالیك، حەنەفی، شافیعی، ئەحمەدی) ئەوەیە: کە خێری قورئان خوێندن دەگاتە مردوو چونکە دوعاو پاڕانەوەیە بەقورئان: کە لەکاتی خوێندنەوەی دا رەحمەت دەبارێ، لەفەرمودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتووە، کە پاڕانەوەو خێرو صەدەقە

دەگاتە مردوو، موسلیم لەصەحیحی خۆیداو بوخاری لە(الادب)دا (أصحاب السنن) جگە لەئیبنو ماجە – لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اذا مات الانسان انقطع عمله الا من ثلاث، صدقة جارية أو علم ينتفع به، او ولد صالح يدعو له) کە ئادەمیزاد مرد ئیتر لەدونیا دادەبڕێو هیچی بۆ ناکرێو سود لەهیچ کردەوەیەك نابینێ جگە لەسێ جۆر کردەوە: صەدەقەیەکی جاری ئەنجام دابێ، پرۆژەیەکی کردبێتەوە سودەکەی بەردەوام بێ، یان زانیاریەکی بڵاو کردبێتەوە سودی لێ ببینرێ. یان منداڵێکی صاڵحی لەدوا جێمابێ دوعای لێخۆشبوونی بۆ بکا. قورطوبی دەفەرموێ: : زۆر فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) هەن ئەم مەعنایە دوپات دەکەنەوەو ئەوە رادەگەیەنن: کە موسوڵمان پاداشتی کردەوەی غەیری خۆی پێ دەگا.

٣- ﴿وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى﴾ کردەوەکانی تۆمار کراون رۆژی قیامەت لەتەرازوی کردەوەکانی دا دەبینرێن. بەسەر خۆیو ئەهلی مەحشەردا رادەنوێنرێن. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (التوبة:١٠٥) لەو رۆژەدا خودا ئاکامی بەندەکانی رادەگەیەنێو پاداشو سزای عەداڵەتکارانەیان دەداتەوە چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

٤- ﴿ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَى﴾ ئادەمیزاد لەقیامەتدا پاداشتو سزای تەواوی خۆی دەدرێتەوە، هیچی لێ کەم ناکرێتەوە، بۆ خراپە پڕاو پڕ سزای خۆی وەردەگرێ، بۆ چاکە دە چەندانە تا حەوتصەد چەندانە پاداش وەردەگرێتەوە.

٥- ﴿وَأَنَّ إِلَى رَبِّكَ الْمُنْتَهَى﴾ سەرەنجامو ئاکام گەڕانەوە بۆ لای خودایە، هەموو دەچێتەوە بەر قاپی پەروەردگار، ئەویش بەعادڵانە لەسەر کردەوەی گەورەو بچوك پاداشو سزایان دەداتەوە.

٦- ﴿وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى﴾ هەر خودایە بەندەی خۆی کەیفخۆش دەکاو دەیهێنێتە پێکەنین. خەفەتباری دەکاو دەیخاتە شین‌و گریان، واتە خۆشی‌و ناخۆشی بەدەست خودایە.

هەر خودایە تایبەتمەندیی پێکەنین‌و تایبەتمەندیی گریانی لەئادەمیزاددا رەخساندوە، هەردوکیان (پێکەنین‌و گریان) نهێنیەکن لەنهێنیەکانی پێکهاتەی ئادەمیزادو کەس نازانێ چۆن پەیدا دەبن. پەروەردگار هۆکاری پێکەنین‌و هۆکاری گریانی لەئادەمیزاددا هێناوەتە دی، بەگوێرەی چەند نهێنیەکی (معقد)و شی نەکراوە وای لەئادەمیزاد کردوە بەشتێك پێ بکەنێ‌و بۆ شتێك بگری، وا دەبێ ئەوەی ئەمڕۆ پێی پێدەکەنێ سبەینێ بۆی دەگری‌و بەپێچەوانەشەوە لایەنی جەستەیی‌و لایەنی دەروونی هەردوکیان پێکەوە ئەو پێکەنین‌و گریانە وەدی دێنن. وادەبێ رووداوێك کۆمەڵێك دەگریەنێ‌و کۆمەڵێك پێدەکەنێنێ، هەریەکەیان بەگوێرەی کاریگەریی تایبەتی خۆیان ئەو دیاردەیان لێوە دیاری دەدا.

٧- ﴿وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا﴾ بەراستیی هەر خودا مردن‌و ژیانی دروست کردوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ (الملك:٢)

٨- ﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى. مِنْ نُطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى﴾ هەر خودایە: کە دوو رەگەزی لەئادەمیزاد بەدی هێناوە، نێرینەو مێینەی دروست کردوە، لەدڵۆپە ئاوێك کە دەڕژێندرێتە ناو منداڵدانی مێینەوە. پاش ماوەیەك خودا گیانی بەبەردا دەکاو دەبێتە ئادەمیزاد یان گیاندارێکی تر...

٩- ﴿وَأَنَّ عَلَيْهِ النَّشْأَةَ الْأُخْرَى﴾ هەر لەتوانای خودادایە کە دوای مردن رۆژی قیامەت ئادەمیزاد زیندوبکاتەوە بۆ ئەوەی هەرکەس سزاو پاداشی کردەوەکانی خۆی وەربگرێتەوە.

١٠- ﴿وَأَنَّهُ هُوَ أَغْنَى وَأَقْنَى﴾ بەراستی هەر خودا ماڵو سامان دەدا بەکەسێك بیەوێ دەوڵەمەندیی بکا، هەر کەسێکیشی بوێ هەژاری دەکا. ئەم سەنگو سوکییە ئەنجام دەدا بەگوێرەی حیکمەتی خۆیو بەرژەوەندیی مەخلوقات، دەوڵەمەند کردنو هەژار کردنی ئادەمیزاد بەدەست خودا خۆیەتی!

١١- ﴿وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَى﴾ هەر پەروەردگار خودای ئەستێرەی گەلاوێژە، ئەم ئەستێرەیە لەکاتی تینی گەرمادا لەدوا ئەستێرەی جەوزاوە هەڵدێ، پێی دەگوترێ (مرزم الجوزاء) یان (عەبور) لەپێش هاتنی ئیسلامدا هۆزی خوزاعەو حیمیەر پەرستویانە. یەکەم کەسێك کە پەرستنی ئەم ئەستێرەی داهێنا پیاوێك بوو ناوی ئەبوکەبشە بوو یەکێك بوو لەپیاو ماقوڵانی عەرەبو یەکێکە لەباپیرەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن دایکیەوە.

بەم بۆنەوە بووە: کە قورەیشیەکان بەپێغەمبەریان دەگوت (ابن ابی کبشة) چونکە ئەمیش وەکوو ئەو لەئاینی باوكو باپیرانی لای داوە.

وەکوو دەڵێن: دوو ئەستێرەی شیعرا هەیە، شیعرای یەمانیو شیعرای شامیی. لێرەدا مەبەست شیعرای (یەمانی)یە: کە پرشنگدارترین ئەستێرەیە لەکۆمەڵە ئەستێرەی (الکلب). بەپرشنگدارترین ئەستێرە دێتە بەرچاوو لەباشووری هێڵی (استواء) بەمەسافەی (١٨) دەرەجە دەبینەدرێ. بە( النجم الکلبی) مەشهوورە، سێ هەزار ساڵێك پێش ئێستاو لەسەردەمی فیرعەونەکاندا بەو ناوە ناسراوە. هەڵبەتە لەم ئەستێرە گەورەترو روناکتر زۆرن، وەلێ کە بەتایبەتی ناوی ئەمی هێنا لەم رووەوەیە: کە وتمان لەپێش ئیسلامدا هۆزی حیمیەرو خوزاعە پەرستویانە. میصرییە کۆنەکانیش پەرستویانە، چونکە دەرکەوتنی لەلای خۆرهەڵاتەوە لەدەوروبەری ناوەڕاستیی مانگی (یولیو- حوزەیران)دا پێش دەرکەوتنی خۆر هاوکات بووە لەگەڵ فەیەضانی نیل لەمیصری ناوەڕاستدا، واتە: هاوکات بووە لەگەڵ گرنگترین روداوی ساڵ. ئەمەش یەکەم نیشانەی دیاریکردنی درێژیی ساڵ

بووە لەهەموو جیهاندا. چونکە دەرکەوتنی ئەستێرەی شیعرا لەپێش خۆردا ساڵی جارێك رودەدا. بۆیە بەسەرەتای ساڵی تازە دانراوە.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: ئەستێرەی شیعرا بیست هێندەی خۆر قورسەو تیشکەکەی پەنجا هێندەی تیشکی خۆرەو دووریی لەئێمە بەئەندازەی ملیۆنێك جار دووی خۆرە لەئێمە.

تیشکی ئەم ئەستێرەیە بەهەشت ساڵ دەگاتە ئێمە لەکاتێکدا تیشکی خۆر بەهەشت دەقیقە دەمانگاتێ. ئەگەر ئەستێرەی شیعرا بەماوەی چەند سەعاتێك بەئەندازەی خۆر لێمان نزیك ببێتەوە ژیان لەسەر زەوی دا نامێنێ‌و دەریاکان دێنێتە کوڵ‌و جۆش‌و وشکانییەکەی دەکاتە سوتە مەرۆ!!

زانایانی ئاسمان شوناسیی دەبێژن لەئاسماندا ئەستێرەی وا هەیە دە هەزار جارو زیاتریش لەئەستێرەی گەلاوێژ گەورەترە تیشکدارترو گەرمترە، وەلێ لەبەر دوریيان لەئێمە بەخەفۆك‌و بچوك دێنە بەرچاو.

١٢- ﴿وَأَنَّهُ أَهْلَكَ عَاداً الْأُولَى﴾ بەڕاستیی هەر خودا گەلی عاد: کە قەومی حەزرەتی(هود) بوون لەناوی بردن لەدوای قەومی نوح گەلی عاد یەکەم نەتەوەیەك بوون خودا لەناوی بردن، ئەم گەلە لەنەوەی (عاد) کوڕی (ئیرەم) کوڕی (سام)ی کوڕی (نووح) بوون، ئەم گەلی عادە بەهێزترین‌و بەشان‌وشەوکەتترین ئادەمیزاد بوون، گەلێکی یاخی بوو سەرسەخت بوون، خودا بە رەشەباو زریانی سەخت لەناوی بردن.

١٣- ﴿وَثَمُودَ فَمَا أَبْقَى﴾ هەروەکوو چۆن گەلی عادی فەوتاند، گەلی ثەمودیشی لەناوبردو کەسیان لێ قوتار نەبوو.

١٤- ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِنْ قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَى﴾ هەروەها لەپێش ئەو دوو نەتەوەیەدا گەلی (نووح)مان لەناو برد بێگومان ئەمان زۆر لەگەلی عادو گەلی ثەمود ستەمکارترو سەرڕەقتر بوون، چونکە ئەمان سەرەتا رێبازی ستەمکارییان داهێناو

یەکەم نەتەوە بوون پێغەمبەری خودایان بەدرۆ خستەوە، ئەو هەموو ماوە دورو درێژە حەزرەتی نووح بانگەوازیی کردن بۆ ئیمانهێنان هیچیان بەگوێدا نەچوو. هەر سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان و لوتبەرزییان نواند، بۆیە حەزرەتی نوح ناچار بوو دوعایان لێ بکاو بڵێ: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لا تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾ (نوح:٢٦) .

١٥- ﴿وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَى. فَغَشَّاهَا مَا غَشَّى﴾ هەروەها خودا شارو شارۆچکەو دێهاتەکانی گەلی (لوط)ی ژێرو زەبەرکرد. حەزرەتی جوبرائیل خاکەکەی لەزەوی پچڕین و بەرزی کردەوە بۆ حەواو ئەمجار بەردبارانی کردن، دایپۆشین ئەوەی دایپۆشین لەعەزاب و گاشەبەرد.... کە هەر خودا دەزانێ چۆن بووە!!

## پەند وەرگرتن بەقورئان و شوێنکەوتنی پێغەمبەرو ترسان لەڕووداوی ترسناکی قیامەت

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩ ﴿٦٢﴾ ﴾

لەدوای ئەوەی پەروەردگار نیعمەتەکانی خۆی بەسەر ئادەمیزاددا ڕانواندن ئەمجار هەندێ نمونەی لەسەر دەسەڵات و توانای بێ سنووری خۆی هێنایەوە، کە بڕێك لەو نیعمەتانە بەهیلاکبردنی ئەو گەل و نەتەوانە بوو کە کوفرانی ئەو نیعمەتانەیان کرد، ئەوەشی ڕونکردەوە کە ژیان و مردن بەدەست خودایە، ئەمجار

سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکا: کە ئینکاریی نیعمەتەکانی خودا دەکەن، هەڕەشەیان لێ دەکا کە بترسن لەوەی توشی گەلە ستەمکارەکانی پێشوو بووە تووشی قوڕەیشییەکانیش ببێ، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە رابوونی قیامەت نزیکەو هاکا پەیدا بوو. واتە: ئەی موحەممەد با قوڕەیشییەکان بزانن: کە ئەو هێزو توانایەی ئەوان پێی دەنازن لەئاست هێزو دەسەڵاتی خودادا زۆر هیچ‌وپوچە، ئەو هێزو دەسەڵاتەی گەلی نوح‌و عادو ئەمودی لەناو برد، دەتوانێ ئێوەش ریشەکێش بکا، ئەگەر لەسەر ئەم بێ بڕواییەی خۆتان بەردەوام بن. لەراستی دا لەناوبردنی گەل‌و نەتەوەی بەدخوو گەورەترین نیعمەتی خودایە، چونکە عالەمێك لەئەزیەتدان‌و ستەم رزگار دەکا، لەناو بردنی پیاوخراپ‌و ستەمکار، دەبێتە هۆی بەختەوەری گەل‌و وڵات، کەوابێ ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكَ تَتَمَارَى﴾ بەچ نیعمەتێکی خودای خۆت گومانت هەیەو لەکام نیعمەتی خودادا دەمەدەمێ‌و موجادەلە دەکەی؟

﴿هَذَا نَذِيرٌ مِنَ النُّذُرِ الْأُولَى﴾ ئەم قورئانە ترسێنەرێکە لەترسێنەرەکانی پێشوو، قورئان وەکوو نامە ئاسمانییەکانی تر ترسێنەرە، موحەممەد پێغەمبەرو فروستادەی خودایە وەکوو باقی پێغەمبەرانی پێشوو، ئەویش ئێوە لەسزای خودا دەترسێنێ وەکوو چۆن پێغەمبەرەکانی پێشوو گەل‌و نەتەوەکانی خۆیان لەسزای خودا ترساندوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ (سبأ:٤٦).

﴿أَزِفَتِ الْآزِفَةُ﴾ هاتنی رۆژی قیامەت زۆر نزیك بۆتەوە، رۆژ دوای رۆژ زیاتر نزیك دەبێتەوە، ئەوەندە نزیك بۆتەوە هەر دەڵێی خەریکە رابێ.

﴿لَيْسَ لَهَا مِنْ دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ﴾ جگە لەخودا کەس نیە بتوانێ کاتی هاتنی رۆژی قیامەت دیاریی بکا، چونکە نهێنی ترین غەیبی پەروەردگارە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾ (لقمان:٣٤) یان

ده‌فه‌رموێ: ﴿لا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ﴾ (لأعراف:١٨٧) یان مانای ئایه‌ته‌كه‌ به‌م جۆرمیه‌ (جگه‌ له‌خودا كه‌س نیه‌ بتوانێ پاشۆ پێشی بخا. )

ئه‌مجار سه‌رزه‌نشتی موشریكه‌كان ده‌كا له‌سه‌ر ئه‌وه‌: كه‌ په‌یامی قورئان ره‌ت ده‌كه‌نه‌وه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ. وَتَضْحَكُونَ وَلا تَبْكُونَ. وَأَنتُمْ سَامِدُونَ﴾ ئایا سه‌رتان له‌م قورئانه‌ سوڕ ده‌مێنێ‌و په‌یامه‌كه‌ی ره‌ت ده‌كه‌نه‌وه‌؛ له‌روی گاڵته‌ پێكردنه‌وه‌ پێكه‌نینتان پێ دێ، ناگرین بۆ حاڵی خۆتان، به‌چ عه‌قڵێك قورئان به‌درۆ ده‌خه‌نه‌وه‌؟ چۆن گاڵته‌ به‌ئایه‌ته‌كانی ده‌كه‌ن؟ كه‌وابێ ئێوه‌ له‌فه‌رو به‌ره‌كه‌تی قورئان بێ به‌شن، ده‌بوایه‌ باوه‌ڕی پێبكه‌ن‌و له‌هه‌ره‌شه‌كانی بترسن، به‌په‌ندو ئامۆژگارییه‌كانی دڵتان نه‌رم ببوایه‌و له‌ترسی عه‌زابی سه‌ختی دۆزه‌خ بگریانایه‌. كه‌چی ئێوه‌ بێئاگاو نه‌فامن، یان خۆتان له‌و په‌یامه‌ ئاسمانییه‌ گێل كردوه‌، لوتبه‌رزیی ده‌نوێنن، له‌كاتی خوێندنه‌وه‌ی دا ده‌یكه‌نه‌ ده‌نگه‌ده‌نگ‌و هه‌راو هوریا بۆ ئه‌وه‌ی گوێتان لێ نه‌بێ ئه‌مجار تێ نه‌گه‌ن ﴿فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا﴾ ئه‌ی موسوڵمانان ئێوه‌ سوجده‌ بۆ خودا به‌رن له‌سه‌ر ئه‌وه‌: كه‌ هیدایه‌تی داون، به‌ندایه‌تی هه‌ر بۆ خودا بكه‌ن. واز له‌په‌رستنی بت‌و صه‌نه‌م‌و ئه‌ستێره‌و شتی تر بێنن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سوره‌تی القمر

ئه‌م سوره‌ته‌ ناونراوه‌ سوره‌تی (القمر) چونكه‌ به‌هه‌واڵی له‌تبوونی مانگ ده‌ستی پێ كراوه‌: كه‌ وه‌كوو موعجیزه‌یه‌ك بۆ پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) رویدا. ئه‌م سوره‌ته‌ جگه‌ له‌ئایه‌ته‌كانی (٤٤-٤٥-٤٦) مه‌ككیه‌، ئایه‌ته‌كانی (٥٥) ئایه‌ته‌ ، له‌دوای سوره‌تی (الطارق) نازڵ بووه‌.

**پەیوەندیی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوەی لەسێ رووەوەیە:**

١- لەکۆتایی سورەتی (النجم)دا فەرمووی: ﴿أَزِفَتْ ٱلْآزِفَةُ﴾ زۆر نزیکە قیامەت رابێ ، لەسەرەتای ئەم سورەتەشدا فەرمووی: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾.

٢- گونجانی ناوی هەردوو سورەتەکە لەپەنایەکەوە چونکە (النجم)و (القمر) تەنسیقو هاورێکیفیان لەناودایە.

٣- لەسورەتی پێشوودا بەکورتی باسی بەهیلاکچونی هەندێ گەلو نەتەوەی کرد، لەم سورەتەدا زێدەی بەباسەکان داو زیاتر بەسەرهاتەکانیانی رونکردەوە.

سەرەباسو ناوەڕۆکی سورەتەکە وەکوو باقی سورەتە مەککیەکان بۆ چەسپاندنی بنەماکانی عەقیدەیە. باسی نازڵبوونی نیگاو سروش بۆ پێغەمبەرو هەڕەشەکردن لەکافرەکان لەسەر ئەوە کە ئایەتەکانی خودا، ئەو ئایەتانەی لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) دەیانوێنێ بەدرۆیان دەخەنەوە ئەمجار باسی حیسابۆ لێکۆڵینەوەی قیامەتو عەزابی دۆزەخ بۆ کافرەکانو نیعمەتەکانی بەهەشت بۆ خوداپەرستانە.

بە کورتی ئەم سورەتە پڕە لەوادەو هەڕەشە، لەپەندو ئامۆژگاریی، لەسەرگورشتەی نەتەوە پێشینەکان، هەڕەشەکردن لەکافرەکان بەو جۆرە عەزابەی گەلە رابوردوەکانی پێ لەناو برا، وادە دان بەخوداپەرستان بەنازو نیعمەتی بەهەشتی رازاوە.

هەردوو پیری فەرمووده (موسلیمو بوخاریی) لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ پێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە بەچاوی خۆم دیم مانگ دوو لەتبوو، قورەیشیەکان وتیان مانگ جادوی لێ کراوە، ئیتر ئایەتی ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ نازڵ بوو.

موحەممەدی کوڕی جوبەیرو ئەبوداودی (الطیالیسی)و بەیهەقی لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا

مـانگ دولـەت بـوو، قورەیـشیەکان وتیـان: ئەمـە سـیحری ئیبنـو ئـەبی کەبـشەیە سیحری لێ کردوین، بـزانن پرسـیار لەکاروانـچیو ڕێبواران بکـەن ئـاخۆ لـەدەرەوەی مەککە ئەو دیاردەیان دیوە؟

پرسـیاریان لـێ کـردن، هـەموو وتیـان بـەڵێ دیمـان مـانگ دوولـەت بـوو، ئـیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ی نازڵ کرد.

## دوولەتبوونی مانگ و هەڵوێستی موشریکەکان بەرامبەری

﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ ﴿٣﴾ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّنَ ٱلۡأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزۡدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكۡمَةُۢ بَٰلِغَةٞۖ فَمَا تُغۡنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡۘ يَوۡمَ يَدۡعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيۡءٖ نُّكُرٍ ﴿٦﴾ خُشَّعًا أَبۡصَٰرُهُمۡ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ كَأَنَّهُمۡ جَرَادٞ مُّنتَشِرٞ ﴿٧﴾ مُّهۡطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِۖ يَقُولُ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَسِرٞ ﴿٨﴾﴾

پەروەردگار هەواڵی نزیکبوونەوەی ڕابوونی قیامەت ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ﴾ ڕابوونی قیامەت نزیك بۆتەوە، تەمەنی دونیا کۆتـایی هـات، ئـەو مـاوەی تەمـەنی دونیـا، کـە مـاوە دوا ڕەوانـەکردنی حـەزرەتی موحەممـەد(ﷺ)

بەنیسبەت ئەو ماوەی لەوەپێش ڕۆییشتووە، زۆر کەمە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەنزیکبوونەوەی ڕابوونی قیامەت دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلا تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ (النحل:١)، یان دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ﴾ (الانبیاء:١) ئەبوبەکری (البزار) ڕیوایەت دەکا لەئەنەسەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) وتاریدا بۆ هاوەڵەکانی، لەو کاتەدا خۆر خەریك بوو ئاوا بێ، تیشکێکی کەمی مابوو، فەرمووی: (والذی نفسی بیده، ما بقی من الدنیا فیما مضی منها الا کما بقی من یومکم هذا فیما مضی منه، و ما نری من الشمس الا یسیرا).

فەرموودەیەکی تر هەیە پشتگیری ئەم فەرموودەیە دەکا، موسلیمو بوخاریو ئیمام ئەحمەد لەسەهلی کوڕی سەعدەوە ڕیوایەتیان کردوە دەڵێ: ژنەوتم لە پێغەمبەر دەیفەرموو: (بعثت أنا والساعة هکذا) ڕەوانە کراومو بوم بەپێغەمبەر، ڕۆژگاری منو قیامەت ئاوا لەپەنایەکەوەن، قامکی شایەتومانو قامکە درێژەی ناوەڕاستی بەیەکەوە جوت کردنو ئاماژەی بەنزیکیی ڕابوونی قیامەت کرد.

ئەمجار پەروەردگار هەواڵی لەتبوونی مانگ ڕادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ مانگ دوولەت بوو کردمانە موعجیزە لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو نیشانەیەك بۆ نزیکبوونەوەی هاتنی قیامەت. ئیبنوکەثیر دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) مانگ لەتبوو، لەسەر ڕاستیی ئەم ڕوداوە زۆر حەدیثی مەتەواتەرو صەحیح هەنو کۆڕای زانایانی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە. ئەو لەتبوونە موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەر بووە..

هەرچەندە لەو کاتەوە: کە ئەم ئایەتە نازڵ بووە هەزارو چوارصەدو ئەوەندە ساڵە تێپەڕیوەو قیامەت ڕانەبوە، وەڵێ دەتوانرێ بگوترێ: نزیکیەکەی بەو ئیعتیبارەیە کە هاتنەکەی مسۆگەرەو هەرچی هاتنی مسۆگەر بێ بەنزیك دادەنرێ.

ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو هی تریش لەئەنەسەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: دانیشتوانی مەککە داوایان لەپێغەمبەر(ﷺ) کرد: کە موعجیزەیەکیان نیشان بدا، ئەویش مانگی بەدوولەتیی نیشان دان.

هەر موسلیمو بوخاری لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا مانگ بوو بەدوولەت، لەتێکی لەسەر کێوی (حراء) و لەتێکی لەخواریەوە بوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (اشهدوا) بروانن‌و ببینن. یان شایەتومان بێنن: کە من پێغەمبەرم.

ئەمجار پەروەردگار هەڵوێستی کافرەکان دیاریی دەکاو سەررەقیو قیرسیچمەییان لەبەرامبەر موعجیزەی ئاشکرای پێغەمبەردا دیاریی دەکا. دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ﴾ ئەگەر ئەو موشریکە نەفامانە موعجیزەیەکی ئاشکرا ببینن: کە بەڵگەیە لەسەر راستیی پێغەمبەرایەتی موحەممەد، پشتی لێ هەڵدەکەن‌و ئیمانی پێ ناهێنن‌و بەدرۆی دەخەنەوەو دەڵێن سیحرێکی ئاشکراو گەورەو بەردەوامو پتەوە، بالادەستی هەموو سیحرێکە. .

﴿وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُسْتَقِرٌّ﴾ حەق‌و راستییان بەدرۆ خستەوە، شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون، بەبیرو بۆچونی خۆیان موحەممەد ساحیرە، کوڵەوەنانییە، شاعیرە. ئەمجار پەروەردگار هەرەشەی لێ کردن‌و فەرمووی: هەموو کارێك دەگاتە ئاکامی خۆی، لەوێدا دەوەستێت، جا ئەگەر چاك بێ چاکەی لێ پەیدا دەبێ، ئەگەر خراپیش بێ خراپەی لێ وەدی دێ . خێر بۆ خێرخوازان‌و شەڕ بۆ شەڕخوازان. بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر دادیان ناداو هەموو شتێك ئاکامی خۆی هەیە، کاری پێغەمبەریش دەگاتە ئاکامو حەتمەن سەرکەوتوو دەبێ. ئەمەش دڵدانەوەی خوداپەرستانەو مژدە پێدانیەتی بەوە: کە سەرکەوتن هەر بۆ ئەوە لەدونیاداو بەختەوەریی بۆ خۆیو شوێنکەوتوانیەتی لەقیامەت دا.

ئەمجار سەرزەنشتی بێبڕواکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءَهُمْ مِنَ الْأَنْبَاءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ﴾ بێگومان ئەوەندە دەنگو باسی پێشینان بۆ کافرەکانی مەککەو هاو وێنەکانیان هاتووە: کە بەسیان بێ‌و لەهەڵوێستی ناشیرین‌و بیروباوەڕی پوچ بیانگێڕێتەوە لەم قورئانەدا ئەوەندەمان سەرگوزشتەی گەلە پێشینەکان‌و ئەوەی توشیان بوو لەسەر لاساریان‌و جۆری عەزاب‌و شێوەی لەناوبردنیان بۆ قوڕەیشیەکان‌و هاو وێنەکانیان گێڕاوەتەوە، هێندەمان پەندو ئامۆژگاریی بۆ تابیلا کردونەوە: کە بەسیان بێ بۆ ئەوەی واز بێنن لەخراپەکاریی. دەست هەڵگرن لەبتپەرستیی‌و یاخی بوون‌و سەرکەشی‌و سوربوون لەسەر بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر.

﴿حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ﴾ ئەو هەواڵ‌و پەندو ئامۆژگارییانەی لەقورئاندا بۆیان نێردراوەو بەگوێچکەیاندا دراوە، هەموویان حیکمەت‌و دانایین‌و لەتۆپەڵاکی حیکمەت‌و ڕەوانیدان، بێ کەم‌و کوڕین، دەڵێ: ﴿فَمَا تُغْنِ النُّذُرُ﴾ ئامۆژگاریی‌و پەند دادان بۆ ئەو جۆرە ئادەمییە سەر ڕەقانە بێ سودە، چونکە سەرکەشی‌و لوتبەرزییان وایان لێ دەکا گوێ بەحەق نەدەن، ترساندنی ترسێنەران بۆ کەسانی بێ بڕوا هیچ سودێك نادا، چونکە دەرگای دڵیان داخراوە. ئەتۆ ئەی پێغەمبەر لەلاساریی ئەوان دڵگران مەبە، تۆ ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام داوە، پەیامی خۆت گەیاندوە، ئەوان لێی بەهرەمەند نەبوون، ئێمە لەعۆدمیان دێین.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (یونس:١٠١).

ئەمجار فەرمان بەپێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَى شَيْءٍ نُكُرٍ﴾ ئەی موحەممەد ئەتۆ پشتیان لێ هەڵ بکەو چیتر خۆتیان لەگەڵ ماندو مەکە، چونکە هەوڵدان لەگەڵیان بێ سودە، چاوەڕوانی سەرەنجام بە، ئەی موحەممەد بیر لەوە بکەوە: کە ڕۆژێك دێ ئیسرافیل فو بەکەرەنای صوردا دەکا

بانگیان دەکا بۆ شتێکی ناخۆش لەسەر دڵو دەرونیان، بۆ شتێکی سامناك: کە لەوەپێش نەیاندیوە، ئەویش حیسابو لێکۆڵینەوەی سارای مەحشەرە: کە تا بڵێی ترسناکە.

﴿خُشَّعاً أَبْصَارُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ الآجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُنْتَشِرٌ﴾ ئەو رۆژە رۆژێکە کافرەکان تێیدا چاو بەرەوژێرو ریسوا، بەو حاڵە مەهتوکییەو سەرشۆڕییە لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، لەبەر زۆریو قەرەباڵغیو تێکەوە هاویشتنو هاتوچۆی خێراو کێشکردنیان بۆ گۆڕەپانی حیسابو بەپیرەوە چوونی بانگەوازیی ئیسرافیل دەڵێی کوللەی بەرەڵلابووی تێکەڵو پێکەڵن. هەر تێکەوە دەهاون. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ﴾ (القارعة:٤) .

﴿مُهْطِعِينَ إِلَى الدَّاعِ يَقُولُ الْكَافِرُونَ هَذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾ بەهەڵەداوانو پەلەپڕوزە دێن بەپیر بانگەوازییەکەوە، ئەمجار بەدەم راکردنو هاتنی بەپەلەوە کافرەکان دەڵێن: ئەمڕۆ رۆژێکی سەختو دژوارە لەسەر ئێمە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ. عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ (المدثر:٩-١٠) وەلێ بڕواداران ئەو ترسو بیمەیان لەسەر نیە.

## گێڕانەوەی سەرگورشتەی نەتەوە پێشینەکان: کە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستەوە

### (١) چیرۆکی قەومی نوح (عليه السلام)

﴿ ۞ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانْتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ

ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾

لەوەپێش بەکورتی باسی هەندێ لەنەتەوە پێشینە بەدرۆ خەرەوەکانی کرد، ئەمجار لێرەدا هەندێ بەدرێژی باسی چوار لەو سەرگورشتانە دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ﴾ ئەی پێغەمبەر لەپێش قەومەکەی تۆدا قەومی نوح پێغەمبەری خۆیان بەدرۆ خستەوە، بەندەو فروستادەی ئێمە: کە نوح بوو بەدرۆیان خستەوە، وتیان شێتە، هەڕەشەیان لێ کرد، ئەزیەتیان دا جوێنیان پێدا، وتیان: ئەگەر واز نەهێنی بەردەبارانت دەکەین. حەزرەتی نوح نۆسەدو پەنجا ساڵ لەناو قەومەکەی دا مایەوە بانگەوازیی کردن، هەوڵی لەگەڵ دان، درێژەی بەئامۆژگارییدا، ساڵەهای ساڵ بەلێبڕانەوە لەگەڵیان خەریك بوو، هەتا ئەم زیاتر بانگەوازیی بکردنایە ئەوان شێلگیرتر دەبوون و پەرەیان بەیاخیبوونی خۆیان دەدا، پتر سور دەبوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، تا کار گەیشتە ئەوە حەزرەتی نوح لێیان نائومێد بوو، دڵنیا بوو لەوەی کە ئیمانی پێ ناهێنن. ئیتر ئەو کاتە: ﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانْتَصِرْ﴾ نوح لەخودای خۆی پاڕایەوەو وتی: خودایە من لەبەرامبەریکردنی ئەوان بێ هێزم ناتوانم چیتر پەرە بەبانگەوازیی بدەم، ئەو هەموو ماوە دوورو درێژە لەگەڵیان خەریك بووم هیچم

بەهیچ نەکرد، کەسیان باوەڕی پێ نەکردم. بەڵکوو هەتا من زیاتر ئامۆژگارییان بکەم ئەوان شێلگیرتر دەبن. هانات بۆ دێنم و لێت دەپاڕێمەوە کە یارمەتی ئایینی خۆت بدەی، تۆڵەمیان لێ بستێنەو لەناویان بەرە. ﴿فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ﴾ دەرگای ئاسمانمان لێ کردنەوە، بەرێژنە بارانمان بەسەردا باراندن، ﴿وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُوناً فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ﴾ زەویمان لێ کردنە کانیاوی هەڵقوڵاو لەهەموو ئاقارێکەوە ئاو هەڵقوڵا، ئاوی ئاسمان و ئاوی زەوی تێکەڵاو بوون بەگوێرەی بڕیارو فەرمانێك؛ کە لەئەزەلدا درابوو، تۆفان هەڵساو دونیای داگیر کردو هەموویانمان خنکاندن، ﴿وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ﴾ نوح و شوێنکەوتوانیمان هەڵگرتن لەسەر چەند تەختە دارێکی لێکدراو بەبسمارو گوڵمێخ ، واتە: بەکەشتی دروستکراو لەتەختەو بسمار رزگارمان کردن. ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِمَنْ كَانَ كُفِرَ﴾ کەشتیەکە لەژێر چاودێری ئێمەدا دەڕۆیی و لەنقوم بون و مەشاکیل پاراستمان، سەرمان خست بەسەر ناحەزانیدا. قەومەکەیمان خنکاند لەسزای کوفرو بیدینی بەردەوامیان، ﴿وَلَقَدْ تَرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ کەشتیەکەمان هێشتەوە بۆ ئەوە ببێتە پەندو عیبرەت بۆ کەسانێك پەند وەربگرن، یان ئەو کردەوەیەمان کردو بەو دەردەمان بردن بۆ ئەوەی ببێتە پەندو عیبرەت بۆ ئادەمیزادی دوا خۆیان، ئایا کەسێك هەیە پەند وەربگرێ.

قەتادە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: (پەروەردگار کەشتی (نوح)ی هێشتەوە، تا سەرەتای پەیدابوونی ئیسلام. ئیبنو کەثیر دەڵێ ظاهیر وایە مەبەست ئەوە بێ خودا جینسی کەشتی هێشتەوە، چین دوا چین دروستیان کردو سودیان لێ بینی وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَآيَةٌ لَهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ. وَخَلَقْنَا لَهُمْ مِنْ مِثْلِهِ مَا يَرْكَبُونَ﴾ (يس: ٤١-٤٢) .

﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ ئەی بیسەر! بڕوانەو وردبەرەوە، بزانە سزای سەختی من چۆن بوو بۆ ئەوانەی بڕوایان بەمن نەکردو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ

خستەوە؟ چیم بەسەر ئەوانە هێنا؛ کە گاڵتەیان بەفروستادەو ترسێنەرەکانم کرد؟ چۆن یارمەتی پێغەمبەرەکانم داو تۆڵەم لەناحەزو بەدرۆخەرەوەکانیان ستاند؟ ئیستیفهامەکە بۆ سەرزەنشتکردن‌و ترساندنە، واتە ئێوەش بترسن لەعەزابی خوداو وا مەکەن بەدەردی ئەوان بچن.

﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ بەراستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردوە بۆ لەبەرکردن‌و تێگەیشتن، وشەکانیمان ئاسان کردوە بۆ نوطق پێکردن، مانای ئایەتەکانمان ئاسان کردوە بۆ تێگەیشتن، پڕمان کردوە لەپەندو ئامۆژگاریی، هەرکەسێك بیەوێ لێی بەهرەمەند دەبێ، ئایا کەسێك هەیە پێی پەند ئامێز بێ‌و عیبرەت وەربگرێ؟

ئایەتەکە بەرونی ئادەمیزاد هەڵدەنێ: کە خوو بدەنە خوێندنی قورئان‌و فێربوونی‌و تێگەیشتن لەمانای ئایەتەکانی‌و ئەمجار پابەند بوون بەفەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (ص:٢٩) یان ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ الْمُتَّقِينَ وَتُنْذِرَ بِهِ قَوْماً لُدّاً﴾ (مریم:٩٧) . ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەگەر خودا قورئانی بۆ ئادەمیزاد ئاسان نەکردایە نەیدەتوانی کەلامی خودا بخوێنێتەوە.

لەم سورەتەدا چەند جارێك ئایەتی ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ دوبارە بۆتەوە، پێدەچێ حیکمەتەکەی بێدار کردنەوەو ئامۆژگاریکردن بێ بۆ ئەوەی زیاتر پەندی لێ وەربگیرێ‌و سەرنج بدرێتە سەرەنجامی گەلە پێشینە لەناو براوەکان‌و پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرین‌و لەزەمینەدا بنج بەست بن‌و هەمیشە لەبەرچاومان بن‌و بترسین لەو ئاکام‌و سەرەنجامە. چونکە دوبارە کردنەوەی شت ماناکە لەدڵدا جێگیر دەکا. بیرخستنەوە بێ ئاگا بێدار دەکاتەوە.

### (٢) چیرۆکی عاد (هود) عليه السلام

﴿ كَذَّبَتۡ عَادٌ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ﴿٢٠﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٢٢﴾ ﴾

دوابەدوای چیرۆکی قەومی نوح: کە ئەو هەموو پەندو ئامۆژگارییەی لەخۆ گرتبون سەرگورشتەی گەلی(عاد)مان بۆ دەگێڕێتەوە. بۆ ئەوەی زیاتر پەندو عیبرەتیان لێ وەربگیرێ. جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: کە سەرەنجامی موشریك و یاخی بوو ستەمکاران لەناوچون و فەلاکەتە. جوداوازی لەنێوان ئەم گەل و ئەو گەلدا نیە. دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ واتە: چۆن گەلی نوح و پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستەوە، گەلی (عاد)یش پێغەمبەری خۆیان بەدرۆ خستەوە. بڕوایان پێ نەکردو ئەزیەتیان دا، ئێمەیش تۆڵەمان لێ ستاندن. دەی ئەی کۆمەڵی قوڕەیش و هەموو ئادەمیزاد بڕوانن و ببیستن و بزانن: چۆنم سزادان و چیم بەسەر هێنان! وا ئێستا بەدرێژی بۆتان باس دەکەین ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً صَرْصَراً فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُسْتَمِرّ﴾ ئێمە ڕەشەبایەکی توندو تیژو ساردو بەردەوام و نەپساومان نارده سەریان لەڕۆژێکی شوم و نەگبەتدا، نەگبەت بوو بۆ ئەوان و بەردەوام بوو لەسەریان، تا لەبێخی دەرنەهێنان و ئاسەواری نەبڕینەوە نەوەستایەوە. لەناوی بردن و خستنیە عەزابی سەخت و دژواری ژیانی قیامەتەوە سزای دونیایان بەسزای قیامەتیانەوە پەیوەست بوو. نموونەی ئەو ئایەتە ئایەتێکی تر: کە دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً صَرْصَراً فِي أَيَّامٍ نَحِسَاتٍ﴾ ( فصلت:١٦) یان دەفەرموێ:

﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُوماً﴾ (الحاقة:١٧) هێزو تەوژمی ئەو ڕەشەبا سارده وەهابوو ﴿تَنزِعُ النَّاسَ﴾ زەلامی لەزەوی وەکوو درەخت هەڵ دەکەندو دەیبرد بەئاسماناو لەحەواڕا سەربەرەوخوار دەیدان بەزەوی داو ملی دەتەقاندن‌و سەریان لەلاشەیان جودا دەبووەوە، هەموویان لاڵ‌و پاڵ بەمردوویی دەکەوتن ﴿كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُنْقَعِرٍ﴾ دەتگوت بنکە دارخورمای هەڵکەندراون، وەکوو دارخورمای هەڵکەندراوو فڕێدراو لاڵ‌و پاڵ لێی کەوتبوون.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کە گەلی عاد قەدو باڵایان درێژ بووە، جەستەیان گەورەو چوارشانەو تێکسمڕاو بوون، ڕەشەباکە سەری هەڵکەندون‌و جەستەیان لەو دەشتە کەوتووە. ڕەشەباکە جەستەی وشك کردونەوەو گۆشتی پێوە نەهێشتون، وەکوو داری وشك‌و ڕەقی لێ کردون.

ئەمجار ترسناکیی عەزابەکە دوبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ بڕوانن سزای سەختی من چۆن بوو چیم بەسەر هێنان‌و ترساندنەکەم چۆن بوو؟!

﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ بێگومان قورئانمان ئاسان کردوە بۆ بیر لێ کردنەوەو پەند لێ وەرگرتن‌و، نەصیحەت‌و ئامۆژگاریی، ئامۆژگاریی زۆرمان تێدا کردوە. وادەوە هەڕەشەی جۆراو جۆرمان تێدا لێ کردون، ئایا کەسێك هەیە پەند ئامێز ببێ‌و عیبرەت وەربگرێ؟ بەڵێ سەرەنجامی گەلی عاد شوم‌و نەگبەتی بوو، لەناوچوونیان بەوشێوە داخوازی ئەوەیە ئادەمیزاد بیر لەخۆیان بکەنەوە، بترسن لەو سەرەنجام‌و ئاکامە تێگەیشتن لەوەش ئاسانە چونکە قورئان بەشێوەو شێوازێکی ئاسان‌و سەهل نمایشی کردوە، هەر کەسێ دڵی بداتێ لێی حاڵی دەبێ‌و دەتوانێ خۆی بەختەوەر بکا.

## (٣) چیرۆکی ثمود حەزرەتی صالح (عليه السلام)

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ ۖ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾ ﴾

لەوەپێش چیرۆکی قەومی نوحو قەومی عادی گێڕانەوە، ئێستا دێتە سەرگێڕانەوەی چیرۆکی سێیەم کە سەرگوزەشتەی قەومی ثەموودە، هەر کەسێکیش پێغەمبەرێك بەدرۆ بخاتەوە وەکوو ئەوە وایە هەموو پێغەمبەرانی بەدرۆ خستبێتەوە، چونکە هەموویان لەبنەماکانی عەقیدەدا یەکن.

موعجیزەی حەزرەتی صالح بریتی بوو لەوشترێك بەفەرمانی خودا لەبەردێك هێنرابوە دەر، ئەم وشترە رۆژێك ئاوی بیر یان کانیەکەی دەخواردەوە، رۆژی دوایی شیریان لێ دەدۆشی، شیرەکەی بەشی هەموو خێڵەکەی دەکردو لێشیان

زیاد دەبوو. هەڵسان وشترەکەیان کوشت، خودا بەعەزابی گرمەو دەنگی بەرزی لەرادەبەدەر لەناوی بردن. دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ﴾ هۆزی ثەمود پێغەمبەری خۆیان کە ناوی صالح بوو بەدرۆ خستەوە، کەسێکیش پێغەمبەرێك بەدرۆ بخاتەوە دەشێ پێی بگوترێ هەموو پێغەمبەرانی بەدرۆ خستونەوە، چونکە هەموویان لەبنەمای عەقیدەدا لەهێڵە گشتییەکانی شەریعەتدا یەك پەیڕەوو پڕۆگرامیان هەس.

**ئەمجار پەروەردگار شێوەی بەدرۆخستنەوەکەیان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ:**

١- ﴿فَقَالُوا أَبَشَراً مِنَّا وَاحِداً نَتَّبِعُهُ إِنَّا إِذاً لَفِي ضَلالٍ وَسُعُرٍ﴾ لەناو خۆیاندا کەوتنە قسەو مقۆمقۆ، وتیان: چۆن دەبێ ئێمە شوێن ئادەمیزادێك بکەوین لەرەگەزو هۆزی خۆمان بێ بەتەنیا بێو کەسی لەپشت نەبێ. کەس شوێنی نەکەوتبێ؟! بەراستیی ئەگەر ئێمە شوێن کەسێکی ئاوەها بکەوین خەسارەتمەندو سەرلێ شێواوین، لەحەقو راستی لامان داوە، شێتو وێتین، خۆمان توشی جۆرەها عەزابی سەختو دژوار کردوە. .

سەیرە خۆیان بەگومرا دەزانن ئەگەر شوێن پێغەمبەری خودا بکەون، خۆیان بەدۆزەخیو عەزابخوردە حسێب دەکەن ئەگەر رێگای هیدایەت بگرنە بەر، بۆیە تۆمەتی درۆزنی پاڵ پێغەمبەرەکەیان دەدەنو بەچاوچنۆكو بەرژەوەند پەرستی لەقەڵەم دەدەن. دەڵێن: ﴿أَأُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنْ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾ چۆن ئەو زێدە لەئێمە تایبەت کراوە بەوە بکرێتە پێغەمبەرو سروشی بۆ بێ؟ لەکاتێکدا هی وامان تێدایە زۆر لەئەو شیاوترە بۆ ئەو پلەوپایە، بەڵکوو ئەو درۆ دەکاو لەدرۆزنی دا سنووری شکاندوە، بەناڕەوا لافی پێغەمبەرێتی لێ دەدا. چاوچنۆكو تەمەعکارە، بەرژەوەندیی خۆی گەرەکەو دەیەوێ بەم بۆنەوە خۆی بەسەرماندا بسەپێنێ. خۆ بەزلزانو لوتبەرزە، ئەم فیزو تەکەببورەی وای لێ کردوە ئەم درۆ زلە پێکەوە نێ.

ئێستاش زۆر لەداعیانی ڕێبازی ئیسلامو موجاهیدانی خۆبەختکەر ئەم جۆرە تۆمەتانەیان دەدرێتە پاڵو جۆرەها بوختانی ناجۆریان بۆ دەکەن!

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿سَيَعْلَمُونَ غَداً مَنِ الْكَذَّابُ الأَشِرُ﴾ لەوە بەولاوەو بەم نزیکانە لەو دەمەدا: کە عەزابی سەختی خودا یەخەیان دەگرێ لەدونیادا یان لەقیامەتدا ، دەزانن کێ درۆزنو چاوچنۆکە، کێ شیاوی پێغەمبەرایەتیە. واتە: هەر ئەوان درۆزنو لوتبەرزو سەر ڕەقن. داهاتوو دەری دەخا حەقیقەت چۆنەو چۆن نیە، دڵنیا بن لەو حەقیقەتە رزگاریان نابێ. .

ئەمجار پەروەردگار باسی تاوانەکەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ﴾ ئێمە وشترێکی شیردەری گەورە لەبەردێکی رەقو تەق دێنینە دەر وەکوو خۆیان داوایان کردوە، بۆ ئەوەی ببێتە نیشانەی پێغەمبەرایەتی صالحو ببێتە تاقیکردنەوەیان. چاودێرییان بکە بزانە چی دەکەنو هەڵوێستیان چی دەبێ بەرامبەر ئەو موعجیزەیە. دان بەخۆتا بگرەو پشوو درێژ بەبەرامبەر ئەزیەتدانیان، دڵنیا بەسەرەنجامو سەرکەوتنی راستیی لەدونیاو قیامەتدا هی تۆیە.

﴿وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُحْتَضَرٌ﴾ پێیان رابگەیەنە: کە ئاوی بیرەکە، یان کانیەکە لەنێوان ئەوانو حوشترەکەیان دا بەشکراوە، رۆژێک قۆرغی ئەوانەو رۆژێک تایبەتە بەحوشترەکەوە. هەموو بەشە ئاوێك خاوەنی خۆی هەیەو دەبێ لەنۆرەی خۆی دا ئامادە بێ. واتە: لەنۆرەی حوشترەکەدا نابێ ئەوان ئەوان ئامادە بنو لەنۆرەی ئەوانیشدا نابێ حوشترەکە لەوێ بێ. نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ هَٰذِهِ نَاقَةٌ لَهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾ (الشعراء:١٥٥) موجاهید دەڵێ: واتە قەومەکە ئامادەی ئاوەکە دەبن، رۆژی نۆرەی خۆیان بۆ خواردنەوەی ئاوو رۆژی نۆرەی حوشترەکەش ئامادە دەبن بۆ شیر دۆشین، ئەگەر وشترەکە لەوێ نەبوو ئاو بخۆنەوە، ئەگەر لەوێ بوو شیر بدۆشن. ئەم

نۆبەكاریو دابەشكردنە لەبەر ئەوە بوو ئاژەڵی گوندەكە لەحوشترەكە دەترسان، ئەگەر حوشترەكەیان بدیایە نەئەهاتن بۆسەر ئاوەكە. بەمەش دانیشتوانی گوندەكە تەنگەتاو بونو ویستیان لەحوشترەكە رزگاریان ببێ. بۆیە ﴿فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَى فَعَقَرَ﴾ هاواریان لەشەقاوەو پیاوكوژی هاوەڵیان كرد: كە قوداری كوڕی سالف بوو، لەهەموانیان زیاتر شەقاوە بوو پیاوێكی ئازاو بەئیقدام بوو، هەڵیان نا بۆ ئەوەی حوشترەكە بكوژێو لەم ئاو بەشكردنو نۆرەناوە رزگاریان بێ. ئەویش تاویدایە شمشێرو دایوەشاندە قاچی حوشترەكەو چوارپەلی بڕین. ئەمجار سەری بڕی. بەم شێوە تاوانی گەورەی ئەنجام دا. ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ سزام دان بڕوانە سزاكەم چەند سەختو دژوار بوو، سەیر بكە چ تۆڵەیەكم لێ ستاندن لەسەر كوفرو بێدینیو بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرەكەم، ئەو پێغەمبەرەی ئامۆژگاری كردنو ترساندنی لەو ئاكامە بەدبەختیە. ئەمجار جۆری عەزابەكەیان دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ﴾ جوبرائیلمان ناردنە سەرو نەڕەی بەسەرا كردن، هەموویانی دوا براو كرد، كەسیان لێ دەرنەچوو هەموویان مردنو رزینو وشك بوونەوە. وەكوو قانگە لاشكو چیلكەو چەوێڵو پرژوپاڵی درەختی كۆكراوەی ژێر پێ كەوتووی ئاژەڵیان لێ هات، هیچیان بەسەر هیچەوە نەماو هاڕ دران!!

﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ بێگومان قورئانمان ئاسان كردوە بۆ بیركردنەوەو پەند وەرگرتن لەرووداوی رابردو، ئایا كەسێك هەیە پەند وەربگرێ؟!

## (٤) چیرۆكی قەومی لوط (عليه السلام)

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَجَّيْنَاهُمْ بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِعْمَةً مِنْ عِنْدِنَا كَذَلِكَ نَجْزِي مَنْ شَكَرَ

﴿وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾﴾

ئەمە چیرۆکی چوارەمی ئەم سورەتەیە، چیرۆکی گەلی (لوط)ە دروودی خودای لێ بێ. خودا لەناوی بردن لەتۆڵەی ئەوەدا پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستەوەو رفتارو رەوشتی ناشیرینیان پەیرەو دەکرد. دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ﴾ گەلی (لوط) پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستەوە، گوێیان بەئامۆژگاریو هەڕەشەکانی نەدا، سوور بوون لەسەر کردەوەی ناشیرینو کوفرو بێدینی خۆیان، کە یەکێ لەکارە ناشیرینەکانیان نێربازیی بوو. ئەم چیرۆکە لەچەند شوێنی تری قورئان دا بەدرێژیی هێنراوە، لێرەدا مەبەست گێڕانەوەی تەفصیلاتی ئەو سەرگورشتەکە نیە، بەڵکوو مەبەست پەندو عیبرەت وەرگرتنە لەسەرەنجامی کوفرو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرو سوربوون لەسەر کاری نابەجێ. ئەمجار پەروەردگار جۆری عەزابو شێوەی لەناوبردنەکەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِباً إِلَّا آلَ لُوطٍ نَجَّيْنَاهُمْ بِسَحَرٍ﴾ ئێمە ناردمانە سەریان رەشەبایەکی توندو بەهێز کە لەگەڵ خۆیا بەردە وردەو زیخی هەڵدەگرت، بەردەوام بوو لەسەریان تا لەناوی بردنو ئاسەواریی بڕینەوە، هەموویانی لەناو برد جگە لە(لوط) و ئەوانەی شوێنی کەوتبوون، ئەوانەمان لەبەرەبەیان دا پێش هاتنی عەزاب لەشار وەدەرنانو رزگارمان کردن. شایانی باسە ئەوانەی رزگاریان بوو حەزرەتی لوط خۆیو (٢) کچەکەی بوون، ئەگینا کەسی تر ئیمانی پێ نەهێنابوو تەنانەت ژنەکەیشی عەزابی

خودا گرتیەوە، چونکە ئەویش یارمەتیدەری بێڕەوشتەکان بوو. هۆی رزگار بوونی رزگار بووەکان ئیمانهێنان و شوکرو سوپاسگوزارییان بوو، دەفەرموێ: ﴿نِعْمَةً مِنْ عِنْدِنَا﴾ ئەوانەمان رزگار کردن لەروی فەضل و نیعمەتی خۆمانەوە، رێزمان لێ گرتن و فریایان کەوتین: ﴿كَذَلِكَ نَجْزِي مَنْ شَكَرَ﴾ ئێمە بەو شێوە پاداشتی کەسێك دەدەینەوە کە ئیمان بێنێ و پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانمان بێ و سوپاسگوزار بێ.

ئەمجار پەروەردگار باسی عەدالەتکاریی خۆی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَنْذَرَهُمْ بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ﴾ بێگومان پێغەمبەرەکەیان زۆری ئامۆژگاریی کردن و ترساندنی لەهەڵمەتی ئێمە. زۆریان لەگەڵ خەریك بوو پێی وتن ئەگەر ئیمان نەهێنن خودا بەعەزابی سەخت لەناوتان دەبا، وەلێ ئەوان هیچ گوێیان پێ نەدا، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو گومانیان لەهاتنی عەزابەکە کردو پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستەوە. تەنانەت کوفرو بێدینی و خراپەکاریان گەیشتە ئەوە تەماع لەمیوانەکانی بکەن، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَنْ ضَيْفِهِ﴾ ویستیان کاری نێربازی لەگەڵ میوانەکانی دا بکەن، کە کۆمەڵێك فریشتە بوون لەشێوەی چەند کوڕێکی لاودا ببوونە میوانی. ژنەکەی حەزرەتی (لوط) هەواڵی بەقەومەکە دابوو: کە کۆمەڵێك گەنجی جوان بەمیوانی هاتوونە ماڵی لوط، ئیتر ئەوان بەهەڵەداوان هێرشیان کردە سەر ماڵی حەزرەتی لوطو بەردەرگایان لێ گرت و داوای بەدەستەوەدانی میوانەکانیان لێ کرد. ئەویش دەرگای لێ داخستن و کەوتە بەرگریکردن لێیان، هەوڵیان دا دەرگا بشکێنن و سواری میوانەکان بن، حەزرەتی لوط ئامۆژگاریی کردن، رەهنومایی کردن: کە بچن ئاگری جینسیی خۆیان بەچوونەلای خێزانەکانیان بکوژێننەوە، واز لەرەوشتی نێربازی بێنن. (حەنەحەبەشەی) نێوان حەزرەتی لوطو قەومەکەی درێژەی کێشاو سوربوون لەسەر چونەژورەوەو دەستدرێژیکردن بۆ سەر میوانەکانی ئیتر دەستی قودرەت

کەوتەکار، فریشتەکان دەستیان کرد بەئەنجامدانی کاری خۆیان، دەفەرموێ: ﴿فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ﴾ چاومان کوێر کردن، وایان لێ هات هیچیان نەدەبینی، نەیانتوانی چیتر زەخت لەحەزرەتی لوط بکەن بۆ بەدەستەوەدانی میوانەکانی، بەڵکوو هەوڵیان دا بگەڕێنەوە ڕێگایان دەرنەکرد، بەکوێرەکوێرە دەستیان بەدیواری خانوەکان گرت و گەڕانەوە، هەڕەشەیان لەحەزرەتی لوط کرد: کە هەر رۆژیان لێ بێتەوە وا دەکەن و وا بچێ!

شایانی باسە ئەمە یەکەمجارە قورئانن بەئاشکرا ئاماژە بەکوێربوونی چاویان بکا... لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالُوا يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَنْ يَصِلُوا إِلَيْكَ﴾ (هود: من الآية٨١).

ئیمام (الضحاك) دەڵێ: خودا چاوی کوێر کردن و فریشتە خۆ بەمیوان نیشاندراوەکانیان نەبینن، وتیان: ئێمە بینیمانن چونە ناو خانوەکەوە، ئەدی بۆ کوێ چون؟ هیچیان دەست نەکەوت و گەڕانەوە.

ئەمجار لەسەر زمانی فریشتە پێمان گوتن: ﴿فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دە بچێژن ئازاری عەزابی سەخت و ئاگامی هەڕەشەکانم. ئەمە ئەو عەزابەیە ئێوەمان لێ ترساندبوو، ئەو سەرەنجامەیە گومانتان لێی هەبوو.

ئەمجار پەروەردگار جۆری عەزابەکەو کاتی هاتنی دیاریی کردو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ صَبَّحَهُمْ بُكْرَةً عَذَابٌ مُسْتَقِرٌّ﴾ بێگومان لەبەرەبەیاندا هێرشی هێنایە سەریان عەزابێکی کوشندەی بەردەوام، لێیان نەبووەوە تا لەبێخی دەرهێنان. عەزابەکە رەشەبایەك بوو زەوی لەو کافرو نێربازانە پاك کردەوە، لەو کاتەدا؛ کە عەزاب یەخەی گرتبوون لەئەوپەڕی ئازارو ناخۆشی دا بوون، بانگیان لێ کراو پێیان گوترا ﴿فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ سزای کردەوەکانتان بچێژن و سەرەنجامی ترساندن و هەڕەشەکانمان ببینن!!

﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ بێگومان ئێمە ئایەتەکانی قورئانمان بۆ لێ حاڵی بوون و بیرخستنەوە ئاسان کردوە ئایا کەسێك هەیە پەند وەربگرێ؟! پەندو ئامۆژگاریی زۆرن وەلی پەند لێ وەرگرتن کەمە.

ئەم چوار زنجیرە چیرۆکانەی باسکران لەناوەوەی جزیرەی عەرەبدا بوون، ئێستا دێتە سەر باسکردنێکی زنجیرەیەکی تر لەدەرەوەی نیوە دورگەی عەرەبیدا.

## چیرۆکی فیرعەون و داروودەستەکەی

﴿وَلَقَدْ جَآءَ ءَالَ فِرْعَوْنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَـٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾﴾

ئەمە چیرۆکێکی ترە لەسەرگورشتەی گەل و نەتەوە ستەمکارەکان کە خودا لەناوی بردن و زەوی لێ پاك کردنەوە، وەلێ زۆر بەکورتی ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ﴾ بێگومان لەسەر زەمانی موساو هارون مژدەو ترساندنی زۆر ئاراستەی فیرعەون و داروودەستەکەی کرا، هەڕەشەیان لێ کرا ئەگەر سەرپێچی بکەن، مژدەیان پێدرا ئەگەر پابەندی فەرمانی خودا بن، هەوڵیان لەگەڵ درا، موعجیزەو نیشانەی گەورەو ئاشکرایان نیشان درا.

بەڵام ئەوان هیچیان بەگوێدا نەچوو بەڵکوو ﴿كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَاهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُقْتَدِرٍ﴾ هەموو ئایەت و موعجیزەکانی ئێمەیان بەدرۆ خستەوە، موعجزەکانیان بەسیحر دانان و خاوەنی موعجیزە بەساحیر. ئیتر لەتۆڵەی لاساری و سەرڕەقییان خودا بەعەزابی دژوار گرتنی و لەناوی بردن. کەسیان لێ لەپاش بەجێ نەما. بەتواناو هێزی لەبن نەهاتوو گرتنی، هێزو دەسەڵاتێك لەگەڵ جەبەروت و لوتبەرزییان گونجاو بێ.

## سەرزەنشتکردنی موشریکەکانی قورەیش و ئاماژەکردن بەسزای تاوانباران و پاداشتی خوداپەرستان

﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَىْءٍ فَعَلُوهُ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍۭ ﴿٥٥﴾ ﴾

لەوەپێش باسی لەناوبردنی هەندێ لەگەڵ نەتەوە پێشینەکانی کرد (قەومی نوح و هود و صالح و لوط) و فیرعەون و داروودەستەکەی. ئەمجار خیطاب ئاراستەی قورەیشیەکان دەکاو بەئوسلوبی پرسیاری نینکارئامێز هەڕەشەیان لێ دەکا. ئەوەیان پێڕا دەگەیەنێ: کە ئەو عەزاب و لەناوبردنەی توشی گەلە پێشینەکان بووە دور نیە توشی ئەمانیش ببێ. ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو بێدینی و سور بن لەسەر

بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەر(ﷺ). دەفەرموێ: ﴿أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِنْ أُولَئِكُمْ أَمْ لَكُمْ بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ﴾ ئایا کافرەکانی ئێوە (ئەی موشریکەکانی قورەیش) باشترن لەو بێبڕوایانەی سەرگورشتەکانمان گێڕانەوە؟ کە خودا لەتۆڵەی سەرڕەقیو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرانیان بەعەزابی سەخت ریشەکێشی کردن. یان ئێوە لەخوداوە ئەماننامەتان پێ دراوەو لەکتێبە ئاسمانییەکاندا بۆتان نوسراوە: کە هەرچی بیکەن چاوپۆشیتان لێ دەکرێو سزاو عەزابی خودا ناتانگرێتەوە!

واتە: ئەی قورەیشیەکان کافرەکانی ئێوە لەکافرەکانی نەتەوە پێشینەکان باشتر نین، ئێوە لەئەوان رێزدارتر نین. هەتا لەعەزابی خودا ئەمین بنو خۆتان بەپەنادراو لەعەزاب حسێب بکەن. لەکتێبە ئاسمانیەکانیشدا ئەمانتامەتان پێ نەدراوە: کە لەعەزابی خودا بەدوورن.

بێگومان ئەمە هەڕەشەیەکی توندە ناراستەی قورەیشیەکان کراوە، ترساندنیانە بەعەزابی دونیاو قیامەت، پوچەڵبوونەوەی هەموو شوبهەو گومانێکە: کە ئەوان پەنای بۆ بەرن، گرتنو کۆنترۆڵکردنی هەموو کونو کەلەبەرو رێگاو دەروازێکە بیانەوێ لێیەوە قوتار بن. ئەوە ئاکامو سەرەنجامی گەلە ستەمکارو بێبڕواکانی رابردوە، هیچ شتێك نیە بتوانێ ئێوە لەو چارەنووسییە بپارێزێو نەهێڵێ توشی ئەو سەرنجامە ببن. کەوابێ چی زوە بەخۆتاندا بچنەوەو لەهەڵوێستی خۆتان پەشیمان ببنەوە. بۆ ئەوەی بەدەردی ئەوان نەچنو ئەوەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئێوە نەیێ. .

ئەمە هەڕەشەو سەرزەنشتە بۆ هەر کەسێك لەعەرەب کەسوور بێ لەسەر کوفرو بێدینی. مەبەست هەندێ لەعەرەبە نەك هەموویان، با بزانن کافرەکانیان لەکافری گەلو نەتەوەکانی تر باشتر نین، بەڵکوو هەموویان وەکوو یەکن یان خراپترن: ﴿أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُنْتَصِرٌ﴾ بەڵکو ئەوان دەڵێن: ئێمە کۆمەڵێکی زۆرو خاوەن دەستو بازوو هێزو توانایین، دەتوانین: کۆمەڵی کەمو بێهێزی

دوژمنانمان هەڵاچۆ بکەین، پێیان وایە: لەناو خۆیاندا یارمەتی یەکتریی دەدەن. هاوکاریکردنیان بۆ یەکتر هێزو توانای بۆ دابین کردون. دەتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن.

﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ لەوە بەولاوەو بەم نزیکانە کۆمەڵیان پەرتەوازە دەبێ‌و تێك دەشکێن‌و هەڵدێن، لەراستی دا ئەمە موعجیزەیەکی پێغەمبەر بوو، ئەوەبوو لەرۆژی غەزای بەدردا خودا تێکی شکاندن‌و سەرانی کوفر یان کوژران یان بەدیل گیران، کۆمەڵ‌و لەشکریان تێك شکا،

بوخاری‌و نەسائی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: رۆژی غەزای بەدر پێغەمبەر(ﷺ) لەژێر خێمەیەکدا بوو دەستی بەرز کردبوەو لەخودا دەپارایەوەو دەیفەرموو: (أنشدك عهدك ووعدك اللهم ان شئت لم تعبد بعد اليوم فی الارض أبدا) ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکر دەستی پێغەمبەری گرت‌و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا بەسە چیتر مەپارێوە، زۆرت ئیلحاح کرد، ئەوجار پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوەو ئایەتی ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ی دەخوێند....

ئەمجار پەروەردگار ئاماژە بەوە دەکا: کە ئەو کافرانە هەر بەوەندە وازیان لێ ناهێندرێ، بەڵکوو کار زۆر لەوە گەورەترەو ئەوانە عەزابی قیامەتیان لەپێشەو گیرۆدەی دەبن لێی قوتار نابن. دەفەرموێ: ﴿بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ﴾ بەڵکوو قیامەت کاتی سزادانیانە، ئەو عەزابەی لەدونیادا توشیان دەبێ لەکوشتن‌و برین‌و دیلی‌و تێشکان، هەموو عەزابی هەرەشە پێ لێکراویان نیە، بەڵکوو سەرەتای عەزابیانە، عەزابی قیامەت زۆر لەعەزابی دونیا دژوارو بەئێش ترە، عەزابێکی نەبڕاوەو بەردەوامە...

ئەمجار جۆری عەزابی قیامەت دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ﴾ بێگومان ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن‌و هەموو کافرو تاوانبارانی گەڵ‌و نەتەوەکان بەکۆن‌و نوێیانەوە لەژیانی دونیادا سەرگەردان‌و سەرلێ شێواون

لەقیامـــەتیشدا لـــەناو ئـــاگری هەڵگیرســـاوی دۆزەخدان بـــۆ هەتاهەتایـــە تێـــدا دەمێننەوە.

﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ﴾ بێگومـان تاوانبـارە کافرەکـان لـەناو دۆزەخـدا بـەئاگر سـزا دەدرێـن، بـەناو ئـاگردا لەسـەر رویـان رادەکێـشرێن، بـۆ زێـدە سەرزەنـشتکردنو سـوکایەتی پێکـردن پێیـان دەگـوترێ دە ئـــازارو ســـوتانی ئـــاگری دۆزەخ بـــچێژن، ئەمـــە ســـزای کـــردەوەو پاســـاوی هەڵویستەکانتانە.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە بەیان دەکا: کە هەر خۆی بەدیهێنـەرو مەزنـدەکارو نەخشەکێـشە بـۆ هـەموو شـتێك تەنانـەت کـردەوەی بەندەکانیـشی خـۆی بەدیهێنەریانە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ ئیمـە هـەموو شتێکمان بـە ئەندازە دروست کردووە، هەموو شتێك هەموو کردەوەیەك لەم بوونەوەردا لەژیانی دونیـادا بـەخێرو چاکەیەوە خـودا دروسـتی کـردوە، خـودا بـەگوێرەی حیکمـەتو دانایی خۆی مەزندەی کردوەو هێناویەتیە وجود، هەرچی پەیدا بووەو پەیدا دەبێ هەمووی لای خودا تۆمارکراوەو لەلەوحولـەحفوظدا چەسپاوە، پـێش پەیـدابوونی لەزانیاری خودادا دیاریو ئاشکرایە، چۆنیەتیو چەندییەتی، حاڵو زەمانو مەکانی بەتەواویێ دیـاری کـراوە. وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾ (الفرقان:٢) یان دەفەرموێ: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى. الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى. وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾ (الاعلى١-٣) ئەهلی سوننەتو جەماعـەت ئـەم ئایەتـەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر هەبونی تەقدیر کردنی پەروەردگار بۆ هەموو شتێك زانیاری تەواوی بەو شتانە پێش پەیـدابوونیانو تۆمـار کردنیـان لـە لەحولـەحفوظدا پـێش بەدیهێنانیان. ئیمام ئەحمەدو موسلیم لـەئیبنو عومـەرەوە ریوایـەت دەکـەن دەڵێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرموێ: (کـل شـیء بقـدر حتـی العجـز والکسل) هـەموو شـتێك بەئەنـدازەو نەخـشەو تەقـدیری خودایـە، تەنانـەت نـەتوانینو تەمبـەڵیش. ئیمـام

ئەحمەدو تیرمیذیو حاکم لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: (یا غلام انی اعلمك كلمات: احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، اذا سألت فاسأل الله، واذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لو آجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك الا بشيء قد كتبه الله لك، وان اجتمعوا على ان يضروك بشيء لم يضروك الا بشيء قد كتبه الله عليك رفعت الاقلام و جفت الصحف) ئەی کوڕی خۆشەویست من چەند وشەیەکت فێر دەکەم، لەدڵیان بگرەو بیانکەرە بەرنامەی ژیانت. ئاگاداری فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودا بە، خودا چاودێریت دەکاو لەگێرۆدەبون دەتپارێزێ. خودات لەیاد بێو پشتی پێ ببەستە، هەموو کاتێ یارمەتیدەرتەو بەهاناتەوە دێ. هەرکاتێ داوای شتێکت کرد لەخودا داوا بکە، پێویستت بەپشتیوان بوو خودا بکەرە پشتیوانی خۆت. داوای کۆمەکی هەر لەو بکە. باش بزانە ئەگەر هەموو عالەم بیانەوێ یارمەتیەکت بدەن لەشتێکدا، ناتوانن یارمەتیت بدەن مەگەر خودا بۆی نووسیبێ، ئەگەر هەموو گەلو نەتەوەکان کۆ ببنەوە بیانەوێ زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن مەگەر خودا لەچارەی نووسیبێ، هەموو شتێك لەلای خودا لەلەوحولمەحفوظدا نووسراوەو قەڵەم هەڵگیراوەتەوەو مەرەکەبی کاغەز وشك بۆتەوە.

ئەمجار پەروەردگار کار بەجێیی‌و دەست ڕۆیوی خۆی رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾ فەرمانی ئێمەیە بەدیهێنانی مەخلوقات هەر ئەوەندەیە پێی دەڵێین: ببەو خێرا دەبێ، پێویست بە دووبارەکردنەوەی فەرمانەکە ناکا، چاو تروکاندنێکی پێ ناوێ. وەکوو لەئایەتی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (یس:٨٢) ئەمجار دەگەڕێتەوە بۆ دووبارەکردنەوەی پەند دادانو ئاگادارکردنەوەی ئادەمیزاد دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ سوێند بێ بەخودا ئێمە ئەی قورەیشیەکان زۆرمان لەهاووێنەکانی ئێوە لەکوفرو بێدینی دا بەهیلاك بردوە،

لەگەڵو نەتەوە پێشینەکان لەتۆڵەی ئەوەدا: کە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە، ئایا کەسێك هەیە پەند وەربگرێ بەریسوابون و لەناوچوونی ئەوان. کەسێك هەیە بیر لەسەرەنجامی خۆی بکاتەوەو خۆی تووشی ئەو نەگبەتیو چارەڕەشییە بپارێزێ؟

﴿وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ، وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُسْتَطَرٌ﴾ هەرچی ئادەمیزاد کردویانەو دەیکەن لەخێرو شەڕ هەمووی لە لەوحولمەحفوظدا تۆمار کراوەو لەدەفتەرو تۆمارگەی فریشتەکاندا نووسراوە، هیچ شتێك نیە گەورە بێ یا بچوك، کردار بێ یا گوفتار بایەخدارو بێبایەخ ئیللا لە لەوحولمەحفوظدا نووسراوە لەتۆمارگەو سجلی فریشتەکاندا چەسپاوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ (ق:١٨)

ئیمام ئەحمەدو نەسائیو ئیبنو ماجە لەعائیشەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (يا عائشة اياك ومحقرات الذنوب فان لها من الله طالبا) ئەی عائیشە خۆت بپارێزە لەگوناهی بچوكو هیچو کەم بایەخ چونکە فریشتەکانی خودا کۆیان دەکەنەوە. ئەمجار پەروەردگار لەبەرامبەر سزاو عەزابی کافرەکاندا باسی پاداشتی خوداپەرستان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ﴾ بێگومان تەقواکاران لەناو باخاتی رازاوەو جوانو قەشەنگو جۆگاو کانیاوی جۆراوجۆردان، جۆگای ئاوو هەنگوینو شیرو مەی: کە سەرخۆشکەر نیە ﴿فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ﴾ لەیانەو مەجلیسی رێز لێنراوو حەقو راستدان لەلای خودای خۆیان رێزیان لێ دەگیرێ، خودای خاوەن دەسەڵاتو بەدیهێنەرو کاربەجێو زاناو داناو مەلیکی بوونەوەر.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی الرحمن

ئەم سورەتە هەندێ پێیان وایە مەککییەو هەندێ دەڵێن: مەدەنییە. (٨٧) ئایەتە هەندێ پێیان وایە (٧٦) ئایەتە.

١- ئیبنو مەسعودو موقاتیل دەڵێن: مەدەنییە، بۆیە لەهەندێ موصحەفدا بەمەدەنی دەست نیشان کراوە.

٢- قورطوبیو ئیبنو کەثیرو جەماوەری زانایانی تەفسیر پێیان وایە مەککییە، بنەمای رای ئەم زانایانە قسەی (الحسن)و عوروەی کوڕی زوبەیرو عیکریمەو عەطاو جابیرە.

٣- ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: هەمووی مەککییە جگە لەئایەتی ﴿يَسۡـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەوانەی: کە دەبێژن مەککییە بەڵگەیان ریوایەتی عوروەی کوڕی زوبەیرە: کە دەڵێ: یەکەم کەس کە بەدەنگی بەرز دوا پێغەمبەر(ﷺ) لەمەککەدا قورئانی خوێند ئیبنو مەسعود بوو، ئەوەبوو هاوەڵان وتیان: تا ئێستا قورەیشیەکان گوێیان لێ نەبوە قورئان بەدەنگی بەرز بخوێندرێتەوە، کێ هەیە بوێرێ بەدەنگی بەرز بەگوێیان دا بدا؟ ئیبنو مەسعود وتی: من، هاوەڵان وتیان: دەترسین توشی ئەزیەتو نارەحەتیت بکەن، ئێمە دەمانەوێ کەسێك بەوکارە هەڵسێ کەسوکاری زۆری هەبێ، بەرگری لێ بکەن. ئیبنو مەسعود گوێی بەوە نەداو لەلای (المقام) بەدەنگی بەرز وتی (بسم الله الرحمن الرحيم، الرحمن، علم القرآن..) ئیتر درێژەی پێداو دەنگی لێ بەرز کردەوەو قورەیشیەکان لەیانەکانی خۆیاندا بوون گوێیان لێ گرتو دەیانگوت: ئەوە کوڕەکەی ئومموعەبدە یەژێ چی؟وتیان: ئەوەی موحەممەد پێی وایە بەنیگا بۆی هاتووە دەیخوێنێتەوەو پەلاماریان داو دەستیان کرد بەلێدانی.

لەلایەکی تـرەوە ئـەوە چەسپاوە: کـە پێغەمبـەر(ﷺ) جارێـك نوێـژی بـەیانی لـە(نەخلـە) کـردو سـورەتی (الـرحمن)ی تێـدا خوێنـد، کۆمـەڵێك جندۆکـە بەوێـدا تێپەرین و گوێیان لێ بوو ئیمانیان بەپێغەمبەر هێنا.

تیرمیذی لەجابیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتـەلای هـاوەڵانی و لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی سورەتی (الـرحمن)ی بەسـەرداخوێندنەوە، هـاوەڵان بێـدەنگ بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئـەم سـورەتەم بەسـەر جندۆکـەدا خوێنـد لـە(لیلـة الجن)دا ئەوان باشتر کاردانەوەیان تێدا بوو، هەر کە دەگەیـشتمە ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَـا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیانگوت: خودایـە ئێمـە بەرامبـەر هـیچ نیعمـەتێکی تـۆ سـپڵەو پێنـەزان نین. ئەم ریوایەتانە بەڵگەی ئەوەن کە سورەتەکە مەککەییە.

ئەم سورەتە ناونراوە (الرحمن) چونکە سـەرەتا بەیـەکێك لـەناوە جوانـەکانی خودا دەستی پێکراوە، کە وشەی (الرحمن)ە . ناوێکی تریشی هەیـە پێـی دەگـوترێ (عـروس القـران) بەیهـەقی لـەئیمامی عەلییـەوە ریوایـەتی کـردوە دەفـەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەموو شتێك عەروسی هەیە، عەروسی قورئـان: سـورەتی (الـرحمن)ە. پەیوەنـدی ئـەم سـورەتە بەسـورەتی پێـشەوە لـەم رووەوەیـە: کـە ئـەم سـورەتە درێــژەی بــاس و شــیکردنەوەی کۆتــایی ســورەتی (القمــر)ە. لــەوی دا بەشێوەیەکی کورت باسی دەردو مەینـەتی قیامـەت دەکـا، تـەنگ و چەڵەمەی ئـەو رۆژەو جۆری عەزابی تاوانباران و پاداشی تەقواکـەران و باسـی بەهەشـت و رابـواردنی خوداپەرسـتانی تێـدا، شـیکراونەوە. لەسـورەتی پێـشوودا باسـی جۆرەهـا عـەزابی سەخت کرا: کە توشی گەلی نوح و گەلی هودو نەتەوەی صالح و فیرعەون بوو. لێرەدا باسی جۆرەها نیعمەتی خودا دەکا بەسەر بەندەکانی دا بەگشتی لەدونیاو قیامـەت دا.

ئەم سورەتە وەکوو باقی سورەتە مەککییەکانی تر جەخت دەکاتەوە لەسەر بنەماکانی عەقیدەو چەسپاندنیان لەدڵو دەروندا باسی یەکتاپەرستیو نیگاو سروشو رۆژی قیامەت دەکا.

## گەورەترین نیعمەتی خودا لەدونیاو قیامەت- نیعمەتی قورئانو نیعمەتە کەونییەکان

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ٢ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ٤ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ٥ وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ٦ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ٧ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ٨ وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ٩ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ١٠ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ١١ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ١٢ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣﴾

وەکوو وتمان: رای پەسەند ئەوەیە: کە ئەم سورەتە مەککی بێ. سورەتەکە: ئوسلوبو نەسەقێکی تایبەتی هەیەو راگەیاندنێکی گشتییە لەگۆڕەپانی بونەوەردا، رانواندنو ناساندنی نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی پەروەردگارە بەسەر بەندەکانی دا: کاربەجێیی پەروەردگارو دەستڕەنگینی لەبەدیهێنانی مەخلوقاتدا لە رژاندنی

نیعمەتەکانی دا بەسەر ئادەمیزادو گیاندارانی دا، لە نەخشەکێشانی بۆ بوونەوەرو ئەوەی تێیدایە، بەشایەت گرتنی بونەوەرە لەسەر ئادەمیزادو جندۆکە: کە بەم سورەتە خیطابیان ئاراستە کراوە لەگۆڕەپانی بونەوەرداو لەپێش چاوی هەموو بونەوەر دەفەرموێ: ﴿الرَّحْمَنُ، عَلَّمَ الْقُرْآنَ﴾ خودای خاوەن رەحمو بەزەیی قورئانی فێری پێغەمبەر کردووەو بەنیگاو سروش بۆی ناردوە تا ئەویش بەموسوڵمانانی بگەیەنێو فێریان بکا، ببێتە بەڵگە لەسەر ئادەمیزادو رۆژی قیامەت بیانویان نەبێ: فێربوونو تێگەیشتنی قورئان ئاسان کردوە بۆ ئەوانەی خودا رەحمیان پێبکاوهیدایەتیان بدا، بۆ ئەوەی بخوێننو لەبەری بکەنو فێری ببنو ئادابو خوورەوشتی جوانی لێ فێر ببنو بیکەنە یاسی ژیانیانو لێی بەهرەمەند ببنو بەختەوەری دونیاو قیامەتی لێ دەستەبەر بکەن.

جا چونکە ئەم سورەتە مەبەستە سەرەکییەکەی رانواندنی نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی پەروەردگارە بەسەر بەندەکانی دا بۆیە هەر لەسەرەتاوە باسی گەورەترین نیعمەتی خودای کرد: کە نیعمەتی فێربونی قورئانە، چونکە جەمسەری خۆشبەختیی دونیاو قیامەتە: کەتەلۆکی بوونەوەرەو بەرنامەی ژیانە.

ئەمجار نیعمەتێکی تر رادەنوێنێ، ئەویش نیعمەتی دروستکردنی ئادەمیزادە: کە ئامێری ئاوەدانکردنەوەی زەوییە. دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ الْإِنْسَانَ﴾ ئادەمیزادی لەنەبوەوە دروست کردوە ﴿عَلَّمَهُ الْبَيَانَ﴾ فێری قسەکردنی کردوە، ئێمە دەبینین ئادەمیزاد ئاخاوتن ئەنجام دەدا، تەعبیر لەهەستو شعووری خۆی دەداتەوە، تێدەگاو کەسانی دیکە تێدەگەیەنێ، ئەمە خۆی لەخۆیدا موعجیزەیەکی گەلێ مەزنەو لەبەر زۆر دوبارەبونەوەو زۆریی لێمان بووەتە شتێکی ئاسایی، هەست بەم نیعمەتە گەورە سەرسوڕهێنەرە ناکەین، بۆیە قورئان لەچەند شوێنێکدا ئاماژە بەو نیعمەتە دەکاو لەخەوی بێئاگایی بەخەبەرمان دێنێو سەرنجمان بۆ گرنگی نوتق تەعبیر دانەوە لەهەستو شعور رادەکێشێ.

ئەم ئینسانە چیەو لەچ پەیدا بووەو چۆن تەعبیر لەویستەکانی دەداتەوە؟
بێگومان ئەم ئادەمیزادە سەرسوڕهێنەرە سەرەتا لەخانەیەکی مەنەوی لەمنداڵدانی دایکی دا ژیان دەست پێ دەکا. خانەیەکی زۆر بچوکی وایە کە بەچاو نابیندرێ، زۆری پێ ناچێ ئەم خانەیە لەمنداڵدانڏا گەشە دەکاو دەبێتە کۆرپەلەیەکی پێکهاتوو لەملیۆنەها خانەی جیاجیا. ئێسقان، ماسولکە، دەمار، پێست...هتد.

ئەمجار ئامێری هەستەکان بۆنکردن، دیتن، بیستن، چەژتن، لەمسکردن و کارە گرنگەکانی ئەم هەستانە لەو کۆرپەلەدا سەرەتایان سەر هەڵدەداو وردە وردە گەشە دەکەن. ئەمجار نهێنی گەورەو موعجیزەی سەرسوڕهێنەر لەو زارۆکەدا دێتە دی ئەویش بریتییە لەتێگەیشتن و تەعبیردانەوە. لەهەست و شعورو ئیلهام و خەیاڵ...هتد

ئەمانە هەموویان لەو خانە بەسیتە زۆر بچکۆلەیە پەیدا دەبن، چۆن پەیدا بوون و کێ هێنانیە دی. لەوەڵامدا ناچارین بڵێین خودا هێناونیە دی. وەکوو قورئان ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لا تَعْلَمُونَ شَيْئاً وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (النحل:٧٨) لەڕاستیدا پێکهاتنی ئامێری ئاخاوتن یەکەیەکی سەرسوڕهێنەرەو هەتا لێی بکۆڵینەوە سەر سوڕمانەکە زیاتر دەبێ... زوبان، لێو، مەلاشوو، قوڕگ، ددان، بۆری هەوا، چاڵ و چۆڵی ناو قورگ و سییەکان. ئەمانە هەموویان هاوکاریی یەکتر دەکەن بۆ پەیدا بوونی دەنگ و وشەو ڕستە، زنجیرەیەکن لەزنجیرەکانی تەعبیر دانەوەو دەربڕین. ئەمانە وێڕای گرنگییان و کاریگەرییان لەو عەمەلییەتەدا، تەنها لایەنێکی میکانیکی و ئالین لەو عەمەلییەتە ئاڵۆزەدا، پەیوەندییان هەیە بەمێشك و بیستن و ئەعصابەوە، پاشان بەعەقڵەوە کە ئێمە تەنها ناوەکەی دەزانین و بەس. چۆنیەتی و حەقیقەتە کە نازانین. بەڵکوو نازانین چۆن کار دەکاو ڕێبازی کارکردنەکەی چۆنە.

بێگومان دیاردەی ئاخاوتن و چۆنیەتیەکەی تا بڵێی ئاڵۆزو سەرسوڕهێنەرە، قۆناغەکانی زۆرو هەنگاوەکانی هەمەجۆرن، هەندێ لەو قۆناغ و هەنگاوانە نهێنین و تا ئێستا نازاندرێ چۆنن.

ئادەمیزاد کاتێك هەست دەکا بەپێویستی قسەکردن، ئەو هەستە لەعەقڵەو یان لەگیانەوە دەگواسترێتەوە بۆ مێشك و لەوێوە بۆ کۆئەندامی ئامێری ئاخاوتن. دەڵێن: مێشك لەرێگەی ئەعصابەوە فەرمان دەردەکا بۆ وتنی ئەو قسەیەی دەیەوێ بیکا، وشەکە خودا فێری ئادەمیزادی کردوە. ئەو کاتە سییەکان برێك لەهەوای کە تێیدایە تور دەدا بۆ ئەوەی بگاتە بۆریەکانی هەواو لەوێوە بۆ قورگ و داوە دەزوە دەنگییەکان: کە تا بڵێی سەرسوڕهێنەرن، ئیتر ئەو هەوایە لەقورگدا دەبێتە دەنگ و عەقڵ بەویستی خۆی شێوەکەی لەبەرزی و نزمی، خێرایی و لەسەرەخۆیی زبری و نەرمی...هتد سنوردار دەکا. زمان و لێوو ددان و مەلاشو هاوکاری قورگ دەکەن بۆ وەدی هێنانی وشەکە. کەلە چەند پیتێك پێك دێ، هەر پیتە کان و مەخرەجی خۆی هەیە، بەرێبازی خۆی دا لەقورگەوە تا لەدوو لێو دەردەچێ قۆناغەکانی خۆی دەبڕێ و لەپیتەکانی دی جیا دەبێتەوە. زمان تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە، ئەویش ئەوەیە هەموو پیتێك لەزماندا رێبازی خۆی هەیەو پێیدا تێدەپەڕێ و ئیقاعێکی تایبەتی و جەرەسێکی تایبەتی لێ پەیدا دەبێ. ئەمە بۆ تاقە وشەیەك، کە بنمایە بۆ رستەو باس و فیکرەو مەشاعیر، هەموو ئەمانە جیهانێکی سەرسوڕهێنەرن و لەگیانی ئادەمیزاددا دێنە دی و خودا دەیانخولقێنێ و بە ﴿عَلَّمَهُ الْبَيَانَ﴾ ئاماژەی پێکردن!!

عونصورەکانی فێرکردن: کتێب و مامۆستایە: کە بریتین لەقورئان و پێغەمبەر. قوتابییە: کە ئادەمیزادە، چۆنیەتی فێرکردنە: کە درکاندن و بەیانکردنە. بەم چوار ئایەتە پەروەردگار ئاماژەی بۆ هەموو عونصورەکان کرد.

﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾ خۆر کە خاوەنی ئەو تیشکە روناکەیەو مانگ کە ئەو نورە جوانە بەشەو دەبەخشێتە زەوی هەردوکیان بەگوێرەی حیسابو یاسایەکی زۆر وردو رێكوپێك هاتوچۆ دەکەن، هەریەکەیان بورجو مەنزڵی خۆی هەیە رێگیری لەیەکتر ناکەن، بەو هاتووچۆیەی خۆیان گۆڕانکاریی وەرزەکانو ژمارەی رۆژوحەفتەو مانگو ساڵ دەزاندرێ، کاتەکانی گونجاو بۆ کشتوکاڵو بەخێوکردنی باغو دروێنەو رنینو چنینی دانەوێڵەو بەروبوومەکان دیاریی دەکرێ. کاتی قەرزو مامەڵەی بازرگانیو کارکردنو تەمەنی ئادەمیزادیان پێ دەزاندرێ. سودو فەرێ زۆریان بۆ ئادەمیزادو گیاندارانی ترو روەكو درەختەکان هەیە. بە گوێرەی قانونو یاسایەکی زۆر ورد بەشوێن یەکتردا دێنو دەرۆنو لەرێبازی خۆیان لانادەن. بێگومان خۆر گەورەترین قەبارەیەك نیە بەئاسمانەوە وەنەبێ لەهەمووی ئەستێرەکانی تر پرشنگدارتر بێ، چونکە لەو بۆشاییە بەرفراوانەدا کە ئێمە سنورەکەی نازانین ملیۆنەها ملیۆن ئەستێرە هەن، هی وایان تێدایە زۆر لەخۆر گەورەترو تیشکدارترو گەرمترە. شیعرای یەمانی قەبارەکەی (٢٠)هێندەی خۆرەو تیشکەکەی پەنجا هێندەیەتی.

ئەستێرەی ( السماك الرامح) قەبارەکەی هەشتا ئەوەندەی قەبارەی خۆرەو تیشکەکەی هەشت هەزار جار هێندەی تیشکی خۆرە. ئەستێرەی سیوەیل (سهیل) دووهەزارو پێنج صەد جار لەخۆر بەتین ترە.

وەلێ خۆر بۆ ئێمەی دانیشتوی سەرزەوی لەهەموو ئەستێرەکانی تر گرنگ ترە، چونکە مانەوەی زەویو ژیانی زیندەوەرانی ناو دەریاو وشکانی، پابەندە بەچەندیەتو چۆنیەتی تیشكو گەرمی هێزی کێشندەی خۆرەوە.

مانگیش یەکێکە لەئەستێرە بچوکە پەیوەندیدارەکان بەزەوییەوە. وەلێ گرنگییەکی تەواوی هەیە بۆ ژیانی سەر زەوی، چونکە هۆکارێکی سەرەکییە بۆ مەددو جەزری شەپۆلی دەریا.

قـەبارەی خـۆرو ئەنـدازەی گـەرمی‌و دووری لەئێمـەو ڕۆیـشتنی لەفەلـەکی خۆیدا، هەروا قەبارەی مانگ‌و دووری لـەزەوی‌و هەڵسوڕانی، یاساو ڕێسایەکی زۆر وردیـان بـۆ کـراوە، گرنگـی‌و تایبەتمەندییـەکی زۆریـان هەیـە بـۆ ژیـانی سـەرزەوی هەرکامێکیان لەو یاساو ڕێبازەی خۆی لای دا یان کەم‌و زیاد بکا ژیـان لەسـەر زەوی یان نامێنێ یان دەگمەن دەبێ. خـۆر (٥٩٢) هـەزار میـل لەئێمـە دوورە، ئەگـەر لـەو ئەندازە نزیکتر بوایە زەوی دەسوتا یان دەتوایەوەو دەبوو بەهەڵم‌و بەناو بۆشایی دا بلاو دەبووەوە، ئەگەر دوورتـر بوایـە سـەرزەوی دەبـووە بەسـتەڵەك‌و ژیانی لەسـەر نەدەگونجا!

ئەو گەرمییەی لەخۆرەوە دەمانگاتێ پلەیەکە لەدە ملیۆن پلەی گەرمی خـۆر، لـەوە کـەمتر بـێ یـان زیـاتر لەگـەڵ ژیـانی سـەر زەوی ناگونجـێ. کـەوابێ ئـەو ئەندازەیەی گەرمی دەمانگاتێ گونجاوە بۆ ژیان. خۆ ئەگەر ئەستێرەی (شیعرا) بەو قەبارەو گەرمییەی هەیەتی لەشوێنی خۆر بوایە، ئـەوا گۆی زەوی دەبـووە بوخـارو نەدەما.

هەروەها مانگ بەقەبارەو دووری لەزەوییەوە ڕێك لەگەڵ ژیانی سـەر زەوی گونجاوە. واتە: ئەگەر قەبارەکەی گەورەتر بوایە یان لەزەوی نزیکتر بوایە ئەوا ئـەو مەددو جەزرەی لەدەریاکاندا پەیدای دەکرد هەموو سەر زەوی دەگـردە تۆفـان‌و ئـاو دایدەپۆشی‌و ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو. هێزی کێشندەی خۆرو مـانگ بـۆ ڕاگرتنـی زەوی لەسەر ئەو حاڵە تایبەتییـەی خـۆی گرنگییـەکی ئێجگار زۆریـان هەیـە، واتـە لەڕاگرتنی دا یان لەکاتی ڕۆینی دا بەناو ئـەو بۆشـاییە برفراوانـەدا، ئـەو بۆشاییە کۆمەڵـەی خـۆریی ئێمـەی تێـدا جـەرەیان دەکـا بەتیـژی بیـست هـەزار میـل لەسـەعتێکدا بـەرەو (بـرج الجبـار) لەگـەڵ ئەوەیـشا بەملیۆنـەها سـاڵ لەگـەڵ ئەسـتێرەیەکی تـر دەعـەم ناکـەن‌و بەیـەکا هەڵناتـەقن‌و لـەم بۆشـاییە بـەرفراوان‌و سەرسوڕهێنـەرەدا سـاڵەهای سـاڵە ئـەم ملیۆنـەها ملیـۆن ئەسـتێرەیە دێن‌و دەچن‌و هەڵدەسوڕێن‌و هیـچیان بەئەنـدازەی تـاڵ مویـەك لەتـەوەرەی خـۆی لانـاداو شـێوەی

هەڵسوڕان و چەندییەت و چۆنیەتیان ناگۆڕێ و حیسابی هاوسەنگی و ڕێك و پێكیان تێك ناچێ[١]. (ئیمانم هەیە بەخوداو ڕاستیی فەرمووە: حەقیقەتەو گومانی تێدا نیە كە دەفەرموێ: ﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾!

ئەمجار هەندێ دیاردەی سەرزەوی ڕادەنوێنێ و دەفەرموێ: ﴿وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ﴾ بێگومان ئەو گژوگیایەی قەدی نیەو ئەو درەختانەی قەدیان هەیە بەسروشت گەردنكەچی فەرمانی خودان و بەگوێرە حاڵ و وەزعی خۆیان سوجدە بۆ خودای خۆیان دەبەن، هەمو وەكوو ئادەمیزادو جندۆكەو فریشتە بەئیختیارو ویستی خۆیان سوجدە بۆ خودا دەبەن، بەڵێ پەیدابوونی گژوگیاو دارودرەخت لەسەر زەوی بۆ ماوەیەك و بەرهەمهێنانیان بۆ بەروبوم و دانەوێلەو سود وەرگرتنی ئادەمیزاد لێیان لەزۆر لایەنەوە، نیشانەی گەردنكەچییانە بۆ فەرمانی خودا ، بێگومان ئەم بونەوەرە هەمووی پەیوەندیی گەردنكەچی و عیبادەتی بەخودای بەدیهێنەرەوە هەیە، گژوگیاو ڕوەك و درەخت نمونەیەكی ئەم بوونەوەرەن و بەڵگەن لەسەر مەیل و ئیتیجاهی بونەوەر هەمووی.

بوونەوەر دروستكراوێكی خاوەن گیانە، بەڵام گیانێكی هەیە دیارەو ڕوخسارو پلەی لەكائینێكەوە بۆ كائینێكی تر دەگۆڕێ. وەلێ لەحەقیقەتدا یەك گیانە.

دڵی ئادەمیزاد زۆر لەمێژە هەستی بەوە كردوە: كە بوونەوەر خاوەن گیانە، مەیلی گیانەكەیشی بۆ لای خودایە، بەئیلهامی خۆرسك ئەمەی زانیوە وەلێ ناوناوە پەردەی بەسەردا دراوەو تۆزو غوبار لێی شێواندوەو نەیتوانیوە بەو عەقڵە سنوردارەی خۆی و تەجرەبەی هەستەكانی ئەو زانیارییە كەمەند بكا. زانیاری ئەمڕۆ ئەو ئەگەرە دەخاتە ڕو: كە گەردیلە یەكەی بینای بونەوەرە، گەردیلەیش لەڕاستی دا بریتیە لەڕوناكی و بەس، جەم‌وجوڵ بنەمای بونەوەرەو تایبەتمەندیی هاوبەشی نێوان هەموو تاكەكانی بوونەوەرە!!

قورئـــــان بەئاشـــــکرا دەڵــێ: بوونـــەوەر بەحەرەکـــەی گیــانی ڕوی لەبەدیهێنەرەکەیەتی، حەرەکە گیانیەکەش حەرەکە ئەصلییەکەیەتی، حەرەکە ڕواڵەتیەکەی ڕەنگدانەوەی حەرەکە گیانیەکەیەتی. قورئان لەزۆر ئایەتدا ئاماژەی پێ دەکا، یەکێك لەو شوێنانە ئایەتی ﴿وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ﴾ە هەروەها ئایەتی ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾ (الاسراء:٤٤) یان ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ (النور:٤١) دەی ئەگەر ئادەمیزاد گوێ بۆ ئەم ڕاستیانە بگری‌و موتابەعەی بوونەوەر بکا لەعیبادەت‌و تەسبیح کردنی دا هەست دەکا: کە بوونەوەر لەدەوروبەری هەمووی هەستیارو زیندووەو سەرگەرمی عیبادەت‌و خوداپەرستییە، هەموو شتێك هاوشانی ئادەمیزادی خوداپەرست‌و عیبادەتکارە!!

ئــەمجار ســەرنجی ئــادەمیزاد بــۆ لای دیــاردەی هاوکێشەیی نێــوان تاکــەکانی بوونــەوەر ڕادەکێشی‌و ئــەوە ڕون دەکاتــەوە کــە تــەعادول‌و بەرامبــەریی‌و تــەوازون لەهەموو شتێکدا پێویستەو دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ. أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ﴾ ئـەو ئاسمانـە بەرفراوانـەی بـەرز کردۆتـەوەو شـکۆمەندیی پـێداوە لـەژوور زەوییـەوە ڕاگیریـی کـردوە، بـەو هـەموو ملیۆنـەها کاکەشـانەوە، هـەر کاکەشێکیش ملیۆنەها خۆرو ئەستێرەی تێدایە! تەرازوی دادو عەدالەتی لەنێوان عالەمی بالاو عالەمی پایینـدا دانـاوە، بەدەسـتی قـودرەت هاوکێـشەی نێوانیـانی ڕاگرتووە، ئەو هەزاران ملیۆن‌و بگرە بلیۆن‌و زیاتریش لەئەستێرەو مـانگ‌و خـۆر لـەو فـەضـا بەرفراوانـەدا هاتووچـۆ دەکـەن‌و لەگـەڕدان، ئەسـتێرەیەك ڕێگـا بەئەسـتێرەیەکی تـر نـاگری‌و لـەڕێڕەوو تـەوەرەی خـۆی لانـاداو چـرکەیەك پـاش‌و پێش ناکەن. .

لەتەك ئەو گەورەیی‌و دەسەڵاتەی ئاسمانی پێ بەرز کردۆتەوەو بونەوەری پێ هەڵدەسورێنی‌و لەنگەرو تەوازونی نێوان ئەو بلیۆنەها ئەستێرەو قەبارە زەبەللاحانەی پێ راگرتووە. لەسەر زەوی تەرازوی هەق‌و عەدالەتکاریی داناوەو فەرمانی بەئادەمیزاد کردوە عەدالەت پەیرەو بکەن لەکڕین‌و فرۆشتن‌و گۆڕینەوەی کالآدا بەویژدان‌و عەدالەت هەڵس‌وکەوت بکەن‌و کارەکانیان ئەنجام بدەن، نرخی کەسایەتیەکان‌و روداوەکان‌و هەموو شتێك بەتەرازوی عەدالەت بکێشن. بۆ ئەوەی ژیانی ئادەمیزاد لەسەر زەوی رێبازی ئاسایی خۆی بگرێ‌و چەواشەکاریی نەکەوێتە ناو کۆمەڵگاوە، شوێن هەواو هەوەس‌و بەرژەوەند پەرستیی نەکەون، زێدەڕەوی‌و سنور بەزێنی ئەنجام نەدەن.

ئەمجار جەخت لەسەر پابەند بوون بەعەدالەتکاریەوە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾ کێشەکانتان بەعەدالەت کێشانە بکەن، تەرازوبازیی مەکەن، لەنرخی کالآی کەسانی دیکە دامەشکێنن، بەڵکوو بەتەرازوی حەق‌و راستخوێنەوە کالآکانتان کێشانە بکەن، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾ (الشعراء:١٨٢). بەم جۆرە عەدالەت لەسەر زەوی دەچەسپێ، کێشانەو پێوانە رۆڵی خۆیان دەبینن، حەق‌و راستیی لەسەر زەوی‌و لەژیانی ئادەمیزاددا پەیوەست دەبێ بەبیناو یاسای بونەوەرەوە. پەیوەست دەبێ بەیاسای ئاسمانەوە بەتەرازووی عەدالەتی پەروەردگارەوە. ئیتر بەختەوەری دونیاو قیامەت دێتە دی. کامەرانیی‌و هەرزانی‌و ئارامیی باڵی خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا دەکێشن. .

ئەمجار باسی نیعمەتی زەوی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ﴾ پەروەردگار وەکوو چۆن ئاسمانی بەرز کردۆتەوە، زەوی راخستووە بۆ ئەوەی گیانلەبەران سودی لێ وەربگرن، کێوی تێدا داکوتاون بۆ ئەوەی نەلەرزێ‌و گیانلەبەرانی بتوانن لەسەری ئارام بگرن، هەندێکی وشکانی‌و زوربەی زۆری دەریایە، بڕێکی دەشت‌و بڕێکی شاخ‌وداخە، بەشێکی دەشتایی‌و نەرمانەو بەشێکی

تـری رەقـەنو لمبـەڵانو سـوتەمەرۆیە. هەنـدێکی سـاردو کوێـستانە، هەنـدێکی گەرمەسێرو بیابانە. ئێمە بەهۆی جێگیربونمان لەسـەر زەویو راهاتنمـان بەکـەشو هەواو دیاردەکانی، لەوانەیە کەمتر هەست بەو نیعمەتە گەورەیە بکەین؛ کە خـودا بۆی رەخساندوین، وای لـەم زەوییـە پـانوپۆرە کـردوە: کـە لەگـەڵ بـاقی ئەسـتێرەو خۆرو مانگو قەبارەکانی ناو بۆشایی بـەرفراواندا لەگـەردو خـولدا بـێو ژیانیـشی لەسەر گونجاو بێو بەئارامی لەسەری بژین. تەنانەت هەست بەو نیعمەتە گەورەیـە ناکەین کە بریتییـە لەداسکنانو هـەڵکردن لەسـەری مەگـەر ئـەو کاتانـە نـەبێ کـە بوومەلـەرزەو بورکانێـك پەیـدا دەبـێو زەوی رادەشـڵەقێنێو ژیـانو مـاڵو سـامانو خـانو بـەرەمان دەکەوێتـە خەتـەرەوە، لـەماوەی چـەند چـرکەیەکدا ئـەو جێگـا ئارامانــەمان لێ دەکەوێتــە شــەقەتۆڵەو ئەگــەر تێـشدا نەچـین لـەلێواری مــەرگ دەگەڕێینـەوە. ئالـەو کاتـەدا هەسـت بەنیعمـەتی گـەورەی پـەروەردگار دەکـەینو دەزانین ئەو ئارامگرتنو (استقرار)ەمان چەند خۆشەو چ نیعمەتێکی مەزنە!

لە راستیدا ئادەمیزاد شیاوی ئەوەن، یا بڵێین: ئەرکی سەرشانیانە: کە هەموو ساتو زەمانێك ئەم حەقیقەتەیان لەبەرچاو بێو بزانن ئەم زەوییـەی وان لەسـەری بـەو هـەمو پـانو پۆرییـەی هەیـەتی، وەکـو گەردیلەیـەك وایـە لـەناو بۆشـاییەکی فراوانی رەهادا، ماسی ئاسا مەلـە دەکاو هەڵدەسوڕێو دوو جۆر سوڕانەوەی هەیـە. سـووڕانەوەیەکی بـەدەوری خـۆی دا هەیـە لەسـەعاتێکدا هـەزار میـل دەبـڕێ. سوڕانەوەیەکیشی بەدەوری خۆردا هەیە لەسەعاتێکدا شەصت هـەزار میـل دەبـڕێ. لـەکاتێکدا زەویو خـۆرو کۆمەڵـەی خـۆریی لـەو بۆشـاییـیـە کـاکی بـەکاکییـەدا بـەخێرایی بیـست هـەزار میـل لەسـەعاتێکدا دوور دەکەونـەوەو، بـەرەو بـورجی (الجبـار) دەکـشێن. بـەڵێ ئەگـەر ئادەمیزادەکـان بیرێـك لەمـە بکەنـەوەو بـزانن کـە ئەوان هەمیشە لەسـەر پـشتی ئـەم گـۆ مەلەکـەرەو بـەم خێراییـە لـەو بۆشاییەدا لەجەرەیانداو جگە لەقودرەتی خودا هیچ شـتێك رای نـەگرتوون، هەمیـشە دڵیـان

لەترسا لێی دەداو چاویان بەملۆق دەوەستاو گیانو جەستەیان دەکەوتە لەرزینو دەحەبەسانو هەمیشە دڵیان پەیوەست دەبوو بەخوداوەو هانایان بۆ دەبردو خۆیان دەخستە پەنای مەحکەمیو سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتە گەورەیە دەبوون. کە زەوی بۆ گیانلەبەران راخستووەو بەئارامی لەسەر دەژینو هەست بەلەرەو راتڵەقاندن ناکەن هەر دەڵێ وێستاوەو جووڵە ناکا!

﴿فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ﴾ لەناو زەویدا میوەهاتی جۆراوجۆر هەیە لەتامو بۆنو سودبەخشیدا، لەدیمەنو شێوەو رەنگدا، هەروەها دارخورمای تێدایە: کە خاوەنی گۆپکەیەو دوایی دەبێتە خورمای شیرینو بەتام. ﴿وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ﴾ هەروەها گەلێ دانەوێڵەی تری وەکوو گەنمو جۆ کە خاوەنی کاو گیایە، کە دانەوێڵەکەی بژێوی ئادەمیزادو کاو گیایەکەی ئالفی ئاژەڵە. ﴿وَالرَّيْحَانُ﴾ ریحانەو هەموو گوڵو گیایەکی بۆنخۆش کە بەبۆنکردنیان دەبێتە مایەی حەسانەوەی سەرومێشكو جەستە دەمار شێل دەکاو بژێوی گیانە. ئەمجار خیطاب ئاراستەی ئادەمیزادو جندۆکە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام نیعمەتە لەو نیعمەتانەی باسکران کە خودا رشتونی بەسەرتاندا بڕوا ناکەن! ئەگەر بڕواتان بەنیعمەتەکانی خودا ببوایە بڕواتان بەخۆیشی دەکرد، ئەگەر بڕواتان بەخۆی هەبوایە تەنها عیبادەتتان هەر بۆ ئەو دەکرد بتو صەنەمو شتی ترتان نەدەکردە هاوەڵی.

## دەست نیشان کردنی هەندێ لەنیعمەتەکان

﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا

تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ ﴾

دوای ژماردنی بنەمای نیعمەتەکانی خودا بەسەر ئادەمیزادداو بەدیهێنانی عالەمی باڵاو پایین لەئاسمانەکان‌و زەوی دێتە سەر رونکردنەوەی حاڵ‌و وەزعی هەندێ لەمەخلوقات‌و دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ﴾ پەروەردگار ئەصلی ئادەمیزادی لەقوڕێکی وشکەوە بووی ترینگە لێهاتوو بەدی هێناوە. لەقوڕێکی سورەوە کراوە بەئاگر: کە دەشوبهایە سواڵەت‌و ئەگەر بەشتێکی تر لێی بدرایە ترینگەی لێ دەهات.

شایانی باسە قورئان بۆ دەس نیشانکردنی ئەصلی ئادەمیزاد جارێك دەفەرموێ: ﴿مِن تُرَابٍ﴾ واتە: لەگڵ، جارێك دەفەرموێ: ﴿مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ واتە لەقوڕێکی گۆڕاوو بەسەر یەکا ترشاو، لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾ لەقوڕێکی لینج‌و بەدەستا نووساو، لێرەشا دەفەرموێ: ﴿مِن صَلْصَالٍ﴾ لەسواڵەت. ئەمە ئاماژەیە: کە ئادەم (عليه السلام) سەرەتا لەگڵ‌و دوایی بوومتە قوڕو ئەمجار قوڕەکە ترشاوەو گۆڕاوە، بۆنی لێ هاتوە، ئەمجارە قوڕەکە لینج‌و جیڕ بۆتەوە، پاشان ئەو قوڕە وشك بووەتەوەو بوومتە سواڵەت. ئەمانە هەموو قۆناغ بون بەسەر جەستەی ئادەمدا تێپەڕبوون پێش ئەوەی گیانی بەبەردا بکرێ.

﴿وَخَلَقَ الْجَانَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ﴾ پەروەردگار جندۆکەی لەبڵێسەی ئاگر دروست کردون، ئاگرێکی بێ دوکەڵی تێکەڵ لەرەنگی زەردو سورو سەوز!

خاتوو عائیشە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: فریشتە لەنوور دروستکراون، جندۆکە لەبڵێسەی ئاگرو ئادەم لەو گڵو قوڕەی کە بۆتان باسکراوە.

﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئێوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیزادو کۆمەڵی جندۆکە بەچ نیعمەتێکی خودا بڕوا ناکەن‌و چ نیعمەتێکی ڕەت دەکەنەوە؟ بۆچی ئەوەندە سپڵەو پێنەزانن‌و سوپاسی نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی ناکەن؟!

زانیاریی تازە ئەوەی دەخستووە کە جەستەی ئادەمیزاد لەو عونصورانە پێك هاتووە: کە زەوی لەخۆی گرتون. وەکوو کاربۆن‌و هایدرۆجین‌و ئۆکسجین‌و فسفۆڕو کبریت‌و ئازۆت‌و کالیسیۆم‌و پۆتاسیۆم‌و سۆدیۆم‌و کلۆرو مەگنیسیۆم‌و ئاسن‌و مس‌و ئەلەمینیۆم‌و سلیکۆن‌و یۆدو فلۆرین‌و کۆباڵت‌و زەنگ.... دەی ئەمانە هەر ئەم عونصورانەن کە گڵیان لێ پێك هاتوە. هەرچەندە ئەو عونصورانە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جوداوازیی هەیە، هەروەها ڕێژەیان لەئادەمیزاددا جوداوازە لەو ڕێژەیەی هەیانە لەگڵدا...

بەڵام بەنیسبەت دروستکردنی جندۆکە لەبڵێسەی ئاگر زانیاریی ئادەمیزاد هیچی لێ نازانێ چونکە ئەوە مەوزوعێکە لەدەرەوەی سنووری توانای ئادەمیزاددایە. ئەوان عالەمێکن لەئێمە نادیارو نهێنین‌و زانیاریی ئێمە پەیان پێ نابا. تاکە سەرچاوە دەربارەی ئەوان قورئانە، خەبەری ئەو خودایەیە: کە بەدیی هێناون‌و خۆی دەزانێ چۆنی دروست کردون، بۆ خۆی دەفەرموێ: لەبڵێسەی ئاگر دروستمان کردون، پێویستە ئێمە بڕوامان بەوە هەبێ‌و سەد دەرسەد بەراستی بزانین.

جندۆکە لەسەر زەوی لەگەڵ ئادەمیزاددا دەژین، وەلێ نازانین شێوەی ژیانەکەیان چۆنە، قورئان لەو بارەوە هیچی بۆ باس نەکردوین‌و پێویستە ئێمەیش لەخۆمانەوە لەو مەوزوعە نەدوێین. قورئان ئاماژە بەوە دەکا: کە ئەوانیش وەکوو ئادەمیزاد خیطابی قورئانیان ئاڕاستە کراوەو پێویستە شوێن پەیامی ئیسلام بکەون‌و حەزرەتی موحەممەد﴿ﷺ﴾ پێغەمبەری ئەوانیشە!!

﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ﴾ خودا خودای هەردوو خۆرهەڵاتە خودای هەردوو خۆرئاوایە، واتە لەشەش مانگەی بەهارو هاویندا خۆر لەژوور خەتی (ئیستیواء)ەوە هەڵدێ، رۆژگار کورتو شەوگار درێژ دەبێ، خۆر بەم دوانزە مانگە (١٢) کەلو دەبڕێو چوار وەرز (بەهار، هاوین، پاییز، زستان) پەیدا دەبن، کەشوهەوا بەگوێرەی گۆڕانی وەرزەکان دەگۆڕێن، سەرماو گەرما، هەورو هەساو، باران و بێبارانی...هتد هەموو پەیدا دەبن و بەسەر دەچن بۆ قازانجی ئادەمیزادو پەرەپێدانی ژیان لەسەر زەوی. ئەگەر ئەم وەرزانە نەبوونایە ژیان نەدەبوو، کەوابێ ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام نیعمەتی خودا ئێوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیزادو جندۆکە بڕوا ناکەن و بەدرۆی دەخەنەوە؟؟

لە ئایەتێکی تردا کە دەفەرموێ: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ﴾ (المعارج/٤٠) مەبەستی گۆڕانی شوێنهەڵاتو شوێن ئاوابوونە: کە رۆژانە دەگۆڕێ ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ. بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لا يَبْغِيَانِ﴾ هەموو چۆمەکانی کێش کردون لەسەرەخۆ دەڕژێنە ناو دەریاوە دوو بەحر پێك دەگەن، دەریای سوێرو دەریای شیرین، دەریای سوێر بریتییە لەئاوی دەریاو دەریالوشەکان، ئاوی شیرینیش ئاوی چۆمەکانە، هەردوو دەریاکانی بەرەڵاکردوە روەو یەکتر دەڕۆن و بەیەك دەگەن وەلێ نایەڵێ تێکەڵ بن و هەریەکەیان لەسنووری خۆیدا رادەگرێ لەنێوانیاندا دیوارێکی سروشتیی خوداکرد هەیە، دابەشکردنی ئاو لەسەر زەوی بەو شێوەیە بەسودفەو رێکەوت نیە، بەڵکوو لەلایەن خودای پەروەردگارەوە تەقدیر کراوەو نەخشەی بۆ دانراوە. ئاوی سوێر سێ لەسەر چواری روبەری زەوی دادەگرێ، ئەم رێژە زۆرە لەئاوی سوێر پێویستە بۆ پاکڕاگرتنی کەشو هەوای زەوی و گونجانی بۆ تێدا ژیان.

هەرچەندە بەدرێژایی رۆژگار زەوی گازی لێ هەڵدەستێو زۆربەشی گازی ژەهراوییە، کەچی هەوا پیس نابێو رێژەی پێویست بۆ ژیانی تێدا هەیە، هۆکاری ئەم هاوکێشەییە هەبوونی ئەو روبەرە بەرفراوانەیە لەئاوی سوێر لەسەر زەوی. .

لەم دەریالووشە سوێرانەوە بەهۆی گەرمایی خۆر هەڵم هەڵدەستێو دەبێتە باران‌و دەبارێتەوە بۆ سەر زەوی‌و دەبێتە ئاوی شیرین‌و کانیاوو چۆمەکان پێك دێن. گونجاوی نێوان پان‌وپۆڕی دریاکان‌و گەرمایی خۆرو ساردی چینەکانی هەوا لەبەرزاییداو هۆکارە فەلەکییەکانی تر دەبنە هۆکاری پەیدابوونی باران‌و هەبوونی ئەو ئاوە شیرینە. ئەگەر ئاوی شیرین نەبێ ژیان لەسەر زەوی نامێنێ، ئەگەر ئاوی سوێری دەریا لووشەکانیش نەبێ کەش‌و هەوای سەرزەوی بەکەڵکی تێداژیان نابێ‌و بارانیش نابارێ. چۆمەکان هەموویان لەسەر زەوی دەکشێن‌و سوێرایی لەگەڵ خۆیان دەبەن‌و دەرژێنە ناو دەریاکانەوە. هیچ سروشتی دەریاکان تێك نادەن، بەرواڵەتیش ئاستی روبەری چۆمەکان لەئاستی دەریاکان بەرزترە بۆیە دەریاکانیش بەئاوی سوێر چۆمەکان داناپۆشن‌و سروشتی چۆمەکان ناگۆڕن بەم جۆرە هەمیشە لەنێوان ئاوی سوێرو ئاوی شیریندا پەردەیەکی پتەوی خوداکرد هەیەو هیچکام لەم دوئاوە تێکەڵ بەیەك نابن‌و سروشتی یەکتر ناگۆڕن کەوابێ حەقە بگوترێ ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئەی ئێوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیزادو جندۆکە بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن‌و چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە...؟!

ئەوەتا ئاوی شیرینی بۆ رەخساندون بۆ خواردنەوەی خۆتان‌و زیندەوەرانی ترو ئاودانی باغ‌و باغات‌و کشتوکاڵ. ئاوی سوێریش بۆ پاککردنەوەی ئاوی راوەستاو لەمیکرۆب‌و پاککردنەوەی چینی هەوا لەگازی ژەهراوی‌و پیس‌و پەڵۆخی ترو دەرهێنانی مرواری‌و شیلان لێی. وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ

وَالْمَرْجَانُ﴾ دێتە دەر لەو دوو دەریایە یان لەیەکێکیان؛ کە دەریا سوێرەکەیە مرواریو شیلان. [1]

هەڵبەتە لوئلوئو مەرجان لەبنەڕەتدا دو گیانداری ناو دەریانو تا بڵێی سەرسوڕهێنەرن، لوئلوء لەبنەڕەتدا گیاندارێکە دەچێتە قوڵایی دەریاوە، لەناو صەدەفێکدایە بۆ ئەوەی لەخەتەریات بپارێزرێ ئەم گیاندارە لەهەموو کائینێکی زیندوو جوداوازە چ لەروی پێکهاتەیەوە چ لەروی ژیانیەوە، شەبەکەیەکی زۆر وردو سەیر چنراوی هەیە ناهێڵێ وردە زیخو شتی وای بچێتە ناو سکەوە هەروەها ئاوو هەوای بۆ دەپاڵێوێ لەودیو شەبەکەکەوە چەند دەمێکی هەیە وەکوو دەمی گیاندارو هەموو دەمێکی چوار لێوی هەن، هەرکاتێ گەردیلە زیخێك یان پارچە بەردێك یان گیاندارێکی زیانەخرۆ خۆی گەیاندە صەدەفەکە خێرا ئەم گیاندارە کە بنەمای لوئلوئە مادەیەکی لنج دەردەکاو ئەو بەردە وردە یان ئەو گیاندارە هێرش بەرەی پێ سواخ دەداو پاش ماوەیەك رەق دەبێو دەبێتە لوئلوء قەبارەی لوئلوئەکە بەگوێرەی قەبارەی ئەو شتەیە؛ کە بەمادە لینجەکە سواخ دراوە مەرجانیش یەکێکە لەگیاندارە سەرسوڕهێنەرەکان لەقوڵایی دەریادا دەژی لەخوار پێنج مەتر تا سێصەد مەتر بەلای خواروی خۆی بەبەردێکەوە یان بەقەدە دارێکەوە دەنووسێنێ کونی دەمی کە لەلای سەروی جەستەوەیەتی بەچەند ئەندامێکی ورد ورد دەورە دراوە بەکاریان دەهێنێ بۆ پەیدا کردنی بژێو، هەرکاتێ ئەم ئەندامانەی دەوری دەمی نێچیرێکیان دەست کەوت زوربەی کاتیش گیانداری وردیلە وەکوو کێچی ئاوی دەبنە نێچیری یەکسەرلە پەلوپۆ دەکەوێو پێیەوە دەنووسێو ئامێرەکان دەکشێنەوەو نێچیرەکە بۆ لای دەمی خوار دەبێتەوە دەچێتە ناو سکیەوەو بەناو قەناتێکی تەنگەبەردا تێدەپەرێ؛ کە دەق دەشوبهێتە قورگی ئادەمیزاد ئەم گیساندارە خانەی زاووزێی لێوە دەردەچنو هێلکە گەراکان متوربە

---

([1]) فی ظلال القرآن ج٧/٦٨٢-٦٨٣

دەکا ئـەو زاروڵـەی کـە خـۆی بەبـەرد یـان بەقەدەدارەکـەوە هەڵواسـیوە پێـوەی دەنووسێو ژیانی تەنهایی دەست پێ دەکا مەرجانی سور بریتییە لەو پارچە رەقەی دەمێنێتەوە پاش فەوتانی بەشـە زینـدوەکان لەگیاندارەکـە ئـەم پەیکـەرە بەردیانـە لەبنکی دەریادا زۆرن.

﴿وَلَـهُ الْجَـوَارِ الْمُنْـشَآتُ فِـي الْبَحْـرِ كَـالأَعْلامِ﴾ هـەر بـۆ پـەروەردگارە ئـەو کەشـتییانەی بـەناو دەریـادا هاموشـۆ دەکـەن، کـە لەبـەر گـەورەیی‌و زەبـەللاحیان دەڵـێی کێـون. خـودا عـەقڵی داوە بـەئادەمیزاد کـە ئـەو ئـامێرە گـەورە بارهـەڵگرە زەبەللاحانە دروست بکەن، بـەقودرەتی خـودا بـەناو دەریـادا رەو دەکـەن‌و خۆتـان‌و کاڵاو بەروبومـتانیان پێ دەگوێزنەوە، تەنانەت ئێستا کەشتی وا دروست کراوە پێنج سـەد هـەزار تـەن‌و زیـاتریش نـەوت هەڵـدەگرێ. کەشـتیی هـەڵگری فڕۆکـە (حاملـة الطائرات)ی وا هەیە بۆ خۆی شارێکە دەڵـێی کێـشوەرێکی سـەربەخۆیە خـۆ ئەگـەر خودا مەیلی لێ بێ دەریا رادەگرێ‌و ناهێڵێ کەشتی بەناویا رەوبکەن بازرگانی‌و گەڵێ بواری تری ژیانتان دەوەسـتێ دروستکردنی کەشـتی- لـەوەپێش‌و ئێـستاشی لەگـەڵدا بـێ – لەنیعمەتــە گــەورەکانی پــەروەردگارە بەســەر بەندەکانیــەوە. بــەهۆی کەشتی‌یەوە بازرگانی دەکرێ‌و هەرزانی دەکەوێتە وڵاتەوە. بەکورتی: هـەر خودایـە: عـەقڵی دروسـتکردنی کەشـتی بـەئادەمیزاد داوە سروشـتی دەریـای وا دانـاوە: کـە کەشتی بار قورسی زەبەللاحی ئاوای پێدا هاتووچۆ بکا، کەوابێ ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن‌و کام نیعمەتەی رەت دەکەنەوە؟!

## نەمانی بوونەوەرو مانەوەی خودا

﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسْأَلُهُ مَن فِي

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ ﴾

دوای ژماردنی نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی قیامەتو بەڵگە هێنانەوە لەسەر قودرەتی خوداو تاكو تەنهایی زاتی پاکی، هەواڵی راستەقینە رادەگەیەنێو حوکمو بڕیاری ئەزەلی خۆی بەگوێچکەی بوونەوەردا دەداو دەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ﴾ هەرچی لەسەر زەوی هەیە لەو گیانلەبەران، هەروەها ئەهلی هەموو ئاسمانەکانو ناو زەوی هەموویان دەفەوتێنو هیچیان نامێنن ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ تەنها زاتی پەروەردگار دەمێنێتەوە، خودای خاوەن شکۆو بەخشش ئەو خودایەی شیاوی ئەوەیە بەندایەتی بۆ بکرێ بەگەورەو شکۆمەند بناسرێ خودای خاوەن تواناو دەسەڵاتی رەها.

لەژێر تارمایی ئەم دەقە قورئانی‌یەدا هەموو هەناسەو جمەوجوڵێك مت دەبێ، هەمو دەنگێك دەنووسێ، لەناوچونو فەوتان گشتییەو هەموو شتێك دەگرێتەوە، هەموو شتێك دەپێچرێتەوە فەناو نەمان هەموو بونەوەر دەگرێتەوە تەنهاو تەنها زاتی خاوەن جەلالو بەخشش دەمێنێتەوە بەجەلالو ویقارو شکۆمەندیی خۆی هەموو عالەمی هەستیی دادەپۆشێ!!!

بێگومان گەورەترین نیعمەتی خودا هاتنی رۆژی جەزایە، رۆژی تۆڵەستاندنو پاداشدانەوە، تۆڵە لەستەمکارانو پاداشدانەوەی چاکەکاران.

تیرمیذی لەئەنەسەوە ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (ألظو بياذ الجلال والاكرام) واتە خوو بەو دوعایەوە بگرن، لەپاڕانەوەدا دووبارەی بکەنەوە هەروا ریوایەت کراوە پێغەمبەر(ﷺ) بەلای پیاوێکدا رۆیی نوێژی دەکرد،

لەدوعاکردندا دەیگوت (یا ذ الجلال والاکرام) ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی دوعاکەت گیرا بوو.

لەدوعای مەئثورو بیستراو لەپێغەمبەرەوە ئەم دوعایە ریوایەت کراوە، (یاحی یا قیوم، یا بدیع السموات والارض، یا ذ الجلال والاکرام لا اله الا انت، برحمتك نستغیث أصلح لنا شأننا كله ، ولا تكلنا الی أنفسنا طرفة عین ولا الی أحد من خلقك).

لەئایەتێکی تردا مانای ئەم ئایەتە دوپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (القصص/٨٨)

﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەم نیعمەتانەی خودا بڕوا ناکەن؟ کام نیعمەتەی خودا بەدرۆ دەخەنەوە. ئادەمیزادو هەموو مەخلوقات لەمردندا یەکسانن، هەموو زیندەوەرێك دەبێ تاڵاوی مردن بچێژێ. ئەمجار دەچنە ژیانی قیامەتەوە، ئەو کاتە خودای خاوەن شکۆمەندو کیبریا بەعەدالەت لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکا، مردنو لەناوچون قۆناغە بۆ ژیانی جاویدانیو هەمیشەیی کەوابێ مردنو لەناوچون خۆی لەخۆیدا نیعمەتە، نیعمەتێکی گشتییەو هەموو کەس دەگرێتەوە، نیعمەتێکە لەجیهانی فانیو دەردو مەینەتی ئادەمیزاد دەگوێزێتەوە بۆ خانووی ئەبەدیو بەرفراوان.

﴿يَسْأَلُهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەموو دانیشتوانی ئاسمانەکانو زەوی داوا لەپەروەردگار دەکەن، بۆ دابینکردنی پێویستییەکانیان، ئەهلی ئاسمانەکان داوای لێخۆشبون دەکەن هەروەها فریشتەکانیش داوای رزقو رۆژییو لێخۆشبون بۆ ئەهلی سەرزەوی دەکەن، هیچ کەس نیە لەبونەوەردا پێویستی بەخودا نەبێ، هەموو شتێك بەگوێرەی خۆی ئاتاجی پەروەردگارە، هەموویان بەزمانی حاڵ یان بەزمانی گفتوگۆ لێی دەپاڕێنەوە داوای لێ دەکەن، وەلێ خودا هیچ پێویستییەکی بەکەس نیە ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ پەروەردگار هەموو رۆژێ هەموو ساتو کاتێك

ئیشی هەیە خەریکی بەڕێوە بردنی بونەوەرە، گیان دەبەخشێو دەمرێنێ ئەم نـزم دەکـاو ئـەو بـەرز دەکاتـەوە، ئـەم دێنێتـە دنیـاوەو ئـەو لـەدنیا دەردەچـێنێ ئـەم دەوڵەمەند دەکاو ئەو هەژار، ئـەو زەلیـل دەکـاو ئـەم عـەزیز فلاّن ساغە نەخۆشـی دەخـا فیـسار نەخۆشـە شـیفای دەدا لـەتاوانی ئـەم خـۆش دەبـێو سـزای تاوانبارێـك دەدا... ئیبنو جـەریرو طەبـەرانیو ئیبنـو عەساکیر لەعەبـدوڵڵای کوڕی مـونیبی (الازدی) یەوەریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ وتمان: ئەی پێغەمبەری خـودا! ئـەو (شـەئنە) چیە خـودا هـەموو ڕۆژێ خەریکیەتی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەوەیە لەتاوان خۆش دەبێ، تەنگانە لا دەبا، گەلو نەتەوەیەك بەرز دەکاتەوەو، گەلو نەتەوەیـەك دوا دەخـا... ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَـا تُكَـذِّبَانِ﴾ بـەکام نیعمـەت لەنیعمەتـەکانی خـودا بـڕوا ناکـەن، کـام نیعمەتـەی بـەدرۆ دەخەنــەوە، بێگومــان بــەڕێوەبردنی بونــەوەرو دابینکردنــی پێویستیاتی مـەخلوقاتی نیعمـەتانێکن کـەس ناتوانـێ ئینکارییـان بکا بـەهیچ کـس بەدرۆ ناخرێنەوە.

## تۆڵە لێستاندن لەسەر تاوانو پاداش دانەوە لەسەر کردەوەی چاك

﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ الثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن

نَارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾﴾

دوای رانواندنی برێك لەنیعمەتەكانی خودا بەسەر بەندەكانی لەژیانی دونیادا، ئەمجار باسی حیساب‌و لێكۆڵینەوەی ژیانی قیامەتیان بۆ دەكا: كە لەو رۆژەدا هەركەسەو بەگوێرەی كردەوەكانی پاداش دەدرێتەوە، كەس هەڵاتنی بۆ ناكرێ‌و رزگار بوونی نیە. دەفەرموێ: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَا الثَّقَلانِ﴾ لەوە بەولاوە دەستمان بۆتان بەتاڵ دەبێ ئەی كۆمەڵی ئادەمی‌و جندۆكە بۆئەوەی حیساب‌و لێكۆڵینەوەتان لەگەڵ بكەین‌و تۆڵەی تاوانەكانتان لێ بسێنین پاداشی چاكەتان بدەینەوە ئای لەم هەڕەشە توندوتیژەی پەروەردگار كە ئاڕاستەی ئادەمیزادو جندۆكەی كردوە. هەڕەشەیەك هیچ شتێك خۆی بۆ راناگرێ‌و هەموو شتێك لەگل‌وگۆ دەخا خودای باڵادەست‌و خاوەن تواناو دەسەڵاتی رەها، خۆی بۆ حیساب‌و لێكۆڵینەوەی ئەو دوو كۆمەڵە مەخلوقاتە بێ دەسەڵاتە تەرخان دەكا، بێگومان خودا هیچ شتێك لەشتێكی تر بێ‌ئاگای ناكا، پێویست ناكا بۆ ئەنجام دانی حیساب‌و لێكۆڵینەوەی مەخلوقات واز لەكاری تر بێنێ‌و خۆی بۆ ئەوە تەرخان بكا. وەلێ كە وای فەرموە ئەوە بۆ زێدە ترساندن‌و توند كردنی هەڕەشەكەیە.

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا﴾ ئەی كۆمەڵی جندۆكەو ئادەمیزاد! ئەگەر دەتوانن لەملاو لەولای ئاسمانەكان‌و زەوییەوە دەربچن‌و خۆتان لەچنگ قەزاو قەدەری خودا رزگار بكەن‌و بچنە شوێنێك خودا دەستی پێتان نەگا، دەڵێیان برۆنە دەرێ ئەوە عەرزو ئەوە گەز.

﴿لا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾ دڵنیابن ناتوانن لەئاسمان‌و زەوی دەربچن‌و خۆتان لەدەست خودا رزگار بكەن مەگەر بەهۆی توانایەكەوە بێ: كە لەمپەرەكان ببڕێ‌و

کۆسپەکان رامالّێ وەلحال ئەو هێزو توانایە هەر خودا هەیەتیو ئێوە دارای ئەوە نین. ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن، کام نیعمەتی بەدرۆ دەخەنەوە؟ هەندێك لەو نیعمەتانە ئاگادار کردنەوەی پێش وەختو ترساندنتانە لەسزا؟ بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن، هەروەها هەلّنانتان بۆ چاکەکردنو جلّەوگیری لێ کردنتان لەخراپە ﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِنْ نَارٍ﴾ ئەگەر لەفەرزی مەحالّدا لەئاسۆی ئاسمانەکانو زەوی دەربچن دەنێردرێ بۆ سەرتان —ئەی کۆمەڵی ئادەمیو جندۆکە- لافاوێك لەگڕو بلّێسەی ئاگری بێ دوکولّ ﴿ونحاس﴾ هەروەها دوکەڵی رەش، یان دەرژێنین بەسەرتاندا مسی تواوە. ﴿فَلا تَنْتَصِرَانِ﴾ هیچ لایەکتان ناتوانن یارمەتی لایەنەکەی ترتان بدا، ئەی کۆمەڵی ئادەمیو جندۆکە. هەرچی بکەن ناتوانن عەزابی خودا لەخۆتان دوور بخەنەوە. ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا ئێوە بڕوا ناکەنو کام نیعمەتەی بەدرۆ دەخەنەوە؟

## شەق بونی ئاسمانو حالّو وەزعی تاوانباران لەرۆژی قیامەتدا

﴿ فَإِذَا انشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَا يُسْأَلُ عَن ذَنبِهِ إِنسٌ وَلَا جَانٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾ يُعْرَفُ الْمُجْرِمُونَ بِسِيمَاهُمْ فَيُؤْخَذُ بِالنَّوَاصِي وَالْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا الْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾

يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾

له‌وه‌پێش په‌روه‌ردگار ترس و سامی حیساب و لێكۆڵینه‌وه‌ی قیامه‌ت و رزگار نه‌بوون له‌و حاڵه‌ی رانواند، ئه‌مجار باسی ئه‌و گۆڕانكارییه‌ ده‌كا كه‌ به‌سه‌ر بونه‌وه‌ردا دێ ده‌فه‌رموێ: ﴿فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ﴾ كه‌ رۆژی قیامه‌ت هات و ئاسمان شه‌ق‌وپه‌ق بوو وه‌كوو گوڵاڵه‌ سوره‌ سوور هه‌ڵگه‌ڕا توایه‌وه‌ وه‌كوو رۆنی قاڵ كراو یان ئاسمان وه‌كوو زه‌یت توایه‌وه‌ ره‌نگاوره‌نگ وه‌ستا وه‌كوو بۆیاخ ده‌مێ به‌سوری و ده‌مێ به‌زه‌ردو وه‌ختێك به‌شین و كاتێك به‌سه‌وز خۆی نواند، ئه‌وه‌ش له‌به‌ر ترسی زۆرو قورساییی به‌ڵاو موصیبه‌تی ئه‌و رۆژه‌ سه‌خته‌.

﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ به‌كام له‌نیعمه‌ته‌كانی خودا بڕوا ناكه‌ن و كام نیعمه‌تی ره‌ت ده‌كه‌نه‌وه‌ ئه‌ی كۆمه‌ڵی ئاده‌می و جندۆكه‌ بێگومان راگه‌یاندنی ئه‌و جۆره‌ هه‌واڵانه‌ ترس ده‌خاته‌ دڵ و ده‌روونه‌وه‌و له‌خراپه‌كاریی ده‌تانگێڕێته‌وه‌، كه‌وابێ ئه‌مه‌ش نیعمه‌تێكی گه‌وره‌ی په‌روه‌ردگاره‌.

﴿فَيَوْمَئِذٍ لا يُسْأَلُ عَنْ ذَنْبِهِ إِنْسٌ وَلا جَانٌّ﴾ ئه‌و رۆژه‌ی ئاسمان شه‌ق ده‌بێ و قیامه‌ت راده‌بێ، هیچ كه‌س له‌ئاده‌می و په‌ری پرسیاری تاوانه‌كانی لێ ناكرێ چونكه‌ هه‌موویان به‌روخساریان دیاره‌، له‌و كاته‌ی له‌گۆڕه‌كانیان راده‌بن و دێنه‌ ده‌ره‌وه‌ روڕه‌ش و چاو زه‌ردو خه‌م و خه‌فه‌تبارو سه‌رشۆڕن هه‌روه‌ها له‌به‌رئه‌وه‌ خودا هه‌موو كرده‌وه‌كانی تۆمار كردون و هه‌ركه‌سه‌ له‌نامه‌ی ئه‌عمالی دا باشی و خراپی رونكراوه‌ته‌وه‌.

موجاهید ده‌ڵێ: فریشته‌كان پرسیار له‌ تاوانباران ناكه‌ن چونكه‌ به‌سه‌رو سیماوه‌ ده‌ناسرێنه‌وه‌..

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَـذَا يَـوْمُ لا يَنطِقُـونَ. وَلا يُـؤْذَنُ لَهُـمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾ (المرسلات:٣٥-٣٦) هەڵبەتە قیامەت مەوقیف مەوقیفە لەو مەوقیفەدا پرسیاریان لێ ناکرێ، وەلێ مەوقیفی تر هەیە پرسیاریان لێ دەکرێ، نەك لەتاوانباران بەڵکوو لەهەموو کەس وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ. عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (الحجر:٩٢-٩٣) یان دەفەرموێ: ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْؤُولُونَ﴾ (الصافات:٢٤) دەی کەوابێ: ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئێوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیزادو جندۆکە بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن‌و کام نیعمەتەی بەدرۆ دەخەنەوە. کە بڕێك لەنیعمەتەکانی ئەم ئاگادار کردنەوە پێش وەخت‌و ترساندنەیە هەتا خەڵکی وەهۆش خۆ بینەوەو دەست لەکوفرو تاوان هەڵبگرن، پەروەردگار هۆی پرسیار لێ نەکردنیان لەو مەوقیفەدا رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يُعْـرَفُ الْمُجْرِمُـونَ بِـسِيمَاهُمْ فَيُؤْخَـذُ بِالنَّوَاصِـي وَالأَقْـدَامِ﴾ کافرو تاوانبارەکان رۆژی رابوونی قیامەت‌و هاتنە دەرەوەیان لەگۆڕەکان بەروخسارو دەم‌وچاویان دەناسرێنەوە، روڕەش‌و روزەرد، سەرشۆڕو خەفەتبارن، لەدوورەوە دیارن ئیتر بەقژی پێشسەرو قاچیان رادەکێشرێن‌و تورِ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە! واتە گرمۆڵە دەکرێن‌و قاچیان دەبرێتە لای قژی پێشەسەریان‌و دەخرێنە ناو ئاگرەوە.

﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام نیعمەت لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن‌و کام نیعمەتەی بەدرۆ دەخەنەوە؟ ئەوەتا پێش وەخت ئاگادار کراونەوەو ترسێندراون سەرەنجامی تاوانبارانتان پێ راگەیەندراوە. .

جا لەو کاتەدا: کە دەخرێنە ناو دۆزەخەوە بۆ زێدە سەرزەنشت‌و ئەزیەتدان پێیان دەگوترێ ﴿هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ ئەمە ئەو دۆزەخەیە تاوانباران بەدرۆیان دەخستەوە، ئەوا ئێوە چوونە ناوی‌و بەچاوی خۆتان بینیتان، دەسا بچێژن عەزابی سەخت‌و نەبڕاوەی ﴿يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ آنٍ﴾ ئیتر

تاوانباران لەناو دۆزەخدا دەمێك بەناگر دەسوتێندرێن و كاتێكیش ئاوی كوڵاتووی وەكوو مسی تواومیان بەقورگا دەكرێ، ریخۆڵەو ناوسكیان پارچە پارچە دەكاو دایدەپلۆخێنێ. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ. فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ﴾ (غافر/٧١-٧١٢) یان دەفەرموێ: ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُؤُوسِهِمُ الْحَمِيمُ. يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ. وَلَهُمْ مَقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ﴾ (الحج:١٩-٢١) دەی ئەم ترساندن و رونكردنەوە پێش وەختانە ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئێوە بەكام نیعمەتی خودا بڕوا ناكەن؟؟ ئەم ئاگاداركردنەوەو ترساندنە یەك لەدوای یەكانە نیعمەتی خودان و پێویستە بەرچاویان بگرن و بەخۆتاندا بچنەوە.

## نیعمەتە جۆراو جۆرەكان لەبەهەشتدا بۆ تەقواكاران

﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ ۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ

وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَـٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَـٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾

لەوەپێش باسی ئەو تەنگو چەڵەمانەی کرد: کە توشی تاوانباران دەبێ لەقیامەتدا، بەدبەختیو چارەڕەشی موشریكو یاخی بووانی نمایش کرد، ئەمجار لەبەرامبەر ئەوەدا باسی پاداشی تەقواکاران دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾ بۆ کەسێك لەخودا بترسیو یادی ڕۆژی حیسابو لێکۆڵینەوەی بەردەم بارەگای خودا بکا، دو بەهەشتی ماددیی ئەو شوێنو لەمزەتو رابواردنە جەستەییەی دەست دەکەوێ بەدوو جۆر خۆشی پاداشی دەدرێتەوە، ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕواناکەنو چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە، خۆ نیعمەتی بەهەشت بێ وێنەیەو بەردەوامو نەبڕاوەیە. مامۆستا سەیید دەفەرموێ: لەسورەتی بەقەرەوە تا ئێرە ئەمە یەکەمجارە قورئان باسی دوو بەهەشت بکا، وادیارە ئەو باغچانە لەناو بەهەشتی گەورەو بەرفراواندان، وەڵێ: کە لێرە باسیان دەکا دەگونجێ لەبەر زێدەخۆشیو بەرزییان بێ لەسورەتی (الواقعة)دا باسی ئەوە دەفەرموێ: کە بەهەشتییەکان دوو تاقمی گەورەو زۆرن، ﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ﴾و ﴿أَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ بۆ هەر تاقمێکیشیان نازو نیعمەت هەیە، لێرە وای بۆ دەچین ئەو دوو بەهەشتە بۆ تاقمی پلەوپایە بەرز بن لەوانەیە ئەو کۆمەڵە پێشکەوتوو نزیکەی خودا بن کە لەسورەتی واقیعەدا بە ﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ﴾.

﴿أُوْلَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ﴾ ئاماژەی بۆ کردن، ئەمجار باسی دوو باغچەی تر دەکا: کە لەدوو باغچەی تر نزمترن لەوانەیە ئەو دووەش بۆ تاقمێکی تر بن کە پلەوپایەیان لەخوار تاقمی پێشووەوە بێ وێدەچێ ئەوە (اصحاب اليمين) بن.

ئەمجار وەصفی دوو بەهەشتەکە دەکاو دەفەرموێ: ﴿ذَوَاتَا أَفْنَانٍ﴾ لقی دارو درەختیان سەوزو تەڕو تازەو بەدەماخن هەموو جۆرە میوەیەکیان پێوەیە یان ئەو دوو باغچەیە جۆرەها دارو درەختو میوەیان تێدایە. ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەی ئێوە بەکام نیعمەتی خودا بڕوا ناکەنو چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیو جندۆکە خۆ ئەم دیمەنو نازو نیعمەتە لەوانەن: کە هەوڵ دەدرێ وەدەستیان بێنن. ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾ لەهەردووك لەو بەهەشتانەدا دوو کانیاوی ڕەوان هەن، ئاوەکەیان ڕەوان دەبێ بۆ ئاودانی دارو درەختو گوڵو گوڵزاری ئەو دوو باخانە ئیتر لەهەمو میوەجاتێك بەرهەم دێنن حەسەنی بەصری دەڵێ: ئەو دوو کانیاوە یەکێکیان پێی دەگوترێ سەلسەبیل ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەنو چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە خۆ ئەوانە نازو نیعمەتێکی حەقیقیو ڕاستو دروستنو هیچ شكو گومانێك لەهەبوونیان نیە.

﴿فِيهِمَا مِنْ كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾ لەو بەهەشتانەدا لەهەموو جۆرە میوەو نەوعەکان دەخورێو لەززەتیان لێ وەردەگیرێ جۆرێکیان تەڕو تازەو جۆرێکیان وشکە هەردوکیان بەتامنو نازاندرێ کامەیان لەکامەیان خۆشترە هێندە نایابن شتی وا جوانو ڕازاوە بەچاو نەبینراوەو بەگوێچکە نەبیستراوەو بەخەیاڵیش بەسەر دڵدا ڕانەبردوە، ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەنو چ نیعمەتێك بەدرۆ دەخەنەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: نیعمەتی دونیا بەنیسبەت نیعمەتی قیامەتەوە هەر ناوەو ناوەڕۆك نیە واتە: بەرامبەریی ناکرێنو جوداوازیی نێوانیان زۆرە ئەو

بەهەشتیانە ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾ پاڵی لێ دەدەنەوە لەسەر چەند راخەرێك ناواخنەکەیان پارچە مەخمەری ئەستورە، ئەی دەبێ دیوی دەرەوەی چی بێ و چەند جوان و رازاوە بێ؟ لەسەعیدی کوڕی موسەیەبیان پرسی: کە ناواخنی راخەرەکانیان مەخمەری ئەستور بێ ئەی دەبێ بەرگ و دیوە ظاهیرەکەیان چۆن بێ؟ لەوەڵامدا وتی: ئەوەیە کە خودا فەرموویەتی ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ (السجدة:١٧) ئیبنوعەباس دەفەرموێ: باسی ناواخنەکەی بۆ کردون بۆ ئەوەی دڵتان پێی ئاشنا بێ و بیناسن، وەلێ دیوی دەرەوەی ئەو راخەرانە هەر خودا دەزانێ چۆنن !!

﴿وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾ میوەهاتی درەختەکانی ئەو دوو بەهەشتە بەیدەستن، هەر کاتێ بەهەشتییەکان بیانەوێ و چۆنیان بوێ ئاوا بۆیان حازرەو لەنزیکەوە بێ ماندوبوون دەیانچنن وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ (الحاقة:٢٣) یان دەفەرموێ: ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلاً﴾ (الانسان:١٤) وێڕای ئەو هەموو نازو نیعمەتە جۆراوجۆرانە ﴿فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلا جَانٌّ﴾ لەو دوو بەهەشتەدا حۆری شۆخ و شەنگ هەن، چاو بەدەرەوە نین و چاویان دەبڕنە مێردەکانیان، هەموویان کچن و لەوەپێش نە ئادەمی و نە پەری دەستیان لێ نەداون، لەبەهەشتدا دروست کراون. ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن و چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە؟؟

﴿كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ﴾ ئەو حۆریانە دەڵێی یاقوت و مەرجانن لەسپی و صافی و بێگەردیدا، جەستەیان صاف و لوس و سپی و ناسك و سەرکوڵمەیان سورو تا بڵێی جوان. ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن و چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە؟

﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾ ئایا پاداشی چاکە چاکە نیە؟ واتە: پاداشی کردەوەی چاك لەدونیادا بەهەشتی جوانو رازاوەیە لەقیامەتدا ئەم دوو بەهەشتە بۆ خاوەن باوەڕانی کردار چاکن ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەن، چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە؟

بەغەوی‌و بەیهەقی‌و ئیبنو ئەبی حاتەم‌و ئیبنو مەردەویهی لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ئایەتی ﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾ی خوێندەوەو فەرموی دەزانن خودا چی فەرمووە؟ هاوەڵان وتیان: خوداو پێغەمبەر دەزانن ئەمجار فەرمووی خودا دەفەرموێ: پاداشی کەسێك کە نیعمەتی یەکتاپەرستیی پێ ببەخشم‌و تۆفیقی بدەم بۆ ئەنجامدانی ئەو نیعمەتە جگە لەبەهەشتی جوان‌و رازاوە هیچی تر نیە.

## وەصفێکی تری باخەکانی بەهەشت

﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ

يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾

پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشودا باسی جوانیو رازاوەیی دوو باخچەی بەهەشتی کرد کە پاداشی تەقواکارو لەخواترسانە، ئەمجار وەصفی دو باخچەی تری بەهەشت دەکا کە لەخوار دو بەهەشتەکەی ترەوەن دەفەرموێ: ﴿وَمِنۡ دُونِهِمَا جَنَّتَانِ﴾ دوو جۆر باخی رازاوەی تر هەن لەبەهەشت دا بۆ لەخوداترسان، یان دوو باخچەی تر هەن لەخوار ئەو دوو باخچەیەی لەوەوپێش باس کران بۆ: کەسانێك ؛ کە پلەوپایەیان لەخوار پلەوپایەی ئەو تاقمەوەیە کە لەئایەتەکانی پێشودا باس کران.

ئەم دوو باخچەیەی لەم دوو ئایەتەدا وەصفیان دەکا بۆ تاقمێکن قورئان بە(اصحاب اليمين) ناویان دەبا واتە ئەوانەی: کە نامەی عەمەلیان دەدرێتە دەستی راستیان.

﴿مُدۡهَآمَّتَانِ﴾ ئەم دوو باخچەیە درەختەکانیان روەك و شیناوردیان چڕوپڕو زۆر سەوزو تەڕ دەماخن، ئەوەندە سەوزن رەش هەڵگەڕاون، ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام نیعمەتەی خودا بڕوا ناکەنو چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە.

﴿فِيهِمَا عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ﴾ لەو دوو بەهەشتەدا دوو کانیاوی هەڵقوڵاو هەن، ئاوەکەیان هەڵدەقوڵێ بۆ ئەوەی لەبەریان بڕوا وەکوو ئاوی دوو باخچەکەی تر.

﴿فَبِـأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَـا تُكَـذِّبَانِ﴾ بـەکام نیعمەتـەی خـودا بـڕوا ناکـەنو چ نیعمەتێکی رەت دەکەنەوە؟؟

﴿فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْـلٌ وَرُمَّـانٌ﴾ لەو دوو باخـەی بەهەشـتدا هەیـە میوەهـاتی زۆرو جۆراوجۆر بەتایبەتی خورماو هـەنار کـە دوو جۆرە میـوەی زۆر جـوانو فـرە بەسودن. ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئێوە بـەکام نیعمەتـەی خـودا بـڕوا ناکـەنو چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە؟ ﴿فِـيهِنَّ خَيْـرَاتٌ حِـسَانٌ﴾ لـەو دوو باخـەدا ئـافرەتی جەستە جوانو رەوشت شیرین هەن، روخسار جوانو رەفتار پەسەند.

﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَـا تُكَـذِّبَانِ﴾ بـەکام لەنیعمەتـەکانی خـودا بـڕوا ناکەنو کام نیعمەتی بەدرۆ دەخەنەوە.

ئەو ئافرەتە روخسار جوانو رەفتار شـیرینانە ﴿حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِـي الْخِيَـامِ﴾ چـەند جۆرێکن سـپیو صـافو بێگـەردو چاورەشـی چـاو گـەورە، داپۆشـراو لـەناو خەیمەکانی بەهەشـتدا خێمەی لەدوڕ دروستکراو ئەوان وەکوو ئافرەتی دونیا بەناو جادەو کۆلاّناندا هاتوچۆ ناکەن ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَـذِّبَانِ﴾ بـەکام لەنیعمەتـەکانی خودا بڕوا ناکەنو چ نیعمەتێکی بەدرۆ دەخەنەوە؟!

﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلا جَانٌّ﴾ لەوەپێش هیـچ کـەس لـەئادەمیو جنۆکـە دەستیان لێ نەداون، بەتایبەتی بۆ لەخوداترسانو تەقواکاران دروست کراون. ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەکام لەنیعمەتەکانی خودا بڕوا ناکەنو چ نیعمـەتێکی بـەدرۆ دەخەنەوە؟!

﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾ ئەو بەهەشتیانە پاڵیان داوەتـەوە لەسەر سەرینو دۆشەکی نەرمو شلو سەوز، فەرشی جوانو پـڕ نـەخشو نیگاریـان بۆ راخراوە: کە تـا بڵێی سـەرنج راکێشو جوانو نایـاب دروسـتکراون ﴿فَبِـأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَـا تُكَـذِّبَانِ﴾ بـەکام لەنیعمەتـەکانی خـودا بـڕوا ناکـەنو چ نیعمـەتێکی بـەدرۆ دەخەنەوە؟!

﴿هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾ ئایا پاداشی چاکە چاکە نیە، بەڵێ پاداشی ئیمانو کردەوەی چاکە بەهەشتی رازاوەیە.

﴿تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ بەرزو پیرۆزو پاکو بێ عەیبە خودای خاوەن کەرەمو بەخشش شیاوی ئەوەیە بەشکۆمەند بناسرێو کەس لێی یاخی نەبێ رێزی بگیرێو عیبادەتی بۆ بکرێ سوپاسگوزاریی بکرێ کوفرانی نیعمەتەکانی نەکرێ هەمیشە لەیاد بێو بیر نەچێتەوە.

تێبینی ئەوە دەکرێ: لەوەپێش لەدوای باسی نیعمەتەکانی دونیا فەرمووی: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ..﴾ بەمە ئاماژەی بەوە کرد کە جگە لەخودا هەموو مەوجودێك دەفەوتێ. دوا بەدوای باسکردنی نیعمەتەکانی قیامەتیش فەرمووی: ﴿تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ..﴾ بەمەش ئاماژەی بەوە کرد: کە ئەهلی بەهەشت بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوەو ذیکری خودا دەکەنو لەززەتی لێ وەردەگرن...!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی الواقعة

ئەم سورەتە (٩٦) ئایەتەو مەککییە، ناونراوە بەسورەتی (الواقعة) چونکە لەسەرەتای سورەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾. دوابەدوای سورەتی (الرحمن) چونکە لەچەند رویەکەوە پەیوەندییان بەیەکترەوە هەیە:

١- لە هەردوو سورەتەکەدا باسی قیامەتو بەهەشتو دۆزەخ هەیە.

٢- لەسورەتی (الرحمن)دا حاڵو وەزعی تاوانبارانو لەخوداترسان لەقیامەتدا کراوە، ئاماژە بەسزای سەخت بۆ تاوانبارانو پاداش بۆ تەقواکاران کراوە. لەم سورەتەشدا حاڵو وەزعی قیامەتو تەنگو چەڵەمەکانیو دابەشکردنی ئادەمیزاد بۆ سێ کۆمەڵو تاقمو سەرەنجامی هەرسێ کۆمەڵەکان رونکراوەتەوە.

٢- لەسورەتی (الرحمن) دا باسی شەق و پەقبوونی ئاسمانی کرد لەم سورەتەشدا باسی لەگرێژنەچوونی زەوی و وشەقەتۆڵە هاتنی دەکا. کەوابێ هەردوو سورەتەکە باسی رابوونی قیامەتیان لەخۆ گرتووەو ناوەڕۆکیان لێك دەچێ، هەرچەند تەرتیب و زنجیرەی نمایشکردنی باسەکان جوداوازییان هەیە.

## رابوونی قیامەت و دابەشکردنی ئادەمیزاد بۆ سێ تاقم

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾ وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾ فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾﴾

واقیعە ناوە بۆ سورەتەکەو ناوەڕۆکی باسەکەشیەتی، یەکەم مەوزوعێك: کە سورەتەکە باسی لێوە دەکا، مەوزوعی زیندوبوونەوەی قیامەتە، باسی رابوونی ئەو رۆژەیە: کە رۆژی حیساب و لێکۆڵینەوەیە، رەتدانەوەی ئەوانەیە گومانیان لەرابوونی هەیە، هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، قورئان بەدرۆ دەخەنەوە. بۆیە سورەتەکە بەباسی قیامەت دەست پێ دەکا هەموو قسەیەك دەبڕێ و هەموو شك و گومانێك دەڕەوێنێتەوە. دەفەرموێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾ کە قیامەت رابوو، هیچ

هێزێك نیە بتوانێ بەرگری بكاو نەهێڵێ رابێ. بەڵكوو هەردێو گومان لەهاتنیدا نیە ﴿لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾ كاتێك قیامەت رادەبێ كەس نیە بتوانێ بەدرۆی بخاتەوە كەس ئینكاریی ناكا روداوەكان لەبەرچاون‌و هیچ مەجالی گومان نیە!!

﴿خَافِضَةٌ رَافِعَةٌ﴾ ئەو رۆژە هەندێ كەس كە لەدونیادا بەرواڵەت بەرز بوون نەوییان دەكاو دەخرێنە ناو دۆزەخەوە، هەندێ كەسیش كە لەدونیادا بەرواڵەت هیچ‌و پوچ‌و پایین بوون، بەرزیان دەكاتەوە بۆ بەهەشت بەرێ دەكرێن. چونكە هەموو روداوێكی گەورە گۆڕانكاریی لەكێشانەی كۆمەڵگادا دەكا، دیارە روداوی رابوونی قیامەت لەهەموو روداوێك گەورەترە: كەوابێ دەبێ گۆڕانكاریەكەشی زۆر گەورە بێ تەرازوی كێشەكان بگۆڕێ، هەندێ نەوی بكاو هەندێ بەرز بكاتەوە.

﴿إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا﴾ ئەو كاتەی زەوی وەشەقەتۆڵە دەكەوێ‌و جم‌وجوڵی نا ئاسایی لێ رودەدا، دەكەوێتە تەكاندان‌و هەڵبەزو دابەز هەرچی شاخ‌و كێو هەیە هەمووی بەسەر یەكدا دەروخێ‌و تەخت دەبن. ﴿وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا﴾ كێوەكان وردو خاش كران. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيباً مَهِيلاً﴾ (المزمل:١٤).

﴿فَكَانَتْ هَبَاءً مُنْبَثًّا﴾ بوون بەتەپ‌وتۆزو گەردو چون بەهەوادا، قیامەت رابوو ئادەمیزاد زیندو كرانەوەو كێشی سارای مەحشەر كران. ﴿وَكُنْتُمْ أَزْوَاجاً ثَلاثَةً﴾ لەو رۆژەدا ئێوە بوون بەسێ تاقم (اصحاب اليمين، اصحاب الشمال ، السابقون المقربون). وەكوو لەوەدوا باسیان دەكاو دەفەرموێ:

١- ﴿فَأَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ﴾ ئەوانەی كە لەو رۆژەدا نامەی كردەوەكانیان بەدەستی راستیان وەردەگرن‌و بەرەو بەهەشت بەرێ دەكرێن چەند لەخۆشیدان‌و چەند بەختەوەرن؟ هەرمەپرسە چ خۆشی‌و بەختەوەرییەك دایان دەگرێ!!

٢- ﴿وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ﴾ ئەوانەی لەو رۆژەدا نامەی عەمەلیان بەدەستی چەپ وەردەگرن‌و راپێچی ناو دۆزەخ دەکرێن ئای چەند بەدبەختو چارەڕەشن، چەند خەسارەتمەندو بەفتارە چۆن؟ هەر باس ناکری‌و نایەتە گوفتار.

٣- ﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ. أُولَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ. فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ هەموو دەست پێشخەرەکان بۆ ئیمانهێنان لەگشت گەل‌و نەتەوەیەك، ئەوانەی زوو بەپیر بانگەوازیی پێغەمبەران‌و بانگخوازانی ئایینەوە چون‌و ئیمانیان هێناوەو تۆبەیان لەتاوان‌و تاوانباریی کردوەو رویان کردۆتە کاری چاکەو بەدڵسۆزیی خوداپەرستیان ئەنجام داوە ئەوانە دەستەی یەکەمن بۆ چوونە ناو رەحمەتی خوداوە، بۆ وەرگرتنی پاداشی باش‌و پلەوپایەی بەرز، ئەوانە نزیك خراوەن لەرەزامەندیی خودا ، بۆ هەتاهەتایە نیشتەجێ دەکرێن لەناو بەهەشتدا.

ئیمام ئەحمەد لەخاتو عائیشەوە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەت دەکا: کە فەرمویەتی: دەزانن کێ لەرۆژی قیامەتدا پێش هەموو کەس دەچنە ژێر سێبەری عەرشی خوداوە؟ هاوەڵان عەرزیان کرد: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوانەن: کە حەقیان پێ درا قبوڵی دەکەن، ئەگەر داوای حەقیان لێ کرا دەیدەن، حوکم بۆ کەسانی دیکە دەکەن وەکوو ئەوەی حوکم بۆ خۆیان بکەن.

## جۆرەکانی نیعمەتی خوداپەرستە دەست پێشخەرەکان

﴿ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلْآخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَـٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ

وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ ﴾

لەوەپێش باسی تاقمی سێیەمی کرد، کە بەندە ڕاستاڵە دەست پێشخەرەکانن، ئەمجار لێرەدا جۆری نیعمەتەکانیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿ثُلَّةٌ مِنَ الآوَّلِينَ. وَقَلِيلٌ مِنَ الْآخِرِينَ﴾ ئەو دەست پێشخەرە لەخودا نزیکانە لەگەل‌و نەتەوە پێشینەکان کۆمەڵێکی زۆرن‌و لەهەژمار نایەن، کەمێکیشیان لەم ئوممەتەن! لەواقیع زۆرن وەلێ کەمییەکەیان بەنیسبەت هی گەل‌و نەتەوە پێشینەکانە.

ئەمجار باسی ڕابواردن‌و کۆڕ بەستنیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿عَلى سُرُرٍ مَوْضُونَةٍ. مُتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ﴾ ئەوان لەبەهەشتدا دادەنیشن لەسەر کورسی‌و قەرەوێڵەی بەبزماری ژێر داکوتراوو دۆشەگی چنراو بەدەزوی لەزێڕ دروستکراون بەدرڕو یاقوت‌و زوبەرجەد نەخشێنراوو ڕازاوە، لەسەر ئەو کورسی‌و سەریرانە پاڵی لێ دەدەنەوە بەرامبەر بەیەك‌و دەم بەپێکەنین‌و دەم‌و چاو گەشاوەن وەرز نابن‌و کێشەیان تێ ناکەوێ‌و ڕقیان لێك هەڵناسێ.

﴿يطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ﴾ بۆ خزمەتکردن‌و دڵ ڕاگرتنیان چەند گەنجێکی تازەلاو ڕوخسار جوان بەسەریاندا دەسوڕێنەوە، ئەو خزمەتچییە لاوانە پیر نابن‌و ڕەنگ‌و ڕوخساریان ناگۆڕێ، بەسەر بەهەشتییەکان دا دەسوڕێنەوە

﴿بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ﴾ بەسوراحیو پەرداخو پیاڵەی بێ دەسكو دەسكدار، پڕ لەشەرابی نایابو هەڵێنجراو لەسەرچاوەو كانیاوە هەڵقوڵاوەكانی بەهەشت، صافو بێگەردو بۆنخۆشو فەرەحبەخشو مەست نەكەر ﴿لا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلا يُنْزِفُونَ﴾ بەخواردنەوەی ئەو مەیە سەریان نایەشێو سەرخۆش نابنو عەقڵو هۆشیان لەدەست نادەن. ﴿وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ﴾ هەروەها میوەی نایابو هەڵبژاردەو پەسند كراویان بەسەردا دەگێڕن، چ میوەیەكیان حەز لێ بێ بۆیان دەستەبەر دەكەن. ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ هەرچی ئارەزۆ بكەن لەگۆشتی پەلەوەرو باڵندە بۆیان دابین دەكەنو دەیخەنە بەردەستیان.

﴿وَحُورٌ عِينٌ. كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ﴾ وێڕای ئەو نازو نیعمەتانەیان حۆری سپیو سۆڵی چاوڕەشو چاو گەورەیان بۆ ئامادە كراوە: كە تابڵێی ڕەشایی چاویان ڕەشەو، هەتا خودا حەز بكا جوانو ناسكن دەڵێی: دوڕڕی ناو صەدەفن، دەستیان لێ نەدراوە.

﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەم نازونیعمەتو بەخششانە لەپاداشی كردەوە باشەكانیانە.

﴿لا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلا تَأْثِيماً. إِلَّا قِيلاً سَلاماً سَلاماً﴾ بەهەشتیەكان لەبەهەشتدا قسەی بێ هودەو پڕوپوچو بێمانا نابیسن، جنێو بەیەكدانو تانوت لێكدان نیە، یەكتر شكاندنو دڵ ڕەنجاندنی تێدا نیە. بەڵكوو شیرینترین قسەو گفتوگۆ لەیەكتر دەبیسنو سڵاوو ڕۆژباشو چاكو چۆنی لێكدی دەكەن. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ﴾ (ابراهيم: ٢٣).

## نيعمەتەكانى (أصحاب اليمين)

﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْآخِرِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾

لەدواى دياريكردنى نيعمەتى بەندە دەست پێشخەرو لەخودا نزيك خراوەكان دێتە سەرباسى نازو نيعمەت ئەو خوداپێداوانەى رۆژى قيامەت نامەى ئەعماليان لەلاى راستەوە دەدرێتێ، دەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ ؟ ئەصحابوليەمين چى ئەصحابوليەمين؟ هەر مەپرسە چەند بەختەوەرنو چ نازو نيعمەتێكيان هەيە!؟ ئەمانە ئەو ئەصحابى يەمينەن كە لەسەرەتاى سورەتەكەدا باسى كردن. پلەو پايەيان لەخوار پلەو پايەى كۆمەڵە دەست پێشخەرە لەخودا نزيك خراوەكانەوەن چونكە لەدونيادا خوداپەرستىو دڵسۆزييان لەوان كەمتر بووە نازو نيعمەتيان كەمتر دەبێ. وەڵێ وێراى ئەوەش شوێنو مەكانيان خۆشو دڵگيرەو لەخۆشىو شاديىدان، ﴿فِي سِدْرٍ مَخْضُودٍ﴾ لەژێر سێبەرى دارى نەبقى بێ چقڵو گەڵاى زۆرو بەرەونەقدا دەبن ﴿وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ﴾ لەناو باخى مۆزدا؛ كە هێشوەكانى چين چين لەسەر يەكنو لاسكى مۆزەكە ديارنيە. ﴿وَظِلٍّ مَمْدُودٍ﴾ لەژێر سێبەرى

بەردەوامی درەختەکانداندو هەتاویان لێ نادا ﴿وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ﴾ ئاوی هەڵڕژاوو رەوان: کە هەمیشە دەکشێ و جوانیی بەباخ و باخاتەکان دەبەخشێ. ﴿وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ﴾ هەمیشە وان لەناو میوەهاتی زۆرو جۆراوجۆردا، ﴿لا مَقْطُوعَةٍ وَلا مَمْنُوعَةٍ﴾ ئەو میوەهاتە نابڕێ و لەکەس قەدەغە ناکرێ، وەکوو میوەی دونیا نیە بۆ هەندێ کەس هەبێ و هەندێ دەستی نەکەوێ، برێ کات هەبێ و برێ کات ببڕێ. ﴿وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ﴾ ئەونەی نامەی ئەعمالیان بەدەستی راست وەردەگرن، لەسەر سەریرو قەرەوێڵە دادەنیشن، فەرشی پاکوخاوێن و بەنرخ و بەرز لەروی مادی و مەعنەوییەوە بۆ ئەوەی لەسەریان لەگەڵ حۆرییەکانیان رابوێرن. ﴿انا أنشأناهن انشاءا﴾ ئێمە ئەو حۆرییانەمان بۆ دروست کردون، ﴿فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَاراً﴾ کردومانن بەکچ، هەموویان چوارده ساڵ و دەست لێ نەدراون، هەرکاتێ بچنە لایان کچن و ئێش و ئازاریان نابێ ﴿عُرُباً أَتْرَاباً﴾ هەموویان هاو تەمەنن و خۆ خۆشەویست کەرن لای مێردەکانیان، ﴿لِأَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾ ئەمانە هەموو بۆ ئەصحابولیەمینەکانە. ئەوانەی نامەی ئەعمالیان دەدرێتە دەستی راستیان ﴿ثُلَّةٌ مِنَ الأَوَّلِينَ. وَثُلَّةٌ مِنَ الْآخِرِينَ﴾ کۆمەڵێکیان لەخاوەن باوەڕە پێشینەکان و کۆمەڵێکیشیان لەخاوەن باوەڕەکانی دواین: کە ئوممەتی پێغەمبەری ئیسلامن.

## سزای ئەوانەی نامەیان دەدرێتە دەستی چەپیان لەقیامەتدا

﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُواْ

يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَأَكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾

لەوەپێش باسی نازونیعمەتی دوو کۆمەڵی خوداپێداوی کرد: کە کۆمەڵی (السابقون) دەست پێشخەرو کۆمەڵی ئەصحابولیەمین بوون. ئەمجار لێرەدا باسی کۆمەڵێکی تردا دەکا بەدبەختو چارەڕەشو لەناو عەزابی جۆراوجۆردا دەتلێنەوەو رزگار بوونیان نیە. دەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ﴾ ئەوانەی نامەی عەمەلیان بەدەستی چەپ وەردەگرن کێنو لەچ حاڵو وەزعێکدا دەبن؟! هەر مەپرسە چی! دەبێ چ عەزابێکی سەختو دژواریان بدرێ؟!

ئەمجار پەروەردگار سزاکەیان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ﴾ ئەوانە وان لەناو بۆگەنو هاڵاوو گڕەی گەرمی ئاگردا، ئاوی کوڵاتووی زۆر گەرمیان بەقوڕگدا دەکرێ. ﴿وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ﴾ لەژێر سێبەری دووکەڵی رەشی دۆزەخدان، ﴿لا بَارِدٍ وَلا كَرِيمٍ﴾ وەکوو سێبەری تر فێنکایی تێدا نیە، دیمەنی جوانو دڵگیر نیە، خێرو بەرەکەتی تێدا نیە بێ سودو قازانجە. تێبینی ئەوە دەکرێ باسی (سەمومو حەمیم)ی کردو ناوی ئاگری نەهێنا، بۆ ئەوەی ئاماژە بکا پێیان لەسەر

ناخۆشی عەزابی ئاگرەکە: چونکە لەکاتێکدا ئەو هەوایەی هەڵی دەمژن ژەهرو بۆگەن بێ، ئاوی خوردنەوەیان ئاوی کوڵاتوو بێ، کە ئەمانە لەدونیادا هۆی رەحەتیو فێنکایین دەبێ ئاگرەکەیان چۆن بێ لەقیامەتدا !! لەکاتێکا لەدونیاشدا سوتێنەرە!؟ کەوابێ هەر مەپرسە چەند گەرمو سوزمەندیە.

ئەمجار هۆی ئەو عەزابو ئەشکەنجەدانەیان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُتْرَفِينَ﴾ ئەوان لەژیانی دونیادا بەنازەمزۆی خۆیان رایان بواردووە، سەرگەرمی دابین کردنی شەهوەتو نارەزۆبازیی خۆیان بوون ، هیچ گوێیان بەحەلاڵو حەرام نەداوە، ئامۆژگاریی پێغەمبەرانو بانگخوازان رێبازی خودایان بەلاوە پەشم بوو ﴿وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنْثِ الْعَظِيمِ﴾ سور بوون لەسەر ئەنجامدانی تاوانی گەورەو تۆبەیان لێ نەدەکردن، هاوەڵیان بۆ خودا دادەناو بتو صەنەمیان دەکردنە هاوشانیی، رابوونی قیامەتو زیندوبونەوەیان بەلاوە درۆ بوو، ﴿وَكَانُوا يَقُولُونَ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ﴾ دەیانگوت: ئایا ئەگەر ئێمە مردینو بوینە گڵو خۆڵو ئێسقە رزیو تازە زیندوو دەکرێینەوە؟! خۆمان هیچ، ئەدی باوکو باپیرانمان چۆن زیندوو دەکرێنەوە دوای تێپەڕبوونی ئەو هەمو رۆژگارە بەسەر مردنیانـدا؟! واتە: بەهیچ جۆرێك نەخۆمانو نە باوكو باپیرانمان زیندوو نابینەوەو نابنەوە،

پەروەردگار رەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ لَمَجْمُوعُونَ إِلَى مِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، پێیان بڵێ باوكو باپیری رابردوو لەمێژینەتان: کە پێتان وایە لەبەر زۆر کۆنیو تێپەڕبوونی زۆر ساڵو رۆژگار بەسەریاندا زیندوونابنەوەو ئەوانو خۆتانو ئەو وەچەو نەوانەشتان کە لەدوای ئێوەوە دێنو دەمرنو هەموتان تێکڕا دوای مردن زیندوتان دەکەینەوەو لەسارای کاکی بەکاکی مەحشەردا کۆتان دەکەینەوە بۆ حەقو حیساب لەرۆژێکی دیاری کراودا، هیچ پاشو پێشی تێدا ناکرێو کەمو زیاد ناکا کاتێك بەخۆتان

دەزانـن وا لەسـاراى مەحـشەردا كۆكراونـەوە، وەكـوو لەئایـەتێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ بِالسَّاهِرَةِ﴾ (النازعـات١٣-١٤) یـان دەفـەرموێ: ﴿ذَلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ وَذَلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ وَمَا نُؤَخِّرُهُ إِلَّا لِأَجَلٍ مَعْدُودٍ يَوْمَ يَأْتِ لا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ (هود:١٠٣-١٠٥)

ئـەمجار پـەروەردگار بـڕی دیـاردەی سـزای خـواردنو خواردنـەوەیان دەسـت نیشان دەكاو دەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ لَآكِلُونَ مِنْ شَجَرٍ مِنْ زَقُّومٍ فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ﴾ بێگومـان ئێـوە ئەی كۆمەڵی گومڕاو سەرلێـشێواوان، ئـەی ئەوانـەی: كـە ئینكاریی هـەبوونی خـودا دەكـەنو بڕواتـان بەتاكوتـەنهایی خـودا نیـە، پێغەمبـەرەكانی بـەدرۆ دەخەنـەوە، زیندوبونەوەو حیسابو لێكۆڵینەوەی رۆژی قیامەتتان بەلاوە درۆیە، دڵنیـا بـن: كـە ئـەو رۆژە هـەر دێو دەكەونـە نـاو سـزای سـەختی دۆزەخـەوەو، بـڕێ لەعـەزابی بـۆ دیاریكراوتان ئەوەیە لـەدرەختی زەققـوم دەخـۆن، ئـەو درەختـەی هێنـدە ناشـیرینە قێزی لێ دەكرێ، بەرەكەشـی تـاڵو تفـتو بۆگەنـە، هێنـدەتان برسـی دەبـێ گـەدەی خۆتـانی لێ دەئـاخنن، ئـەمجار ئێـوە دوای خـواردنی نـاخۆشو تفـتو تـاڵ ئـاوی كوڵاتووشـی بەسـەردا دەكـەن، خواردنـەوەتان لـەو ئـاوە كوڵاتـووە وەكـوو ئـاو خواردنەوەی حوشتری تینو دەبێ هەر لێی دەخۆنەوەو تینوایەتیتان ناشكێ، واتـە : ئـاو خواردنـەوەتان بەشێوەیەكی ئاسایی نیـە بـەڵكو وەكـوو ئـاو خواردنـەوەی ئـەو حوشـترانە وایـە: كـە توشـی جـۆرە نەخۆشـیەك دەبـن، هـەر ئـاو دەخۆنـەوە تینوایەتییان ناشكێ تـا دەتـەقن. دۆزەخییـەكانیش لـەو ئـاوە كوڵاتـووە دەخۆنـەوەو تینوایەتیان ناشكێ. ﴿هَذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ﴾ ئـەم خـواردنو خواردنـەوەی باسـمان كـردن لـەخواردنی زەققـەموتو خواردنـەوەی ئـاوی كوڵاتـوو ئـەوە زیافـەتو میواندارییانە لەرۆژی سزادان

ئەوەیان دەرخوارد دەدرێ بەڵکوو ئەوە بڕێکە لەسزاو پێشەتای سزاکەیانە وێڕای ئەو سزایە سزای تریشیان دەدرێ.

## بەڵگە لەسەر خودایەتی خوداو هەبوونی توانای رەها لەسەر زیندوکردنەوەو دانەوەی پاداش و سزا

﴿ نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ

﴿أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَـٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَـٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾

لەوەپێش باسی حاڵو وەزعی هەرسێ تاقمەکەی کرد_السابقون، ئەصحابو المیمەنە، ئەصحابو المشئمەـسەرەنجامی هەرسێکیانی رون کردەوە، ئەمجار رەددی ئەوانەی دایەوە کە پەیامی خودا بەدرۆ دەخەنەوە، بەڵگەی جۆراوجۆری لەسەر خودایەتی خۆی هێنایەوە بەوە کە رزقو رۆزی مەخلوقات دەدا، بڕیاری زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەی رۆژی قیامەتی دوپات کردەوە فەرموی: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلا تُصَدِّقُونَ﴾ ئێمە سەرەتا لەنەبوەوە ئێوەمان دروستکرد، بۆ خۆتان دان بەوەدا دەنێن‌و ئەوە دەزانن ئەدی بۆچی بڕوا بەزیندوبوونەوە ناکەن؟ خۆ کەسێك بتوانێ سەرەتا شتێك دروست بکا دەتوانێ جارێکی دی دروستی بکاتەوە. ﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ﴾ نیشانم بدەن‌و پێم بڵێن: کە ئەو تۆماوەی دەیخەنە ناو رەحمی ئافرەتانەوە، ئایا ئێوە لەمنداڵدانـدا رەنگی دەرێژن‌و ئادەمیزادی لێ دروست دەکەن؟ یان خودا بەدیهێنەرەو ئەو ئەو کارە ئەنجام دەدا؟ بێگومان خودا لەو دڵۆپە مەنییە ئەو ئادەمییە دێنێتە وجودو رێکی دەخاو پەروەردەی دەکا ژیان‌و تەمەنی، رەنگ‌و روخساری رزق‌و رۆژیی دەست نیشان دەکا.

﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنْشِئَكُمْ فِي مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ ئێمە مردنمان لەنێواندا دابەش کردون‌و تەمەن‌و ئەجەلی هەریەکێك لەئێوەمان دیاریی کردوە، هی واتان هەیە تەمەنی درێژ دەکەین‌و بەپیری دەیمرێنین، هی واشتان هەیە تەمەنی کورتەو بەگەنجی یان بەساوایی ژیانی لێ دەستێنینەوە. بەڵام هەمووتان پیاڵە شەرابی مردن دەچێژن‌و لەیاسای مردندا یەکسانن هیچ شتێك ناتوانێ ببێتە لەمپەرو نەهێڵێ ئەو کارە ئەنجام بدەین،

بەڵكوو ئێمە دەتوانین ئێوە لەناو بەرین‌و لەجیاتی ئێوە چینێکی تر بخەینە گۆڕەپانی ژیانەوە، بەڵكوو دەتوانین شێوەو روخساریی تر بدەین بەچینی تازە کە ئێوە نایزانن.

بەکورتی ئێمە بڕیاری مردنمان بۆ ئێوە داوە، دەتوانین بەشوێن ئێوەدا چینی تر بێنین لەشكڵ‌و شێوەی ئێوە بۆ ئەوەی ژیان لەسەر زەوی بەردەوام بێ، دەشتوانین بەشێوەی تر دروستتان بکەین، شكڵ‌و روخسارتان بگۆڕین.

یان مانای ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ ئەوەیە دەفەرموێ:دەتوانین لەدوای مردنتان لەقیامەت ئێوە دروست بکەینەوە بەشێوەیەك: کە ئێوە هیچی لەبارەوە نازانن جگە لەوەی کە خودا خۆی هەواڵی داونێ، واتە ئێمە دەسەوسان نین لەدروستکردنی نموونەی ئێوەو دروستکردنەوەتان جارێکی دی پاش مردن‌و رزین‌و بوونتان بەخاك‌و خۆڵ ئێوە ئەی ئادەمیزاد خۆتان دان بەوەدا دەنێن کە لەسەرەتادا بەدیهێنەر خودایە، دەی کەسێك بتوانێ لەسەرەتادا لەنەبووەوە ئێوە دروست بکا، دەشتوانێ جارێکی تر دوای مردنتان دروستتان بکاتەوە، ئەمە شتێکی ئاشکراوو بەڵگە نەویستە.

﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلا تَذَكَّرُونَ﴾ بێگومان زانیوتانەو دەزانن: کە خودا یەکەمجار لەنەبووەوە دروستی کردون، سەرەتا لەدڵۆپە ئاوێك‌و دوایی ئەو دڵۆپە ئاوە بوەتە خوێنپارەو پاشان گۆشتپارە ئەمجار پەیکەری ئێسقان‌و دوایی بەگۆشت داپۆشیوە، گیانی بەبەردا کردوەو ئامێری بیستن‌و دیتن‌و دڵ‌و باقی ئەندامەکانی تری ئێوەی هێناوەتە دێ‌و کردونی بەو ئادەمیزادە جوان‌و هەستیارو داناو لێزانە، ئەریّ ئێوە بۆ ئەوەندە سەرڕەق‌و ڤیرسیچەمەن بۆ بیر لەوە ناکەنەوە: کە مادام خودا بتوانێ سەرەتا ئاوا دروستتان بکا دەشتوانێ جارێکی دی پاش مردن دروسستان بکاتەوە نەدەبوو ئێوە لەوەدا هیچ گومانێکتان هەبێ، دەبوایە بەبێ سێ‌و دوو ئەوەتان وەربگرتایەو بڕواتان پێ بکردایە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ (الروم:٢٧) یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلا يَذْكُرُ الْإِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئاً﴾ (مريم:٦٧) یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (يس:٧٩) یان دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدىً أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ (القيامة ٣٦-٤٠).

ئەمجار جارێکی تر بەشێوەیەکی لەسەرخۆو چەسپێنەر بەڵگەیەکی تر رادەنوێنێ لەسەر دەسەڵاتو بەتوانایی خودا، موعجیزەیەکی بەرچاوو دووبارەوەبوو نیشانی ئادەمیزاد دەداو سەرنجیان رادەکێشێ بۆ لێ وردبونەوەییو بڕواکردن پێیو دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾ پێم بڵێن: ئەوەی ئێوە دەیکێڵن، زەوی هەڵدەگێڕنەوەو تۆوی تێ دەکەن، ئەرێ ئێوە ئەو تۆوە دەروێنن یان ئێمە دەیرووێنین؟ رۆڵی ئێوە جگە لەکێڵانو تۆو پێوەکردن چی ترە؟ بێگومان ئێمە دەیڕوێنینو شینی دەکەینو پێی دەگەیەنین، وا دەکەین ئەو دەنکە تۆمە رێگای خۆی بگرێو قۆناغەکانی پێگەیشتن بگرێتە بەرو پێیاندا بڕواو هەڵە نەکا. بێگومان دەستی قودرەت سەروکاریی دەکاو پەروەردەی دەکاو پێی دەگەیەنێ. ئەو کاروانە سەرسوڕهێنەرەی پێ ئەنجام دەدا، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ساڵانەو وەرزانە دیاردەی تۆو کردنو شین بوونی دانەوێڵەو پێگەیشتن دوبارە دەبێتەوەو ئادەمیزاد بەچاوی خۆی دەیبینی هەرگیز عەقڵ پەی پێ نەدەبردو خەیاڵ تارمایی نەدەدی. چ عەقڵێك بڕوای بەوە دەکردو چ خەیاڵێك تارمایی ئەوەی دەدی کە ئەو دەنکە دانەوێڵەیە ئەو هەموو لاسكو پرژو گەڵاو هەیتو هوتەی لەخۆ گرتووە یان ئەو دەنکە خورمایە هەموو ئەو رەگو قەدو لقو پۆپو میوەیەی تێدایە؟؟ چ عەقڵێك خەیاڵ کێشی دەکرد بۆ ئەوەی ئەم دیاردە سەرسوڕهێنەرانە تەصەوور بکا؟

﴿لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَاماً فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ إِنَّا لَمُغْرَمُون بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ واتە: ئێمە بەلوطفو رەحمەتی خۆمان دەیڕوێنینو پێی دەگەیەنین، خۆ ئەگەر مەیلمان لێ بوایە وشکمان دەکردەوە، پێش پێگەیشتنو دروێنەکردنی دەمانکردە پوشو پەلاشو هیچ سودتان لێ نەدەبینی، ئەو کاتە ئێوە سەرسام دەبوونو دەکەوتنە پەکوپەکو، دەتانگوت: مایەپوچ خۆمانو مالوێرانو خەسارەتمەند خۆمان، بەلکوو دەتانگوت: ئێمە بەتێداچوونی کشتوکالەکەمان خۆشمان تێداچوینو دەفەوتێین. رزقوروزیمان لێ بڕاو هیوا بڕاو بووین.

وەلێ خودا بەفەضلو رەحمەتی خۆی پێی دەگەیەنێو وای لێ دەکا میوەو بەروبومتان بداتێ سودی لێ وەربگرن. هەر خودا یە رێگا دەدا ئەو روەکە یان ئەو درەختە رۆلی خۆی بگێڕێو کاروانی خۆی تەواو بکا، ئەو قۆناغانەی دەنکە تۆمێك دەیانبڕێ هەمان قۆناغن کە دلۆپە مەنی لەناو رەحەمدا دەیانبڕێ. هەردوکیان نمونەی گیانو وینەیەکن لەوێنەی ژیان کە دەستی قودرەت دروستی دەکاو چاودێری دەکا.

﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ أَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ﴾ ئەی ئادەمیزادینە پێم بلێن: ئەو ئاوە شیرینەی دەیخۆنەوەو گڕی تینوەتی خۆتانی پێ دادەمرکێنن، ئایا ئێوە لەهەورەوە باراندوتانە، یان ئێمە بەقودرەتو فەضلو رەحمەتی خۆمان باراندومانە؟ ئەدی خۆ ئێوە دەزانن ئێوە توانای ئەوەتان نیە باران بباریێنن، بەناچاریی دان بەوەدا دەنێن کە خودا باران دەبارێنێ. دەی بۆچی دان بەتاكو تەنهایی خودادا نانێن، بۆ بڕوا بەهاتنی قیامەتو زیندوبوونەوە ناکەن؟!

﴿لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجاً فَلَوْلا تَشْكُرُونَ﴾ ئێوە هیچ رۆلێکتان نیە لەبارانەدنی باراندا، بارینی باران هەر بەدەست خودایەو هەر ئەو دەتوانێ باران ببارێنێ... خۆ ئەگەر مەیلمان لێ بوایە دەمانکردە سوێراوو بەکەلکی خواردنەوەو ئاودێری

نەهاتایە دەی بۆچی ئێوە سوپاسی خودا ناکەن و نیعمەتی ئەوەتان لەبەرچاو نیە کە خودا بەفەضلی خۆی ئاوی شیرینی بۆ باراندون لێی دەخۆنەوەو کشتوکاڵی پێ ئاودێر دەکەن و ئاژەڵتانی پێ ئاو دەدەن. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَكُمْ مِنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ يُنْبِتُ لَكُمْ بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالأَعْنَابَ وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل:١٠-١١). ئیبنو ئەبی حاتەم لەئەبوجەعفەرەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ): کە ئاوی دەخواردەوە دەیفەرموو (الحمد لله الذى سقانا عذبا فراتا برحمته ولم يجعله ملحا اجاجا بذنوبنا) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەیە: کە بەرەحمەتی خۆی ئاوی شیرین و گوارای بۆ دابین کردوین، بەهۆی تاوان و سپڵەیمان نەیکردوە بۆ سوێرو تاڵ و تفت.

ئەمجار نیعمەتێکی تر نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ أَأَنْتُمْ أَنْشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنْشِئُونَ﴾ پێم بڵێن و نیشانم بدەن ئەو ئاگرەی هەڵی دەگیرسێنن ئایا ئێوە دارەکەیتان دروست کردوە یان ئێمە دروستمان کردوە؟!

لەناو وڵاتی عەرەبدا دوو درەخت هەن (مەرخ و غەفار) ئەم دوو درەختە ئەگەر لێکیان بدەی ئاگریان لێ پەیدا دەبێ، لقێ لەم و لقێ لەو بێنە لێکیان بخشێنە ئاگریان لێ دەردەچێ. ﴿نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعاً لِلْمُقْوِينَ﴾ ئێمە ئاگری دونیامان کردوە بەبیرخەرەوە، ئاگری دۆزەخیان بیر دەخاتەوە، هەم سودو قازانجی هەیە بۆ رێبواران و دانیشتوانی سارا واتە ئەوانە پتر پێویستیان بەئاگر هەیە، ئەگینا هەموو کەس و هەموو کاتێ پێویستی بەئاگر هەیە.

بێگومان کەشفکردن و دۆزینەوەی ئاگر لەلایەن ئادەمیزادەوە رووداوێکی گەورەو وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لەکاروانی ژیانیدا، دەتوانرێ بگوترێ: گەورەترین رووداوێکە: کە شارستانییەت لییەوە دەستی پێکردوە، بەڵام چونکە زۆر بووە ئولفەتی پێوە گیراوە بۆتە شتێکی ئاسایی و سەرنجمان راناکێشێ بەهەر حاڵ

مـوعجیزەی ئـاگرو نهێنـیٚ ئـەو مادەیـە بومتـە کەرەسـەی لێکۆڵینـەوەی زانایـانو لێکۆڵەرەوەکانو ئەوان پتر لەکەسانی دیکە نرخی ئەو مادە سەرسوڕهێنەرە دەزانن. بەڵێ پەروەردگار ئاگری ئاسایی دونیای کردوە بەبیرخەرەوەی ئاگری دۆزەخ، بێجگە لەوەی: کە زۆربەی کارەکانی ژیانی ئادەمیزاد بەهۆی ئاگرەوە ئەنجام دەدریٚ.

ئیمام ئەحمەدو بوخاریو موسلیم لەئەبوهورەیرەوە لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا: کە دەفەرمویٚ: ئـاگری دونیـا کـە ئـادەمیزاد دایدەگیرسـێنیٚ بەشـێکە لەحـەفتا بەشـی ئـاگری دۆزەخ، واتـە: ئـاگری دۆزەخ حـەفتا هێنـدەی ئـاگری دونیـا گەرمـە. ئەوەش لەیاد نەکەین لەیاسای ئابوری ئیسلامی دا سیٚ شت بـۆ هـەموو کـەس چـون یەکنو تیٚیدا شەریکن - ئاگرو لەوەڕو ئاو- ئەم سیٚ شتە ملکی هەموو کەسنو نابیٚ کەسیان لیٚ مەنع بکریٚ.

ئـیتر کـاتی سـیياقی سـورەتەکە دەگاتـە ئـەم ئاسـتەو بـەو جـۆرە حـەقائیقو نهێنـییەکان نمایش دەکاو دەیانکاتە بەڵگە لەسەر راستیی پەیامی ئیسلامو سەرنجی ئادەمیزاد بۆیان رادەکێشیٚ، ئـاوڕ لەحەقیقـەتێکی تـر دەداتـەوە: کـە حەقیقەتـەکان پێیـەوە پەیوەسـتنو هـەموو سـەرە دەزووەکـان بـۆلای ئـەو دەگەڕێنـەوە، ئـەوەیش حەقیقەتی هەبوونی خودایە بـەو هـەموو عـەظەمـەتو شـکۆمەندییەی هەیـەتیو فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە ئەم حەقیقەتە بەزینـدو بگـریٚو مـافی خـۆی بـداتیٚ. دەفەرمویٚ: ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ تەسـبیحاتی خـودای گـەورەو شـکۆمەندی خۆت بکە: کە بەدەسەڵاتی رەهـای خـۆی ئـەم هـەموو شـتە جـودا جوداو بەکـەڵکو سەرسـوڕهێنەرانەی دروسـت کـردون، ئـەو هـەموو فـەضلو بەخششانەی بەسـەر ئادەمیزاددا رشتوە، کە ئـەو خەڵکـە تـەمبیٚ خواردو نـابنو پەنـد وەرنـاگرن، ئـەتۆ ئـــەرکی خـــۆت ئـــەنجام بـــدەو تەســـبیحاتو تەقدیـــسی خـــودا بکـــە.

## سەلماندنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو راستیی قورئان‌و سەرزەنشتکردنی موشریکەکان

﴿ ۞ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾

﴿فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ (٩٣) وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ (٩٤) إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ (٩٥) فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ (٩٦)﴾

سورەتەکە مەککییەو باس لەبنەماکانی عەقیدە دەکا: لەوەپێش بەڵگەی لەسەر حەق‌و راستیی خودایەتی خوداو رابوونی قیامەت‌و حیساب‌و لێکۆڵینەوەی سارای مەحشەرو سزاو پاداش هێنانەوە ئەمجار لێرەدا بەڵگە لەسەر راستیی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو راستیی قورئانی پیرۆز دەهێنێتەوە، سوێند بەشوێنی لێ ئاوابونی ئەستێرە دەخوا: کە قورئان قسەی جندۆکەو شەیاتینی نیە، شیعرو سیحرو جادوبازیی نیە، بەڵکوو کەلامی خودایەوبە نیگا بۆ پێغەمبەری نازڵ کردوە. سەرزەنشتی موشریکەکان دەکا لەسەر پڕوپووچی بیروباوەڕیان، لەسەر بڕوا نەبوونیان بەتاک‌وتەنهایی خودا، لەسە رەتکردنەوەی پەیامی پێغەمبەر(ﷺ).

ئەمجار دەگەڕێتەوە بۆ نمایشکردنی حاڵ‌و وەزعی ئەو سێ تاقمەی کە لەسەرەتای سورەتەکەدا باسی کردن_السابقون، ئەصحابولیەمین، ئەصحابوششمال_ دەفەرموێ: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ﴾ سوێند دەخۆم بەشوێنی لێ ئاوابوونی ئەستێرە، کە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر بەتوانایی خودا دەڵێن پیتی (لا) زیادەیەو بۆ تەئکیدە، لەزوبانی عەرەبدا لەپێش فیعلی (أقسم)وە وشەی (لا) زیاد دەکرێ. هەندێکی تر دەڵێن: وشەی (لا) زیاد نیەو لەسەر مانای خۆیەتی چونکە لەناو عەرەبدا وا باو بوو هەر کاتێک یەکێك بیویستایە لەسەر شتێکی ئاشکرا سوێند بخوات، دەیگوت (لاأقسم) واتە سوێند ناخۆم، واتە ئەو شتە ئەوەندە ئاشکراو عەیانە پێویست بەسوێند ناکا. هەندێ جاریش: کە بیانویستایە سوێند بەشتێکی گەورە بخۆن دەیانگوت (لا أقسم) واتە: من ئەم شتە بەسوێند پێخواردن گەورەی ناکەم بەڵکوو خۆی لەخۆی دا گەورەیە، سوێندی پێ بخۆم یان نەیخۆم چون یەکە.

**هەرچۆنێك بێ مەبەستەكە سوێند خواردنە سوێند خواردن لەقورئاندا بەچەند شێوەیەك هاتووە:**

١- پەروەردگار سوێند بەزاتی خۆی بخوا وەكوو دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ﴾ (الذاريات:٢٣) یان ﴿وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُمْ﴾ (الانبياء:٥٧)

٢- سوێند خواردن بەمەخلوقاتی خۆی وەكوو ﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا﴾، ﴿والطور﴾، ﴿والذاريات﴾، ﴿والنجم﴾، ﴿والشمس﴾، ﴿والقمر﴾، ﴿والليل﴾، ﴿والنهار﴾..... هتد

٣- سوێند خواردن بەقورئان وەكوو ﴿يس. وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ﴾ (يس:٢) یان ﴿ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ﴾ (ص:١) یان ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ (ق:١) یان ﴿حم وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ (الزخرف:٢)

بەلای جەماوەری زانایانەوە یەكێك لەنیشانەی گەورەیی خودا ئەوەیە: كە سوێند بەمەخلوقاتی خۆی دەخوا. ﴿وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ﴾ بێگومان سوێند خواردن بەشوێن لێ ئاوابوونی ئەستێرە سوێندێكی گەورەیە ئەگەر بزانن.

بێگومان ئەو رۆژەی قورئان نازڵ بووەو ئەم خیطابەی ئاراستەی ئادەمیزاد كردوە، رۆژگارێك بووە ئادەمیزادەكان زانیارییەكی زۆر كەمیان دەربارە شوێنهەڵاتو شوێنی لێ ئاوابوونی ئەستێرەكان هەبوە، هەر ئەوەندەیان لێ زانیوە كە بەچاو دیتویانە هەڵدێنو ئاوا دەبن، هەیانە خەفوكو هەیانە پرشنگدار بۆیە فەرمووی سوێندخواردن بەشوێنی لێ ئاوابوونی ئەستێرە، سوێندێكی گەورەیە ئەگەر بزانن. وەلێ زانیاری ئادەمیزاد ئەمرۆ دەربارەی ژمارەو چۆنیەتی ئەستێرەكان زۆر زۆر لەهی ئەو رۆژگارە پترەو هەست بەگەورەیی ئەو سوێندە دەكەین، هەرچەندە ئێمەیش تا ئێستا كەمێك لەگەورەیی شوێنی ئەستێرەكانو قەبارەو روناكییان دەزانین، بەڵام بەو زانیارییە كەمەیشمانو بەهۆی ئەو ئامێرو دووربینە بچوكو سنووردارانەمان ئەوەندەمان بۆ دەركەوتووە: كە تەنیا كۆمەڵە

ئەستێرەیەك لەکۆمەڵـە ئەسـتێرەکانی نـاو بۆشـایی بـەرفراوان، کـە بریتییـە لـە ﴿مەجەڕڕە﴾ وکۆمەڵەی خۆریی ئێمە سەربەو مەجەرەیەیە ژمارەی ئەستێرەکانی دەگاتە هەزار ملیۆن ئەستێرە.

زانایـانی فەلـەك دەبێـژن ئـەم ئەسـتێرانە کـە ژمارەیـان چـەند بلیـۆن ئەستێرەیە، هەیانە بەچاوی ئاسایی دەبیندرێ، هەیانە بەدووربین‌و ئامێری تایبەتی نەبێ نابینـدرێ، هەیـە هـەر نابینـدرێ وەڵێ هەسـت بـەبوونی دەکرێ. هـەموو ئـەم ژمارە زۆرو بێ‌شمارەی ئەو ئەسـتێرانە لـەناو بۆشـایی بـەرفراواندا لەگـەڕدان‌ودێن‌و دەچـن، ئەگـەری لێـك نزیـك بوونـەوەو پێکـدا هەڵتـەقینی ئەسـتێرەیەك لەگـەڵ یەکێکی تردا ئەگەرێکی هێندە دوورە دەگاتە ئاستی مەحاڵ!

هەریەکـە لـەم ئەسـتێرانە ڕێـڕەوی خـۆی هەیـەو لەمـەداری خـۆی دا هەڵدەسـوڕێ، کاریگـەری‌و کاردانـەوەی لەگـەڵ ئەسـتێرەکانی تـردا بەتەنـسیق‌و نەخـشەو پلانـەو دەسـتی قـودرەت کێـشی ڕاگرتـوون‌و مـەهاری گرتـوون‌و نـاهێڵێ هیچیان لەڕێبازی خۆی لابدا.

هەتا زانیـاری ئـادەمیزاد پـتر پێش بکـەوێ‌و ئـامێری دووربـین تـرو بـەتواناتر بخاتـە کـار پـتر هەسـت بەوەدەکـەین: کـە ﴿مواقـع النجـوم﴾ شـیاوی ئـەو سـوێند خواردنەیە کە خودا سوێندی پێ خواردوە!

ئەمجار وەڵامی سوێندەکە دێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّـهُ لَقُـرْآنٌ كَـرِيمٌ. فِـي كِتَـابٍ مَكْنُونٍ. لا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ. تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ بێگومان ئەو نامەیەی بۆ تـۆ بەنیگا نێردراوە قورئـانێکی گـەورەو پـیرۆزە، پـڕە لەفـەڕو بەرەکـەت، سـودو بـەهای زۆرە، هیدایەت‌و زانیاری‌و حیکمەت‌و ڕەهنومایی بۆ بەدەست هێنانی بەختـەوەریی دونیاو قیامەت بێ‌شمارە.

موناسـەبەو تەنـسیق لـەنێوان سـوێند پـێ‌خوراو کـە ئەسـتێرەیەو سـوێند لەسـەرخوراو: کـە قورئانـە ئاشـکراو عەیانـە. لـەم ڕووەوە: کـە ئەسـتێرە تاریکـایی

حیسسی لادەباو روناکی دەخاتە شوێنی، قورئانیش تاریکایی مەعنەوی:- کە کوفرو نەزانییە- لادەباو هیدایەتو ئیمان لەدڵەکاندا دەروێنێ!

﴿فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ﴾ ئەم قورئانە لەلەحولمەفوظ دا پارێزراوە جگە لەفریشتە نزیکەکانی بارەگای ئەقدەس کەسی تر بەسەری دا ئاگادار نین، ئەم فریشتە نزیکانەی بارەگای خودا پێیان دەگوترێ (الکروبیون) هەروەها لەئاسماندا جگە لەفریشتە کەسی تر دەستی ناگاتێ. ئەمە رەتدانەوەی موشریکەکانە: کە دەیانگوت: شەیاتینی ئەم قورئانەیان بۆ موحەممەد هێناوەتە خوارێ، یان دەیانگوت: قسەی کاهینەکانە، یان موحەممەد بۆ خۆی شێت بوەو لەخۆیەوە قسە دەهاوێ، هەروا چەند قسەو بوختانی تری لەم جۆرە خوزەبعەلاتە. ئیتر پەروەردگار بەم ئایەتە رەدی دانەوەو ئەوەی راگەیاند: کە قورئان لە لەحولەحفوظدایەو لەوێوە هاتووە، فریشتەی تایبەت لەئاسمانەوە دایبەزاندۆتە سەر دڵی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) نەك شەیاتینی.

وشەی (لا) نافییەیەو ناهییە نیە. ئەوە دەچەسپێنێ کە جگە لەفریشتە لەلەوحولەحفوظداو لەکاتی هێنانی دا بۆ سەر زەوی کەسی تر بەسەری دا ئاگادار نیەو دەستی لێ نادا. ئەگەر بەم جۆرە مانا نەکرێ نەفی فیعلەکە نایەتە جێ. واتە: مانای (لایمسه) بەحەقیقی نایەتەدی چونکە ئەوەتا لەدونیادا کافرو گاورو جولەکە پاكوپیس دەستی لێ دەدەن.

فەحوای ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کە کافرو لەشپیسو بێدەستنوێژ نابێ دەست بکەنە قورئان بەڵکوو دەبێ بەدەستی بەدەستنوێژەوە دەستی بکرێتێ. ئیمام مالیك لە(موطأ)ەکەیداو ئیبنوحیبان لەصەحیحەکەی دا ریوایەتیان کردوە: دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) لەو نامەیەی دا کە بۆ عەمری کوڕی حەزمی نووسی ئەوەی تێدا بوو: کە نابێ کەس دەست بکاتە قورئان مەگەر بەدەستی بەدەستنوێژەوە بێ. واتە لەشپیسو بێدەستنوێژ نابێ دەستی لێ بدەن. ئەبوداود لە(مەراسیل)داو (أصحاب

السنن) لەفەرمودەکەی (الزهری)یەوە ریوایەتیان کردوە کە دەڵێ: خوێندومەتەوە لەپەڕاوی (عەبد ئەبی بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم دا ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ولا یمس القرآن الا طاهر) نابێ جگە لەپاكو دەست بەدەستنوێژ کەسی تر دەست بکاتە قورئان.

دەست لێدانی قورئان بەبێ دەستنوێژ بەلای زۆربەی زانایانی ئیسلامەوە قەدەغەیە، هەموشیان حەدیثەکەی (عەمری کوڕی حەزم) یان کردۆتە بەلگە: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (پاكو دەست بەدەستنوێژ نەبێ نابێ دەست بکاتە قورئان).

مالیکییەکان دەبێژن دروستە بۆ فێربوونو فێرکردن بەبێ دەستنوێژ مامۆستاو قوتابی دەست لەقورئان بدەن. لە(الحکم)و حەممادو داوودی کوڕی عەلی (الظاهری)یەوە ریوایەتکراوە: کە هەلگرتنو دەست لێدانی قورئان بۆ لەشپیسو بێ دەستنوێژی موسوڵمانو بۆ کافر چ مەنعێکی تێدا نیە. تەنیا داوود ئەوەی چەرت کردوە: وتویەتی نابێ موشریك قورئان هەڵبگرێ.

بەلگەی ئەم کۆمەڵە زانایە ئەوەیە دەفەرموون پێغەمبەر(ﷺ) نامەی بۆ قەیصەری رۆم نووسی، لەو نامەدا ئایەتی قورئانی تێدا بوو، دەی ئەو نامەیە هەم بێدەستنوێژ دەستی لێ داوەو هەم ناموسوڵمان وەلامیان دراوەتەوە بەوە: کە ئەوە کاتی ضەرورەتو ناعیلاجی بووە، نابێتە بەلگە کەوابێ یاساغکردنی دەست لێدانی قورئان بەبێ دەستنوێژ بەفەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) چەسپاوە نەك بەصەریحی ئایەتەکە.

لەلایەکی ترەوە زانایانی ئیسلام ئەوەیان بەلاوە راجیحە کە مەبەست بە(کتاب) لەئایەتی ﴿فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ﴾ دا ئەو قورئانەیە کە بەدەست فریشتەوەیەو لەلەوحولەحفوظدایە. ئاماژە بەئایەتێکی تر: کە دەفەرموێ: ﴿فِي صُحُفٍ مُكَرَّمَةٍ. مَرْفُوعَةٍ مُطَهَّرَةٍ.بِأَيْدِي سَفَرَةٍ. كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ (عبس١٣-١٦) چونکە

ئایەتەکە بۆ ئەوە هاتووە قورئان دوور بخاتەوە لەوەی شەیاتینی دایانبەزاندبێ، ڕەددی موشریکەکان دەداتەوەو بیرو بۆچونیان ڕەت دەکاتەوە. هەروەها چونکە سورەتەکە مەککییە، پێ لەسەر مەوزوعی بنەماکانی عەقیدە دادەگرێ، باسی یەکتاپەرستیو زیندوبونەوەو پێغەمبەرایەتی لەخۆگرتووە! باسی دەست لێدانی قورئان بەبێ دەستنوێژ یان بەدەستنوێژەوە، یاساغکردنی یان ڕەوایی، مەوزوعێکی فیقهییەو عادەتەن ئایەتە مەدەنییەکان باسی لێوە دەکەن!

لەلایەکی ترەوە وشەی (مکنون) بەمانا پارێزراوو داپۆشراوە واتە چاوی ئادەمیزاد نایبینێو دەستیان لێی ناکەوێ. دەی ئەگەر مەبەست بە(کتاب) لەئایەتەکەدا ئەم قورئانە بێ: کە ئێستا بەدەستمانەوەیە، وەصفدار کردنی بە(مکنون) چ فائیدەیەکی وای تێدا نیە.

﴿أَفَبِهَٰذَا الْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ﴾ ئایا ئێوە گومانتان هەیە لەئەم قورئانە پیرۆزەی پێتان ڕادەگەیەنێ: کە قیامەت هەیە، ئایەتەکانی بەدرۆ دەخەنەوە؟ بڕوا بەو بنەما عەقیدەییانە ناکەن: کە بۆتان شی دەکاتەوە؟ پشتگیریی کافری تر دەکەن لەسەر کوفرو دەبنە هاوپەیمانی یەکتر؟

﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ سوپاسگوززاریتان بۆ ئەو ڕزقو ڕۆزییەی پێتان دەبەخشێ ئەوەیە نیعمەتەکانیی بەدرۆ دەخەنەوە؟ واتە: لەشوێنی سوپاسکردنتان لەسەر نیعمەت، نیعمەتەکانی بەدرۆ دەخەنەوە، بڕواتان بەزیندوبوونەوە نیە، ئایەتەکانی قورئان ڕەتدەکەنەوە!! جا دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکار تر بێ لەجیاتی سوپاسکردنی نیعمەت پەیامی پێغەمبەر ڕەت بکاتەوە؟!

ئەمجار کۆتایی سورەتەکە بەنمایشکردنی دیمەنێك دەهێنێ، کە تەصەورکردنیی مچوڕکە بەجەستەدا دێنێو مرۆڤ لینگە لەرزەی پێ دەکەوێ، ئەوەش دیمەنی کاتی سەرەمەرگە، ئەوکاتەی هەموو دەمەدەمێو کێشەیەك دەبڕێنێتەوە، ئەو کاتەی ئادەمیزاد لەنێوان کۆتایی ژیانی دونیاو سەرەتای دەست

پێکردنی ژیانی قیامەتدایە. کە ناتوانێ چرکەیەك بۆ دواوە بگەڕێتەوەو خۆ لەو وەزعە قوتار بکا دەفەرمووێ:

﴿فَلَوْلا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ﴾ دەی بۆچی کاتێك نەخۆشتان دەکەوێتە حاڵەتی گیانەڵاوەو، دەست دەکا بەچەناگە کوتان‌و چاوی بەملۆق دەوەستن روح دەگاتە قوڕگی.

﴿وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ﴾ ئێوەش بەخەم‌و پەژارەوە لەدەوری کۆبونەوەو تەماشای دەکەن‌و سەرنج دەدەنە حاڵ‌و وەزعی لەناو ئێش‌و ئازاری گیانکێشاندا ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لا تُبْصِرُونَ﴾ وەلحاڵ ئێمە بەعیلم‌و بەقودرەتی خۆمان بەفریشتەکانمانەوە لەئێوەی لێ نزیك ترین، وەلێ ئێوە نابینن چی روەدەدا، فریشتەی گیانکێشان نابینن، ئالەم کات‌و ساتەدا: کە ژیانی دونیای تەواو کردوە، دونیاو کاروباری ماڵ‌و سامان‌و منداڵی، دۆست‌و ئاسیاوو کەس‌وکاریی بەجێ دێڵێ‌و بەرەو جیهانێك دەڕوا: کە پێی ئاشنا نیە، جگە لەکردەوەی باشی‌و ئیمانی راستی، هیچ شتێکی تر فریای ناکەوێ‌و بەکەڵکی نایە.

ئالەم کاتەدا گیانەکەی شت دەبینێ وەلێ ناتوانێ قسە لەو روداوانە بکا: کە دەیانبینێ، ئەوانەی لەدەورەشی کۆبونەوە هیچ نابینن، ئەوەی لەبەرچاویان دیارە جەستەکەیەو چاویان تێبڕیوە، نازانن چی روەدەداو هیچیشیان پێ ناکرێ. ئیتر لێرەدا توانای ئادەمیزاد زانیاری دەوەستێ‌و مەودای نامێنێ دەزانێ چەند دەسەوسان‌و بێ توانایە چەند زەبون‌و لاوازە!!

﴿فَلَوْلا إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ. تَرْجِعُونَهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ دەی ئەگەر حاڵ‌و وەزع وەکوو ئێوە دەڵێن وابێ، زیندوبوونەوە نەبێ حیساب‌و لێکۆڵینەوە نەبێ، سزاو پاداش نەبێ ئەدی بۆچی گیانەکەی نابەنەوە شوێنی خۆی؟!

ئەگەر ئێوە راست دەکەن زیندوبوونەوە نیە، خودایەك نیە، تاكوتەنهاو بەدیهێنەری ئێوە، سزاو پاداش نیە، دە مەهێڵن ئەو خۆشەویستەتان بمرێو ماڵئاواییتان لێ بکا.

بەکورتی ئەگەر ئێوە (وەکوو خۆتان دەڵێن) بەدیهێنەرتان نیەو خۆتان خالقن، دەی بۆ ناتوانن گیان لەقورگەوە بگێڕنەوە بۆ شوێنی خۆی؟! ئەگەر راست دەکەن زیندوبوونەوە نیە، دەگیانی ئەو کەسەی لەگیانەڵادایە بگێڕنەوە بۆ ناو جەستەی بامردنی لەکۆڵ بێتەوەو زیندوبونەوەی بەسەردا نەیە.

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامی ئەو ئادەمیزادانە رون دەکاتەوە لەو کاتەدا: کە لەگیانەڵادانو دوا مردنیان، دەیانکاتە سێ تاقمو دەفەرموێ:

١- ﴿فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ. فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ﴾ ئەو بەندەیەی لەگیانەڵاودایە یان مردوە، ئەگەر لەخودا پێداوەکان بێو لەژیانی دا دەست پێشخەر بووبێ بۆ ئیمانهێنانو ئەنجامدانی کردەوەی چاكو لەخودا نزیك بێ، واتە لەو پێڕو تاقمە بێ: کە لەسەرەتای سورەتەکەدا بە ﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ﴾ ئاماژەیان بۆ کرا، ئەوا لەخۆشیو حەسانەوەدایە، پەرۆشی ژیانی دونیای نیە، رازییە بەو بەشو نیعمەتەی خودا لەو دونیا پێی داون رزقو رۆژیی زۆرو زەبەندە لەبەهەشتدا بۆیان دابینکراوە، لەگیانەڵاودا فریشتە مۆژدەی بەهەشتی پێ دەدەن. ریوایەت کراوە: کە موسوڵمان لەدونیا دەرناچێ هەتا لەبەهەشتەو رێحانەیەکی بۆ دێنن بۆنی پێوە دەکا.

٢- ﴿وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ. فَسَلَامٌ لَكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾ خۆ ئەگەر ئەو کەسەی: کە لەگیانەڵاودایە، یان مردوە لەو پێرە بێ: کە نامەی ئەعمالی بەدەستی راست وەردەگرێ، ئەوە فریشتە مزگێنی دەدەنێو پێی دەبێژن سڵاوت لێ بێ، سڵاوی براو هاوەڵەکانت لەوانەی نامەی کردەوەکانیان بەدەستی راستیان وەرگرتووە، هیچ ناخۆشیوتەنگو چەڵەمەیەکت لەپێش نیە، ئەتۆ لەپێری ئەصحابولیەمینی بەسڵاوو رێزەوە پێشوازیت لێ دەکەن، وەکوو لەئایەتێکی تردا

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ. نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنْفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ. نُزُلاً مِنْ غَفُورٍ رَحِيمٍ﴾ (فصلت٣٠-٣٢).

٣- ﴿وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ.فَنُزُلٌ مِنْ حَمِيمٍ. وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ خۆ ئەگەر ئەو ئادەمیزادە لەگیانەلاو کەوتووە، یان ئەو مردوە لەو کەسانە بێ: کە گومڕاو حەق بەدرۆخەرەوەن، بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیەو لەرێبازی راستو حەق لایان داوە، رۆژی قیامەت نامەی عەمەلیان بەدەستی چەپ وەردەگرن، لەزومرەی ئەو بەدبەختانەیە کە لەسەرەتای سورەتەکەدا بە(أصحاب الشمال) ئاماژەیان بۆ کرا. ئەوانە (خودا پەنامان بدا) خوانیان بۆ ئامادە کراوە لەئاوی کوڵاتوو خۆراکی ژەقنەموت، ئەمجار خستنە ناو دۆزەخەوە بەزەختو نوغرۆ بوونی لەناو ئاگردا.

٤- ئای لەو بەدبەختیو چارەڕەشییەی بەرەو پیری دەچێو تێی دەکەوێ، لەو میوانداریو سفرەو خوانەی بۆی ئامادە کراوەو چاوەڕێیەتی.

﴿إِنَّ هَذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ﴾ بێگومان هەموو ئەو خەبەرو زانیاریانەی لەم سورەتەدا دەربارەی زیندوبوونەوەو شتی تر نمایش کران سەد دەرسەد حەقو راستنو هیچ گومانیان تێدا نیەو چۆن پێتان راگەیاندراوە رێك دێتە جێو بەموو خیلافی تێدا نابێ.

﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ ئەی پێغەمبەر: تۆ خودای خۆت بەپاكو بەرزو پیرۆز بناسە، لەهەموو کەموکوڕیو خەوشێك بەدووری بگرە، هەر شتێك شیاوی خودایەتی ئەو نەبێ وەپاڵی مەدە، ئەو کافرو نەفامانە باوەڕت پێ بکەن یان نەیکەن خۆیان بەرپرسیارن، ئەتۆ هەر راگەیاندنت لەسەرەو بەس.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی الحديد

سورەتی حەدید مەدەنییە واتە لەدوای کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە نازڵ کراوە. بۆیە ناونراوە سورەتی حەدید چونکە لەئایەتی ژمارە (٢٥)ی‌دا ئاماژە بەسودوەرگرتن لەئاسن دەکاو ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئاسن کەرستەیەکی گرنگە بۆ پیشەسازی‌و پێشکەوتنی شارستانییەت.

**موناسەبەو گونجانی ئەم سورەتە لەگەڵ سورەتی ( واقیعە ) لەم رەوەوییە :**

١- کۆتایی سورەتی پێشوی بەرستەی ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ هێنا، سەرەتای سورەتی حەدیدیشی بە ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ دەست پێکرد.

٢- سەرەتای سورەتی حەدیدی کرد بەهۆکارو عیلەت بۆ کۆتایی سورەتی (الواقعة) واتە: کە لەکۆتایی سورەتی واقیعەدا فەرمانی کرد بەتەسبیحاتو فەرمووی ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ لەسەرەتای سورەتی حەدیدا پاساوی بۆ ئەو فرمانە هێنایەوەو فەرمووی: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: تەسبیحاتی خودا بکەن چونکە هەرچی لەئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە تەسبیحاتی خودا دەکا...!

سەرەباس‌و مەوضوعی ئەم سورەتە وەکوو باقی سورەتە مەدەنییەکانی تر باسی حوکمە شەرعییەکان دەکا، بانگەوازیی کۆمەڵگای ئیسلامیی دەکا بۆ ئەوەی کەسایەتی خۆی لەبیروباوەڕەکەی دا بێنێتە دی دڵ‌و دەرونی تاکەکان پاڵفتە بکا بۆ بانگەوازیی خودا، ماڵ‌و سامانی خۆیان، گیان‌و تەمەنی خۆیان لەپێناو ئایینی خودادا بەخت بکەن، جیهادو تێکۆشان لەرێگەی خودادا بکەنە بەرنامەو هەوڵ بدەن ئاڵای (لااله الا الله) لەبەرزی بشەکێنەوە.

بنەماكانی حوكمی ئیسلامی دیاریی دەكاو پەردە لەسەر عەیب‌و ریسوایی دووڕوەكان هەڵدەداتەوە، حەقیقەتی دونیاو قیامەت دەردەخاو ئەوە رون دەكاتەوە: كە دونیا خانوی لەناوچونەو نەمانی بەسەردا دێ، قیامەت خانوی ئەبەدییەو بڕانەوەی نیە.

ئامۆژگاری موسوڵمانان دەكا؛ كە صەبر بگرن لەسەر بەڵاو ناخۆشی، هەڵیان دەنێ بۆ دادوەری‌و ئاوەدان كردنەوەی زەوی، فەرمان دەكا بەتەقواو شوێنكەوتنی پەیامی پێغەمبەر.

ئەمجار كۆتایی سورەتەكە بەوە دێنێ: كە پەند لەبەسەرهاتی گەلە پێشینەكان وەربگرین

## هەموو بونەوەر تەسبیحاتی خودا دەكا

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ

بَصِيرٌ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾﴾

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالآرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەرچی لەئاسمانەکانو زەوی دایە تەسبیحاتی خودا دەکا، لەهەموو کەمو کوڕیو عەیبو نەنگیەك بەدوری دەگرێ، هەریەکە لەئادەمیزادو فریشتەو جندۆکە، لەئاژەڵو روەكو درەختو جەمادات بەزمانی گوتن یان بەزمانی حاڵ تەسبیحاتی خودا دەکەنو دان دەنێن بەگەورەییو خودایەتیدا، ملکەچی فەرمانو بڕیارنی، هەموو ئەم بونەوەرە بەگیاندارو بێ گیانییەوە بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودای خاوەن دەسەڵاتی رەهاو زانیاری بەرفراوان. هەمویان تێکڕا گەردنکەچی پەروەردگارنو هەریەکەیان بەجۆرێك بەندایەتی خۆی دەنوێنێ. خودا عەزیزو بالادەستو شکۆمەندە، لەروانگەی ئەو بالادەستیەوەیەتی هەرچی لەئاسمانەکانو زەوی دا هەیە تەسبیحاتی دەکەن، حەکیمو زانایە لەهەڵسوڕاندنی بوونەوەردا هەموو شتێکی وامەهار کردوە بەگوێرەی حیکمەتی خودایانەی خۆی بێو بچێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالآرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾ (الاسراء:٤٤) دەقە قورئانیەکە بەروونی بێ پەردە ئەوە دەگەیەنێ: کە هەموو شتێك لەئاسمانەکانو زەویدا تەسبیحاتی خودا دەکا. ئیتر پێویست بەوە ناکا لەمانای دەقەکە لا بدەینو تەئویلی جۆراوجۆری بۆ بدۆزینەوە، ئێمە چی وا لەتایبەتمەندیو سروشتی ئەم بوونەوەرە نازانین جگە لەوەی خودای بەدیهێنەر پێمان دەفەرموێ ئیتر کە خودای بەدیهێنەر دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ

وَالْأَرْضِ﴾ ماناکەی ئاشکراو رونە پیویست بەپێچو پەناو تەئویل ناکا، بەڵکوو ئێمە بۆمان هەیە لەمانای ئەم ئایەتەو نموونەی ئەم ئایەتە دان بەوەدا بنێین؛ کە هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە خاوەن گیانەو هەستو شعوری هەیەو رو دەکاتە خودای بەدیهێنەرو بەزمانی خۆی تەسبیحاتی پەروەردگار دەکا.

بێگومان ئەمە وێچوترین ماناو گونجاوترین تەصەورە کە لەگەڵ مانای ئاثاری صەحیحو راست یەك دەگرێتەوە هەروەکوو چۆن ئەزموونی هەندێ دڵی صافو بێگەرد لەبرێ کاتی ناوازەدا، لەحاڵی نەمانی پەردەی مادی بەسەر دڵەوەو دەستەبەر بوونی ئیشراقی نەفسیو پەیوەند بوونی بەخەقیقەتی شاراوەی نێو شتەکان پشتگیری ئەو مانایە دەکا هەبوونی هەستو گیانی تایبەتی بۆ هەموو شتێك دەچەسپێ ئەوەتا پەروەردگار فەرمانی خۆی ئاراستەی کیوو پەلەوەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ﴾ ئەوەتا فەرمانەکە ئاراستەی جەماداتو پەلەوەر کراوە: کە لەگەڵ داودا بەندایەتی خودا بکەن. ئیمامی موسلیم لەصەحیحەکەی دا لەجابیری کوڕی سومرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ان بمكة حجرا كان يسلم علىَ ليالي بعثت.انى لأعرفه الآن) بەردێك هەیە لەمەککە، لەو سەرو بەندەدا: کە کرابوم بەپێغەمبەر سڵاوی لێ دەکردم، ئێستا دەزانم ئەو بەردە کامەیەو لەکوێوەیە. .

تیرمیزی بەئیسنادی خۆی لەئیمامی عەلییەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: لەتەك پێغەمبەردا بووم لەمەککە، بەیەکەوە دەرچوین بۆ قەراغو بیجاغی مەککە، توشی هەر گردو کێوو درەختێك دەبوین بەزمانی خۆی دەیگوت (السلام عليك يا رسول الله)

بوخاری لەصەحیحەکەیدا بەئیسنادی خۆی لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر بنکە دارخورمایەك وتاری خوێندەوە، دوایی کە مینبەریان بۆ دروستکردو لەسەر مینبەرەکە وتاری خوێندەوە بنکە

دارخورماکە دەستی کردبە ناڵە ناڵ. پێغەمبەر(ﷺ) لەمینبەرەکە دابەزیو دەستی بەسەردا هێناو ئیتر داسەکنا!

دەربارەی چەسپاندنی ئەو حەقیقەتە کەونیە ئایەتی قورئان زۆرو رونو ئاشکران بۆ نموونە:

١- ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ..﴾ (النور: ٤١).

٢- ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ...﴾ (الحج : ١٨)

٣- ﴿..وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ..﴾(الاسراء:٤٤)

دەی هیچ پێویست ناکا تەئویل بۆ ئەم دەقە قورئانیو فەرمودانە بدۆزینەوەو لەمانای خۆیان لایان بدەین، ﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەر بۆ خودایە خاوەنێتیو فەرمانڕەوایی ئاسمانەکانو زەوی، بەویستی خۆی هەڵیان دەسوڕێنێو گۆڕانکارییان تێدا دەکا، دەسەڵاتی رەهاو بێسنووری هەیە، کەس نیە هاوەڵو هاوشانی بێ، کەس ناتوانێ تەگەرە بخاتە نیشوکارییەوە، فەرمانی رەوایەو دەبێ بیتە جێ، جگە لەویستی ئەو هیچی تر نایەتە دی، ژیان دەبەخشیو زیندوان دەمرێنێ، ژیان دەخوڵقێنێو مردن وەدی دێنێ، ئەندازەی ژیانو تەمەن بۆ هەموو زیندەومرێك دەكا، كاتی مردن بۆ هەموو گیاندارێك تەقریر دەكا. ئەو زاتە بەسەر هەموو شتێكدا بەتواناو بەدەسەڵاتە. هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ، هەرچی نەیەوێ نابێ. گیان تائێستا نهێنییەو نازاندرێ سروشتی چۆنەو چۆن پەیدا بووە. کەس دارای ئەوەی نیە بڵێ: لەوێوە هاتوە یان ئاوا هاتووە بەڵکوو کەس نازانێ چیەو چۆنە، دەقە قورئانیەکە ئەوەمان پێ

رادەگەیەنێ: کە خودا ژیان دەبەخشێ بەزیندەوەر، کەس ناتوانێ ئینکاریی ئەوە بکا یان پێچەوانەی ئەوە بسەپێنێ.

مردنیش وەکوو گیان نهێنیەکی شاردراوەیە، کەس سروشتی نازانێ، کەس ناتوانێ بیخولقێنێ چونکە جگە لەخودا کە خۆی بەخشندەی گیانە کەسی تر ناتوانێ وەری بگرێتەوە بەزیندوکردنو مراندن دوو دیاردەی فەرمانڕەوایی ڕەهای پەروەردگارن هەر خۆی دەتوانێ ژیان ببەخشێو وەریشی بگرێتەوە.

﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ زاتی خودا هەر هەبووەو نەبوونی پێش نەکەوتووە، لەپێش ئەودا هیچ شتێك نەبووە، باقییەو هەر دەمێنێو دوای هەموو شتێکە، ظاهیرو ئاشکراو بڵندە، لەژوور هەموو شتێکەوەیە، پەنهانو نادیارە، هیچ شتێك لەو پەنهانو نادیارتر نیە، زانایە بەهەموونهێنیەك ، عەقڵو ژیر حەقیقەتی زاتی نازانن چۆنە هەستەکان دەرکی ناکەن، زانایە بەهەموو شتێكو هیچی لێ گوم نابێ.

ئیمامی موسلیم لەصەحیحەکەی دا لەئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللهم انت الاول فليس قبلك شيء، وانت الاخر فليس بعدك شيء، وانت الظاهر فليس فوقك شيء، وانت الباطن فليس دونك شيء، أقض عنا الدين واغننا من الفقر) ئەمجار باسی بەدیهێنانی کەون دەکاو دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ خودایەکی وەهایە: کە ئاسمانەکانو زەوی لەشەش ڕۆژدا یان لەشەش قۆناغدا بەوپەڕی ڕێكوپێکیو جوانو ڕازاوەو گونجاو بەدیهێناون، هەرچەندە دەیتوانی بەچرکەیەك ئەو کارە ئەنجام بدا وەلێ لەوانەیە حیکمەتەکە ئەوە بێ: بەندەکان فێری لەسەرخۆیی پشوو درێژی بکا.

حەقیقەتو چۆنیەتی ئەو شەش ڕۆژە یان ئەو شەش قۆناغە هەر خودا دەیزانێو بەس! چونکە ڕۆژگاری ئێمە بەهۆی هەڵسوڕانی زەوی بەدەوری خۆی دا

لەبەرامبەر خۆرەوە پەیدا دەبن، دەی ئەم کاتو ساتەی ئێمە: کە رۆژو شەویان پێ دەڵێین.

دوای دروستبونی خۆرو زەوی پەیدابوون، کەوابێ ئەم رۆژانەی ئاسمانەکانو زەوییان تێدا دروست کراوە جودایە لەرۆژی ئێمەو هەر خودا دەزانێ چۆنن.

ئەمجار عەرشی کۆنترۆڵ کرد بەو شێوەی شیاوی خودایەتی خۆیەتیو ئیرادەی کردوە. دەسەڵاتو هەیمەنەی خۆی بەسەر بوونەوەردا چەسپاندو بونەوەری خستەگەڕو هەڵسوڕان.

وێڕای بەدیهێنانو کۆنترۆڵ کردنی هەموو بونەوەر بەو شێوە تۆکمەو مەحکەمە. ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ دەزانێ چی دەچێتە ناو زەوییەوەو چی لێ دێتە دەر، چی لەئاسمان دێتەخوارو چی بەرز دەبێتەوە بۆی، لەهەموو چرکەیەکدا بێشمار لەهەموو جۆرێك زیندەو نازیندە دەچێتە ناو جەرگی زەوییەوە هەر خودا دەزانێ رۆژانە چەند دڵۆپە بارانو چەند مردو چەند شتی تر زەوی هەڵیان دەلوشێ، هەر خودا دەزانێ لەچرکەیەکدا چەند روەكو درەختو بەروبومو کانو کانزاو شتی تری لێ دێتە دەر هەر خودا دەزانێ لەچرکەیەکدا چەند بەفرو بارانو تەرزەو تیشكو نەیازیكو فریشتەو قەزاوقەدەرو شتی تر لەئاسمانەوە دێنە خوارو چەند لەفریشتەو کردەوەی بەندەکانو دوعاو پاڕانەوەو هەڵەو گەلێ شتی تر لەبینراوو نەبینراو بۆ ئاسمان بەرز دەبنەوە.

هەر زانیاری خودا دەتوانێ کۆنترۆڵو سەرژمێری ئەم هەموو شتانە بکاو هیچی لێ گوم نەبێ. .

نموونەی ئەم ئایەت ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلا رَطْبٍ وَلا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ (الأنعام:٥٩)

لە کاتێکدا ئادەمیزاد دڵی داوەتە زەوی‌و ئاسمان‌و بیر لەو تێکەو لێکەیە دەکاتەوە، گورج قورئان دەیگێڕێتەوە بۆ لای زاتی خۆی‌و دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خودا بەزانیاری توانـاو دەسەڵاتی خـۆی لەگەڵتانە ئەی ئادەمیزاد؛ لەهەر کوێیەك بن، خودا ئاگادارە بەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدەن‌و هیچی لێ تێك ناچێ‌و لێی گوم نابێ. پەروەردگار هەموو کاتێ لەگەڵ هەموو کەسەو لەهەموو شوێنێکە، ئاگاداری هەموو کردارو گوفتارێکە گەورەو بچوك نهێنی‌و ئاشکرا لای ئەو چون یەکە.

﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ خاوەنیەتی‌و فەرمانڕەوایی ئاسمانەکان‌و زەوی هی خودایەو کەسی تر هاوبەشی نیە. دونیاو قیامەت هی خۆیەتی‌و هەرچی بیەوێ دەیکاو کەس نیە بتوانێ حوکم‌و بڕیاری رابگرێ یان نەهێڵێ ئەنجامی بدا. لەسەر هەموو کارێکی سوپاسی دەکرێ، هیچ بڕیارو حوکمێکی جێگای رەخنە نیە سەرەنجام رۆژی قیامەت هەموو کاروبارێك بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، حیساب‌و لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەندەکانی دەکا، بەعەداڵەت سزاو پاداشی کردەوەکانیان دەداتەوە، هیچ کەس بەئەندازەی گەردیلەیەك ستەمی لێ ناکرێ.

﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَهُوَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ پەروەردگار هەر خۆی هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، شەوو رۆژ دەگۆڕێ‌و بەحیکمەت‌و دانایی خۆی ئەندازەیان دیاریی دەکا، شەو دەخاتە ناو رۆژو، رۆژ دەخاتە ناو شەوەوە، جاری وا دەبێ شەوگار درێژ دەبن‌و رۆژگار کورت دەبن، جاری وایش دەبێ بەپێچەوانەوە شەو کورت دەبن‌و رۆژ درێژ، وایش دەبێ وەکوو یەکیان لێ دێ، بەم جۆرە وەرزەکانی ساڵ دروست دەبن‌و بەشوێن یەکدا دێن‌و هەر وەرزە سودو تایبەتمەندی خۆی هەیە!

پەروەردگار نهێنیو پەنامەکی ناو دڵو دەروون دەزانێو ئاگای لەهەموو شتێك هەیەو هیچ شتێکی لێ نادیار نیە.

## هەڵنانی ئادەمیزاد بۆ ئیمانهێنان بەخوداو بڕوا کردن بەپێغەمبەرو بەخشینی ماڵ لەرێگەی خودادا

﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴿١١﴾ يَوۡمَ تَرَى

ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾

لەوەپێش پەروەردگار بەڵگەی تاکوتەنهاییو زانینو توانای رەهای خۆی راگەیاند لەروانگەی بەدیهێنانو هەڵسوڕاندنی بونەوەرو گۆڕانکاریی لەشەوو رۆژدا.

ئەمجار بەشوێن ئەوەدا بڕێ ئەرکی ئایینی دیاری کردنو فەرمانی بەموسوڵمانان کرد: کە ئیمان بەتاکوتەنهایی خودا بێنن‌و بڕوا بەپێغەمبەر بکا، دڵسۆز بێ لەگەڵ ئایینی خوادا،ماڵو دارایی خۆی لەپێناو خودادا بەخت بکا. دەفەرموێ: ﴿آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بڕوا بەتاکو تەنهایی خودا بکەن، هەروا بڕواتان بەراستیی پێغەمبەرێتی موحەممەد هەبێ‌و شوێن پەیامی پیرۆزی بکەون، بەردەوام بن لەسەر ئەو بیروباوەڕەو خۆتانی لەپێناودا بەخت بکەن.

﴿وَأَنْفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾ ببەخشن لەو ماڵو سامانەی خودا ئێوەی کردوە بەجێنشین تێیدا، ﴿فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَأَنْفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ ئەوانەی وێڕای ئیمانهێنان بەخوداو بەپێغەمبەر ماڵو سامانیشیان دەبەخشن لەرێگەی خودادا، ئەوانە پاداشی گەورەو باشیان هەیە کە بەهەشتی رازاوەیەو رەزامەندیی خودایە. .

ئیمام ئەحمەد لەعەبدوڵلای کوڕی (الشخير)ەوە دەڵێ: چومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (الهاكم التكاثر، يقول ابن آدم؛ مالی مالی، وهل لك من مالك الا ما اكلت فأفنيت، أو لبست فأبليت أو تصدقت فأبقيت) زۆریی ماڵو سامانو وەچەو منداڵ ئێوەی بێ ئاگا کردوە، هەوڵدان بۆ زۆر کردنیانو خۆ هەڵەوگیر کردن پێیانەوە ئێوەی لەکاروباری قیامەت بێ ئاگا کرد، ئادەمیزاد هەر دەڵێ:

ماڵەکەم ماڵەکەم، ئایا ماڵی تۆ چییە تا ئەوەندە خۆتی پێ هەڵەوگێر بکەی؟؟ ئایا ماڵی تۆ جگە لەوەی خواردوتەو فەوتاوە، ئەوەی لەبەرت کردوەو کۆن بووەو دڕاوە، ئەوەی بەخشیوتەو پەزمەندەت کردوە بۆ قیامەت هیچی ترت هەیە؟!

ئیمام موسلیم ئەم فەرمودەیەی ریوایەت کردوەو ئەمەشی لێ زیاد کردوە ﴿وما سوى ذلك فذاهب و تاركه للناس﴾ جگە لەوە تۆ دەمری‌و بەجێی دێڵی بۆ کەسانی دیکە.

﴿وَمَا لَكُمْ لا تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ چیە بۆ ئێوە ئیمان ناهێنن؟ چ لەمپەرێك هەیە ناهێڵێ ئیمان بێنن بەخودا خۆ ﴿وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا بِرَبِّكُمْ﴾ پێغەمبەر(ﷺ) لەناوتاندایەو لەخۆتانەو بانگەوازیتان دەکا بۆ ئیمانهێنان، هەمیشە ئامۆژگاریتان دەکاو بەڵگەو نیشانە لەسەر راستیی پەیامەکەی دەهێنێتەوە. قورئانتان بۆ دەخوێنێتەوە، کە پڕە لەبەڵگەو نیشانەی ئاشکرا، هەڵتان دەنێ بۆ ئەوەی ئیمان بەتاك‌وتەنهایی خودا بێنن ﴿وَقَدْ أَخَذَ مِيثَاقَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار لەعالەمی زڕوێتدا پەیمانی لەئێوە وەرگرتووە، ئەو کاتەی گەرای هەموو ئادەمیزادی لەپشتی ئادەم هێنایە دەرێ‌و خیطابی ئاراستە کردن‌و فەرمووی: ئەرێ من خودای ئێوە نیم؟ هەموویان بەیەکدەم وەڵامیان دایەوەو وتیان: بەڵێ تۆ خودای ئێمەی، هەروەها لەبونەوەردا، لەئاسۆو دەوروبەرتاندا، لەخودی خۆتاندا چەندەها بەڵگەی تاك‌وتەنهایی خۆی نیشانی ئێوە داوە، عەقڵی پێداون بۆ ئەوەی خودای پێ بدۆزنەوە، ئەگەر ئێوە راست دەکەن‌و دەتانەوێ ئیمان بێنن هیچ بیانوێکتان نیە، ئیمامی بوخاری لەصەحیحەکەی دا ریوایەتی کردوەو دەفەرموێ: رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: ئێوە لەئیمانی کام خاوەن باوەڕان سەرتان سوڕماوە؟ وتیان لەئیمانی فریشتە، فەرمووی: جا ئەوان بۆ ئیمان ناهێنن‌و ئیمانیان پتە نابێ هەمیشە لەلای خودای خۆیانن؟ وتیان: پێغەمبەران، فەرمووی جا ئەوان بۆ ئیمان ناهێنن‌و ئیمانیان پتەو نابێ پەیتا پەیتا نیگایان لەخوداوە بۆ

دێ؟ وتیان: کەوابێ ئیمانهێنانی خۆمان جێگای سەرسوڕمانە، فەرمووی: جا ئێوە بۆ ئیمان ناهێنن و ئیمانتان پتەو نابێ من لەناوتان دام وەلێ ئیمانهێنانی ئەوانە جێگای سەرسوڕمانە: کە لەمەودوا دێنە گۆڕەپانی ژیانەوەو قورئانیان دەست دەکەوی و ئیمانی پێ دەهێنن.

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) راستی فەرموە: جوداوازییەکە زۆر رون و ئاشکرایە، فەرقی ئێمەو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاسمان و رێسمانە، داخوازیی ئیمانهێنان و بەڵگەی ئیمانهێنان لای ئەوان زۆر بەهێزتر بووە لەوەی لای ئێمەیە. ﴿هُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ عَلَى عَبْدِهِ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَإِنَّ اللَّهَ بِكُمْ لَرَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾ خودایەکی وەهایە کە قورئانی بۆ بەندەی خۆی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) نازڵ کردوە، موعجیزەو نیشانەی پێ بەخشیوە، کە لەهەموانیان گەورەتر ئایەتەکانی قورئانە، بۆ ئەوەی ئێوە لەتاریکی کوفرو نەفامیی رزگار بکاو بتانخاتە سەر رێبازی هیدایەت و روناکی ئایینی ئیسلام، یەقین و باوەڕ لەدڵتاندا جێگیر ببێ، بێگومان خودا رەحم و بەزەیی زۆرە بۆ بەندەکانی، پێغەمبەری بۆ ناردون، نامەی ئاسمانی بۆ نازڵ کردون، بیانووی بڕیون، شوبهەو گومانی رەواندونەوە.

دوای ئەوەی هەڵێنان بۆ ئیمانهێنان وماڵبەخشین، سەرزەنشتی کردن لەسەر ئیمان نەهێنان، ئەمجار شەرزەنشتیان دەکا لەسەر ماڵ نەبەخشین و چروکی. دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ چییە بۆ ئێوە چ بیانوێکتان هەیە؟ چ لەمپەڕێکتان لەبەردەمدایە ناهێڵێ ماڵ و سامانتان ببەخشن؟ ببەخشن لەهەژاریی مەترسن، چونکە ئەو کەسەی لەبەر خاتری ئەو ماڵ و سامان دەبەخشن خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، خۆی تێیاندا فەرمانڕەوایە، گەنجینەی ئاسمانەکان و زەوی هەمووی لای ئەوە. هەموو ماڵ و سامانێك دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا ، ماڵ و سامان هی خودایەو ئێوە بریکارو جێنشینن لەسەری. چی ببەخشن خودا بۆتان پڕ دەکاتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ

﴿وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ (سبأ: ٣٩) یان دەفەرموێ: ﴿مَا عِنْدَكُمْ يَنْفَدُ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ بَاقٍ﴾ (النحل:٩٦).

لەراستی دا دەستەی یەکەم لەموسوڵمانان (مهاجرین‌و ئەنصار) ئەوەی لەتوانایاندا بوو لەماڵبەخشین‌و خۆبەختکردن ئەنجامیاندا، لەکاتی تەنگانەو ڕۆژی رەشدا جوانترین نموونەی جوانمێری‌و سەخاوەتیان نواند، لەرۆژگاری پێش رزگار کردنی مەککە یان پێش پەیماننامەی ئاشتی (حودەیبییە)؛ کە ئیسلام غەریب‌و بێهێزو گەمارۆ دراوبوو لەهەموو لایەکەوە، هەموو جیهان دوژمنی بوو، ئا لەو رۆژگارەدا هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوپەڕی دڵ قایمی‌و ورە بەرزی‌و گیان بەخشی‌و ماڵبەخشینیان لێ وەشایەوە. بۆیە لەماوەیەکی کەمدا سەروەرییان بەدەست هێناو ئیمپراتۆرییەتی فارس‌و رۆمیان روخاندو بوونە تاکە هێزی دونیای ئەو رۆژگارەو زۆربەی جیهانی ئاوەدانی ئەوسایان کۆنترۆڵ کرد!!!

﴿لا يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ﴾ ئەو موسوڵمانەی لەپێش رزگارکردنی مەککەدا ماڵ‌و سامانی خۆی لەرێگای خودادا بەخشیوەو دژی کوفر جەنگاوە نابێتە هاوتای کەسێك کە لەدوای فەتحی مەککە ماڵ‌و سامانی بەخشیوەو دژی کوفر جەنگاوە، ئەم دوو تاقمە یەکسان نین، ﴿أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا﴾ ئەوانەی پێش رزگارکردنی مەککە ماڵیان بەخشیوەو جیهادیان کردوە پلەو پایەیان گەورەترە لەوانەی دوای رزگار کردنی مەککە ئەو کارەیان ئەنجام داوە. چونکە ئەو کاتە پێویستی موسوڵمانان بەماڵ‌و بەخشین‌و بەخشندەیی پتر بوو لەکاتی دوای فەتح، پێش فەتح موسوڵمانان بێهێزو هەژار زەبوون بون، بەڵام دوای فەتح موسوڵمان زۆر بون‌و بەهێز بون‌و خێرو بەرەکەت زیاد بوو، ماڵ‌و سامان زۆر بوو. ئەو ئاتاجییەی پێش فەتح هەبوو دوای فەتح نەما.

بەلاَم لەگەلْ ئەوەشدا ﴿وَكُلّاً وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى﴾ هەردوو تاقمەكە خودا وادەی پاداشی باشی پێداون: كە بەهەشتی رازاوەیە وەلێ پلەیان خوارو ژوورە. ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خودا ئاگادارە بەكردارو رەفتارتان، حالْو وەزعی نهێنیو پەنامەكیتان دەزانێو پاداشتان دەداتەوە بەگوێرەی كردەوەكانتان.

ئیمام ئەحمەد لەئەنەسەوە ریوایەت دەكاو دەلْێ: خالیدی كوڕی وەلیدو عەبدوررەحمانی عەوف دەم بەقالْییەكیان بوو، خالید وتی: چەند رۆژێك پێش ئێمە موسولْمان بون ئەمجار خۆتانمان بەسەردا رادەوەشێنن!؟ ئەمەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دعوا لی أصحابی فو الذی نفسی بیده لو انفقتم مثل أحد او مثل الجبال ذهبا ما بلغتم أعمالهم) واز لەهاوەلاَنم بێنن، سوێندم بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەكێك لەئێوە بەئەندازەی كێوی ئوحود یان بەئەندازەی كێوان زێڕ ببەخشن ناگەنە كردەوەی ئەوان.

بوخاریو موسلیمو هی تریش لەئەبو سەعیدی خودریەوە ریوایەتیان كردوە دەلْێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (لا تسبوا أصحابی، فو الذی نفس محمد بیده لو ان أحدكم انفق مثل احد ذهبا ما ادرك مد احدهم ولا نصیفه) جنێو بەهاوەلاَنم مەدەن، سوێندم بەو كەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر یەكێك لەئێوە بەئەندازەی ئوحود زێڕ ببەخشێ ناگاتە موددی یەكێكیان بەلْكوو نیوە موددێكیش.

ئەمجار بەروبومی بەخشین دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ وَلَهُ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ كێیە ئەو كەسەی مالْی خۆی لەرێگەی خودادا دەبەخشێو بەتەمای پاداشی خودایە، واتە: مالْێكی حەلاَلْ ببەخشیو منەت بەسەر بابای هەژاردا نەكاو بەدزیەوە ئەو كارە ئەنجام بدا، پاداشی خودا چاوەڕوان بكا، ئەوە خودا ئەو قەرزەی بۆ دوچەندانە دەكاتەوە، لە دە هێندە تا حەوتسەد هێندەی بۆ دەنووسێ. بەگوێرەی گۆڕانی وەزعو حالْی بەخشندەو پێ بەخشراوەكە، سەرباری ئەوەش پاداشی باشو بەنرخ تریشی دەداتێ: كە بەهەشتی رازاوەیە.

ئیبنو ئەبو حاتەم لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: کە ئایەتی ﴿مَنْ ذا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً...الاية﴾ نازڵ بوو ئەبو دەحداحی ئەنصاریی وتی: ئەی پێغەمبەرئەوە بەراستیی خودا داوای قەرزمان لێ دەکا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بەڵێ ئەی ئەبودەحداح! وتی دە دەستتم بدەرێ ئەی پێغەمبەر خودا! پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی خستە ناو دەستییەوە، ئەمجار ئەبودەحداح وتی: ئەوا باخە خورماکەم بەقەرز دا بەخودا، (باخە خورماکەی شورایەکی بەدەوردا کرابوو شەشسەد بڕە خورمای تێدا بوو، ماڵو منداڵیشی هەر لەناو باخەکەدا دەژیان. ) ئیتر ئەبو دەحداح هاتەوە بۆ ماڵەوە بانگی لەخێزانەکەی کرد ئەویش بەوشەی بەڵێ وەڵامی دایەوە، ئەبو دەحاح وتی: لەباخەکە وەرە دەرەوە بەقەرز داومە بەخودای گەورەو مەزن.

لەریوایەتێکی تردا هاتووە: کە خێزانەکەی وتویەتی: ئەبودەحداح، سەوداکەت قازانجی کردوە، ئیتر کەلو پەلو منداڵەکانی لێ هێنایە دەرەوە، ئەمجار پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: چەند بڕە دارخورمای بەردار لەبەهەشتدا بۆ ئەبودەحداح ئامادەکراوە.

ئەمجار پەروەردگار باسی ئەو ڕۆژە دەکا کە پاداشی خواپەرستانی تێدا دوچەندانەو چەند چەندانە دەدرێتەوە دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُورُهُمْ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! باسی ئەو ڕۆژە بۆ هاوەڵانت بکە: کە تۆ دەبینی پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی خوداپەرست؛ ئەوانەی لەژیانی دونیادا بەخشندە بوون نورو روناکی لەسەر پردی سیرات لەپێشیانەوە دەڕواو ڕێگایان بۆ روناكو خۆش دەکاو بەدەستی راستیان نامەی عەمەلیان گرتووەو بەرەو بەهەشت دەڕۆن. واتە: کردەوە باشەکانیان دەبنە هۆی رزگاربونیانو رەهنومایی کردنیان بۆ بەهەشت.

ئەمجار فریشتەکان پێیان دەڵێن: ﴿بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ مزگێنیتان لێ بێ ئەمڕۆ کە دەچنە ناو باخو باخاتێکەوە بەژێر درەختو باڵەخانەکانی دا چۆمو جۆگای جوانو دڵڕفێن دەبن، بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوەو هەرگیز لێی وەرز نابن. ئەمەش بەهۆی ئەو کردارو رەفتارە باشانەی لەژیانی دونیادا ئەنجامتان داوە. ئەو روناکیو رزگاربوونە بەمراز گەیشتنێکی فرە مەزنەو لەوە خۆشترنیە. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَالْمَلائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَاب. سَلامٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ (الرعد/۲۳-۲٤).

**بەکورتی: بڕواو بەخشین لەدونیادا، سێ سەروەری بۆ موسوڵمان لەقیامەت دەستەبەر دەکەن:**

(۱) رزگاربوونی رۆژی حیساب

(۲) مزگێنی فریشتە بەبەهەشت، مانەوەی ئەبەدیی لەبەهەشتدا بۆ هەتاهەتایە. ئایەتەکە ئەوە رادەگەیەنێ: کە خوداپەرستان نارەحەتیو تەنگانەی ئەو رۆژەیان توش نایە.

## حاڵو وەزعی دووڕووەکان لەرۆژی قیامەتدا

﴿ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ

وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ﴾

لەوەپێش حاڵو وەزعی موسوڵمانە بەخشندەکانی کرد، ئـەمجار لێرەدا باسـی دووڕووەکان دەکا، حاڵو وەزعی پەرپوتی‌و هیوابڕاوییان لەو ڕۆژەدا ڕون دەکاتەوەو دەفـەرموێ: ﴿يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انْظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِنْ نُـورِكُمْ﴾ لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی قیامەتە پیـاوانی دووڕوو ئافرەتـانی دووڕوو بـەو موسـوڵمانانە دەڵێن: کە لەناو نورو ڕوناکی‌دان‌و نامەی ئەعمالیان بەدەستی ڕاستیان گرتووە، ئەی موسوڵمانە بەختـەوەرو بەمراز گەیشتوەکان! تۆزێك چاوەڕێمان بکـەن‌و ئاوڕێکمـان لێ بدەنـەوە بـەڵکوو لێتـان نزیـك ببینـەوەو کـەمێك لـەنوورو ڕونـاکی ناوچـەوانتان وەربگرین‌و لەم تاریکستانی‌و سزا بەئازارە ڕزگارمان ببێ.

کۆمەڵێك لەزانایانی ئیسلام دەفەرموون: ئادەمیزاد هـەموویان ڕۆژی قیامـەت لەناو تاریکی‌دان، وەلێ پەروەردگار ئەم نـورو ڕوناکییـە بەموسـوڵمانان دەبەخشێ‌و دووڕووەکان داوایان لێ دەکەن: کە ئاوڕێکیان لێ بدەنەوە، چونکە ئەگـەر ئاوڕیـان لێ بدەنەوە ڕوناکی دەم‌و چاویان لەدووڕوەکان دەدا.

وەلێ بە وەڵامێکی هیوابڕ وەڵامیـان دەدرێتـەوە مرادیـان حاصـڵ نابـێ، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُـوراً﴾ لەلایـەن فریـشتەوە یـان لەلایـەن موسوڵمانەکانەوە پێیان دەگوترێ: بگەڕێنەوە بۆ دونیا لەوێ هەوڵ بـدەن ئەم نوورە بەدەست بێنن، وەکوو چۆن ئێمە بەدەستمان هێناوە، ئەم گاڵتە پێکردن‌و سوکایەتی پێکردنـــەیان تۆڵـــەی ئەوەیـــە: کـــە لـــەژیانی دونیـــادا مونافیقـــەکان گاڵتـــەیان

بەموسـولْمانەکان دەکـرد، دەیـانگوت ئێمـەیش موسـولْمانینو بڕوامـان بەپـەیامی ئیسلام هەیە بەلاّم لەراستیدا بێبڕوا بوون.

﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُمْ بِسُورٍ لَهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِنْ قِبَلِهِ الْعَذَابُ﴾ ئیتر خێرا شورەیەك لەنێوان بڕواداران‌و بێبڕوایان دەکێشرێ، ئەو شورەیە دەروازەیەکی تێدایـە خـودا پەرسـتانی لێ دەچـنە ژوورەوە، دیـوی نـاوەوەی ئـەو شـورەیە بـەلای بەهەشـتدایەو پڕە لەرەحمەت‌و نیعمەتی خودا، دیوی دەرەوەی بەلای دۆزەخ دایـەو پڕە لەسزا !

ئەمجار لەو دەمەدا: کە بڕواداران‌و بێ بڕوایـان لێـك جیـا دەکرێـنەوەو ئـەوان بـۆ بەهەشـت‌و ئـەمان بـۆ دۆزەخ ﴿يُنَـادُونَهُمْ أَلَـمْ نَكُـنْ مَعَكُـمْ﴾ بێبڕواکـان بـانگی بـڕواداران دەکـەن‌و پێیـان دەڵـێن: ئـەرێ ئێمـە لـەجیهاندا لەگـەڵ ئێـوە نـەبووین؟ وەکوو ئێوە حازری جومعەو جەماعەت نەدەبوین؟ لەگەڵ ئێوە کاروبـاری حـەجمان نـەکرد؟ وەکـوو ئێـوە نەچـوین بـۆ جیهـادو روبـەڕوی دوژمـن نەبوینـەوە؟ هـەموو ئـەرکێکی ئایینیمـان وەکـوو ئێـوە ئـەنجام نـەدا؟ ئـەدی بۆچـی ئێـستا ئێـوە بـەرەو بەهەشت دەچن‌و ئێمە بەرەو دۆزەخ؟!!

﴿قَالُوا بَلَى وَلَكِنَّكُمْ فَتَنْتُمْ أَنْفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَـانِيُّ حَتَّـى جَـاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ موسولْمانەکان وەلاّمیان دەدەنەوەو دەڵێن: بـەڵێ ئێـوە بەرواڵەت لەگەڵ ئێمە بوون وەلێ بۆ خۆتان بەهۆی دووڕوویيتانەوە نەفسی خۆتـان بەفتارە برد، بەرواڵەت موسولْمان‌و لەدڵدا کافر خۆتـان تووشـی ئـەم رۆژە سـەختە کـرد، سـەرگەرمی تـاوان‌و دابینکردنـی پیویـستیاتی ئارەزۆبـازیی خۆتـان بـوون. تۆبەتان دواخست‌و چاوەڕوانی ئەوە بوون موسولْمانان توشی چورتم‌و بەلاّی رۆژگار بن‌و ئیعلانی کوفرو بێـدینی خۆتـان بکـەن، بـەو حاڵـەتی نیفاقـەوە مانـەوە شك‌و گومانتـان لەبنـەماکانی ئـایین‌دا هـەبوو، زیندوبوونـەوەتان بـەلاوە پەشـم بـوو، لەراسـتیی قورئـان دوودڵ بـوون، مـوعجیزەی ئاشـکراتان بەسـیحر دەزانـی. هیـوای

پوچو بێ بنەما دەسخەرۆی کردن، دەتانگوت: خودا لێمان خۆش دەبێ، ئاوا ژیانتان بردە سەر تا مردن یەخەی گرتن، شەیتان فێڵی لێ کردن، ئەوەی بردە گوێچکەتانەوە: کە خودا غەفوورو رەحیمەو لەسەر تاوان سزاتان نادا!! ئیتر سزای سەختی دۆزەخ بچێژنو سەرزەنشتی خودی خۆتان بکەن.

﴿فَالْيَوْمَ لا يُؤْخَذُ مِنْكُمْ فِدْيَةٌ وَلا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەمرۆ فیدیە لەئێوەو لەکافرەکان وەرناگیرێ، جێگەتان دۆزەخەو باشترین شوێنە بۆ ئێوە هەر ئەوەتان قابیلە، دۆزەخ قۆناغێکی بەدو خراپە کەوا بۆی دەچن!

## ترسان لەخوداو پاداشی موسوڵمانانی بەخشندەو سزای کافرەکان

﴿ ۞ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَـٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَـٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ

لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾

لەوەوپێش باسی حاڵو وەزعی خواپەرستانودووڕووەکانی کرد لەرۆژی قیامەتدا، ئەمجار موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ زێدەلەخوداترسانو کردنەوەی دڵو گوێچکەیان بۆ بیستنی ئایەتی قورئانو پەیڕەوکردنی ڕێنومایەکانیی. ئەمجار موسوڵمانان دەترسێنێ لەلاسایی کردنەوەی ئەهلی کیتابو وەرگرتنی خوورەوشتی ئەوان. دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ﴾ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە: کە موسوڵمانان دڵیان نەرم بێو لەکاتی بیستنی ئایەتەکانی قورئاندا چاویان فرمێسك هەڵوەرێنێ، پاشان لەنیازو مەبەستەکانی قورئان حاڵی بنو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بن؟؟

پەروەردگار دەیەوێ موسوڵمانان وا لێ بکا هەمیشە جیددی بن لەئایینەکەیاندا، هەموو کاتێ دڵو دەرونیان ئامادەباشی ئەوەی تێدا بێ قورئان وەربگرن بەبیستنی ئایەتەکانی چاویان ئاوی تێ بچزێو دڵیان بێتەکوڵ ، تەمبەڵی نەیانگرێو پشتیان لەخوداپەرستیی راستەقینە سارد نەبێتەوە، لەسەرەتاوە موسوڵمانان بەو گوڕو تینو تەوژمەوە باوەشیان بەئیسلامدا کردو بەحەماسەتو وەرەبەرزیو بڕواوە جەنگان بۆیە توانیان لەماوەیەکی کورتو قیاسیدا وێڕای کەمی ژمارەو کەمی کەرەستەی جەنگیان ڕەوڕەوەی مێژوو بگۆڕن، وا دیارە بەرەبەرە پاش ماوەیەك ئەو تینو تەوژمە لەدڵی هەندێ لەموسوڵمانەکاندا کز بووە بۆیە خودا بەو ئوسلوبە سەرنج ڕاکێشە سەرزەنشتی کردنو وەئاگای هێنانەوە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: خودا تەمبەڵییەکی لەدڵی موسوڵمانەکاندا بینی بۆیە دوای تێپەڕ بونی سیانزە ساڵ لەنازڵ بونی قورئان سەرزەنشتی کردن!

ئەمجار جڵەوگیری ئەوە لەموسوڵمانەکان دەکا کە لاسایی گاورو جولەکە بکەنەوە، فەرمانیان پێ دەکا لەخورەوشتی ئەوان دوربن. دەفەرموێ: ﴿وَلا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ با موسوڵمانان لاسایی ئەهلی کیتاب نەکەنەوە، نەچن وەکوو ئەو گەلو نەتەوانەی لەپێش هاتنی ئیسلامدا نامەی ئاسمانییان بۆ نێردراوە لەگاورو جولەکەو کاتێ رۆژگارێکی درێژ بەسەر ئایینەکەیاندا تێپەری سەردەمی هاتنی پێغەمبەرەکانیان دوور کەوتەوە، ئیتر دڵیان رەق بوو وایان لێ هات وەعظو ئامۆژگاریی کاری تێنەکردن، وادەو هەرەشە هەستیی نەبزواندن، گۆڕانکارییان لەتەوراتو ئینجیلدا کرد، دەستیان کرد بەدونیا خواردنو ئایین فرۆشتن، شەریعەتی خۆیان وا شێواند هیچی بەسەر هیچەوە نەما، جۆرەها راو بۆچونی جیاجیاو بێ بناغەو بێبەڵگە لەئاینەکەیاندا بەرپا بوو، کوێرانە شوێن مالەو قەشەکانیان کەوتن، زۆربەی مالەو قەشەکانیشیان لەسنوری ئایینی خودا دەرچوونو ئەوەی بەئایینیان حسێب دەکرد فڕی بەسەر ئایینی خوداوە نەبوو. دڵیان لەتاوانکاری دا رەش بووبوو، کردەوەکانیشیان بەتاڵو پوچ! وەکوو لەئایەتێکی تردا قورئان دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظّاً مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ﴾ (المائدة:١٣) ئەمجار پەروەردگار نموونەیەك دێنێتەوە بۆ کاریگەریی وەعظو ئامۆژگارییو خوێندنی قورئان، دەفەرموێ: ﴿اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بزانن: کە خودا دوای ئەوەی زەوی وشكو سوتەمەڕۆیە زیندوی دەکاتەوە بێگومان ئێمە نیشانەکانی دەسەڵاتی خۆمانتان بۆ رون دەکەینەوە بۆ ئەوەی ئێوە ژیر بنو بەخۆتاندا بچنەوە. بەم جۆرە پەروەردگار جڵەوگیری لەموسوڵمانەکان دەکا کە وەك گاورو جولەکەکانیان لێ نەیە، بەوێنەی ئەوان سەریان لێ نەشێوێ، بۆیە پەروەردگار فەرمانی ئاراستە کردنو پێی فەرمون با ئێوە وەکوو ئەهلی کیتابتان

لێ نەیە، ئایینتان لەبیر بچێتەوەو شەریعەتتان لێ بگۆڕێ. هەمیشە قورئان بخوێننەوەو لەمانای ئایەتەکانی ورد ببنەوە، گوێی لێ رابگرن و بیری لێ بکەنەوە، چونکە قورئان بارانی رەحمەتەو بیروباوەڕ لەدڵەکاندا تازە دەکاتەوە، گەشەو نەشەیان پێدەکا، چۆن زەوی وشك و سوتەمەڕۆ کە بارانی لێ دەبارێ زیندوو دەبێتەوەو گژوگیاو گوڵ و گوڵزاری تێدا دەڕوێ، قورئانیش بۆ دڵە مردوەکان وەهایە، زیندویان دەکاتەوەو نەش‌ونمایان تێدا بەدی دێنێ. مشت وماڵیان دەکا، ژەنگ و چڵکیان لەسەر لادەبا.

ئەمجار پەروەردگار پاداشی بەخشندەکان چ پیاو بن چ ئافرەت دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً يُضَاعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ بێگومان پیاوانی بەخشندەو ئافرەتانی دڵاوا ئەوانەی کە لەماڵ‌وسامانی خۆیان دەبەخشنە هەژارو ئاتاجان، بەنیازی بەدەستهێنانی رەزامەندیی و پاداشی خوداو یارمەتی بێنەوایان دەدەن، بەڕوی گەش و ناوچاوانی رونەوە دەسگرۆیی هەژارو لێقەوماوان دەکەن، منەتیان بەسەردا ناکەن و خۆیان هەڵنانێنەوە، ئەوانە خودا چاکەکانیان بەدەچەندانە بۆ تۆمار دەکا، بەبەریشیەوە هەیە تا حەوتسەد هێندەو زیاتریش پاداشیان بداتەوە، بۆ ئەوان هەیە پاداشی زۆرو بەبەهاو رێز! دەبێ چ پاداشتێك بێ، خودا بە ﴿أجر كريم﴾ ئاماژەی بۆ کردبێ؟!

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ أُولَئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ وَالشُّهَدَاءُ عِنْدَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ﴾ ئەوانەی خاوەن بیروبڕوان دان بەتاك‌وتەنهایی خودادا دەنێن و بڕوایان بەپێغەمبەرانی خودا هەیە، ئەوانە لەپلەوپایەی صیددیقین‌دان، وەکوو ئەوان لای خودا رێز لێ گیراون، ئەوانەیش کە لەرێگای خودادا شەهید بون و گیانی خۆیان بەخت کردوە بۆ ئەوەی ئاڵای (لا الە الا الله، محمد رسول الله) لەبەرزیی بشەکێتەوەو ئایینی خودا بەرقەرار بێ و شەریعەتی خودا یاسای کۆمەڵ و فەرمانڕەوا بێ، ئەوانە پاداشی گەورەیان لای خودا بۆ ئامادە کراوە، نوورو روناکی

قیامەتیان پێ دەدرێ‌و بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن‌و بەمراز دەگەن، ئیمامی عەلی دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەهاوەڵانی فەرمو: ئێوە کێ بەشەهید حسێب دەکەن؟ وتیان: کەسێك لەپێناو ئایینی خودادا گیانی خۆی بەخت بکا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی کەوابێ شەهیدی ئوممەتی من کەمن. نەخەیر شەهید هەر ئەوانە نین بەڵکوو کەسێك بەناحەق بکوژرێ شەهیدە، کەسێك بەتاعون بمرێ شەهیدە، کەسێك بەسك ئێشە بمرێ شەهیدە.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوان ئینکاریی هەبوون‌و تاك‌و تەنهایی خودا دەکەن، ئایەتەکانی قورئان ڕەت دەکەنەوە، پشت لەبەڵگەو نیشانەکانی خودایەتی خودا هەڵدەکەن. پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، ئەوانە ئەهلی دۆزەخن، ڕۆژی قیامەت تووڕ دەدرێنە ناوی‌و بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە!

## دونیا بێ بایەخەو هەوڵ بدەن لەقیامەتدا بەختەوەر بن

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ

وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢١﴾

له ئایەتەكانی پێشودا حاڵو وەزعی موسوڵمانانو كافرەكانی لەقیامەتدا رون كردەوە، بەشوێن ئەوەدا هیچو پووچی ژیانی دونیاو بەنرخی ژیانی قیامەت باس دەكا، موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ ئەنجامدانی ئەو كارانەی لێخۆشبوونو رەزامەندی خودایان پێ دەستەبەر دەبێ.

دەفەرموێ: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ﴾ ئەی ئادەمیزادینە؛ هەموتان بزانن ژیانی دونیا گاڵتەو گەپە، ماوەیەكەو بەسەر دەچێ، یاری منداڵانەو زوو تێك دەچێ، خۆ خەریك كردنە بەشتێكەوە سودی نیە، ئارایشتێكەو ئادەمیزادی دونیا پەرست خۆی پێ دەرازێنێتەوە زۆری پێ ناچێ نامێنێ. خۆهەڵنانەوەو شانازی كردنە بەسەر یەكتردا، هەندێكتان بەسەر هەندێكتاندا شانازیی دەكا بەماڵو سامانو منداڵو خزمو كەسوكارو داروەدەستە. خۆیان پێوە هەڵدەكێشنو لافو گەزاف لێ دەدا. وەكوو لەئایەتێكی تردا ئامازە بەم مانایە دەكاو دەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الْمَآبِ﴾ (آل عمران:١٤) ئەمەش نیشانەی بێبایەخی جیهانە، ئەوە دەخوازێ كە ئادەمیزاد هێندە خۆی پێوە هەڵوگێڕ نەكا قیامەتی لەبیر بەرێتەوە.

ئەمجار ژیانی دونیا دەشوبهێنێ بەگژوگیایەکی تەمەن کورتی زوو بەسەرچوو خێرا پەرپیوو بێسود، دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرّاً ثُمَّ يَكُونُ حُطَاماً﴾ دونیا وەکوو بارانێك وایە: کە ئەو گژوگیایەی پێ شین دەبێ کەشتیار سەرسام بکاو دڵی پێ خۆش ببێ پاشان وشك ببێو، ببینی زەرد هەڵبگەڕێو ئەمجار ببێتە پوشو پەڵاشو با بەملاو بەولای دا بداو پاش ماوەیەك شوێنەکەی ببێتەوە بەزەوییەکی سوتەمەڕۆ، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالأَنْعَامُ حَتَّى إِذَا أَخَذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَاراً فَجَعَلْنَاهَا حَصِيداً كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ﴾ (یونس: ٢٤) ئیتر هەرکەسێك دونیاپەرست بێو خۆی پێوە هەڵەوگیر بکا، جوانی، رازاوەیی کورتخایەنی دەسخەرۆی بکا، بەتەواوی قیامەتی لەبیر بچێتەوە، ئەوە بەدبەختو چارەڕەشە ﴿وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ لەژیانی قیامەتدا دوو حاڵ هەن یان سزای بەشیدەت بۆ دوژمنانی خودا، یان لێخۆشبونو رەزامەندی خودا بۆ خۆشەویستانی. ژیانی دونیاش جگە لەمەتاعو هۆکارێکی رابواردن هیچی تر نیە، داوو تەڵەیەکە بۆ کەسێك تێی بکەوێو خوی بداتێ.

کەسێك وای لێ هات لەدونیاپەرستییدا پێی وابوو هەر ژیانی دونیایەو ژیانی تر نیە، ئەوە ماڵوێرانو بەدبەختو چارەڕەشە.

سەعیدی کوڕی جوبەیر فەرمویەتی دونیا ئامێری هەڵخەڵەتاندنو دەسخەرۆبوونە، ئەگەر هێندەت خو دایە قیامەتی لەبیر بردیەوە، وەڵێ ئەگەر دونیات کرد بەمەزرەعەی قیامەتو بەکارت هێنا بۆ بەختەوەریی دوارۆژو وەدەستهێنانی رەزامەندیی خودا ، ئەوە باشترین کاڵایەو بەنرخترین هۆکارە.

ئیمامی بوخاریو ئەحمەد لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەهەشت بۆ هەریەکێ لەنێوە لەسەرەی نەعلەکەی لێی نزیکترە. دۆزەخیش هەروا) کەوابێ خێرو شەڕ لەئادەمیزاد نزیکنو خۆی کامەیانی بوێ لەئامێزی دەگرێ.

ئەمجار پەروەردگار موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ پێشبڕکێ کردن لەکاری چاکەدا بۆ دەست پێشخەری لەوەدەست هێنانی لێخۆشبونو بەهەشت، بەهۆی ئەنجامدانی کردەوەی چاکو خۆگرتنەوە لەشتی حەرامو کاری نادروست. دەفەرموێ: ﴿سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان، پەلە بکەن لەئەنجامدانی کاری چاکەو بکەونە پێشبڕکێو موسابەقە لەگەڵ یەکتری بۆ ئەنجامدانی ئەو کردەوە چاکانەی دەبنە هۆی لێخۆشبونی خودا لێتان، پەلە بکەن لەتۆبەکردنو گەڕانەوە بۆ لای خوداو پەشیمانبوونەوە لەتاوان، بۆ ئەوەی بگەن بەبەهەشتێکی پانو پۆڕ: کە پانیەکەی بەئەندازەی پانی ئاسمانو زەوییە، کە ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی بڕوایان بەتاکوتەنهایی خوداو راستیی پێغەمبەرانی هەیە. ئەرکی سەرشانیان ئەنجام دەدەن خۆ لەو شتانە دەپارێزن: کە خودا نەی لێ کردوە. ﴿ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ ئەو پاداشە گەورەو بەمراز گەیشتنە بێوێنەیە، ئەو بەهەشتە رازاوەو لێخۆشبونو رەزامەندیی خودایە لێتان فەضلو رەحمەتی خودایە پێتان دەبەخشێو واجب نیە لەسەری.

خودا خاوەنی فەضلی گەورەو کەرەمو میهرەبانیی زۆرو زەبەندەیە بۆ موسوڵمانان.

## بەڵاو موصیبەت پەیوەندن بەقەزاو قەدەرەوە، ئەوانەی چروکن ستەم لەخۆیان دەکەن

﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٤﴾﴾

لەوەپێش ئەوەی ڕاگەیاند: کە هەموو خێرو خۆشییەکی قیامەت لەچوونە ناو بەهەشتو لێخۆشبونو ڕەزامەندیی، هەمووی فەضلو کەرەمی خودایە، ئەمجار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە هەرچی ڕوداوو بەڵاو موصیبەتی دونیا هەن هەموویان بەقەزاو قەدەری خودان. ئەمجار موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ ئەوەی بەلەدەستدانی ماڵو سامانو نازو نیعمەت خەفەتبار نەبنو بەرژانی نازو نیعمەت بەسەریاندا لەخۆیان بایی نەبن. هەڕەشە لەوانەش دەکا: کە بەخیلو چروکنو ئەوەی لەسەرشانیانە ئەنجامی نادەن، بەڵکوو دەنە دەنەی کەسانی تریش دەدەن بۆ بەخیلیو دەست قوچاندن. دەفەرموێ: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الآرْضِ وَلا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا﴾ هیچ بەڵاو موصیبەتێکتان توش نابێ نە لەزەوی دا وەکوو گرانیو لافاوو بومەلەرزەو ئەو جۆرە شتانە، نە لەخودی خۆتاندا

وەکوو نەخۆشیو هەژاریو مردنو قەلەقو خەمباریی، ئیللا لەزانیاریی خودادا، لە لەوحولەحفوظدا تۆمار کراوە پێش ئەوەی ئەم مەخلوقاتانە دروست بکەین! هەرچی بەڵاو موصیبەتی دونیا هەیە هەمووی بەقەزاو قەدەری خودایە، خودا لەئەزەلدا تەقدیری کردوەو لە لەوحولەحفوظدا تۆمار کراوە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بێگومان تۆمارکردنی ئەو هەموو روداوو کارەساتانە لەئەزەلداو زانیاریی خودایی پێیان پێش پەیدابوونیان کارێکی سەهلو ئاسانە بۆ خوداو هیچ گرانی تێدا نیە، چونکە خودا بۆ خۆی بەدیهێنەری هەمو شتێکەو دەزانێ چی دروست کردومو چۆنی هێناوەتە دیو چی دەکاو چی بەسەر دێنێ، لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە: دەفەرموێ: (من عرف سر الله فی القدر هانت علیه المصائب) کەسێك نهێنی خودا بزانێ دەربارەی قەزاو قەدەر، قورسایی بەڵاو موصیبەتی لەسەر سوك دەبێ.

لە حەقیقەتو راستی دا هەموو روداوو بەڵاو موصیبەتێك بەدەست خودایەو ئەو خەلقی دەکا، خەلقو ئیجاد بەدەست خودایە، کردەوەی ئادەمیزاد سەبەبو هۆکارێکی رواڵەتییە نەك حەقیقی، سیحرو چاوەزارو کوشتن هەموویان بەکاریگەریی پەروەردگار دێنە دی، (مؤثر)ی حەقیقیو کاریگەر خودایە.

بێگومان ئەم بونەوەرە بەرفراوانە پەروەردگار بەنەخشەو پلانێك هێناویەتە وجود، هێندەی وردبینیو ئەندازیاریی تێدا کردوە، هەر روداوێکی تێدا روبدا پێش بەدیهێنانی بونەوەر خۆی، مەزندە کراوەو بڕیاریی خودایی بۆ دراوە، هیچ شتێکی تێدا بەرێکەوتو بێهودە روونادا، هەرچی روبدا لەم بونەوەرەدا پێش خەلقی زەویو ئادەمیزاد لەزانیاریی خودادا بەوردی تەقدیر کراوە، کاتو شوێنی روداوەکەو چۆنیەتی رودانی لەعیلمی خودادا بەشەفافی دیاریی کراوە. چونکە لەزانیاریی خودادا رابردوو حاڵو داهاتوو لەزەماندا یەکەو بەنیسبەت پەروەردگارەوە ماضیو حاڵو موستەقبەل وجودیان نیە. ئەو زەمەنە رابردوو ئێستایەو دواییە

بەنیسبەت ئێمەوەیە کە ڕۆژێك بووە نەبووین‌و ڕۆژێکیش دێ نابین. ئێمە بەو زەمانە جیاجیایانە سنووری شتەکان دەزانین بەبێ سنووری مەکانیی‌و زەمانیی ناتوانین مەزندەی شتەکان بکەین. خودا بۆ خۆی حەقیقەتی موطلەقەو دەتوانێ بەچرکەیەك ئاگاداریی هەموو بونەوەر ببێ، بەبێ سنوورو لەمپەڕ کون‌و قوژبنی ناو ئەم کەونەو هەر گەردیلەو خانەیەکی دەزانێ چیەو چۆنەو چۆن بووەو چی لێ دێ! ئەم کەونەو هەرچی تێدایەو تێیدا ڕو دەدا هەر لەئەزەلەوە تا ئەبەد لەزانیاری خودادا بەبێ سنورو هەبوونی پەردەو لەمپەڕ دیارییەو گەردیلەیەکی لێ نەدیو نیە. هەر موصیبەتێك خێر بێ یان شەڕبێ کە لەزەوی ڕودەدا یان یەخەی ئادەمیزادەکان خۆیان دەگرێ لەکتێبی ئەزەلی خودادا تۆمار کراوە. کەوابێ پێویستە دڵەکان بەوردی هەست بەو حەقیقەتە بکەن‌و بەو بیروباوەڕەوە هەنگاو بهاون‌و ڕوبەڕوی بەڵاو موصیبەت ببنەوە، ﴿لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ﴾ بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکتان لەکیس چوو ئەوەندە خەفەتی بۆ نەخۆن سەنتەرتان تێك بدا ئەگەر خێرو خۆشیتان هاتەڕێ‌و ماڵ‌و سامانتان زۆر بوو لەشساغ‌و تەن دروست بوون لەخۆتان بایی نەبن‌و بوغرایی ڕوتان تێ نەکا. ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ خودا هیچ خۆبەزلزان‌و شانازیکەرو خۆهەڵکێشێکی خۆش ناوێ، هەرکەسێ لەدڵی خۆی دا خۆی بەلاوە زل بێ‌و لوتبەرز بێ، شانازی بەسەر مەردومدا بکا، بەماڵ‌و منداڵ‌و کورسی‌و پلەوپایە بنازێ تاوانەو خودا سزای دەداو تۆڵەی لێ دەستێنێ. بێگومان خەفەت‌و خۆشی، دڵتەنگی‌و دڵخۆشی لەسروشتی ئادەمیزاددان‌و جڵەوگیری لەشتێك ناکرێ سروشتیی بێ، کەوابوو ئەمیەکە ڕودەکاتە ئەو حاڵەتانەی لەفەرەح‌و حوزنەکەوە سەر هەڵ دەدەن. بەم جۆرە کەیفخۆشییەکە وای لێ بکا کوفرانی نیعمەت بکا، یان ناخۆشییەکە وای لێ بکا ناڕازی بێ بەقەدەر! واتە حوزن‌و فەرەحەکەی لەئەندازەو سنوور دەربچن بگاتە ئەو حاڵەتەی نەهی لێ کراوە، ئەگینا کێ هەیە بەناخۆشی دڵتەنگ نەبێ‌و

بەخۆشیی کەیفخۆش نەبیّ. وەلێ پێویستە لەسەر خۆشی سوپاسگوزار بینو لەناخۆشی دا پشوو درێژ بین.

﴿الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَمَنْ يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ خۆبەزلزانو خۆهەڵکێش ئەوانەن بەخیلو چروکن دەستیان ناچێتە خەرجکردنی ماڵو سامانی خۆیان بۆ هەژارو ئاتاجان، زەکاتی ماڵی خۆیان دەرناکەن، یارمەتی لێقەوماوان نادەن. نەك هەرئەوەندە بەڵکوو داوا لەکەسانی دیکەش دەکەن دەست قووچاوو بەخیل بن، بەڵکوو بەخیلیو چروکی لەپێش چاوی کەسانی دیکە جوان دەکەن، کەسێك پشت لەبەخشندەیی بکاو بێگوێی فەرمانی خودا بکا، با ئەوە بزانن خودا هیچ ئاتاجی بەئەو نیەو لێی بێمنەتە. چونکە خودا شوپاسکراوە لەئاسمانەکانو زەوی دا بەگوێ نەکردنی ئەمو ئەو چ زیانێکی پێ ناگەیەنێ. بەخیلو چروك زیان بەخۆی دەگەیەنێو خۆی خەسارەتمەندە وەکوو قورئان لەسەر زمانی حەزرەتی موسا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى إِنْ تَكْفُرُوا أَنْتُمْ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ (ابراهيم:٨) یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ (فاطر:١٥).

## دەستووری کۆمەڵگای ئیسلامییو یاسای حوکم

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ (٢٥)﴾

لەوەپێش باسی حاڵو وەزعی دونیاو قیامەتی کرد، ئەمجار لێرەدا مەبەست لەناردنی پێغەمبەران دیاریی دەکا کە خودا ناردونی بۆ رێکخستنی کۆمەڵگاو رەهنومایی کردنی ئادەمیزاد بۆ رێبازی راستو بەختەوەریو چەسپاندنی عەداڵەتکاریی لەناو کۆمەڵگادا بۆ ئەوەی بەختەوەریی دونیاو قیامەت بەدەست بهێنن. دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ﴾ بێگومان ئێمە فریشتەمان ناردوە بۆ لای پێغەمبەرانمانو نیگاو سروشمان پێدا ناردوە بۆیان، پێغەمبەرانیشمان رەوانە کردون بۆ سەر گەلو نەتەوەکانیان، موعجیزەو بەڵگەی ئاشکرامان لەسەر راستیی پەیامەکەیان پێداون، شەریعەتو یاسامان بۆ ناردون تا بیگەیەننو بۆ مەردومی شی بکەنەوە، ﴿وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ نازڵمان کردوە بۆ سەر ئەو پێغەمبەرانەمان نامەی ئاسمانیی وەکوو (تەوراتو زەبورو ئینجیلو قورئان) لەناو ئەو نامە ئاسمانییانەدا حوکمو عەداڵەتکاریمان ناردۆتە خوار، فەرمانمان بەپێغەمبەرانمان کردوە کە ئەو شەریعەتو یاسایە بەمەردوم رابگەیەنن.

بۆ ئەوەی ئادەمیزادەکان شوێن شەریعەتی خودا بکەونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار ببنو ژیانی خۆیان بەگوێرەی ئەو یاسایە بەرێوە بەرن. بەویژدانو عەداڵەتکاریی لەگەڵ یەکتردا مامەڵە بکەن، کاروباریی دونیاو قیامەتیان بەگوێرەی شەریعەتی خودا ئەنجام بدەن، رێز لەشەریعەتی خودا بگرنو شوێن پێغەمبەرانی خودا بکەون.

﴿وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ ئاسنو پۆڵامان بۆ دروست کردون، دەرهێنانو دروستکردنیمان فێر کردون، شارەزامان کردون؛ کە ئامێری جیاجیای جەنگیو ناجەنگی لێ دروست بکەن، تۆپو تفەنگو کەشتیو سەیارەو فرۆکەو شەمەندەفەرو گەلێ شتی تری گرنگتری لێ دروست بکەن.

لە ئاسندا هێزێکی جەنگیی زۆر سەخت هەیە، هەرچی ئامێری جەنگ هەیە هەموی لەئاسن دروست دەکرێ، بەڵکوو ئاسن هێزی بەکارە لەئاشتیو شەڕدا،

سوودى زۆرى بۆ ئادەميزاد هەيە لەزۆر بواردا بەكارى دێنن، دروستكردنى باڵەخانەى قاتقاتو ئامێرى كشتوكاڵو كردنەوەى رێگاوبانو ئامێرى پيشەسازيى جەنگىو ئابورىو كارگەى دروستكردنى كاڵاو پێداويستى ژيان، هەموويان پێويستيان بەئاسن هەيە، بەشى زۆريان لەئاسن بەرهەم دەهێنرێن. هەر بەئاسن ئادەميزاد دەتوانێ پردو رێگاوبان رابكێشێو سروشت بۆ سودى خۆى بەكار بێنێ. هەرچى شارستانيەت هەيە بەبێ ئاسن دەستەبەر نابێ، هەموو ئامێرێكى كاركردن بەدەگمەن نەبێ بەشێكى ئاسن تێدايە، شەمەندەفەرو ئامێرى كشتوكاڵو رستنو چنينو بيناسازيىو چاپو چاپەمەنىو گەلێ شتى تر پەيوەستن بەئاسنەوە. بەڵكوو بەئاسن پارێزگاريى لەئايينو لەوڵات دەكرێ، بۆ تێكشكاندنو تەمبێ كردنى دوژمن بەكار دەهێندرێ.

پێغەمبەر(ﷺ) دواى ئەوەى كرا بەپێغەمبەر سيانزە ساڵ لەمەككە مايەوە، ئاياتى مەككى بۆ نازڵ دەكران بۆ چەسپاندنى بنەماكانى عەقيدەو رەوشى جوان. لەماوەى ئەو سيانزە ساڵەدا هەر خەريكى ئامۆژگاريىو بانگكردنى خەڵك بوو، موعجيزەى دەنواند، قورئانى بۆ دەخوێندن، بەشێوەى جوانو لەسەرەخۆ موناقەشەى دەكرد، بەرنامەى ئايينى خوداى رادەگەياند، كاتێك فەرمانى پێكرا كۆچ بكا بۆ مەدينەو ئيزن درا شەڕ بكا بۆ ديفاع لەعەقيدەو بيروباوەڕو دەوڵەتى تازە رسكاوى ئيسلاميى لەمەدينە.

ئەمجار وێڕاى دەعوەتو بانگەوازىو نەصيحەتو ئامۆژگاريى تاوى دايە شمشێريش، بۆ روبەڕوبونەوەى دوژمنە سەرڕەقەكانو بەگژدا چونەوەيان. ئيمام ئەحمەدو ئەبوداوود لەئيبنو عومەرەوە ريوايەتيان كردوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: (بعثت بالسيف حتى يعبد الله وحده لا شريك له، و جعل رزقى تحت ظل رمحى، و جعلت الذلة الصغار على من خالف امرى، و من تشبه بقوم فهو منهم).

بەكورتى ئادەميزاد دوو جۆرن، هەيانە بەنەصيحەتو ئامۆژگاريى دێتە سەر رێگاى راستو واز لەخراپەكاريى دەهێنێ، هەشيانە بەزەبرو زەنگو شمشێرو

تفـەنگ نـەبێ مـەهار نـاکرێ. زۆر جـاری وا هەیـە کاریگـەریی هێـزو دەسـەڵات لەکاریگەریی قورئان پترە. وەکوو لەئەثەردا هاتوە (ان الله ليزع بالسلطان ما لا يـزع بالقرآن)

ئیتر خودا: کە پێغەمبەرانی ناردوە بەنامەی ئاسمانییـەوە شـەریعەتو یاسـای بۆ داناون، ئاسنیشی دروست کـردوە بـۆ ئـەوەی هـەموو جـۆرە چـەکێکی لێ دروست بکەن، ئایینی پێ بپارێزنو عەدالەتو دادی پێ بچەسپێنن. ﴿وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ واتە: خـودا هـەموو ئـەو کارانـەی کـرد بـۆ ئـەوەی دەری بخاو دەربکەوێ کێ یارمەتی ئایینی خودا دەدا، کێ پشتگیریی پێغەمبەرەکانی دەکا، کێن ئەوانـەی دڵسۆزانە بـەهۆی ئیمـان بروایـان بـەو شـتانەی کـە پەنامـەکین لێیـان وەکوو بـڕوا بـەرۆژی قیامـەت. چەك هەڵدەگرنو ئاسـن بـەکار دێـننو دژی دوژمن دەجەنگن، بێگومان خودا بۆ خۆی تواناو دەسەڵاتی رەهای هەیـەو پێویـستی بەیارمەتیدانی ئێوە نیە، عەزیزو باڵادەستە لەفـەرمانڕەوایی‌و حـوکمڕانی خۆیدا. وەلێ: کە فەرمان بەموسوڵمانان دەکا بـەجیهاد کـردن بـۆ ئەوەیـە خۆیـان سـودی لێ وەربگرن، لەدونیادا سەربەرز بژینو لەقیامەتـدا بەختـەوەر بـنو بـەمرازی گـەورە بگەن کە چونە ناو بەهەشتە.

## شەریعەتە ئاسمانییەکان لەبنەمادا هەموویان یەکن

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُمْ مُهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ

مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند: کە پێغەمبەرانی بەموعجیزەو ئایاتەوە ڕەوانە کردوە، فەرمانیشی بەئادەمیزاد کردوە: کە پشتگیری ئایینی خوداو پێغەمبەرەکانی بکەن، ئەمجار لەم کۆمەڵە ئایەتەدا ئەوە ڕادەگەیەنێ کە هەموو پێغەمبەران یەك بەرنامەیان هەیەو بۆ یەك مەبەست بانگەوازییان کردوە، بنەمای بیروباوەڕیان یەك بووە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ﴾ بێگومان ئێمە بابە گەورەی دووەمی ئادەمیزاد کە حەزرەتی

(نـوح)ە كردمانـە پێغەمبـەرو ناردمـان بـۆ سـەر گەلەكـەی، هـەروەها ئیـبراهیم: كـە خۆشەویـستی خودایـە بـەباوكی پێغەمبـەران ناسـراوە رەوانـەمان كـرد بـۆ سـەر نەتـەوەی تـر، ئـیتر لەوەچەو نـەوەی ئـەم دوو زاتـە زنجـیرەی پێغەمبـەرانمان تێـدا هەڵبـژاردنو رەوانـەمان كـردن، نامـەی ئاسمانیمـان پێـدا نـاردن، هـەموو پێغەمبـەرەكانمان لەنـەوەی ئـەو دوو پێغەمبـەرە بـەرێزەن. هـەر چـوار نامـە ئاسمانییەكان: كـە تـەوراتو ئینجیـلو زەبوورو قورئانـە لەنـەوەی نـوحو ئیـبراهیم بەدەر نیە، وەلێ ئەم نەتەوانـەی كـە ئـەو هـەموو پێغەمبەرانـەیان بـۆ سـەر رەوانـە كراو ئەو نامانەیان بۆ نێردرا هەموویان وەكوو یـەك نـەبوون، بـەڵكوو دابـەش بـون بەدوو كۆمەڵ، ﴿فَمِنْهُمْ مُهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ سـەرەنجامی ئـەو نەتەوانـە ئـەوە بـوو بوونـە دوو تـاقم، كۆمـەڵێكیان بـەپیر بانگـەوازی پێغەمبەرەكانیانـەوە چـونو شـوێن نامـەی ئاسمـانی كـەوتن، زۆرینەشـیان لـەرێگا لایـان داو سـنووری خودایـان شـكاندو فاسـق بـوون بەروالّـەت لـەناو ئایینەكـەدا مابوونـەوە بـەلام هـەموو جـۆرە تاوانێكیان ئەنجام دەدا.

﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِرُسُلِنَا﴾ ئـەمجار دوای نـوحو ئیـبراهیمو گەلـەكانیان پەیتاپـەیتا پێغەمبـەرانی خۆمانمـان نـاردە سـەر گـەلو نەتـەوەكانی دوا ئـەوان، بەگوێرەی پێویستو بەدرێژایی رۆژگار یەك لەدوای یـەك پێغەمبـەرمان نـاردن. تـا گەیشتە سەردەمو رۆژگاری عیسای كوڕی مەریـەم، ئـیتر ﴿وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ﴾ بەشوێن زنجیرەی پێغەمبـەراندا عیـسای كـوڕی مەریـەممان هێنـاو كردمانـە پێغەمبـەرو (ئینجیـل)مـان پێـدا: كـە تەواوكـەری كتێبـی تـەورات بـوو، حەقیقەتو ناوەرۆكی شەریعەتی عیسای لەخۆ گرتبوو، هەندێ ئـەحكامی تـەوراتی سـوك كردبـوون: كـە كـاتی خـۆی پـەروەردگار لەسـەر نەتـەوەی ئیـسرائیلی قـورس كردبون. وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژەی پێ دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾ (النساء: ١٦٠)

ئـەمجار پـەروەردگار بـڕێ ڕەوشـتی نەتـەوەی حـەزرەتی عیـسا بـاس دەكـاو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾ گێڕامان لەدڵی شوێنكەوتوەكانی عیسادا دڵنەرمیو بەزەیی هاتنەوە بەكەسانی دیكەدا بەپێچەوانەی جولەكەكان: كە دڵڕەقو بێویژدان بـوون. شـوێنكەوتوەكانی عیـسا لەخۆیانـەوە دیاردەی ڕەبـەنییان داهێنـا، لـەئاكامی ئـەو زۆرو سـتەمەی چەشـتیان لەدەسـتی سـتەمكاران، هیـچیان بەدەسـتەوە نـەما دەسـتیان كـرد بەخوداپەرستییەكی تایبـەتی: ئـەوە بـوو ڕویـان دەكـردە ئەشـكەوتو بـن بـەردو چـۆڵو بیابـان، جلوبـەرگی زبریـان دەپۆشـیو خـواردنێكی كـەمو هەژارانـەیان دەخـوارد، ژن هێنانیـان لـەخۆیان قەدەغـە دەكـردو لەكۆمەڵو ئاوەدانی گۆشەگیر دەبوون، خـودا لەسـەری پێویـست نـەكردبوون خۆیـان دایانهێنـابوو. ئـەوان ئـەو گۆشـەگیریەیان كـە دایانهێنـابوو مەبەسـتیان ڕەزامەنـدی خودا بوو، لەسەر خۆیان نەزر دەكردو بەباشی ئەنجامیان دەدا، وەلێ پـاش ماوەیـەك كـە لـەڕۆژگاریی حـەزرەتی عیـسا دوور كەوتنـەوە، ئایینەكـەیان شێواو گۆڕانكـاریی تێـدا كـرا، ئـیتر موراعـاتی ئـەرك و پێداویـستی گۆشـەگیرییەكەیان نـەكرد عیبادەتەكەیان كردە ڕوپامـاییو بـۆ مەبەسـتی دونیـایی بـەكاریان هێنـا، فەسادیان لـەناودا بـڵاو بـوەوە. واتـە: (ئـەوان دوو تاوانیـان ئـەنجام دان، یەكـەم گۆشـەگیریو ڕەبەنی خۆیان دایانهێناو لەئایینەكەیاندا نەبوو، دووەم پابەندیشی نەبوون...).

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەت دەكا؛ دەڵێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی ئەی ئیبنو مەسعود، وتم بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فـەرمووی دەزانـی نەتەوەی ئیسرائیل بەسـەر حـەفتاو دوو تـاقمدا دابـەش بـوون؟ سێ تاقمیـان نـەبێ ئەوانی تر هەموویان گومڕاو خەسارەتمەندن:

١- تاقمێـك لـەدوای عیـسا لـەدژی پاشـاو ملهوڕو بـێ ویژدانـەكان ڕاپـەڕینو بانگەوازییان كرد بۆ پابەند بوون بەئایینی حەزرەتی عیساو شەڕیان كـردو لێیـان كوژرا خۆیان ڕاگرتو ڕزگاریان بوو.

٢- تاقمێکی تریان لەدژی پاشاو ملهوڕەکان ڕاپەڕینو بانگەوازییان کرد بۆ ئایینی عیسا کوژرانو بەمشار دایانهێنانو سوتاندنیانن، خۆیان ڕاگرتو بەشەهیدی دونیایان بەجێهێشتو بەمراز گەیشتن.

٣- تاقمێکی تریان توانای شەڕو خەباتیان نەبوو نەیانتوانی بانگەوازیی بکەنو بیرو باوەڕی خۆیان لەناو کۆمەڵدا بڵاوبکەنەوە، ناچار ڕویان لەکێوو کەژو بیابان کردو گۆشەگیر بونو بون بەرەبەن، ئەمانە ئەو کەسانەن کە خودا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ ...﴾

﴿فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ بەخشیمان بەوانەی بەراستی ئیماندار بوونو دڵسۆزانە خوداپەرستییان کرد پاداشی خۆیان، زۆربەی زۆری ئەو رەبەنانە فاسقو گومڕان، لەئایینی خۆیان لایان داوەو سنووری خودایان شکاندوە، بەناحەقی ماڵی خەڵك دەخۆن، فریان بەسەر شەریعەتی عیساوە نیە. ئاشکرایە زێدەڕەوی لەهەموو شتێك ناپەسەندە. تەنانەت لەئەنجامدانی ئەرکی ئایینیشدا.

هەر بۆیە ئایینی ئیسلام ئایینێکی میانەکارەو دژی توند ڕەوییە. ئەبو یەعلا لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ئەرکی ئایینی لەسەر خۆتان قورس مەکەن قورس دەبێ لەسەرتان، بێگومان گەلو نەتەوەیەك ئەرکی ئایینیان لەسەر خۆیان قورس کرد قورس بوو لەسەریان ئەوەتا ئەوە پاشماوەی ئەوانە لەدێرو کەنیشتەکاندا بەدی دەکرێن. ئیمام ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لکل نبی رهبانیة ورهبانیة هذه الامة الجهاد فی سبیل الله عزوجل)

ئەمجار پەروەردگار خیطاب ئاراستەی کۆمەڵی موسوڵمانان دەکا کە دوا زنجیرەن لەزنجیرەی بڕوادارانی ئادەمیزاد لەمێژووی کەونارای داو میراتگرو جێنشینی هەموو ئایینەکانن... دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا

بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُوراً تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەی خاوەن باوەڕانی ئەهلی کیتاب ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەتاك‌وتەنهایی خودا هەیەو پێغەمبەر بەراست دەزانن‌و شوێنی کەوتوون تەقوای خودا بکەن، بترسن لەخودا بەوە هەرچی لێ قەدەغە کردون توخنی مەکەون، هەرچی فەرمانی پێکردون بەگوێرەی توانا ئەنجامی بدەن، شوێن پەیامی پێغەمبەری ئیسلام بکەون، خودا دو بەشتان لەرەحمەتی خۆی دەداتێ چونکە ئیمانتان بەپێغەمبەری خۆتان هەبوە. سەرباری ئەو بەشە رەحمەتە نورو روناکیتان پێ دەبەخشێ بەو نورەوە بەسەر پردی سیراتدا تێدەپەڕن، ڕێگای بەهەشت دەگرنەبەر، لەدونیادا بەهۆی ئەو نورەی ئیمانەوە چاك‌و خراپ جیا دەکەنەوە، خۆتان لەکوفرو نەفامی دەپارێزن. پەروەردگار لەتاوانی رابوردوتان خۆش دەبێ‌و خودا زۆر لێ خۆشبووەو خاوەنی بەزەییە.

پەروەردگار لەم ئایەتەدا وادەی بەوانە داوە کە بڕوایان بەپێغەمبەری ئیسلام هێناوە دوای ئەوەی ئیمانیان بەپێغەمبەرانی پێشوو هەبووە، کە سێ پاداش‌و سەروەرییان بداتێ. دوو چەندانەی پاداش‌و بەخشینی نورو روناکی‌و لێخۆشبون لەتاوانی پێشویان. .

خاوەن نامەکان (بەتایبەت جولەکەکان) پێیان وابوو ئەوان هەڵبژاردەی رەگەزی ئادەمیزادن، خۆیان بەکوڕی خوداو خۆشەویستی خودا دەزانی، دەیانگوت: خودا دڵی نایە ئێمە سزا بدا، هەروەها دەیانگوت هەرکەسێ جولەکەو فەلە نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە، بەهەشت هەر بۆ ئەوان قۆرغ کراوە. لەهەمان کاتدا جولەکەکان پێیان وابوو پێغەمبەرایەتی هەر دەبێ لەرەگەزی نەتەوەی ئیسرائیلدا بێ‌و تایبەتە بەوانەوە. ئیتر پەروەردگار رەددی دانەوەمو فەرمووی: ئەی ئەهلی کیتاب تەقوای خودا بکەن ئیمان بەپێغەمبەری ئیسلام بێنن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ

مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ بۆ ئەوەی خاوەن نامەکان لەو گاورو جولەکانەی بڕوایان بەحەزرەتی موحەممەد نەهێناوە تێبگەنو بزانن: کە هیچ فەضلو رەحمەتێکی خودایان دەست ناکەوێ، تا بڕوا بەحەزرەتی موحەممەد نەکەنو شوێن پەیامەکەی نەکەون دڵنیاش بن کە ناتوانن ئەو فەضلو میهرەبانییە قەدەغە بکەن لەوانەی خودا پێی بەخشیون ئەوەش بزانن: کە ئەو فەضلو میهرەبانییە بەدەست خودایەو خودا دەیدا بەکەسێك شایەنی ئەو سەروەریو بەهرەیە بێ وەکوو چۆن بەموحەممەدو هاوەڵانی بەخشیوە. خودا فەضلو رەحمەتی بەرفراوانەو بەخشایندەو خاوەن بەزەیییەو بەخششی گەورەی هەیەو دەیدا بەبەندە راستاڵەکانی.

بەکورتی ئیمانهێنان بەموساو عیساو بەتەوراتو بەئینجیل بێسودە ئەگەر بڕوا بەحەزرەتی موحەممەد نەکەنو شوێن پەیامی ئیسلام نەکەون...

**بە یارمەتی خودا شەوی یەکەمی رەمەزانی ساڵی ١٤٢٣ی کۆچی لەپاکنوسی ئەم جزمە لەتەفسیری رەوان بومەوە کە بەرامبەر بوو بە ٦/١١/٢٠٠٢**

**لەکاتێکدا کە لەژیانمدا هێندە خەمو خەفەت روی تێ نەکردوم،**

**خودا بەگەورەیی خۆیو بە فەضلو کەرەمی دڵخۆشمان بکاو خەمو خەفەتمان لەدڵ دەربهاوێ...**

**مەلا مەحمود احمد**